ئۆریانا فالاچی

# ژیان و جەنگ و هیچی تر..

وەرگێڕانی:
عەزیز گەردی

**ئەسلی کتێبەکە**

زندگی، جنگ ودیگر هیچ .. ترجمه لیلی گلستان
چاپ پنجم ۱۳۵۳چاپخانه سپهر ، تهران

حکومەتی هەرێمی کوردستان

وەزارەتی ڕۆشنبیری

بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان

xaneywergeran@hotmail.com

- ناوی کتێب: ژیان و جەنگ و هیچی تر..
- نووسەر: ئۆریانا فالاچی
- وەرگێڕانی لە فارسییەوە : عەزیز گەردی
- پیتچنین: ژاوین شالی
- دیزاینی ناوەرۆک : زانا کەمال
- بەرگ : ئارام عەلی
- تیراژ : ١٠٠٠
- زنجیرە : ٢١٠
- چاپخانە: تیشک
- چاپ: چاپی یەکەم
- ژمارەی سپاردن : (٢٠٠٢) ساڵی (٢٠٠٨)


**پێشکەشە بە ( فرانسوا پلۆ )**

**نووسەر**

**وەرگێڕانەکەی پێشکەشە بە گیانی( ئۆریانا فالاچی)**

**وەرگێڕ**

# لەباتی پێشەکی

(ئیلیزابێتا) ی چکۆلەو شادو ناسك، پاش چەند مانگێکی دی تەمەنی دەبێ بە پێنج سالّی. بەخۆمەوە نووساندم و دەستم پێکرد کتێبم بۆ خوێندەوە. لەپڕ سەیری کردم و پرسی:

– ژیان یانی چی؟

– وەلاّمێکی گەلۆرانەم دایەوە:

– ژیان، ماوەی نێوان لەدایك بوون و مردنە.

– مردن چییە؟

– مردن ئەو کاتەیە کە هەموو شتێ تەواو دەبێ و دەبڕێتەوە.

– وەکوو زستان؟ کە گەلاّی دارو درەخت هەلّدەوەرێ؟ بەلاّم خۆ تەمەنی دارو درەخت لەگەلّ زستان تەواو نابی، وانییە؟ کە بەهار هات درەخت دووبارە زیندوو دەبێتەوە، وایە، یان نا؟

بەلاّم بەش بەحالّی پیاو مەسەلەکە وانییە، هەروەها بەش بەحالّی ژن و مندالّیش. کە یەکێ مرد ئەوە هەتاهەیە مردووە و ئیتر دووبارە زیندوو نابێتەوە.

– شتی وا نابێ، ئەمە ر است نییە.

– بەدی، (ئیلیزابێتا)، دەبخەوە!

– من ئەم قسانەی تۆم قبوولّ نییە. من وای بۆ دەچم کاتێ کە یەکێ دەمرێ وەکوو دارو درەخت بەهارێ زیندوو دەبێتەوە.

ئەو رۆژە بۆ بەیانی چوومە ڤێتنام. لەڤێتنام شەڕ بوو، ئاگر بوو، خوێن بوو. من پەیامنێر بووم و چ زوو چ درەنگ هەر رێم دەکەوتە ئەوێ. شەو داهات و خەوتم و لەپڕ دەنگی جەنگ گوێی وڕوکاس کردین.

هەموو شوێنێ دەلەرزی و دەهەژا، کاولکاری بوو،خەلّك دلّ کون کون ببوو. هەراو زەنای مندالاّنی بێ سەرپەرشت و قەپ  و قیڕی ئەو دایکانەی مندالّیان





لەدەست چوو بوو، تێکەلّ ببوو. من هەر زوو تێگەیشتم بەهارێ کەس دووبارە زیندوو نابێتەوە.

من بیرم لەوە دەکردەوە ئێستا لەو سەری دونیا باس باسی ئەوەیە ئەگەر نەخۆشێك تەنیا دە دەقیقەی لەژیاندا مابێ، ئاخۆ دەکرێ دلّی بگوازنەوە و بیخەنە جێگای دلّی نەخۆشێکی تر بۆ ئەوەی ئەمەیان چاك بێتەوە؟ کەچی لێرە هیچ کەس ئەم پرسیارە لەخۆی ناکا: ئایا شتێکی راستە کە کۆمەلّە مرۆڤێکی سپ و ساغ، بێ گیان بکەن و؟... لەرقان هەموو گیانم دەلەرزێ. رق و نەفرەت مێشکم کون دەکا. (ئێلیزابیتا) !پەیمان بێ ئەم لێکترازانەی دونیا، بۆتۆ و بۆ ئەوانی تر باس بکەم؟

بۆ تۆ (ئیلیزابیتا)! کە لەناکۆکییەکانی ئەم دونیایە پڕ ئاژاوەیە ناگەیی و بۆ تۆ کە نازانی، بۆچی من کاتێ کە پێ دەکەنم، لەناخی دلّەوە پێ دەکەنم و بۆچی کاتێ کە دەگریم، ئەوەندە زۆر دەگریم و بۆچی کاتێ کە دەبێ شادومان بم، خۆشحالّ نابم و بۆچی گاوێ بەزەحمەتم و چەلێ بە ئاسانی دێمە دەست؟ تۆ هێشتا نازانی. لەم دونیایەدا، بەموعجیزەو تەقەلا  ژیانی ئینسانێك لە سەرەمەرگ رزگار دەکەن، بەلاّم دەبن بەهۆی مردنی سەدەها و هەزارەها و ملیۆنەها ئینسانی ساغ و زیندوو! دەزانی؟ ژیان، زۆر لەماوەی بەینی لەدایکبوون و مردن زیاترە.

دیسان نەمتوانی وەلاّمێ بۆ پرسیارەکەی (ئیلیزابیتا) بدۆزمەوە. ئایا ئیشێکی راستە پشێوی و نیگەرانی خۆت بۆ مندالّێ باس بکەی؟ من هەولّم دا وابکەم، بەلاّم پاشان بیرم کردەوە: (( چیرۆکەکە بە هەقایەتی کەروێشکی بچکۆلّەو پەپوولەو فریشتەی پاسەوان و بە فریودانی هەمیشەیی بەدیماهی بێنم. بەلاّم ئەو، پاشان خۆی تێ دەگا کە پەپوولە لە هەوەلّەوە کرم بووە و کەروێشك یەکتر هەلّدەدڕن و فریشتەی پاسەوان وجوودی دەرەکییان نییە.

زیندوێتی شتێکی زۆر چاك و خۆشە. چەند خۆش بوو، هەمیشە خۆشحالّ بین بەوەی کە زیندووین. ئەوسا هەستمان دەکرد کە سبەینان شووشتنی دەم و چاو بە پەرداخە ئاوێك چ تام و چێژێکی هەیە، با شەوی پێشوویش بەجلی ئارەقاوی

نووستبین و کیسەی خەوتنیشمان بۆنێکی ناخۆشی لێ بێ و بە دەردەسەری ئاودەستمان دەست بکەوێ؟

دەزانی ئەمڕۆ سەر لەبەیانی چ قەوما؟ فەرماندە دەستووری دابوو پەناگەی ڤێتنامییە باکورییەکان بە فانتۆم بۆمبا باران بکەن. پەناگەکە زۆر لەشوێنی بریندارەکانەوە نزیك بوو. بۆمباکە یەکەو راست بەناوەندی شوێنی بریندارەکان کەوت. قورسایی دەوری سەدو پەنجا کیلۆ دەبوو، بوو بە مایەی قڕتێ کردنێکی ترسناك. ئەم غەڵەتە وای کرد یەکەم هێلیکۆپتەرمان لەدەست بچێ. کە هێلیکۆپتەری دووەم هات، فڕۆکەوانەکە خەبەری هێنا فیت کۆنگ ئەو هێلیکۆپتەرەیان بەردایەوە کەئێمە بەتەما بووین سواری بین. کە ئەم خەبەرەم بیست تەنیا هەستم کرد موچڕکێکم پێ داهات و بەس. دەزانی!؟ ئینسان هەر زوو لە هەموو شتێ رادێ. زۆرمان بەلاوە سەیر نییە کە دەبوو بمرین و نەمردین.

لێمان بووە بە خوو و راهاتووین کە بەرامبەر خراپەکاری و بێ رەحمی تەنانەت برژانگ لێك نەنێین. لەگەڵ ئەمەشدا ژیان شیرینە!

پرسیار لەجۆرج دەکەم:

– کە دەبێ بە تەقە، بیر لەچ شتێ دەکەیتەوە؟

– تەنیا لەکوشتن و لەوەی کە نەکوژرێم. هەمیشە لەکاتی هێرشدا ترسێکی سەیر هەموو گیانم دادەگرێ. یەکەم جار کە بۆ هێرش دەرچووم، کاغەزێکی ژنەکەم پێ گەیشت. نووسیبووی دووگیانە. ئەوەندە دەترسام، هەر وەخت بوو رۆحم دەربچێ. (پۆپ)ی برادەرم لە تە نیشتم بوو. بەیەکەوە هاتبووینە ڤێتنام و هەمیشە هەر بەیەکەوە ش بووین، وەکوو دوو دۆستی لێك دانەبڕاو.

... کاتێ کە تۆپەکەیان پێوە نain، من چاوم لێ بوو، بەڵام هیچم بە (پۆپ) نەگوت. خۆم بەسەر زەوی دادا، بەڵام (پۆپ)م ئاگادار نەکردەوە. دەزانی؟! تەنیا بیرم لەخۆم دەکردەوە. لەوکاتەدا کە تەنیا بیرم لەخۆم دەکردەوە، بینیم، بینیم (پۆپ) تەقییەوە و مرد...

... فیت کۆنگێ بە هەموو هێزی خۆیەوە رایدەکردو هەموو تەقەیان لێ دەکرد، وەکوو چۆن لە ژووری گوللەبارانی باخچەی شار، گوللە بە نیشاوە دەنێن. بەڵام





هیچ گوللەی پێ نەدەکەوت. پاشان من یەك گوللەم پێوەناو بەربووەوە. دەق وەکوو ئەوە وابوو گوللەم بە درەختێکەوە نابێ، تەنانەت چوومە سەری و دەستیشم لێ دا، بەڵام دیسان هەستم بەهیچ نەکرد. شتێکی گەلۆرانەیە، بەڵام ئەوە ئاوهایە!

ژیان هەرچی هەیە، قبووڵە.لەم دونیایەی ئێمەدا، هەر کەسە لە دراوسێکەی زیاتر دڵی بەژیانی خۆیەوەیە. ئەمە شتێکی سروشتییە؟ بەڵام (پۆپ) هەرگیز بەهارێ دووبارە لەدایك نابێتەوە. فیت کۆنگەکەش.

بەڵام (ئیلیزابێتا)! ئایا تۆ و نەوەکانی دوای تۆ چ جۆرە حوکمێکیان بەسەردا دەدەن؟

ژیان جۆرە حوکمدانێکە بە مردن. هەر لەبەر ئەمەشە کە دەبێ تەی بکەین بەبێ یەك هەنگاوی غەڵەت و بێ ئەوەی یەك چرکە بخەوین وبە بێ ئەوەی دوودڵ بین کە غەڵەت دەکەین، یان بیر لەشکانی بکەینەوە، دەبێ تەی بکەین. ئاخر ئێمە ئینسانین، نەفریشتەین و نەحەیوانین... ئێمە بەشەرین...

وەرە خوشکە چکۆڵەکەم، (ئیلیزابێتا)، وەرە، تۆ دەتەویست بزانی ژیان یانی چی؟ ژیان شتێکە دەبێ باش لە رووداو و دیدەنی، لە کردەوە و بیروڕا پڕ بکرێ، باشتریش ئەوەیە کە لەکردەوە و بیروڕای بەشەرانە پڕ بکرێ.

# بەشی یەکەم

بەهەنگاوی ڕاڕا هاتە ژوورەوە، بە حاڵەتێکی وا کە بیەوێ شتێ بڵێ و نەزانێ چۆن بیڵێ. ئەوپشتی بە جانتایەك دادابوو، سەیری منی دەکرد و لە هەمان کاتدا پێیەکی لە هەوا دەهەژاندەوە.

مانگی تشرینی دووەم بوو. دارو درەختی ڤێلاکەم  بە (با) ی ساردی زستان وشك ببوو.

– ڕاستە تۆ دەتەوێ بچی؟

– ئا، (ئیلیزابێتا)!

– باشە، من ئەمشەو لەگەڵ تۆ دەخەوم.

گوتم: باشە ڕازیم. کە من ئەم  قسەیەم کرد، ئەو لەشوێنی خۆی هەستاو هەر ڕایکرد چوو کراسی نووستن و کتێبی (ژیانی رووەك)ی خۆی هێنا. پاشان هات لە تەنیشت من ، لەسەر چوارپاکەم ڕاکشا:

چکۆڵە و شاد و ناسك.

تا چەند مانگی تر تەمەنی دەبێ بە پێنج ساڵ . بەخۆمەوە نووساندم و دەستم پێ کرد کتێبم بۆ خوێندەوە. لەپڕ سەیری کردم و پرسی:

– ژیان یانی چی؟

من هەرگیز پەیوەندیم لەگەڵ منداڵان پتەو نەبووە. هەرگیز نەمتوانیوە خۆم لەگەڵ زمان و مەراقیان بگونجێنم. وەڵامێکی گەلۆرانەم دایەوە، هەر چەندە دەشمزانی ئەوەندە دڵی بەو وەڵامە داناکەوێ.

– ژیان، ماوەیەکە لەنێوان ئەو کاتەی کە دێیتە دونیاو ئەو کاتەی کە دەمری.

– هەر ئەوەیە!؟

– ئا، (ئیلیزابێتا)! هەر ئەوەیە!





– ئەی مردن چییە؟

– مردن، ئەو کاتەیە کە هەموو شتێ دەبڕێتەوە و ئێمەش ئیتر نەماوین.

– وەکوو زستان؟ کاتێ کە گەڵای دارودرەخت هەڵدەوەرێ؟

– ئا ، شتێکی لەو بابەتەیە.

– بەڵام درەخت تەمەنی لەگەڵ زستان تەواو نابێ، وانییە؟ کە بەهار هات درەخت دووبارە زیندوو دەبێتەوە، وایە، یان نا؟

– بۆ پیاو مەسەلەکە بەم جۆرە نییە. پیاوێ، کەمرد، هەتاهەتایە دەمرێ و تازە جارێکی دی زیندوو نابێتەوە.

– ئەی ژن؟ ئەی منداڵ؟

– ژن و منداڵیش هەروا.

– شتی وا نابێ.؟

– بەدی! (ئیلیزابێتا)!

– ڕاست نییە.

– دەزانم، دەبنووا!

– حەزدەکەم بنووم، بەڵام من قسەکانی تۆم بۆ قووت ناچی؟ من وای بۆ دەچم یەکێ کە دەمرێ، وەکوو چۆن درەخت بەزستان وشك دەبێ و بەهارێ دووبارە سەوز و زیندوو دەبێتەوە، ئەویش ئاوها دووبارە  زیندوو دەبێتەوە. کەواتە ژیان دەبێ شتێکی تر بێ، نەك ئەوەی تۆ دەیڵێی.

– ژیان شتێکی تریشە، ئەگەر تۆ بخەوی، بۆت باس دەکەم.

– کەی؟

– بەیانی، (ئیلیزابێتا)!

ئەو ڕۆژە بۆ بەیانی چوومە ڤێتنام. لە ڤێتنام شەڕ بوو، هەر پەیامنێرێ، چ زوو و چ درەنگ، چ لەسەر داوای ڕۆژنامەکەی  و چ لەسەر داخوازی خۆی، ڕێی بەوێ دەکەوت. من خۆم داوام کرد بچم. لەوانەیە بۆ ئەوە بووبێ وەڵامی ئەم پرسیارەم دەست بکەوێ کە ئەو شەوە  نەمتوانی وەڵامی ئیلیزابێتا بدەمەوە: ژیان یانی چی؟ لەوانەیشە کاتی ئەوە هاتبێ کە تێ بگەم ئەوەی مرد، بەهارێ هەرگیز

دووباره لەدایك نابێتەوە.

ئێستا لە(سایگۆن)بووم و بە واق وڕماوی سەیری دەوروبەری خۆمم دەکرد: هیچ جەنگ لەگۆڕێ نەبوو!

ئەی کوا جەنگ؟ لەکوێیە؟

– هیلیکۆپتەر، لەفرۆکەخانەی (تان سون نەت) بەشەست تیری قورس و بۆمبای ناپاڵمی لەسەر پێ، وەستابون.

سەرباز بە دەم و چاوی ئاڵۆسکاوەوە، لە کەناری گۆڕەپانەکە وەستابوون و چاوەڕێیان دەکرد بە سواری فڕۆکە بڕۆن .

بەڵام ئەمە جەنگ نییە!!

بەدرێژایی ئەو ڕێگایەی دەچێتە شار، هەمووی سەنگەری دڕوودار و لەمپەری فەردە لم و حەشارگەی تەقە کردن بوو.

بەڵام ئەمە جەنگ نییە!!

لە شار، سەربازی چەکدار سواری جێبان ببوون و لۆری بەتۆپی بچووك و کەرەستەو پێویستی جەنگ و سندووقی تفاق دەکەوتنە بەر چاو.

بەڵام ئەمە جەنگ نییە.

جەنگ، هیچ جیاوازییی لەگەڵ ئەو (ریکشا) یانە نەبوو کە لەباتی ئەسپ عەرەبانەی بچووکیان ڕادەکێشاو تیژ بەناو خەڵکدا دەهاتن و دەچوون، لەگەڵ ئەو ئاوگێڕانەی سەتڵیان بە هەردوو سەری دار حەیزەرانەوە هەڵواسی بوو و بەخێرایی دەڕۆیشتن و زۆر وەستایانەش لەنگەری خۆیان ڕادەگرت، لەگەڵ ئەو ژنە وردیلانەی جلی درێژیان لەبەر بوو و قژی ڕەش و لووسی خۆیان بەردابووەوە سەر شانیان، لەگەڵ پایسکیل، لەگەڵ ماتۆڕ، لەگەڵ منداڵان کە قووتووی بۆیە و ڕۆنی بۆیە کردنی پێڵاویان پێ بوو، هەروەها جەنگ هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ئەو تەکسییانە نەبوو کە توند و سەرشێتانە دەڕۆیشتن.

ساڵی ١٩٦٧، (سایگۆن) شاری شادی بوو. لەبیرتە؟ لەتشرینی دووەمی ١٩٦٧، چوویتە ڤێتنام؟ لەبیرتە؟ جەنگت هەر بە خەیاڵ دا نەدەهات. ئەو کاتە (سایگۆن)، بەدوکانی پڕ خۆراك و دوکانی زێڕینگریی پڕ زێڕو چێشتخانەی قەشەنگ و





خۆرەتاوی خۆش، مەیلەو حاڵەتی دوای جەنگی هەبوو.

کاتێ کە دەچوویتە ئوتێل، هەڵکێش (ئەسانسۆر) هەبوو، تەلەفۆن هەبوو، پانکەی ساپیتە هەبوو، پێشخزمەتی ڤێتنامی لەگەڵ بچووکترین ئاماژە ئامادەی خزمەت کردنت بوو، هەمیشە سەبەتەیەکی پڕ ئەناناسی تازە و ئەنبەه لەسەر مێز بوو. مردنت هەر بە خەیاڵدا نەدەهات.

شەو داهات و نووستم . لەپڕ سەدای جەنگ گوێی وڕوکاس کردم.

دەنگی تۆپێك و ئینجا تۆپێکی تر و دیسان تۆپێکی تر. دیوارەکان دەهەژانەوە، کاشییەکان بەجۆرێ ڕادەتەکان دەتگوت هەموو بەسەر سەرتدا دەڕووخێن.

چرای بن ساپیتە زۆر بەترسناکی دەهەژایەوە. هەر ڕامکرد بۆ لای پەنجەرە، ئاسمان لە ئاسۆوە سوور دەچووەوە. من جەنگێکم دی و لەم جەنگەدا هەر زوو زانیم بەهارێ هیچ کەس دووباره لەدایك نابێتەوە.

من بیرم لەوە دەکردەوە: ئێستا لەو سەری دونیا مشت و مڕو هەراو هۆریا لەسەر ئەوەیە ئاخۆ شتێکی ڕاستە مرۆڤێکی نەخۆش تەنیا دە دەقیقەی لەژیاندا مابێ، دڵی دەربێنن و بیخەنە جێگای دڵی نەخۆشێکی تر بۆ ئەوەی ئەمەیان چاك بێتەوە؟ کەچی لێرە، هیچ کەس پرسیاری لەخۆی نەدەکرد ئاخۆ ڕاستە کۆمەڵێ مرۆڤی گەنج و پاك و سپ و ساغ لەناو ببەن و؟... هەموو گیانم بۆتە ڕق و نەفرەت. ڕق خزیوەتە ژێر پێستەم و مێشکی سمیوم و پەیمانم لەگەڵ خۆم بەستووە ئەم لێك پچڕانەی دونیا بۆ خەڵکی تریش باس بکەم، هەر سەبارەت بەم لێك پچڕانەش بوو ئەم یادداشتنامەیەم بۆ نووسیوی "ئیلیزابیتا" !

بۆ تۆ کە نازانی بۆچی کاتێ من کە پێ دەکەنم، ئاوها لەناخی دڵەوە پێ دەکەنم و بۆچی کاتێ کە دەگریم، ئەوەندە زۆر دەگریم و بۆچی کاتێ کە دەبێ خۆشحاڵ بم، خۆشحاڵ نابم و بۆچی هەندێ جار ئەوەندە بەزەحمەت و پڕ ئومێد و چاوەڕوانیم. بۆ تۆ کە هێشتا نازانی لەسەر ئەو گۆی زەوییەی کە بە موعجیزە و تەقەلا ژیانی مرۆڤێ لەسەر مەرگ ڕزگار دەکەن، دەبن بەهۆی مردنی سەدان و هەزاران و ملیۆنان ئینسانی ساغ و زیندوو.

دەزانی؟ ژیان لەو ساتە زۆر زیاترە کە دەکەوێتە بەینی ئەو کاتەی دێینە دونیاو

ئەو کاتەی لەدونیا دەردەچین.

(١٨)ی تشرینی دووەم

دوای نیوەڕۆ

نیوەڕۆ، لە (ئاژانسی فرانس پرێس )بووم، کە لەناکاو خەبەرەکەیان پێ ڕاگەیاندین.

پێیان گوتبووم (ئاژانسی فرانس پرێس) باشترین شوێنە بۆ وەرگرتنی هەواڵ و باشترین کەسیش بۆ وەرگرتنی هەواڵ و زانیاری (فرانسوا پلۆ)ی سەرۆکی ئەو ئاژانسەیە، بۆیە پێش نیوەڕۆ چوومە ئەوێ تا چاوم پێ بکەوێ.

پیاوێکی مەیلەو گەنج و قۆز بوو، لەشێکی وەرزشکارانەی هەبوو، قژی خۆڵەمێشی و دەم و چاوی ئێسکن بوو. چاوی ئەوەندە تیژ بوو هیچ شتی لەبەر چاو بزر نەدەبوو. لەهەمان کاتدا غەمگین و خۆش گلە بوو. دەزانی چۆن بوو؟ لەو پیاوانە بوو کە چەند جار دەگەڕێیتەوە بۆ ئەوەی باشتر تەماشای بکەی، چونکە وەکوو پیاوەکانی دیکە نییە، لەو پیاوانەبوو کە سێبەری خۆیان لە چاوی مرۆڤ جێ دێڵن. هەڵس و کەوتی خێرا و سەرکەشی زیاتر سەرنجی ڕاکێشام.

حاڵەت و هەڵس و کەوتی هەرگیز متمانەی لا دروست نەدەکردی، بێگومان ئەویش هەوڵی نەدەدا متمانەت لە لا دروست بکا. بەهەر حاڵ، ئەوکاتەی کە من چوومە ژوورەکەی، ڤێتنامییەکیش هاتە ژوورەوە و کاغەزێکی دایە دەست و شتێکی چرپاندە گوێی من تێی نەگەیشتم. ئەویش لەپڕ لەجێی خۆی دەرپەڕی و بەتووڕەیی دەسکی تەلەفۆنی هەڵگرت و بە ڕقەوە دەستی بە ژمارە لێدان کرد، کەچی ئەوانی تر کپ و بێ جووڵە دانیشتبوون و تەماشایان دەکرد. پرسیم: چ بووە؟ کەس وەڵامی نەدامەوە. دوای چەند دەقیقەیەك خەبەرەکەیان پێ گوتم: دووسبەی، سەعات پێنجی بەیانی، سێ سەربازی فیت کۆنگ لە زیندانی سەرەکی سایگۆن، گوللە باران دەکەن. ناویان: (بۆی وان چیو) و (لومین چا) و (ترونگ دان تان) بوو، هاوینی ڕابردوو بە مەرگ حوکمیان دابوون.

یەکەمیان بە تاوانی خیانەت کردن لە دەوڵەت و هەڵگرتنی چەکی قاچاغ و دووەکەی تریش بە تاوانی ئەوەی نارنجۆکیان فڕێ دابووە ناو چێشتخانەیەك.





فرانسوا، کە بە تووڕەیی دەسکی تەلەفۆنەکەی دانایەوە جێی خۆی، گوتی:

– دەزانی ئەم ئیشە چ مانایەك دەگەیەنێ؟

فرانسوا، بە دوای (لیون)ی سەرۆکی پۆلیسی شاردا دەگەڕا بۆ ئەوەی ڕاستیی خەبەرەکە لە زاری ئەوەوە ببیسێ.

– نەخێر، چ مانایەك دەگەیەنێ؟

– ئەم ئیشە مانای ئەوەیە، ئەوانەی ئیعدام دەکرێن، تەنیا ئەو سێ نەفەرە نابن، بەڵکو شەش نەفەر و ڕەنگە بگاتە نۆ نەفەریش.

– باشە، بۆچی؟

– ئەگەر لێپرسراوانی ڕەسمی دەوڵەتی (سایگۆن)، سێ کەسی مەحکووم بە مەرگ، ئیعدام بکەن، بەرەی ڕزگاری میللیش، بەلانی کەمەوە، سێ زیندانی ئەمریکی ئیعدام دەکەن. ئەوان دەستووریان ئاوهایە. حوزێرانی ١٩٦٥ ، کاتێ کەزیندانییەکیان بە ناوی (تران وان دانگ)، بە تاوانی تەقاندنەوە ی ئوتێلی میترۆ پۆل، ئیعدام کرد و ڕادیۆی ڤێتنامی باشوور ئەم خەبەرەی بڵاوکردەوە، ڕادیۆی بەرەی ڕزگاری میللیش لە بەرنامەی خۆیدا گوتی:

" ئەگەر (تران وان دانگ) گوللە باران بکرێ، ئێمەش زیندانییەکی ئەمریکی ئیعدام دەکەین."

(تران وان دانگ) گوللە باران کرا و هەر ئەو ڕۆژەش، دوای دادگایی کردنێکی زۆر بەپەلە، (جۆرج بنت)ی سەربازی ئەمریکی، بە ئاگری گوللەی فیت کۆنگێك سارد کرایەوە. سەفیری ئەمریکا لە ڤێتنام ناڕەزایی بەرامبەر بەم کارە دەربڕی و لێپرسراوانی ڤێتنامی تاماوەیەك کەسیان گوللە باران نەکرد، بەڵام دوای سێ مانگ، ژەنەراڵ (تی)، لە بەرەبەیانی (٢٢)ی ئەیلوول، بەبێ دادگایی کردن سێ قوتابی ڤێتنامی خوارووی لە گۆڕەپانی شاری (دانانگ) گوللە باران کرد. ئەم قوتابییانە ناویان: (هوین وان لام)و (هوین وان چوو)و (فا وان کو) بوو. دووەکەی بەرایی برا بوون. ڕادیۆی بەرەی ڕزگاری میللی لە (٢٦)ی ئەیلوول بەرنامەی خۆی بڕی و ئەم خەبەرەی ڕاگەیاند: " قسەکەری سەربازیمان خەبەری دا کە دوای گوللە باران کردنی سێ قوتابی خەڵکی (دانانگ)، دوو زیندانی ئەمریکی ئیعدام

کران. ئەم دوو زیندانییە ناویان سەرهەنگ (کنت دوراباك)و کاپتن (هەمبرب وارساس) بوو." کاپتن (وارساس)، ماوەی خزمەت کردنی لە ڤێتنام تەواو ببوو، بڕیار بوو ئەو رۆژەی لەسەری درا، بۆ بەیانی رۆژی پاشی بگەڕێتەوە ئەمریکا. ئەو پیاوە یەکێ بوو لە بەرهەڵستکارە سەر سەختەکانی جەنگی ڤێتنام.

دەوری نیو سەعاتی زیاتر پێ چوو تا (پلۆ)، بە تەلەفۆن ژەنەراڵ (لۆن)ی دۆزییەوە و دوای پرسین و تاقیب کردن، ژەنەراڵ (لۆن) گوتی خەبەرەکە راستە.

پۆلیس زیندانی ئابڵووقە دابوو بۆ ئەوەی خەڵکە ورووژاوەکە پەلاماری زیندان نەدەن.

بێدەنگی باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشابوو، (پلو) لەو بێدەنگییەدا دەستی بۆ دەسکی تەلەفۆن درێژ کرد و بڵندی کرد و بە شێنەیی ژمارەیەکی لێدا. لەکاتێکا کە ئەوانی تر هەموو بەبێ دەنگی تەماشایان دەکرد، ئەو لەگەڵ کابرایەکی (باری زوریتان) ناوێ لە سەفارەتی ئەمریکا، دەستی بەقسە کرد:

– بەڵێ... باری... گوللە باران... بەڵێ باری ... بەیانی سەعات پێنج ... نا ، (باری)، نا... من پێم وایە هەر زۆر رێی تێ دەچێ. من دەزانم دەوڵەت دەبوایە تۆ لەم خەبەرە ئاگادار بکاتەوە کەچی تائێستا ئەم خەبەرەی پێ نەداوی. باشە،(باری) ئەوە جارێکی تر هەموو شتێکم پێ گوتی. بەڵام ئەوەش بزانە نابێ یەك لەحزە وەختت بەفیڕۆ بدەی.

(پلۆ)، بەدرێژایی ئەو ماوەی بە تەلەفۆن قسەی دەکرد، دەم و چاوی خراپ تێك چوو بوو، چاوی لە مۆڵەق وەستا بوو. پاشان بۆی باس کردم کە چۆن چۆنی لە (سایگۆن) فیت کۆنگەکان گوللەباران دەکەن و بە چ جۆرێ لە گۆڕەپانی گەورەی شار دایاندەگرنە بەر گوللە: پێش بەیانی کە حکوومەتی سەربازی(منع التجول) هێشتا جڵەوی بەدەستە و دونیا مەیلە و تاریکە، شەوقی لایتی جیبی سەربازی لە لەشی حوکمدراوەکان دەدەن و گوللە بارانیان دەکەن.

بۆ گوللە باران کردنی حوکمدراوەکان، یەکەم جار گوللەکان دەگوازنەوە بۆ گۆڕەپانی گەورەی شار و لەبن دیواری وەزارەت لەسەر زەوی روو دەکەن، پاشان ژمارەیەك فەردەی پڕ قوم لەبن دیوار و لەپشت گوللەکان دادەنێن بۆ ئەوەی





گوللەی وێڵ دیوارەکە نەشێوێنێ و کون کونی نەکا. ئەم ئیشەیان زیاتر بۆ هاندانی ئەمریکییەکان بوو تا ئازاردانی فیت کۆنگەکان، بە تایبەتی ئەگەر حوکمدراوەکان فیت کۆنگ نەبوونایە.

دوای ئیعدام کردنی کاپتن (وارساس)، ئەمریکییەکان ئیتر تاقەتیان نەما:

" ئێمە سەربازەکانی خۆمان لەپێناوی ئێوە بە کوشتن دەدەین و ئێوەش لە باتی سوپاس کردن، دەیانکوژن؟"

پاشان بەڵێنیان لە ژەنەراڵ (تی) وەرگرت کە ئیتر دیمەنی وا دووبارە نەبێتەوە، بەڵام دوای یەك هەفتە، پێنج تەرمی گوللە باران کراوی تر لە گۆڕەپانی شار کەوتنە بەر چاو.

ئەو حوکمدراوە داماوانەی دەبوایە بەپێی یاسا تاسێ چوار ساڵی تر ئازادی بەدەست بێنن، بە ناوی فیت کۆنگ ئیعدامیان دەکردن. لەراستیدا، حوکمدراوەکان بە ناچاری دەبوون بەقوربانی گوایە ئەو ئەرك و قەرزەی ڤێتنامی باشوور بەرامبەر بە یاسای واشنتۆن لەسەری بوو. دیسان هەر بەو بیانووە بەناو رەوایە، پاش چەند مانگێ دەوڵەمەندێکی چینییان بە ناوی (تاوین) ئیعدام کرد، تەنیا بە تاوانی ئەوەی کە سامانێکی زۆری هەیە وبینا بە قسەی ئەوان سامانەکەی نایاساییە. ئەویش نەك بە شەو و لەبەر شەوقی لایتی جێب، بەڵکو بە رۆژی روناك و لەبەر چاوی ژن و باوك و دایك و منداڵەکانی. منداڵەکان هاواریان دەکرد: "بابە!بابە!" ئەویش هەر فرمێسکی دەڕشت.

رۆژی پاشیش، رادیۆی بەرەی رزگاری میللی لەدەنگ و باسی خۆی دا، گوتی:

((ئێمە ئەگەر بەرامبەر بە ئیعدام کردنی (تاوین) هیچمان نەکردووەو کەسمان گوللە باران نەکردووە، لەبەر ئەوە بووە کە ئەو پیاوە هاوڵاتی ئێمە نییە، بێگومان خۆتان دەزانن هەر کاتێ یەك هاووڵاتی ئێمە ئیعدام بکەن، ئێمەش دوو سێ سەربازی ئەمریکی گوللە باران دەکەین.))

– فرانسوا، پێم بڵێ بزانم تا چ رادەیەك دەرفەتی هەڵوەشانەوەی ئەم ئیعدامە هەیە؟

– لە سەدا پەنجا. ئەویش بەو مەرجەی ئەمریکییەکان خێرا بکەونە خۆ و

بجووڵێن.

دوای چەند سەعاتێك چوومە (جوسپائو). (جوسپائو) ناوی بنکەی هەواڵگری و زانیاری ئەمریکییەکانە. کارمەندانی (جوسپائو) لەم بارەیەوە هیچیان نەدەگوت و زۆر ناڕەحەت بوون کە پەیامنێرێك، ئەویش پەیامنێرێکی فرەنسی مەسەلەی ئیعدامەکەی پێ ڕاگەیاندوون و زۆر لەوە قەڵس و تووڕە بوون کە نەیانتوانی بوو خۆیان خەبەری ئیعدامەکە زووتر وەربگرن.

وا دیاربوو سەفیری ئەمریکا چووبووە لای سەرۆك (وان تیو) بۆ ئەوەی لەم بارەیەوە قسەی لەگەڵدا بکا. ئاخۆ دەتوانێ دڵی (وان تیو) نەرم بکا و  وای لێ بکا بەقسەی بکا، یان نا؟ ئەمە شتێ بوو کەس بەسەر زمانی دا نەدەهات و تەنانەت هیچ کەس بڕوایشی نەدەکرد، بگرە تەنانەت (پلۆ)یش کە شارەزای ڕەوشت و جۆری بیرکردنەوەی سەرۆك و سەرکردەکانی ئەوێ بوو. لە (جوسپائو) دووبارە گەڕامەوە بۆ فرانس پرێس و کە چوومە ژوورەوە، دیم (فرانسوا) دیسان خەریکە بە تەلەفۆن قسە لەگەڵ ژەنەراڵ! (لۆن) دەکا.

ژەنەراڵ (لۆن) لەو بڕوایەدا بوو دەرفەتی هەڵوەشانەوەی ئەو ئیعدامە لەسەدا پەنجا نییە، لە سەدا چل و پێنجە! هەر چۆنێ بێ ئێمە تا نیوە شەو ناتوانین لە بڕیاری کۆتایی ئاگادار بینەوە و ئێستاش سەعات شەشی دوای نیوەڕۆیە. لەم چاوەڕوانییەدا، گەڕامەوە بۆ بیست و سێ ساڵ پێش ئێستا، کە چاوەڕوانی فەرمانی لێ خۆشبوونی باوکم و دوو کەسی ترمان دەکرد کە حوکمی ئیعدامیان درابوو.

لەم سێ فیت کۆنگە، کامیان شکڵی بە باوکم دەچێ؟ هەر سێکیان، هەر سێکیان باوکی منن. هەست دەکەم ئیتر تاقەتم نەماوە لەم ژوورە بمێنمەوە. تێ ناگەم، ئەوە (پلۆ) چۆن دەتوانێ لەم تەلەفۆنەوە بۆ ئەو تەلەفۆن و لەمەکینەی هەواڵەوە بۆ مەکینەی چاپ ڕابکات و ئەوەندە جووڵەو چالاکی بنوێنێ. ڕاستی من لەو خەڵکە ناگەم. ( فلیکس پۆ لۆ)، بە دەم و چاوێکی هێمن کە سێبەری دڕدۆنگی پێوە دیاربوو گوتی:

" من پێم وایە هەر سێکیان دەکوژن!"





(کلۆد لۆریۆ) بە دەم و چاوی خڕو زاری وەکوو کونە قاسەی گوتی:

"گیانە، ئەوە جەنگە جەنگ!"

من لەوێ ڕۆیشتم و دەوری سەعات یازدە دووبارە هاتمەوە.

دەزانی؟ کاتێ کە ببینی لەجەنگدا ئینسانێ بکوژرێ و بزانی لەوانەیە تۆش دەکوژرێی، زۆر لەوە جیایە کە لەناو جەنگدا بیت و هیچ دەسەڵاتت نەبێ و تەنیا بیر کردنەوەت بە دەست بێ وبیر لەگیانی نۆ ئینسان بکەیتەوە کە بە (ئا) یان (نا)ی چەند گەلۆرێکەوە بەسرابێتەوە، هەر لەبەر ئەوەی دەسەڵاتی گەمژەلانەیان هەیە!

ئێستا سەعات حەوتی دوای نیوەڕۆیە. ئێستا ئاخۆ ئەم نۆ ئینسانە زیندووە دەستی دوعا و پاڕانەوەیان لەبەر کێ پان کردۆتەوە؟ ئاخۆ نەفرەت لە چ کەسێ دەکەن؟

(سایگۆن) شەوی گەرمەو هەوای کپ و بێ جووڵەیە و ئەم کەش و سەقا کڵپەدارە ئینسان هەناسە بڕ دەکا.

<u>شەو</u>

دەوری سەعات یازدە گەڕامەوە. نەمتوانی لەوە زیاتر بە تەنیا لەئوتێل بمێنمەوە. سەلامم لێ کردن، کەس وەڵامی نەدامەوە. هەموو تووڕە بوون و متەقیان لێوە نەدەهات. لەو کش و ماتییەدا، تەنیا دەنگی مەکینەی هەواڵ دەهات و دەنگی  جووڵەی کورسی وەکوو دەنگی تۆپ دەکەوتە بەر گوێ.

(لۆریۆ) نینۆکەکانی بە دان دەقرتاند. (پۆلۆ) چاوێکی خۆی هەڵدەگلۆفت. (پلۆ) بەبێ جووڵە لەسەر لاتەختێك دانیشتبوو، پێی درێژ کردبوو بۆ سەر مێز و دەستەکانی وەکوو خاچ لەسەر سنگی لێك تێپەڕاندبوو و لێوەکانی دەگوشی. یەك سەعات زیاتر بەم جۆرە چاوەڕێمان کرد. ئاخیری، دوای سەعات یازدە، تەلەفۆن لێی دا. دوو، چوار، شەش دەست بۆ یەك دەسکە تەلەفۆن چوو. (پلۆ) وەکوو پشیلە دەرپەڕی و دەسکەکەی هەڵگرت: "هەلۆ، فرانس پرێسە!"

دڵم تێك هەڵدەچوو، تەماشای چاوی (پلۆ)م کرد و لە تروسکەی چاوی، زانیم لەو سەر تەلەفۆنەکە چییان پێ گوت. ئیتر پێویستی بە هیچ ڕوون کردنەوەیەك

نەما. هەر زوو زانیمان بڕیاری ئیعدام هەڵوەشاوەتەوە. من دەستم بە پێکەنین کرد، پێکەنین: "ئاه، فرانسوا، سوپاس! سوپاس!"

(فلیکس) لەو بڕوایەدا بوو، مرۆڤ کە سەرەتا دێتە ڤێتنام بە کەمترین شت هەڵدەچێ، بەڵام پاشان هەر زوو لە هەموو شتێ رادێ و دەبڕێتەوە.

(١٩)ی تشرینی دووەم

هەموو لەو باوەڕەدابوون پێویستە بچینە (داکتۆ) چونکە جەنگی راستەقینە لەوێ بوو. هەر بۆیەش ئەمڕۆ بەیانی لەگەڵ (مۆرۆلدۆ) چووین جلی سەربازی بکڕین. دەبوایە بەڵگەنامەیەکیش مۆربکەین و لێپرسینەوەی مردن یان بریندار بوونی خۆمان بگرینە ئەستۆ چونکە سوپای ئەمریکا هیچ لێپرسینەوەیەکی لەم رووەوە قبووڵ نەدەکرد. لە کۆتایی بەڵگەنامەکەدا نووسرابوو:

" تەرمەکەتان بدرێتەوە کێ؟ "

ماوەیەك بەم شتە پێکەنین و بە هەر حاڵ نووسیمان:

" سەفارەتی ئیتاڵیا لە سایگۆن. "

کە سەرو سیمای (تۆرنتۆ)ی سەفیری گەورەمان لە کاتی وەرگرتنەوەی تەرمەکەمان هێنایە بەرچاو، تێرو پڕ پێکەنین.

(مۆرۆلدۆ) بۆ وێنە گرتن لەگەڵ من هاتۆتە ڤێتنام. ئەو پێش دوو ساڵیش جارێکی دیکە هاتبووە ڤێتنام، بۆیە وەکوو من پەشۆکان و شڵەژانی پێوە دیار نییە، بەڵام هەرگیز نەچۆتە مەیدانی شەڕ و کە باسی چوونە (داکتۆن) دەکەین، ئەویش بەقەد من ناڕەحەت و پەشۆکاو دەبێ. هەمیشە دەڵێ: "ئێمە لە حەڤدەی مانگ هاتینە ڤێتنام"وخۆی حەڤدەی مانگ بە رۆژێکی شووم دەزانێ. لەماوەی دوو ساڵی رابردوودا، دە پەیامنێر لە ڤێتنام کوژراون. وا چاکە ناویان بنووسینەوە. قەت کەس شتی وای نەکردووە:

– مانگی (مایس)ی ١٩٦٥، ( پیتەر رۆناڵد وان تیل ) لە باشووری (سایگۆن) بەدەستی فیت کۆنگەکان کوژرا.

– مانگی (حوزەیرانی) ١٩٦٦، (جیری رۆز)یان لە شاری (کانگ نگای)، دوور بین لەمل، بەمردوویی دۆزییەوە لەسەر زەوی کەوتبوو. مەزندەیان کرد بە گوللە تۆپ





کوژرابێ.

– مانگی( تشرینی یەکەمی) ١٩٦٦، (بەرنارد کۆلینبرگ) کاتێ کە بەسواری فرۆکەیەکی شەڕ بەسەر ناوچەیەکی ناسەبازیدا دەسووڕایەوە، کوژرا.

– مانگی (تشرینی یەکەمی) ١٩٦٦، (هوین تان می) لەکاتی شەڕدا لە (کانتۆ) کوژرا.

– مانگی (تشرینی دوەمی) ١٩٦٦، (دیکی چاپل) لە باشووری (دانانگ) بە مین کوژرا.

مانگی (تشرینی دووەمی) ١٩٦٦، (چارلی چلاپا)، لە (کوچی)، بە هاوەن کوژرا.

– مانگی (کانوونی یەکەمی) ١٩٦٦، (سام کاستان)، لە شەڕی ناوچەی دەشتی ناوەندی کوژرا.

– مانگی (شوباتی)١٩٦٧، (برنارد فال)، لەناو لێڕی (هوئە) بە مین لەناو چوو.

– مانگی (ئاداری) ١٩٦٧، (رونالد کالاگەر)، بە هەڵە لە لایەن تۆپچی ئەمریکییەکانەوە کوژرا.

– مانگی (مایسی) ١٩٦٧، (فلیفا شوولەر)، بە هێلیکۆپتەرێ دەچووە (دانانگ)، هیلیکۆپتەرەکە کەوتە بەر گوللە و ئەویش کوژرا.

بریندارەکانی ئەمساڵ دەوری سێ کەس بوون.

پێرێ، لە باڕی ئوتێلی (کونتە نینتال)، (کاترین لو روا)ی وێنەگری فەرەنسیم ناسی کە مانگی مایسی رابردوو، لەکاتی وێنەگرتنی شەڕێك، حەڤدە گوللەی پێ کەوتبوو. کاترین کچێکی قژ زەردی بیست ساڵەیە:

ئەندام وردیلە و بچووکە، دەم و چاوێکی پیرەژنانەی هەیە. قۆڵی راستە و قاچی راستە و گۆنای راستەی پڕ برینە و کە دەڕوا دەشەلێ، چونکە برینەکانی قاچی هێشتا چاك نەبوونەتەوە و ساڕێژ نەبوونە.

لێم پرسی:

– کاترین تۆ بۆچی ناگەڕێیتەوە وڵاتی خۆت؟

ئەویش وەکوو ئەوەی قسەیەکی قۆڕی بیستبێ، شانی هەڵتەکاند و هیچی تر.

بە راستی هاوکارەکانی ئێرەم بنیادەمی سەیرن!

هەندێکیان، (پلۆ) بەنموونە وەربگرین، پەیامنێری پلە یەکن، ئەو کاتە لەباتی ئەوەی لە ڤێتنام بن، زۆر بە ئاسانی دەیانتوانی لە پاریس یان لە لەندەن بن. ئەمانە لەجیاتی ئەوەی هەوڵ بدەن لە ڤێتنام بڕۆن، بەپێچەوانەوە هەوڵ دەدەن زیاتر لەڤێتنام بمێننەوە.

هەندێکیشیان، وەکوو کاترین، لەسەر داخوازی خۆیان هاتوون و کەس ئامادە نەبووە ڕەوانەی ڤێتنامیان بکا مەگەر خۆیان پارەی هاتن و چوونەکە بدەن.

ئەمانە لێرە بەدوای چیدا دەگەڕێن؟ ئایا بە دوای شتێکدا دەگەڕێن کە نەیانبووە؟ بەدوای کارێکدا دەگەڕێن گۆڕانێك بخاتە ژیانیانەوە؟ بەدوای گوللەیەکدا دەگەڕێن کۆتایی بە خەمی دەروونی و هەمیشەییان بێنێ؟ یان ڕەنگە ویستبێتیان لاسای (هەمەنگوای) بکەنەوە. ویستم تێ بگەم!

یەکێکیان دەیگوت:

– کە هاتم بۆ ڤێتنام بۆ ئەوەم بوو بۆ باوکم بسەلمێنم کە وەکوو ئەو بۆی دەچێ من ئەوەندە بێ کارە و بێ توانا نیم.

یەکێکی تر گوتی:

– ژنەکەم ڕۆیشتبوو، جێی هێشتبووم.

یەکێکی تر گوتی:

– کارێکی سەرنجکێشە! ئەگەر بتوانی لە کاتی خۆیدا وێنە بگری، لەپڕ ناوبانگ دەردەکەیت و دوارۆژت مسۆگەر دەبێ.

کاترین بەم جۆر وەڵامی دامەوە:

– دەمەویست بزانم ئەو جەنگەی هەموو باسی دەکەن چ جۆرە شتێکە.

هیچ کەس بە تەواوی ئەو وەڵامەی نەدامەوە کە من دەمەویست.

– من خۆم بۆ ناسینی مرۆڤایەتی هاتوومەتە ئێرە، چونکە حەز دەکەم بزانم کەپیاوێ پیاوێکی تر دەکوژێ، بەتەمای چییە و کاتێ کە دوا گوللە لە جەستەی پیاوێك دەدا، بیر لەچی دەکاتەوە. من بۆ سەلماندنی باوەڕێك هاتوومەتە ئێرە کە هەمیشە بڕوام پێ هەبووە: ئەویش ئەوەیە کە جەنگ شتێکی پووچ گەلۆرانەیە و لەو باوەڕەدام شەڕکردن بەهێزترین بەڵگەی گەلۆرایەتی بەشەرە.





من بۆ ئەوە هاتوومەتە ئێرە تا باس بکەم مرۆڤ چەند دوڕو و ساختەچییە و ئەم دوو ڕوویییە تا چ ئەندازەیەك دەگاتە ڕادەی کۆتایی. گاڵتە جاڕییە، کاتێ کە دەبینین خەڵك بەرامبەر بە گۆڕینی دڵ دەیکەن بە هەرا و هۆریا، پاشان هەر ئەو خەڵکە بەرامبەر کوژرانی ملیۆنەها گەنجی سپ و ساغ، کە دەق وەکوو ڕەشە وڵاخی دەباخانە دەمرن، بێ دەنگ دەبن وهیچ ناڕەزایی دەرنابڕن.

لەو کاتەوە کە هاتوومەتە دونیا، گوێیان بە وشەی ئاڵا و نیشتمان پڕ کردووم و هەمیشە فێری ئەوەیان کردووم دەبێ شانازی بە شەهید بوون بکەم و خۆمی پێ با بدەم و هەرگیز کەس پێی نەگوتووم بۆچی کوشتن لەپێناوی دزیی گوناهێکی گەورەیە، کەچی کوشتن بەجلی سەربازی مایەی شانازییە!

ئەو بەرگەی ئەم بەیانییە کڕیم لەبەرم قورس وناخۆشە. شێوەیەکی گەمژانەی هەیە و هەر نامەوێ لەبەریشی بکەم. ئەوەتا ئەم پۆستاڵە زلانەش ئازارم دەدەن، سەرەڕای ئەمەش من نامەوێ بمرم، من دەترسم. بۆ من ئەوەندە ئاسان نییە پەیڕەوی ئامۆژگارییەکانی (فرانسوا) بکەم کە بۆی لەسەر پارچە کاغەزێك نوسیبووم.

ئەمشەو کاتێ کە گەڕامەوە ئوتێل، کاغەزێکی (فرانسوا)م لەبەر دەرگای ژوورەکەم بینی، لەباتی ئیمزا هەر گێڕی پێدا هێنابوو و لەسەری نووسی بوو:

"هیوادارم لە (داکتۆن) خۆش ڕابوێری. ف. پ ".

(٢٠)ی تشرینی دووەم

سەر لەبەیانی

ئاسان نییە! ترس هەموو گیانی داگرتووم!. دەست و پێم لەترسان سارد بووە و ترس یەك لەحزە لێم جیا نابێتەوە. کاتێ کە چووینە فڕۆکەخانە، وەختە بڵێم هیچ ترسم نەبوو، ڕەنگە لەبەر ئەوەبێ کە وروژا بووم، بەڵام کە سواری فڕۆکەی کارگۆی سەربازی بووین بۆ ئەوەی بچینە (داکتو)، دووبارە ترسم لێ نیشت. (پیکۆ) یەکەم وێستگەی ڕێگای (داکتۆ)یە.

(کارگۆ) فڕۆکەیەکی (سی– ١٣٠) گەورە بوو، دەوری هەشتا سەربازی هەڵدەگرت..

سەربازەکان بەبێ جووڵە دانیشتبوون. تفەنگیان خستبووە بەینی دەست و پێیان و چارەیان غەمبار و بێ جووڵە بوو. تەنانەت کە ئێمەشیان بینی، یەك خەندەیان نەکەوتە سەر لێو و یەك سەرنجی مەراقیان لێ نەداین. یەکێکیان خەوتبوو و کڵاوی تا سەر چاوانی هێنابووە خوارێ.

ئاخیری، کە سەعاتێك بەسەر فڕینماندا تێپەڕی، ئەفسەرێك زاری کردەوە:

– منداڵینە، ئایا ئاگادارن دوێنێ فڕۆکەیەکی (سی–١٣٠) لە بەینی (پیکۆ) و (سایگۆن) کەوتۆتە خوارەوە؟

– بێ دەنگ بە!

– دەشزانن بە چی؟

– نا، بە چی؟

– بە تەقینەوەیەك. نەفەرەکان کەسیان بەزیندوویی دەرنەچوون.

– ئۆە، بێدەنگ!

ئینجا ئاوڕی لەلای (مۆرۆلدۆ) دایەوە و گوتی:

– ئەوە ئێوە ئەم دووەتان پەیامنێرن؟

– بەڵێ!

– گەلحۆی سەیرن ها! کێ زۆری لێ کردوون بێنە ئێرە؟

ئێستا وا گەیشتووینەتە (پیکۆ)و لە فڕۆکەخانە چاوەڕێی هیلیکۆپیتەرین بۆ ئەوەی بمانباتە (داکتۆ). جەنگ هێشتا بە لامانەوە هەر وشەیەکی سادەیە و جەنگ هێشتا هەر ئەو وێنانەیە کە لەرۆژنامە یان لە تەلەفزیۆن دیومانە، هێشتا هەر لەرینەوەیەکی سووکی پەنجەرەیە و هیچی تر.ئێستا ئەم پرسیارە لەخۆم دەکەم: بەراست، کێ ناچاری کردووین بێینە ئێرە؟

بەڵام دەزانم هەر زوو زۆر شت دەبینم و هەست بە جەنگی راستەقینە دەکەم .

هەر وا لەم دەشتە چاوەڕێ دەکەین و وشەی: داکتۆ، داکتۆ، داکتۆ، لەزاری هەموو کەس دەبیسین.

داکتۆ گوندێکە دە کیلۆ مەتر لەسنووری بەینی لاوس و کەمبۆدیا دوورە. راست لەو شوێنەی رێگای (هوشی مینە)ی پێدا دەڕوا، یانی ئەو رێگایەی دەچێتە





بنکەی تفاق و ئامادەکاریی (هانۆی)، کە هی ئەو فیت کۆنگ و ڤێتنامی باکورییانەیە کەبەرە و باشوور دەچن.

لەئاخیر و ئۆخری مانگی تشرینی یەکەم، سەربازێکی راکردووی فیت کۆنگ ئاشکرای کردبوو کە ڤێتنامی باکورییەکان تاقمێکی دەوری حەفت هەزار سەربازیان لەسەر تەپۆلکەیەك ئامادە کردووە بۆ هێرش، بۆیە یەك لیوای ئەفسەری ئەمریکی بە کەرەستەی جەنگی ئاسمانییەوە خۆیان ئامادە کردوە و (وێست مۆرلند)یش دەوری دە هەزار چەتربازی ئامادە کردووە، لە یەکی تشرینی دووەم خوێناویترین جەنگ بەرپابوو کە تائێستا شتی وا لەڤێتنام نەبووە. لە (سایگۆن) دەیانگوت:

(ئەمریکی، یان بە حەوت رۆژ بە سەرکەوتوویی کۆتایی بەو جەنگە دێنن، یان (داکتۆ) یان لێ دەبێ بە (دین بین فوی).

نەخێر، نەترسان شتێکی ئاسان نییە!

<u>دوای نیوەڕۆ</u>

بەپێچەوانەوە، ترسان شتێکی ئاسانە. چونکە من کەترس و دڵەڕاوکێی خەڵکم بینی، لەپڕ ترسی خۆمم لەبیر چووەوە. ئەو هیلیکۆپیتەرەی لە (پیکۆ) سواری بووین تەنیا جێگای چوار نەفەری هەبوو، جگە لە جێگای دوو فڕۆکەوان و دوو رەشاشچی. یەکێ لەچوارەکەی ئێمە پەیامنێری ئێستگەیەکی تەلەفزیۆنی بوو، لەنیویۆرکەوە هاتبوو. وەکوو نێچیرێکی بەتەلەوە بووبێ، دەلەرزی. دەم و چاوی سپی وەك گەچی لێ هاتبوو، دەترسا، بەدایم قەپی لەدەستی دەدا. تەنانەت جارێك قیت بووەوە و بە فڕۆکەوانەکەی گوت بگەڕێتەوە و دایبەزێنێ، بەڵام فڕۆکەوانەکە هەر باوە گۆشی نەدایەوە. کە ترسی ئەوم بینی، تووشی شەرمەزارییەکی وا بووم، یەکسەر بووم بە کەسێکی تر: کەسێکی ئارام و رەحەت و وردبین. ئەو کاتەی ئەو لەترسان دەلەرزی، من بەو پەڕی هێمنی سەرم لە هیلیکۆپیتەرەکە بردە دەرەوە و تەماشای تەپۆلکەکانی لای دەستە چەپی خۆمانم کرد، دووکەڵێکی رەشیان لێ هەڵدەستاو بەرز دەبووە ئاسمان، ئەمە ئەنجامی ئەو بۆمبا ناپاڵمانە بوو کە ئەمریکی بەسەر سەری ڤێتنامییە باکورییەکانیاندا بەریان دابووەوە.

لەتەپۆلکەکانی لای دەستە راستیشمان دیم دووکەڵی سپی بەرز دەبووەوە، ئەمە ئەنجامی ئەو تۆپانە بوو کە فیت کۆنگەکان دەیانهاویشتە ئەمریکییەکان. بەبینینی هیچ یەکێ لەمانە و بەوەی کە، وا دەق لەناو جەنگداین، هیچ نارەحەت نەبووم.

تۆ باش بیری لێ بکەوە، تەنانەت ئەو کاتەی کە رەشاشچی دەهاتەوە سەر رەشاشی لای دەستە راستی و دووبارە دەسرێژی لەو تارماییە کرد کە لەسەر زەوی دەجوولایەوە، دیسان هێمنی خۆم لەدەست نەدا و هەر بە رەحەت و ئارامی دانیشتبووم.

جەنگەلەکانی ئەم ناوچەیە پڕن لە فیت کۆنگ، تازە زانیم بۆچی خەڵکی دەڵێن ئەم جەنگە لە هەموو جەنگێکی تر جیایە. ئەم جەنگە سەنگەری تێدا نییە، هەموو شوێنێ هەر سەنگەرە.

ئەمریکییەکان چەند کارێکی گرنگیان لەڤێتنام گرتۆتە ئەستۆ. یەکێ لەو کارە گرنگانە دامەزراندنی بنکەی سەرەکی کردەوەی ئاسمانییە و بۆ ئەم مەبەستەش ژمارەیەکی زۆری فڕۆکەو هیلیکۆپتەریان لەبەر دەستدایە و کاتێ کە سواری ئەم فڕۆکە یان ئەم هیلیکۆپتەرانە دەبی، هەر دەڵێی لەناو بەرەی شەڕدای و وەکوو ئەوە وایە کە پێست سپی بیت و لەناو ترومبێلێکی داپۆشراو دانیشتبیت و بەناو قەڵەمڕەوی پێست سوورەکاندا تێبپەڕی.

ئێمە وا لە (داکتۆ)ین. لە ئۆردووگایەکی سەربازیی نزیك ئەو رێگایەی دوێ شەو بە هاوەن تێك چووە و ئیتر کەڵکی هات چۆی پێوە نەماوە، لەناو چەند دەرزەن فڕۆکەیەك داین، کە بەدەنگی تۆقێنەر لەناو تۆز و گەردێکی سوور دەنیشن و هەڵدەفڕن، لە تەنیشت سەدان جێب و لۆرین کە سەربازی پیس و پۆخڵ و شەکەت بار دەکەن، و لەناو ئەو تۆپخانانەین کە هەر سێ چرکە جارێك گوللە تۆپێك دەتەقێنن و زەوی و دڵت دەلەرزێنن، و سەربازخانەی داری دڵتەنگ و غەمباریش دەلەرزێنن.

ئاخ، وا نەبوایە ڤێتنام چەند جوان و قەشەنگ دەبوو!! ئەو کێوانەی ئەوەتا بوونەتە کوشتارگەی سەربازان، دەق وەکوو یەك قۆپەنە یەشم و زمڕووت وان.





ئەو ئاسمانە چەند شینە کە ئێستا بۆتە شوێنی بۆمباباران، ئاوی رووبار چەند روون و فێنکە کە ئێستا بۆ کوژاندنەوەی ئاگر بەکاری دێنن. چەند بە ئاسانی دەمانتوانی لێرە هەست بە خۆشبەختی بکەین، چەند (خۆش) بوو لە دەو رووبار راوە ماسی بکەین، و بەپێ بەناو جەنگەڵ دا بڕۆین.

بەڵام، پێم ناڵێی بۆچی هەمیشە شتی جوان لەناو دەبەن؟ کاتێ کە ئاوا لە سەیری ئاسمانی شین و سەوزی ئەو ناوە نقووم ببووم، لەپڕسەرهەنگێکمان لێ پەیدا بوو ، ئەو هەموو جوانییەی تێك داین. لێمان نزیك کەوتەوە و یەکەو دەمانچەی عەرز کردین.

(مۆرۆلدۆ) گوتی:

– نەء، سوپاس!

منیش گوتم:

– نەء، سوپاس!

گوتی:

– حەز دەکەم دەمانچەکەم لێ وەربگرن، چونکە ئێوە جلی سەربازیتان لەبەرە و هەر کەسێ ئەم جلەی لەبەر بێ زۆر بە ئاسانی دەبێ بە ئامانجی گوللەی دوژمن. ڤێتنامییە باکورییەکان کەس بەدیل ناگرن، ئەوان دوژمنی خۆیان دەکوژن.

– لەگەڵ ئەمەشدا، سوپاست دەکەم!

نزیکەی هەر هەموو پەیامنێرەکانی جەنگ یەکە و دەمانچەی وایان پێیە. دەبێ شتێکتان پێ بێ بەرگری پێ لەخۆتان بکەن.

– نەء، سوپاس!

دیار بوو سەری زۆر لەم (نەء، سوپاس!) ەی ئێمە سوڕما بوو.

ئەوسەرهەنگە داماوە سمێڵێکی بچووکی گەلۆرانەی هەبوو، بەشی سەرەوەی لمووزی مشك ئاسای داپۆشی بوو. وام هاتە بەر چاو کە بەو کڵاوەی سەرییەوە هاتۆتە دونیا و لەوانەیە هەر بەو کڵاوەش بخەوێ.

قووتوویەکی بچووکی پڕ وێنەی رەنگاو رەنگی لە گیرفانی پانتۆڵ دابوو، هەر کەسی تازە دەهات پێشانی دەدا. وێنەکان وێنەی کچە هاوڕێکەی بوون بەجلی

نووسـتن و بـێ جلـی نووسـتن، لـەکاتی چـوونەوەی بـە مـادۆن ئـەم وێنانـەی لێ وەرگرتبوو و کە سەیری وێنەکانی دەکرد خۆی دەخوراند. دەبێ شتێکی ناخۆش بووبێ بەدرێژایی رۆژ ئەم وێنانە لەگیرفانی پانتۆڵی هەڵگرێ کە بەدایم بە لاقی دەکەوتن. ئەو کوڕە کارمەندی رێنمایی پەیامنێران بوو و ئێمەی بردە ناو چادری پەیامنێران.

ئێستا مـن وا لـەوێم، لەسـەر چـوارپایەکی بـچووك دانیـشتووم و خـەریکم ئـەم چەندە دێرە دەنووسم.

ئەم شەو هەموو چوارپاکان گیراون و من دەبێ لەسەر زەوی بخەوم.

پـەح! هـەر چۆنێ بـێ و بـە هـەر جۆرێ بخـەوم لـەو سـەربازە وردیلـەی ڤێتنـامی باکوور باشتر دەخەوم کە پێش چەند دەقیقەیێ چاوم پێ کەوت.

تەمـەنی دەوری هـەژدە سـاڵ بـوو، لـە تەپۆلکـەی ژمـارە (١٣٨٣)، لەبرسـان و لـە تینوان و لە هیلاکییان وەخت بوو بمرێ کە ئەمریکی دەستگیریان کرد. پانتۆڵی بەخوێن بوو، چاوی بەسرابووەوە. دوو سەربازی ئەمریکی بن هەڵگریان گرتبـوو و بەراکێش راکێش دەیانبرد.

– سـەرهەنگ، ئـەوە ئەمانـە، ئـەم سـەربازە دەبەنـە کـوێ؟ دەیبەنـە بنکـەی تەندروستی؟

– ئـۆە، نـەخێر! بـۆ لێکۆڵینـەوە دەیبـەن و لـەکاتی لێکۆڵینـەوەدا دەنگـی لەسـەر شریتێك تۆمار دەکەن و پاشان دەنگی بـە بڵنـدگۆ لـە دەورو بـەری تەپۆلکەکە بڵاو دەکەنەوە.

– چ شتێ لەسەر شریتەکە تۆمار دەکەن؟

– ئەوە تۆمار دەکەن کە داوا لە هاوڕێکانی دەکا خۆیان بەدەستەوە بدەن.

– ئەگەر رازی نەبوو وا بکا؟

– هەڵبەت دەیکا، هەڵبەت ئەو ئیشە دەکا.

سەربازە وردیلەکە پـێ خـاوس بـوو. پـڕ کێشی دەکرد نـەڕواو لەگەڵیان نەچێ. ئـیتر دوو سـەربازە ئەمریکییەکـە لەسـەر زەوی بڵنـدیان کـرد و پێیـەکانی وەکـوو یەکێ لەسێدارە درابێ، شۆڕببوونەوە. سەرهەنگ، کە ئەم دیمەنەی بینی لە قاقای





پێکەنینی دا:

– تەماشاکە، چەند سەیرە!

سەربازە وردیلەکە چاوێکی کردەوە و ئەو چاوەی لە دوڕ چاوی سەرهەنگ بڕی.

کێ دەزانێ؟ لەوانەیە ئەمە بەرگدروو بێ و ئەو قاپووتە بارانییانە بدوورێ کە لـە (سایگۆن) دەیفرۆشن.

ئەو قاپووتە بارانییانە ئەم رستەیەیان لەپشت دورابوو:

" کەمردم دەچمە بەهەشت، چونکە لەم سەر زەمینـەدا، لـە دۆزەخ ژیـاوم. ڤێتنام ٩٦٧."

خۆشـییەکەی لەوەدایـە، ئـەو قاپووتانـە ئـەمریکین و رسـتەکەی پشتیـشیان بـە ئینگلیزی نووسراوە.

شەو

یەکـەم هـاوەن بـە پـردو بەسـەر رێگـا کـەوت وکـە زەنگـی مەترسـی لێیـدا، مـن و (مۆرۆلـدۆ) لەسـەر مێزی ئەفسەران دانیشتبووین شتمان دەخـوارد، سـەربازەکان کە گوێیان لەزەنگی مەترسی بوو هەموو قاپ و پەرداخەکانیان بـەگۆڕێ وەرکـرد و تێیان تەقاند هەڵاتن. منیش هەڵاتم. هەموو لە داڵدەیەك دەگـەڕان، بـەڵام شـەوەکەی ئەوەندە تاریك و ئەنگوستە چاو بوو هیچ داڵدە دیار نـەبوو، تـەنیا تـەرمایی رەش بوون کە بەدەم راکردنەوە هاواریان دەکرد: "هاوەن !!، هاوەن !!"

منیش هەر دەمپرسی: "داڵدە، داڵدە لەکوێیە؟"

بەڵام کەس وەڵامی نەدامەوە. لەجەنگدا هەر کەسە خەمی خۆی لەبـەرە، نەفسی نەفسییە. هـەر لـەو کاتەشـدا، تۆپخانـەی ئەمرکییـەکانیش دەسـتی بەتەقـە کـرد. ئاسمان بوو بە ئاگر، بڵێسەی ئاگر بە تەپۆلکەکان دەکەوت و ئیتر بڵێسە و بنیادەم لەیەك جیا نەدەکرانەوە. لەو هەراو هۆریایە (مۆرۆلدۆ)م بزر کرد.

هـاوارم دەکـرد و بـانگم دەکـرد: " مۆرۆلـدۆ! لـەکوێی؟ مۆرۆلـدۆ،؟ " بـەڵام کـێ دەزانـێ چـۆتە کـوێ! لـە پـڕ وای بـۆ چـووم کـە گـوێم لـەدەنگێ بـوو و لـەو کاتـەدا دەستێ بازووی گرتم و یەکێ پێی گوتم: " لەگەڵ من وەرە! "

پاشـان لـە دواوە گـوێم لـە تەقینەوەیـەك بـوو و خـۆم لەداڵدەیـەکی پـڕ سـەرباز

دۆزییەوە. لەسەر سەرمەوە، دەنگێکم هاتەر بەرگوێ، لێی پرسیم:

– خۆ سەلامەتی؟

– بەڵێ.

لە هاوەنەکان ترسای، ها؟

– نا.

دەنگەکە بە ئاوازێکی ئارامتر گوتی:

– من (فرانسوا مازۆر)ی (ئاژانسی فرانس پرێس)م. (پلۆ) لە سایگۆن تەلەفۆنی بۆ کردم، پێی گوتم کە تۆ دێیت و گوتیشی لەوانەیە تۆ پێویستت بە یارمەتی بێ. ئەی کوا وێنە گرەکەت؟

– بزرم کردووە.

– نارەحەت مەبە، ئەم بۆمبا بارانە خەتەر نەبوو.

ئەو ئاوای گوت، بەڵام ئێمە دەوری سەعاتێك لەناو داڵدەکە ماینەوە، گوێمان پڕ دەنگ و هەرا و ژاوەژاوی ترسناك ببوو، تەنانەت سەربازەکانیش ئیتر حەوسەڵەیان نەمابوو.

یەکێکیان بۆ خۆشی ودڵدانەوەی ئەوانی تر، چەند تەلە شقارتەیەکی لەژێر لووتی من داگیرساند و گوتی:

– " ئۆی! بەراستی ئەوە ژنە! "

لەبەر روناکی تەلەشقارتەیەك لەو تەلە شقارتانە دەم و چاوی (مازۆر) م بینی: پیاوێکی قۆزی لووت درێژ و چاو شین. پاشان بەیەکەوە گوێمان لە سەربازەکان گرت:

– ئەها، زانیت؟ بۆ خۆی بەو فرت و فێڵە لە (لۆس ئەنجلس) مایەوە.

– پەح! (جاك) زۆر لەو زیرەکتر بوو.

– جاك چی کرد؟

– ملی لەبەر خواردنەوە نا. ئەوەندەی خواردەوە تا گەدەی بریندار بوو و کەزانیان (جاك) نەخۆشە و گەدەی بیندارە، رەوانەی ئەمریکایان کردەوە.

– وای چەند باش بوو منیش گەدەم بریندار بوایە!





– بەڵێ،بەڵام (هاوارد) لە هەموویان کەلەکبازتر بوو.

– بۆچی؟

کەلێیان پرسی ئایا ئافرەتی خۆش دەوێ، یان نا؟ وەڵامی دایەوە:

– ئۆە، نەبەخوا! هەموو کەس دەزانێ من تەنیا حەزم لەکوڕی لووسکەیە!

– جا، بەراستی بوو؟

– بێگومان نا، بەڵام ئەگەر تۆ پێیان بڵێی: منداڵبازی، یەکسەر رەوانەی ئەمریکات دەکەنەوە، بۆچی چما تۆ ئەمەت نەدەزانی؟

– وای خوایە! ئەی ئەگەر ئێستا ئەم قسەیان پێ بڵێین، چییە؟

– ئۆی نا، زۆر بەدرەنگ کەوتووە گیانە، دەبوایە زۆر پێش ئەمانە بیرمان لێ بکردایەوە!

دەنگی زەنگی مەترسی وەستاو پێیان گوتین پردەکە نزیکەی هەر هەمووی تێك چووە و حەفت کەسیش کوژراون.

(مازۆر) چوو بیانبینێ و منیش گەڕامەوە ناو چادر و (مۆرۆلدۆ)م لەوێ بینی.

گوتی: کاتی مەترسییەکە خۆم لەناو چەندفەردە قومێکی تەنیشت هیلیکۆپتەرەکان شاردبووەوە.

ئێستا زۆر لەمن تووڕەیە.

– تۆ خۆت لەکوێ شاردبووەوە؟

– تۆ، چی؟

– خۆم لای ئەو پیاوە کلۆڵە شاردبووەوە، بەردەوام لە ترسان بەسەرم دا دەڕشایەوە.

– باشە، جا ئەمە گوناهی منە؟

– هەڵبەت، ئاخر من بەدوای تۆدا دەگەڕام.

– منیش هەروا.

– زۆر باشە، ئیتر بەسە!

– تۆش بەسی بکە!

زۆر سەیرە، تائێستا وا بەتوندی لەگەڵ (مۆرۆلدۆ) تێك نەگیراوم .

ئایا دەشێ مرۆڤ، کە رووبە رووی مردن دەبێتەوە، ئەم جۆرە پەستی و نزمییە قبوول بکا؟ لەوانەیە هۆکەی ئەم ئۆردوگایە بێ.

لێرە، مرۆڤ هەست دەکا کەوتۆتە ناو چاڵێك یان چاکتر بڵێین ناو داوێکەوە. دەورو بەرمان هەمووی تەپۆلکەی ڤێتنامی باکوورییە، تەنیا سێ تەپۆلکە لەدەست ئەمریکییەکانە:

تەپۆلکەی (١٣٨٣) و تەپۆلکەی (١١٢٤) و تەپۆلکەی (١٠٩٨) و شەوو رۆژ هاوەن و نارنجۆك لەسەر ئەم تەپۆلکانە دەتەقێتەوە.

پێش ماوەیەکیش، قۆرتێك لە ئەنجامی تەقینەوەی گوللە هاوەنێك لەبەر دەم چادرەکەماندا پەیدا بوو.

دیار بوو ئەم جارەش ڤێتنامییە باکورییەکان بۆ داگیر کردنی تەپۆلکەی (٨٧٥) دەجەنگان، کە پێشتریش چەند جارێك بۆی جەنگابوون و سەر نەکەوتبوون.

ئێستا هەموو سەربازەکان ببوونە دەستە دەستەو راوەستابوون. نەدەیانتوانی بچنە پێش و نەدەیانتوانی بکشێنەوە دواوە، ڤێتنامییە باکورییەکانیش هەموو خۆیان لە پەنا درەختان شاردبووەوە. بەم بارو دۆخە دەوری سەد کەس کوژرابوون و ژمارەیەکی زۆریش بریندار ببوون.

زەوی پڕ بوو لە کوژراوو برینداری لە سەرە مەرگ، لەم بارو دۆخەدا هیچ جۆرە دەرەتانێك نەبوو.

دە هێلیکۆپتەر بۆ بەرگری بەرێ کەوتن و لەم دەیە هەشتیان بە گوللە پێکران. سەربازەکانی ئۆردووگا تووڕە ببوون .

هێدی، بێ ئەوەی پاسەوانەکە ببینێ، بەشێنەیی خۆم گەیاندە لای سەربازەکان و (پۆرتۆ ریکۆ)ییەکەم بینی هاواری دەکرد، ئەویش چ هاوار:

– مامە سام پێی نەگوتبووین: (دەبێ لەگەڵ کۆمۆنیزم بجەنگن!) من نازانم کۆمۆنیزم چییەو هەر ناشمەوێ بزانم و ئەم ڤێتنامییە باکورییە بەدبەختانەش بۆ من هیچ جیاوازییان نییە. ئەی بۆچی خۆیان نایەن لەگەڵ کۆمۆنیزم بجەنگن، ئێمە تەنانەت یەك تاکە ڤێتنامی باشووریشمان لەگەڵ دا نییە.

سەردەستەیەك بەسەریدا دەنەڕاند:





– ئەم دەمەت داخە، هکتۆر!

بەڵام ئەو دەمی دانەخست.

باوکم هەقی بوو تووڕە بێ کەبیستی داوام کردووە بێمە ئێرە:

– (گەلۆر، لێ گەڕێ با کوڕەکانی تری خێزانەکەمان بچن). بەڵام ئەوان ئەوەندە گەلۆر نەبوون داوا پێشکەش بکەن. باوکم کرێکار بوو. شتێ هەیە دەتەوێ پێت بڵێم؟ ئەوانەی لەشەڕدا دەکوژرێن هەمیشە هەر کوڕە کرێکارن!

– بێ دەنگ بە، هکتۆر!

دەنگ و باسی هێرشێکی تر بۆسەر تەپۆلکەی (١٣٨٣) بڵاوبووەوە:

ئێمە سبەی دەچینە سەر تەپۆلکەی ژمار (١٣٨٣).

بەڵام ئێستا دەبێ بخەوین. دونیا ساردە. ئێرە رۆژی گەرم و شەوی ساردە.

دیسان بەختم یار بوو (مازۆر) کیسەی خەوی خۆی دا بەمن.(مۆرۆلدۆ) بەدوو بەتانی خۆی لە سەرما شاردەوە. ئەو وا لەسەر زەوی درێژ بووە و خەریکە خەو دەیباتەوە. بەڵام چەند هەنگاوێ لەولای ئێمەوە، هێشتا هەر دەنگی تۆپخانە و تەقەی گوللە دێ.

(مۆرۆلدۆ) رووی وەردەگێڕێ و ئاخ هەڵدەکێشێ و قرەقڕ دەکا:

– "لێدەن، تەقە بکەن!" هەر گوللەیەك بە چەند لەسەر ئەمریکییەکان دەوەستێ؟ نیو ملیۆن، یەك ملیۆن! ئای، ئەم ئەمریکییانە چەندیان پارە هەیە؟! من هەرگیز لە جەنگی ئەمریکییەکان بەشداری ناکەم.

(٢١)ی تشرینی دووەم

سەر لەبەیانی

ناوی (پیپ)ە. تەمەنی بیست و سێ ساڵە، سیمایەکی قۆزی هەیە. سەرەڕای ئەمەش شەیتان و مزیرە، تفەنگێك و دووربینێکی لایکاو کاغەز و مەرەکەبێکی زۆریشی پێیە. سەر بەبەڕێوەبەرایەتی هەواڵگریی سوپای چوارەمی پیادەی سەربازییە. ئەوە بوو ئێمەی هێنایە سەر تەپۆلکەی (١٣٨٣). ئێمە ئێستا وا لێرە وەستاوین و چاوەڕێی هیلیکۆپتەرێك دەکەین.

من خەریکم شت دەنووسم و کاغەز رەش دەکەمەوە!

– تۆ هەر دەڵێی هەموو ژیانت بەنووسین بەسەر دەبەی، دەکرێ لێت بپرسم چ دەنووسی؟

– دەفتەرێکی بیرەوەری بۆ (ئیلیزابێتا)ی خوشکی چکۆڵەم دەنووسم.

– خوشکە چکۆڵەکەت تەمەنی چەندە؟

– پێنج ساڵە.

– دەشتوانێ دەفتەری بیرەوەریت بخوێنێتەوە؟

– کە گەورە بوو، دەیخوێنێتەوە، (پیپ)!

بڕوای بە قسەکەم نەکرد، پێ کەنی!

(مۆرۆلدۆ) پێکەنی. منیش پێکەنیم. ئەمڕۆ ئێمە بە پێکەنین و خۆشی لەخەو ڕابووین. چەند خۆشە زیندوو بی! چەند باش بوو هەمیشە خۆشحاڵ بین بەوەی کە زیندووین. ئەو کاتە هەستمان دەکرد بەیانی دەم و چاو شووشتن بە پەرداخە ئاوێك چ تام و لەزەتێکی هەیە، با شەوی پێشوویش بەجلی سەربازیی ئارەقاویی خەوتبین و کیسەی خەویشمان بۆنێکی ناخۆشی لێ بێ و بە دەردەسەرییەکی لەڕادە بەدەر ئاودەسێکمان دەست بکەوێ.

تەنیا یەك جەلیکانە ئاو بۆ ئەو هەموو خەڵکە هەبوو، کە نۆرەی من هات لە یەك پەرداخ زیاتری تێدا نەمابوو.

ژەنەراڵ (پێرز) ئەو شانازییەی بە من داوە کە بچمە ئاودەست و سەرشۆکی ئەو. ئاودەستەکەی لە خانیلکەیەکی دار دروست کراوە . لەسەر دەرگا کەی نووسیبوویان: تایبەتی!

بەڵام هەر جارەی کە من دەمەویست بۆ پێویستی بچمە ئەوێ، ئەو پێشتر لەوێ بوو. ئاخیری، جاری چوارەم وامزانی  چۆڵەو کە دەرگام کردەوە لەپڕ دیتم وا لەژێر دووشدایە. دەم و چاوم بینی لەشەرمان سوور هەڵگەڕابوو، هاواری کرد: (ئۆی!). هەروا بە رووتی و پێ خاوسی چووە دەرەوە. داماو ژەنەراڵ! کە بەپێ خاوسی بینیم هیچ بە قارەمانی جەنگی دووەمی جیهانی نەدەچوو کە بەخزمەتی ژاپۆنییەکان گەیشتبوو.

کاتێ کە بەسەر هاتەکەی ژەنەڕاڵ (پێرز)م بۆ (پیپ) باس کرد، گوتی: دەبێ ئەم





مەسەلەیە بۆ کاپتن (شر) باس بکەی.

کاپتن (شر) ئەو کەسە بوو کە سێ تەپۆلکەی گرتبوو و (پیپ) باوەڕی وابوو ئەگەر گرتنی ئەم تەپۆلکەیەش بەو بسپێردرایە، ئەوەی ئەمڕۆ بەیانی رووی دا، رووی نەدەدا.

دەزانی ئەمڕۆ بەیانی چ رووی دا؟ فەرماندە فەرمانی دابوو پەناگای ڤێتنامییە باکورییەکان بە فانتۆم بۆمب باران بکەن، بەڵام پەناگاکە زۆر لە شوێنی بریندارەکانەوە نزیك بوو و کاتێ کە فانتۆمەکان شوێنەکەیان بۆمبا باران کرد، بۆمباکە یەکە و راست بەناوەندی شوێنی بریندارەکان کەوت. بۆمباکە دەوری سەدە پەنجا کیلۆ دە بوو ،  بوو بەهۆی قڕتێ خستنێکی ترسناك.

<u>نیوەڕۆ</u>

بەو هەڵەیەی (پۆپ) کردی، ئێمە هیلیکۆپتەری یەکەممان لەدەست چوو.

کە هیلیکۆپتەری دووەم هات، فڕۆکەوانەکە لێی پرسین:

– لەو سێ نەفەرە کامەتان نەزرتان کردووە؟ چونکە ئەو هیلیکۆپتەرەی ئێوە بەتەما بوون سواری بن، رەشاشچی فیت کۆنگ بەریان دایەوە! من کە ئەم خەبەرەم بیست تەنیا هەستم کرد مووچڕکێکم بە لەشدا هات. چەند راستە کەدەڵێن مرۆڤ هەر زوو لە هەموو شتێ رادێ. راهاتووین سەرسام نەبین بەوەی لەوانەبوو بمرین و نەمردین!. هەروەها راهاتووین بە هیلیکۆپتەر بەسەر پەناگای  فیت کۆنگەکان دا بفڕین و نەترسین، لەکاتێکا کە باش دەزانین چەند کەسێ بەرەشاش نیشانەیان لێ گرتووین. سەر هەڵکێشان لە پەنجەرەی هیلیکۆپتەرەوە لەکاتی دەسڕێژی شەست تیر بۆتە عادەت و ئەوەش بۆتە عادەت کە بەرامبەر بەخراپەکاریی و بێ رەحمی تەنانەت برژانگ لێك نەدەین.

جگە لە پارچە درەختی سووتاوی رەش، هیچ شتی تر لەسەر تەپۆلکەی ژمارە (١٣٨٣) نەمابوو. هەزاران لکە داری شکاو بەشێوەی سەیر سەیر سەریان لە هەوا قیت کردبووەوە و دەوری درەختەکان هەمووی چادر و سەنگەر بوو، دەوراندەوری کێوەکە پڕ فەردە قوم بوو. فیت کۆنگەکان بۆ پاراستنی گیانی خۆیان هەڵیانچنی بوون، زەوی پڕ بوو لە نیگای مۆڵەق وبێ جووڵەی پیاوان:

لە تەنیشت تۆپخانە، دار بەڕوویەك ببووە دوو كەرت، لەسەر دار بەڕووەكە دانیشتم.

كوڕیژگەیەكی گەنج بەنیگای غەمبارەوە خەریكی گوللە بارانی ترۆپكی تەپۆلكەی (٨٧٥) بوو.

(پیپ) دەمی قسەی كردە كوڕیژگەكە و گوتی:

– لاری، پریاسكەیەكم بۆ هێناوی!

لاری گوتی:

– ئێستا دێم.

ئینجا چوو لەسەر زەوی چۆكی داداو سەری زێڕینی بە قەدی تۆپەكە كرد و گوللە هاوەنێكی تری هاویشتە ناو هاوەنەكە و بە دەنگێكی بەرز هاواری كرد:

– (٣٠٤٨). یەك، دوو، ئاگردە.

پیپ دووبارە گوتی:

– لاری!

– سەبركە! (٣٠٤٩). یەك، دوو، ئاگردە.

كوڕێكی تری لەجێگای خۆی داناو پریاسكەكەی لە دەست (پیپ) وەرگرت. (دولوروس)ی پووری لە (كانزاس ستی) پریاسكەكەی بۆ ناردبوو. پریاسكەكە پڕ قوتووی دەرەی بۆ دراوو فندقی كووری و باوی و كارامل بوو.

لاری زۆر حەزی حەزلەم شتانەیە .

– لاری ماوەی چەندە لێرەی؟

– لەو رۆژەوە لێرەم كە ئەو بیرە پووچە لەسەری دام داوا پێشكەش بكەم و بێمە ڤێتنام.

– بۆچی داوات پێشكەش كرد؟

– دڵت چی دەویست؟ ئیتر سێ ساڵ بوو، هەموو رۆژێ دڵەڕاوكەم بوو نەوەك ناوی عەسكەریم بێ. بیرم كردەوە: ئەگەر داوا پێشكەش بكەم، یان دەچم و یان دەمێنمەوە . ئەگەر چووم، كە گەڕامەوە لە ئەمریكا مانگی سەدو پەنجا دۆلارم دەدەنێ. دایك و باوكم زۆر تووڕە بوون. دایكم دەگریا. هەر زوو لە ئیشەكەم





پەشیمان بوومەوە، بەڵام تازە كار لەكار ترازا بوو.

– ماوەی چەندی بەسەردا تێپەڕیوە، لاری؟

– ئۆی! لە كنە من یەك سەدەیە! بەڵام تەنیا سێ مانگی بە سەردا تێپەڕیوە. دەبێ نۆ مانگی تریش لێرە بمێنمەوە. لەو باوەڕەدای بە زیندوویی بگەڕێمەوە؟

– گومانی تێدا نییە، لاری!

– زۆر كاتی وا بووە بیرم كردۆتەوە كە من بە زیندوویی ناگەڕێمەوە و دوعام كردووە. من شەو و رۆژ ئیش و كارم دوعا كردنە. تەنانەت ئەو كاتانەی كاتیشم نییە، هەر دوعا دەكەم. بۆ نموونە كە بۆ هێرش دەردەچین خێرا خێرا لەبەر خۆمەوە دەڵێم: "خودایە، وانەكەی بمرم!"

هاوارێك لەلای تۆپخانەوە هات، گوتی:

– هۆ لاری هۆ! ناگەڕێیتەوە لای ئەم دەزگا پیس و گەنیوەت؟

لاری بە دەم مژینی كاراملەكانی پووره (دولوروس) رۆیشت. چوو بۆ ئەوەی گوللەیەك لە كوڕێكی هاوزێ خۆی بەڵام رەنگ زەرد و چاو بەدامی بگرێ.

– راستە، جۆرج؟

جۆرج ئەو كوڕە بوو كە بە هاوار بانگی لاریكرد. تەمەنی بیست و چوار ساڵ بوو، تەكنیكار بوو، كوڕی كابرایەكی ئیتاڵی بوو كە لەساڵی (١٩٢٤) لە ئەمریكا جێوار ببوو. تەنیا یەك مانگ بوو ژنی هێنابوو كە رەوانەی ئێرەیان كرد.

– بەڵێ، راستە. بەڵام ئایا دەزانی كاتێ كە مرۆڤ تەقە دەكا ئیتر بیر لەهیچ شتێ ناكاتەوە. چونكە ئەگەر تۆ تەقە نەكەی، بەرامبەرەكەت تەقە دەكاو بەرت دەداتەوە.

– لەو كاتەدا بیر لە چ دەكەیتەوە، جۆرج؟!

– تەنیا لەكوشتن و لەوەی كە نەكوژرێم، لەوەی كە زۆر نەترسم.

هەمیشە لەكاتی هێرش كردندا، ترسێكی سەیر دامدەگرێ. یەكەم جار كە بۆ هێرش دەرچووم، نامەیەكی ژنەكەمم بۆ هاتبوو، نووسیبووی كە دوو گیانە. من لەترسان هەر وەخت بوو رۆحم دەربچێ. (پۆپ) برادەرم بوو. بەیەكەوە هاتبووینە ڤێتنام و هەمیشە هەر بەیەكەوە بووین. كوڕێكی كەمدوو بوو، كەچی من هەمیشە

هەر قسەم دەکرد.

هیچ کاتێ لەیەك جیا نەدەبووینەوە، وەکوو دوو هاوڕێی لێك دانەبڕاو وابووین. شتێ هەیە دەتەوێ بۆت باس بکەم.

– بێگومان دەمەوێ، جۆرج!

–شتێکە تا ئێستا بۆ هیچ کەسم باس نەکردووە.

– هەر شتێکی بتەوێ دەتوانی بۆم باس بکەی.

– دەزانی؟ شتەکە لەبارەی (پۆپ)ە.

کاتێ کە گوللە تۆپەکەیان پێوە نایەن... من چاوم لێ بوو... بەڵام بە (پۆپ)م نەگوت. خۆم بەسەر زەوی دادا، بەڵام (پۆپ)م ئاگادار نەکردەوە. دەزانی تەنیا بیرم لەخۆم دەکردەوە و لەو کاتەدا کە لەخۆم بەولاوە بیرم لەهیچ کەسی تر نەدەکردەوە، دیم، دیم (پۆپ) تەقییەوە. ئا، تەقییەوە، چونکە هیچ وشەی ترم دەست ناکەوێ بۆ ئەو شتەی کە بەچاوی خۆم دیم. گوللەکە یەکە و راست بەناوەندی سینگی کەوت و مرد. ئەوە یەکەم جار بوو کوژرانی مرۆیەك ببینم، ئەویش (پۆپ)ی برادەرم بوو.

هاوارم کرد: (پۆپ!) بەڵام ئەو تازە مردبوو. پاشانیش! وای خوایە بمبوورە! پاشانیش... شتێکی تر هەیە تائێستا بە هیچ کەسم نەگوتووە.

– بڵێ، ئەو شتە چییە، جۆرج!

– پێت دەڵێم، ئەگەر نەیڵێم شێت دەبم. پاشان هەستم کرد زۆر شادم. شادم بەوەی تۆپەکە بەو کەوت و بەمن نەکەوت. باوەڕ بە قسەکەم دەکەی؟

– بەڵێ!

– لەم بارەیەوە هەست بە شەرمەزاری دەکەم، وای خودایە !!چەند هەست بە شەرمەزاری دەکەم! بەڵام ئیتر ئەوە ئاوهایە! با شتێکی تریشت پێ بڵێم. دەتەوێ ئەمەشت پێ بڵێم؟ ئەگەر ئێستا، هەر ئێستا گوللە تۆپێکمان بۆ بێ، دیسان حەز دەکەم بەتۆ بکەوێ نەك بەمن. باوەڕ بەقسەکەم دەکەی؟

– بەڵێ!

پاشان پیاوێکم کوشت. یەکەم جار بوو یەکێك بکوژم. ئەویش فیت کۆنگ بوو.





فیت کۆنگەکە بە هەموو هێزی خۆیەوە رایدەکرد و هەموو تەقەیان لێ دەکرد، دەق وەکوو ئەوەی لە ژووری گوللەبارانی باخی شار گوللە لەنیشانە بگرین، ئاوها! بەڵام هیچ گوللەی پێ نەدەکەوت. پاشان من یەك گوللەم تێ گرت و بەرم دایەوە.

– جۆرج، کە ئەو بەربووەوە تۆ هەستت بەچی کرد؟

– هیچ. دەق وەکوو ئەوە وابوو گوللەم لەدرەختێك دابێ. تەنانەت چوومە سەری و دەستیشم لێدا بەڵام دیسان هەستم بەهیچ نەکرد. شتێکی گەلۆرانەیە، وانییە؟

– نا، جۆرج! ئیتر ئەمەیە جەنگ!

– ئەم قسەیەی تۆ وەکوو قسەی ئەفسەرەکە وایە کە گوتی:

" ئیتر ئەمەیە جەنگ! " بەڵام هەر چۆنێ بێ شتێکی گەلۆرانەیە، وانییە ئەفسەر؟

ئەفسەرەکە گوتی:

جۆرج، برۆ ئیسراحەت بکە.

دیارە ئەمرۆ تەپۆلکەی (١٨٣٨) ئارامە. هیچ گوللە تۆپێکیان تێ نەگرتووین، تەنات یەك نارنجۆکیش!

هەتاوێکی گەرم و خۆشە. کوڕەکان خەریکن جلیان دەشۆن و لەسەر لکی شکاوی درەختەکان هەڵیان دەخەن. (پیپ) قاپێ خواردنی بۆ هێنام. مریشك و لۆبیا بوو. خواردنی ئێرە بە ئەندازەیە. بەدەم نان خواردنەوە بیرم دەکردەوە چۆن دەبێ شەڕ لەجێی ئاوها خۆش بکرێ. کە ئەم درەختە سووتاوانە دەبینم، ئاگر کەوتنەوەم بیر دەکەوێتەوە.وەکوو ئەو ئاگرەی پێش چەند ساڵێ لەباخی ڤێلاکەم بەر بوو.

بیرم کردەوە خۆشە قسەیەك لەگەڵ ئەم ئەفسەرە بکەم.ئەفسەرەکە لەسەر کۆتەرەی درەختێك دانیشتبوو، پێی بەسەر خۆڵەکەی بەردەمی دا دەهێنا. هەندێ خاك و گەڵای لەبەر پێ کۆ ببووەوە و قۆپەنێکی قووچی بە پۆستاڵ لێ دروست کردبوو، کت و مت وەکوو ئەو شکڵە جۆراو جۆرانەی لە کەناری دەریا لە لم و قووم دروستی دەکەین.

– رۆژ باش، ئەفسەر!

– ڕۆژ باش!

– ئەم سەربازە... جۆرج دەڵێم، دەڵێی زۆر ناڕەحەتە، وانییە؟ جەنگ شتێکی تۆقێنەرە، وانییە؟

بەبێ تاقەتی سەری بادا، تەماشای ئەو شکڵەی کرد کە دروستی کردبوو. گەڵایەکی سووری هەڵگرتەوە و لەسەر ترۆپکی قۆپەنەکەی دانا.

– تۆقێنەر! من جەنگم تەنیا لە سینەمادا دی بوو و تەواو! هەرگیز بە بیرم دا نەدەهات جەنگ ئەوەندە تۆقێنەر بێ. ئەمڕۆ بەیانی نامەیەکم بۆ براکەم نووسی. بۆ برا هەژدە ساڵییەکەم. من دوو برام هەن، لە (ماسا چۆست)ن. یەکی چواردە ساڵییە و ئەوی تر هەژدە ساڵییە. ئەوەی هەژدە ساڵی، لەوانەیە هەر ساتێ ناوی عەسکەری بێ، بۆم نووسی:

" نامەوێ ئەو شتانەی من لە جەنگدا دیومن، تۆش بیانبینی. لێ مەگەڕێ ڕەوانەی ڤێتنامت بکەن. هەوڵ بدە بۆ خزمەت کردن بچیتە هێزی دەریایی. ئەگەر بتوانی کارێکی وا بکەیت و نەیەیتە ڤێتنام زۆر چاکە! "

داهاتەوە بۆ ئەوەی گەڵایەکی تر هەڵگرێتەوە. گەڵاکەی لەسەر ترۆپکی قۆپەنەکە دانا.

دەتگوت گڵکۆیەکی بچکۆلانەی دروست کردووە.

– گوللە لەسەر سەرمانەوە بەلقی درەختەکان دەکەوت. ئەوەندە دڵمان بەو درەختانە خۆش بوو، بە مە بوایە ماچیان بکەین. حەزمان دەکرد قەت جێیان نەهێڵین، بەڵام ناچار بووین بەرە و پێش بڕۆین. من بەپێش سەربازەکان کەوتبووم و هەمیشە ئاگاداری سەرم بووم، وەکوو ئەوەی تەنیا سەرم هی ئەوەبێ ئاگاداری بم، وەکوو ئەوەی ئەگەر سەرم لە بەڵا بەدوور بگرم، هیچ مەترسییەك هەڕەشەم لێ ناکا. کە ئەوەندە ئاگاداری سەرم بووم، لەوانەیە هۆکەی بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە یەکەم مردووم بینی، کڵاوی لەسەر نەبوو. سەری وەکوو دەبدەبە کەوتبووە سەر شانی.

ئەفسەرەکە بە مات و مەندە هۆشی تەماشای قۆپەنەکەی دەکرد کە وەکوو گڵکۆیەکی بچکۆلە وابوو.





– من نامەوێ براکەم ئەم شتانە ببینێ، نامەوێ بمرێ. ئەگەر ئەمریکا بیەوێ من لە ڤێتنام بمرم قبووڵمە، بەڵام برام نا. لەماڵێك یەك کەس بمرێ بەسە! ئەگەر مرۆڤی نیشتمانپەروەریش بین و شانازی بەوە بکەین کە لەڤێتنام شەڕ دەکەین، دیسان بڕوام وایە هیچ کەس حەز ناکا لێرە بمێنێتەوە، هیچ کەس نییە شانازی بە مانەوەی لێرە،بکات.

ئەفسەرەکە بە تووڕەیی پێلەقەیەکی توندی لەو شکڵەدا کە دروستی کردبوو و بە تەواوی تێك و پێکی دا. دەستێکی زەردی بچووکی پەنجە قوچاوە، لەژێر قۆپەنە تێکدراوەکە بە دەرکەوت، لە شەڕی سێ ڕۆژ پێشتر بەجێ مابوو.

## دوای نیوەڕۆ

جەنگ بۆ ماوەی سێ ڕۆژی تر دەستی پێ کردەوە. لە نۆی بەیانییەوە تا شەشی شەو بەبێ پسانەوە بەردەوام بوو. تەپۆلکەی (١٣٨٣) تەپۆلکەیەکی ڕك و نووك تیژە. پڕە لە دار حەیزەرانی چڕو تێکچڕژاو و ڕووەکی ناوچەیی تر. کاپتن (شر) هاوڕێکانی هان دەدا خێراتر بڕۆن بەڵام سەربازەکان زۆر بە سستی دەچوونە پێش، چونکە دەترسان بکەونە ئەو قۆرتانەی ڤێتنامییە باکورییەکان لێیان دابوو. ئەم قۆرتانەیان زۆر بەچاکی و لێزانی دروست کرد بوو . لە ترۆپکی تەپۆلکەکانەوە تا داوێنی وەکوو مار پێچ دەهاتنە خوارێ. دەق وەکوو ئەوەی توێژی پرتەقاڵ بەشێوەی شریت ببڕین. قۆرتەکان لەژێر زەوی بە لەغەم و نۆینی بن عەرد تێکیان دەکردەو و یەکەمینییان پێش شەش مانگ دروست کرابوو. سەربازە پێست زەردە وردیلەکان لەمانگی حوزەیرانی ڕابردوو دەستیان بە هەڵکۆڵینی زەوی کردبوو، بەڵام ئەمریکییەکان هەر هەستیشیان پێ نەکردبوو.

قۆرتەکان بچووك بوون، ڤێتنامیش وردیلەن و پێویستیان بەجێگای گەورە نییە، ئەم بچووکییەی قۆرتەکان کاری ئەمریکییەکانی دژوار تر کردبوو.

سەربازەکان لەپڕ دەگەیشتنە سەر قۆرتەکان و دەکەوتنە ناویان.

کاپتن (شر) و هاوڕێکانی، سەرەڕای ئەم دژوارییەش هەر لە ڕۆیشتنی خۆیان بەردەوام بوون. هەمیشە وریای هەر دەوەنێ یان درەختێکی بچووکی سەر ڕێگا بوون. لەسەرەخۆ دەخزین و بەردەبوونەوە. ڕەتبوونیان لە هەر درەختێ یان

دەوەنێ بە سەرکەوتنێکی گەورە دادەنا. ماوەی نێوان هەر دار حەیزەرانێك و دار حەیزەرانێکی تر تەنیا پازدە مەتر بوو، ئەو ماوەیان بە دەوری سەعاتێك و هەندێ جار بە دوو سەعات دەبڕی!

دەوری سەعات سێی دوای نیوەڕۆ، کاپتن گەیشتە ئەو قەناعەتە ئەگەر بەم جۆرە بڕۆن هەرگیز بە ئامانجی خۆیان ناگەن. ئەوەبوو داوای یارمەتی لەهێزی ئاسمانی کرد، دەشی زانی فڕۆکەکان دەکەونە بەر دەست ڕێژی گوللەی دوژمن.

فانتۆم هاتن و ناپاڵمێکی زۆریان لە دەوری سەنگەرەکان بەردایەوە، ناپاڵمەکان دوای ماوەیەك گڕیان گرت. سەربازی پێست زەردی وردیلە بەتفەنگ تەقەیان لە فڕۆکەکان دەکرد و هێرش دەستی پێ کرد. دوای دوو سەعات، کاپتن (شر) گەیشتە سەر ترۆپکی تەپۆلکەکە.

ئەمە بڵند ترین قوللەی ئەو ناوچەیەیە. لێرەوە سەراپای دەشت و سەراپای گەلی و ئەو رووبارەشت لێ دیارە کە وەکوو مارپێچ دەڕواتە خوارێ.

دیمەنەکە دەق وەکوو نیگارە شینەکانی چین وابوو. من لەگەڵ کاپتن (شر) بە هیلیکۆپتەر هاتمە سەر قوللەی تەپۆلکەکە. هەر وەکوو گوتم، لەبەر مین و سەنگەری فیت کۆنگەکان، سەرکەوتن بەپێ کارێکی ئەستەمە.

هیلیکۆپتەرەکەش لەترسی مین لەسەر زەوی نەنیشت. ئەوەندەی توانی نزم بووەوە و ئێمەش خۆمان فڕێ دایە خوارێ.

من پێش ئەوەی خۆم هەڵاوێم، کاپتن گوتی: " وریابە، بەرنەبیتەوە! "

من نەمتوانی شوێنی دابەزینم بە وردی دیاری بکەم و لەسەر سك کەوتمە سەر شتێکی نەرم. ئەو شتە نەرمە تەرمی فیت کۆنگێك بوو کەوتبووە ژێر خۆڵێکی کەم. ئێرە تەرمی زۆر لێ بوو. بە ماوەی سێ رۆژ شەست تەرمیان بەخاك سپارد.

ناشتنی ئەو تەرمانەی لەناو سەنگەرەکان مردوون، کارێکی ئاسانە، دەست دەدەیتە بێڵێك و... بەلام ناشتنی مردووە پەرت و بڵاوبوەکانی دەرەوەی سەنگەرەکان، کاتێکی زۆری دەوێ.

– کاپتن چند قوربانیتان بۆ گرتنی ئەم تەپۆلکەیە داوە؟

– هەر زۆر زۆر! سەدو پەنجا تا دوو سەد کەس. حیساب کردنی زەحمەتە.





چونکە فیت کۆنگەکان مردووەکانیان دەبەنەوە. پێش شەڕ، هەریەکە و پەتێکیان لەپێ دەبەستن و کەمردن زیندووەکان ئەو پەتانە رادەکێشن و مردووەکان دەبەنەوە. ئەو تەرمانەی دەبینی بەجێ ماون، ئەمانە تەرمی پاسەوانەکانن.

– ئەی زیندانییەکان؟

– لە ڤێتنام کەس زیندانی ناکەن. نە ئەوان و نە ئێمەیش. چەند حاڵەتێکی تایبەتی لێ دەرچێ، ئەوەی تر هیچ کەس ئامادە نییە دیل و زیندانی هەبێ. کەلێیان نزیك دەکەویتەوە نارنجۆکێك دەتەقێننەوە و خۆشیان و ئێوەش دەکوژن.

ئەو تەرمەم نیشان دا کە بەسەریدا بەربوومەوە و لێم پرسی:

– ئەمەش هەر بەو جۆرە مردووە؟

شانی هەڵتەکاند و گوتی:

– لەوانەیە!

بازووی گرتم:

– تەماشای مەکە! بابڕۆین!

کاپتن تەمەنی سی و شەش ساڵە. وەکوو (تیرۆن پاوەر) قۆزە، هەڵبەت کاتێ کە (تیرۆن پاوەر) قۆز بوو. چەند مانگە خۆی لەگەڵ ژنێك نەدیوە. رەنگە هەر لەبەر ئەوەش بێ کاتێ کە منی بردە سەر ترۆپکی تەپۆلکەکە، لە دوڕ چاوم راما و هەر کاتێ کە دیمەنێکی جوانی دەدی، بە نەرمی بازووی دەگوشیم و دیمەنەکەی نیشان دەدام. پەنجەی لە رادەی ئاسایی زیاتر لەسەر بازووم دەمایەوە، بەلام دەزانم ئەم هەڵس و کەوتەی لە بێ ئاگایی بوو. ئەگەر ئاگای لە هەڵس و کەوتی خۆی بوایە، دەبوایە لە شەرمان سوور هەڵبگەڕێ. تەنانەت کەیف هاتنیشی بە دیداری من هەر بێ ئاگایانە بوو. بەم جۆرە ئێمە لەسەر تەپۆلکەکە، بەسەر قەوانی هاوەن و پارچە ئاسنی تێکەڵ و پێکەڵ و پەڕۆی خوێناویدا دەڕۆیشتین. ئەو زۆر شاد و خۆشحاڵ بوو بەوەی لەگەڵ ئافرەتێك دەڕوا. ئەوەندە شاد و کەیفخۆش بوو تەنانەت هەستی بە بۆنی ناخۆشیی ئارەقە و دەم و چاوی پیس و جلی سەربازیی ژنەی هاوڕێشی نەدەکرد. ئەو ژنەی بە پاك و خاوێن و بە بۆن و بەرامە دەدی، دەست لەناو دەستی بەناو تەرمەکاندا پیاسەی لەگەڵ دەکرد. دەق وەکوو ئەوەی

لە دەشتێکی پڕ حاجیلە پیاسەی لەگەڵ بکا. ئەگەر ئەمشەو بشمرم پێم خۆشە، چونکە ئەم خەیاڵە خۆشەم بەو پیاوە بەخشیوە. سێ ڕۆژ دوای ئەو شەڕە دۆزەخییە، پێشنیارم بۆ کرد لەناو دەشتی پڕ حاجیلەدا پیاسەیەک بکەین.

— وریا بن، دەستتان بدەنە من! بەم جۆرە دەتوانن ئاسوودەتر بڕۆن. حاجیلەی خەیاڵیی لەژێر پێدا لە قووڕ نقووم دەبوون. حاجیلەی خەیاڵی! یان حاجیلەی نائومێدی؟ کامەیان ؟!بەلاّم کاپتن، ئەمە حاجیلە نییە، ئەمە ئینسانێکی دروست و تەواوە. باش سەیری بکە. لەناو چڵی دار حەیزەران گیری خواردووە. دەم و چاوی زەردی خەریکە ڕەنگی مسی لێ دەنیشێ. سەراپای جل و بەرگی پەڵەی ڕەش ڕەشە. سینگی کون بووە. مارمیلۆکێ خەریکە بەسەر لەشی دا دەڕوا و بە کلکە لەقێ لەملی نزیک دەبێتەوە. ماوەیەک لەسەر چاوی دەوەستێ و پێی بچووکی دەخاتە سەر گلێنەی چاوی.

— کاپتن...

کاپتن بازووی بەردام. کلاّوی لەسەر داگرت، پەنجەی لەناو قژی وەردا، دووبارە کلاّوەکەی لەسەر نایەوە و ئاخێکی هەڵکێشا.

— خودایە، جەنگ شتێکی چەند نەفرەتییە!

ئەمە قسەی سەربازێکە لەگەڵتان دەکا!

هەڵبەت ئەو کەسانەی جەنگیان لەلا گەمەیە، مێشکیان تێک چووە. بێ شک شێتن کە ئەم جۆرە جەنگە بە سەرنجکێش و جێی شانازی دەزانن. جەنگ کارەساتێکی ترسناکە! لە گریان زیاتر هیچی تری دەرهەق ناکرێ. بۆ کەسێ دەگرین کە لەوانەیە ڕۆژی جگەرەیەکمان لێ سوو بووبێ، ئێستا وا مردووە و ئیتر ناگەڕێتەوە، بۆ کەسێ دەگرین کە ڕۆژێ خۆمان لێ تووڕە کردووە و ئێستاش بە چاوی خۆمان بە مردوویی دەیبینین، تەنانەت بۆ کەسێ دەگرین کە برادەرەکانی ئێمەی کوشتووە.

— تەرمێکی نیشان دام.

— ئەم مردووە دەبینی؟ سێ نەفەری منی کوشتووە، هەر سێکیش بە نارنجۆک. خۆی لە پەنای ئەم دەوەنە شاردبووەوە، ئەوان نەیاندەدی کەچی ئەو زۆر باش





ئەوانی دەدی.

— ئەی کێ کوشتی؟

— من!

— ئێوە؟

— من... دوای ئەوەی ئەو سێ نەفەرەی کوشت، یەکسەر بەیەک دەسرێژی گوللە کوشتم. دەزانی، بیر دەکەمەوە ئەگەر ڕۆژێ لە نیویۆرک، لەبارێکا بمدیبایە، ڕەنگە خۆشم بویستایە، لەوانەیە باسی کۆمۆنیزم و سەرمایەداریم لەگەڵ کردبایە، بۆی هەیە داوەتیشم بکردایە بۆ ماڵەوە.

— وای خوایە جەنگ شتێکی چەند نەفرەتییە!

— باشە، ئەی بۆچی دەجەنگن؟ بۆچی کاری ئەفسەریتان هەڵبژاردووە.

— چونکە ئەو ڕۆژەی ئەم پیشەیە هەڵدەبژێرین، بیر لەوە ناکەینەوە کە لەوانەیە ناچار بکرێین یەکێ بکوژین. من لەززەت لەوە وەردەگرم لەگەڵ بەردەستەکانم ئیش بکەم. هەست دەکەم مامۆستای قوتابخانەم.

پێشتر لە بەشی فێرکردنی سەربازیی بووم، دەزانی، ئینسان ئەو کاتە بیر لەم شتانە ناکاتەوە، بەلاّم کاتێ کە وەختی کوشتن دادێ دەبینین بەو پەڕی خەرفان و گەلۆری گەیشتووین و ئیتر تازە بە داخەوە کار لەکار ترازاوە.

— کاپتن، کاتێ کە کوشتت، هەستت بەچی کرد؟

— ترسام.

— ئێوە و ترس؟!

ئەم کاپتنەمان جۆرە حاڵەتێکی جەنگاوەرانە و متمانە بەخۆ بوونی هەیە.

— بەڵێ، ترس.

زەردەخەنەیەکی تاڵی هاتێ.

— من ئە ڕۆژە لە سەعات نۆی بەیانی تا شەشی شەو هەر دەترسام.

پێشتریش ترسا بووم. چونکە هەستم دەکرد حەز ناکەم بمرم. من پێشڕەوی هێرشەکە بووم. بەسەر سەربازەکاندا دەمقیڕاند و پێم دەگوتن نەترسن، کەچی خۆم تووشی ترسێکی هەناو پسێن ببووم. شتێ هەیە دەتەوێ پێت بڵێم؟ لەم

جۆره وەختانەدا، ئەوەی یارمەتی چوونە پێشەوەمان دەدا نە هەست بەلێپرسینەوە کردنە بەرامبەر ئەرکی سەر شانمان و نە ئازایەتیشە، بەڵکو تەنیا و تەنیا لە ترسان بەرەو پێشەوە دەچین.

دەشتی سەوز و گوڵە حاجیلەکانمان لەبەر چاو بزر بوو، ئەویش شادی و ئارامی نەما و لەو لێڕەوارە سووتاوەدا، جگە لە بۆن بۆگەنی ئەو گەنجە پێست زەردەی سێ گەنجی پێست سپی کوشتبوو و لە تۆڵەی ئەوەدا دڵیان بەگوللە سمی بوو، هیچ شتی تر نەمابوو. گەنجە پێست زەردەکە لێوەکانی لێك ببوونەوە، دەتگوت دەگرنژی.

بەڵام، ئاخۆ ئەوە ئەم کابرایە بە چ پێدەکەنیٚ؟ خودایە...

لە دوا ساتی ژیانیدا، کاپتن (شر)ی دیوە ترس و رەشاشی بە یەکەوە پێوە ناوە و بەر لەویش دۆزەخێك و تۆپ و هاوەن و ناپاڵمی دیوە. پێش هەموو ئەمانەش چاوەڕێی کردووە.

ئەو پەتانەی بۆ راکێشان و بردنەوەی تەرمەکان لەسەر زەوی کەوتبوون، لەو ناوەدا دیونی. قۆرت لێدانی دیوە. کەس نازانیٚ داخۆ چیتری دیوە.

لەو هەژدە نۆزدە ساڵەی تەمەنیدا، بێجگە لە جەنگ هیچی تری نەدیوە. جەنگ لەگەڵ فرەنسییەکان، جەنگ لەگەڵ ئەمریکییەکان و جەنگ لەگەڵ ئەو کەسانەی نەدەبوایە لە وڵاتەکەی ئەو بن. بەلایەوە گرنگ نەبوو کۆمۆنیزمی قبووڵ بیٚ، یان غەیرە کۆمۆنیزم. ئەو ئەوەندە دەزانی کە ئەم تەپۆلکەو تەپۆلکەکانی تر و دەشت و رووبارەکان موڵکی ئەون و ئەو سێ کوڕە پێست سپییە هاتوون ئەو شتانەی لیٚ بسەنن.

کاپتن (شر)، ئایا ئێوە قەت بیرتان لەم جۆره شتانە کردۆتەوە؟ ها، بیرتان لیٚ کردۆتەوە؟ نەء.، کاپتن بیری لە شتی وا نەکردۆتەوە. ئەو هەرچەندە ئەوپەڕی مرۆڤ دۆستیشە بەڵام ناچارە لەویٚ بمێنێتەوە و ئەو تەپۆلکە و ئەو دەشت و رووبارانە داگیر بکا کە موڵکی خۆی نین.

ئەو ئیتر قەناعەتی پەیدا کردووە کە بەناوی یاسا و بەناوی ئازادی زەلامی کوشتووە. دەزانم ئەگەر لێی بپرسم: " کام یاسا؟ و کام ئازادی؟ " بە حەپەساوی





چاوم تیٚ دەبڕیٚ.

<u>بیرەوەری</u>

من ئێستا وا ئەم بیرەوەرییانە لەناو هیلیکۆپتەرێك دەنووسمەوە کە دەمانباتەوە ئۆردووگا. راستەو خۆ بەسەر ئاگردا هەڵدەفڕین، لەوانەیە ئاگرەکە نیشانەی ئەو دژە هێرشە بیٚ کە چاوەڕێیان دەکرد . وەکوو دوو کەروێشکی چاپووك خۆمان هەڵدایە ناو هیلیکۆپتەرەکە. من کڵاوە ئاسنینە قوورسەکەمم لەسەر نا، هەرچەندە گەردەنیشی دەگوشیم: " سەر! سەر! ئەوەندە ئاگاداری سەری خۆیان دەکەن، وەکوو ئەوەی تەنیا هەر سەر هی ئەوەبیٚ ئاگاداری بکەن ". لە هەمان کاتدا، (جوتێنری)، کە تەمەنی بیست ساڵەو خەڵکی فیلادلفیایە و بەخورتی لەپشت مێزی قوتابخانەوە هێناویانە بۆ ڤێتنام، توند سەری خۆی گرتبوو، کڵاوی لەسەر نەبوو. هاواری دەکرد و دەیگوت:

– هۆ هۆ! لەگەڵ ئێوەمە! پەیامنێرینە! زەحمەت نەبیٚ شتێکم بۆ ناکەن؟ بەڵکو وێنەیەکی مۆر کراوی (جۆلی کریستی)م بۆ رەوانە بکەن؟ لەبیر نەکەن، ها... باشە؟ بە ناونیشانی: جوتێنری، لیوای سێیەم، سەربازی پیادەی دوازدەم، بەڵیٚ، جۆلی کریستی!" گاڵتەی لەگەڵ دەکردین. کاپتن غەمبار بوو و چاوەکانی لەدوو گۆمی پڕ ئاویان دەکرد.

<u>شەو</u>

دووبارە هاتینەوە ئۆردووگا. راست ئەو وەختە گەیشتین کە بریندارەکانی تەپۆلکەی (٨٧٥)یان دەهێنایەوە. ئەمڕۆ بەیانی توانیبوویان خۆیان بگەیەننە سەر تەپۆلکەکەو ئێستا بریندارەکانیان بە هیلیکۆپتەر دەهێنایەوە. هیلیکۆپتەرەکان وەکوو زەرگەتە بە ستوونی دەنیشتن و خۆڵ و تۆزیان هەڵدەکرد و چاویان دەتووزاندینەوە.

پێش ئەوەی هیلیکۆپتەرەکە بنیشیٚ، نەخۆشەوانەکان بەخۆو بە گوازۆکەوە رایاندەکردە لایەوە.

بەڵام تەنیا ئەو بریندارانەی لەبەر ئاوزینگان بوون، دەخرانە سەر گوازۆرك. برینداەرکانی تر خۆیان لە هیلیکۆپتەرەکە فڕیٚ دەدایە خوارەوە و بە برینداری و

خوێناوی و بە شەلەشەل، بەپێکەنین و گریان بەرەو روومان دەهاتن. یەکێکیان بە مێشك لەقاوی، پێدەکەنی، هات خۆی بەسەر من داداو گوتی: " تەپۆلکەکە بگرن! ئەوە فەرمانە، ئەم تەپۆلکە شوومە بگرن! بەلاّم ئێمە نەمانتوانی بیگرین! تێ دەگەی، نەمانتوانی!"

لەپڕ، لەپێکەنین وەستاو خۆی لەمن کێشایەوە و بە سەرنجێکی جددی لێی پرسیم: " ئای، ئەوە تۆ کێی؟ چیت دەوێ؟"

سەربازێکی تر نیوە رووت بوو، تووشی مێشك لەقان ببوو. پێی لە زەوی دەکوتا، توند دەستی لە هەنیەی دەداو بە هۆقە هۆق دەیگوت:

" بێزم لە هەموویان دەبێتەوە، بێزم لە هەمووتان دەبێتەوە، بەدیوومینە، پیسینە! "

ئەوانی تر هەوڵیان دەدا هێوری بکەنەوە و بیبەنە بنکەی تەندروستی، بەلاّم نەیاندەتوانی.

سەربازێکی تری پێست رەش، لە دیار لەگەنی خواردنی سەربازیی خۆی دانیشتبوو و بە ئارامی بەسەریدا دەگریا: " ئەم بۆمبایە قڕی تێ خستن. نەماندەزانی بۆ کوێ راکەین؟ خۆمان لەکوێ بشارینەوە؟ لەژێر تەرمەکان رادەکشاین. من خۆم لەژێر (جۆ) درێژ کرد، (جۆ) مردبوو. بەلاّم هەر چۆنێ بێ گەرمی کردمەوە. جگەرەیەکم بدەرێ . ئایا تۆ تائێستا قەت لەژێر مردوویەك راکشاوی بۆ ئەوەی گەرمت بێتەوە؟ "

ئەفسەرێکی گەمژە بەرەو لای ئێمەی پەیامنێر هات، هاواری کرد، گوتی:

" گەلۆرینە! بێنن، خێرا فلیمی کامێراکانتانم بدەنێ. "

ناچار بووین لەبەر دەستی رابکەین بۆ ئەوەی فلیمەکانمان لێ نەسەنێ.

رەوشێکی سەیر لێرە هەیە بۆ ناسینی گەلۆری.

لەکۆنگرەیەکی رۆژنامەگەریی، ژەنەراڵێکی تەڕ و تازە و ریش تاشاو، بەجلی پاك و ئوتوو کراو، پێی گوتین:

" من نامەوێ بەلای ئێوەوە مرۆڤێکی گەشبین بم، بەلاّم دەبێ ئاگادارتان بکەمەوە کە پێش نیوە شەو، تەپۆلکەی (٨٧٥) دەکەوێتە بەر دەستی خۆمان. "





(٢٢)ی تشرینی دووەم

سەر لە بەیانی

تەپۆلکەی (٨٧٥) نەکەوتە بەر دەستی ئەو ژانەراڵەی بۆ فێنك کردنەوەی لەشی هەمیشە دەچێتە ژێر دووشی خانیلکەی تایبەتی خۆی و رێ لەمیز کردنی منیش دەگرێ.

ئێمەی پەیامنێریش نەماندەتوانی بچینە سەر تەپۆلکەی (٨٧٥)، چونکە هیلیکۆپتەرەکان تەنیا ئەو سەربازانەیان بار دەکرد کە دەچوون لەوێ دەمردن.

لەگەڵ سپێدەی بەیانی هەوڵم دا بچمە سەر ئەو تەپۆلکەیە بەلاّم بێ فایدە بوو. هیلیکۆپتەرەکە تاقمێکی دەبرد تازە لە ئەمریکا هاتبوون، تەنانەت لێ نەدەگەڕان وێنەگرانی جەنگیش سواری هێلیکۆپتەرەکە بن. ئەو تاقمەی تازە هاتبوون گەنجێکی موو سوورەیان تێدا بوو.

ئەو گەنجە بە دەنگی گیراوەوە لێی پرسیم:

– خانم، پێم بڵێ، بزانم راستە سەر ئەو تەپۆلکەیە جێگایەکی ترسناکە؟

– نەخێر، سەرباز! نەخێر! ئەمڕۆ رۆژێکی مەیلەو ئارامە. خۆت دەبینی.

بڕوای بەقسەکەم کرد.

ئێمە لەم ئۆردووگایە دا بێ دەنگ و بێ کارین. هەر ناو بەناو، چەند دەسرێژێکی رەشاشمان لێ دەکەن، بەلاّم کەس گوێی پێ نادا. مەگەر لەکاتی بۆمبا بارانێکی گەورە، ئەگەر نا زەنگی ئاگاداری لێ نادەن. قوڕ بەسەر ئەو کەسەی گوللەی پێ دەکەوێ. ئەگەر هەر ئاوها بیانەوێ زەنگی ئاگاداری لێ نەدەن، دەبێ هەموو وەختی خۆمان لەم کونە بەسەر بەرین.

ئەمڕۆ رۆژێکی خۆشە، من و مۆرۆلدۆ دوو برادەرمان پەیدا کردووە. سەردەستە (نۆرمان جینز)و سەرپەل (باب جین). هەردووکیان بیست و سێ ساڵین. یەکەمیان رەش وەکوو شەوە و دووەمیان زێڕین وەکوو خۆرە. هەرگیز ئەمانەم بەجیا جیا نەدیوە. هەمیشە هەر بەیەکەوەن. مەسەلەی برادەرایەتیان لەوەوە هاتووە کە (نۆرمان) ژیانی (بابی)ی نەجات داوە و (بابی)یش بەش بەحاڵی خۆی ژیانی (نۆرمان)ی رزگار کردووە.

ئەم دووانە لەمانگی مایسی رابردووەوە تا ئێستا پێکەوە بەشداری حەفت شەڕیان کردووە و پێکەوە جەنگاون.

کاتێ بۆ ئاو بردن هاتنە دەم رووبار، ئاشنایەتییان لەگەڵ من و (مۆرۆلدۆ) پەیدا کرد.

کاتێ (بابی) خەریك بوو جەلیکە ئاوەکانی لەناو لۆری دادەنا، من لەگەڵ (نۆرمان) دەستم بە قسە کرد. (نۆرمان) یازدە مانگە هاتۆتە ڤێتنام، بەلاّم دەڵێ: ئەم یازدە مانگەم بەلاوە یازد ساڵە. (نۆرمان) گوتی:

– کە هاتمە ڤێتنام تازە زەماوەندم کردبوو، ژنەکەم رای لەسەر نەبوو بێم. هەمیشە هەر دەگریا. ئای چەند گریا! بۆیە شەو، ئەو نوستبوو، کە بەرێ کەوتم. هێدی لەسەر چوارپاکە هاتمە خوارەوە، بەکپ و بێ دەنگی جل و بەرگم لەبەر کرد و بەپێی پەتی، بەهێواشی لەماڵەوە هاتمە دەرێ. ئای لە خەودا چەند جوان بوو! هەتا ماچیشم نەکرد نەوەك بەخەبەر بێ. ئەگەر ئیتر نەیبینمەوە؟!!

– بەلاّم (نۆرمان)، تۆ مانگێکی تر دەچیتەوە پاڵی.

– لەماوەی مانگێکا، دەشێ سی و شەش ملیۆن جار بمری. ئەمڕۆ بەیانی کاپتن دەگەڕا کێ خۆی داوا پێشکەش دەکا بچێتە سەر تەپۆلکەکە.من رەتم کردەوە، بەلاّم ئەگەر بیویستایە دەیتوانی بمنێرێ.

(بابی) پێم دەڵێ: تۆ هەمیشە غەمباری، نەختێ زەردەخەنەش بکە"

من جاران غەمبار نەبووم، بگرە کوڕێکی شاد و رووخۆش بووم، چونکە هەستم بە گەنجێتی خۆم دەکرد، بەلاّم ئێستا ئیتر پیر بوویم. تاڵە موویەکی سپیم لە سەرم بینیوە. سەیرکە، لێرە، لای چەپی سەرمە، تاڵە موویەکی سپییە.

– من نایبینم.

– لەوانەیە تۆ نەیبینی، بەلاّم خۆی هەیە. لەوانەیە بەخوێندنەوەی نامەی (چارلی)ی برام قژم سپی بووبێ. نووسیبووی ناوی عەسکەری هاتووە و دێتە ڤێتنام. من وەلاّمم دایەوە و بۆم نووسی: (چارلی) هەوڵ بدە لەبەشی بارو گواستنەوە خزمەت بکەی نەك سەربازی پیادە.

(چارلی) کوڕێکی هێمنە. تائێستا کەسی نەکوشتووە، بەلاّم من خەڵکم





کوشتووە، دەزانی، ئەگەر بڕیار بێ یەکێ لەخێزانەکەمان بمرێ، پێم خۆشە ئەو کەسە من بم نەك برام.

من ئەم قسانەم بە قەشە (واتەرز)یش گوت. هەندێ جار کە لەگەڵ قەشە قسە دەکەم هەست بە رەحەتی و ئارامی دەکەم. بە قەشەم گوت: " ئەگەر بڕیار بێ یەکێ بمرێ، من ئامادەم ئەو کەسە بم. " ئەویش گوتی:

"ئەگەر بڕیار بێ یەکێ بمرێ، واچاکە من بمرم، کوڕم!"

– نا، (نۆرمان)، تۆ نامری.

– هەموو وا دەڵێن، بەلاّم من تادێ ترسم زیاد دەبێ. جاری دووەم کەچوومە جەنگ لە جاری یەکەم زیاتر ترسام. لەدڵی خۆمدا دەمگوت: "نۆرمان، ئەم جارە ئیشت تەواوە!". جاری سێیەم لەجاری دووەم خراپتر بوو. و جاری چوارەم... هەر جارەی، دەزانی؟ هەر جارەی کە بریندار دەبم وا دەزانم جارێکی تر ئیشم تەواوە.

– نا، نۆرمان، شتی وا مەڵێ.

– من کە هەمیشە بیرم بەمەوە خەریکە، بۆچی نەیلێم. دەزانی، من هیچ حەز لەکوشتن ناکەم. من نازانم کوشتن بۆ چییە؟ حەز دەکەم هەموو کەس لەباتی ئەوەی بمرێ، خۆشحاڵ و زیندوو بێ. من زۆر کەسم کوشتووە. بەلاّم لەو کاتەدا بیر لەهیچ شتێ ناکەینەوە، تەنیا لەتۆڵەی کوژرانی برادەرەکانمان ئێمەش خەڵك دەکوژین. لەم دونیایە بێزار دەبین و ئەوسا دوژمن بە لامانەوە دەبێ بەنوێنەری ئەم دونیا پیسەی جەنگ. بەلاّم دوای کوشتنی دوژمن، پەشێمان دەبینەوە و لەدڵی خۆماندا دەڵێین: "خوایە، بمبوورە، خوایە!!" ئاخر کەی ئەم جەنگە لەعنەتییە دەبڕێتەوە!؟

– نازانم، نۆرمان! بەلاّم ئاخیری رۆژێ هەر دێ و دەبڕێتەوە.

– بەڵێ، ئەوسایش جەنگێکی تر هەڵدەگیرسێنن. هەمیشە هەر وابووە، چونکە ئەو کەسانەی شەڕ خوازن هەمیشە بەر کەنار و لە ئەمان دان و خەڵکی تر بۆ ئەم ئیشە دەنێرن، ئێمە دەنێرن. دەزانی، سندان لە سەرمایەداریی، سندان لە قارەمانێتی. من تەنیا دەمەوێ بە زیندوویی بمێنم و تەواو. دەزانی، چونکە ژیان

شتێكی خۆشـە! سـەرەتا، هەسـتم بەخۆشـی ژیـان نـەدەكرد و نەمـدەزانی چییە، ئێستا هەستی پێ دەكەم.

بەراستی تۆ تاڵە قژە سپییەكەی سەرم نابینی؟ تۆ نایبینی بەڵام سەرم ئەم تاڵە قژەی تێدایە.

ئینجا نۆرمان چوو بۆ ئەوەی جلیكە ئاوەكان لە باتی (بابی) بخاتە ناو لۆری و (بابی) هات لە تەنیشت من دانیشت و بۆی باس كردم بۆچی (نۆرمان)ی ئەوەندە خۆش دەوێ.

– لەبەر ئەوەی، دەزانی، هەر بۆ نموونە ئەمڕۆ بەیانی رادیۆیەكی ترانزستەریان لە ئەمریكاوە بۆ ناردبوو، لەبەر ئەوەی دەیزانی من حەزم لە رادیۆیە، پێشكەشی منی كرد. بەڵام تەنیا هەر لەبەر ئەوە نییە خۆشم دەوێ، زیاتر لەبەر ئەوە هەوەسم پێ دێ چونكە كە هاتمە ڤێتنام بە گەرمی پێشوازی كردم.

دەزانی، لێرە ئیتر رەنگی پێست گرنگ نییە. ئەو رۆژە وەكوو دوو برا چووینە دەورییەو دێدەوانی. رێگاكە سەر لەبەری پڕ مین بوو. ئەو سوور بوو كە خۆی پێشم بكەوێ و ئەمری پێ كردم ماوەیەك لێی دوور بم. پاشان لە یەكەم جەنگدا، نۆرمان برینداربوو. هەر رامكرد بۆ ئەوەی نەجاتی بدەم، لەهەمان كاتدا منیش بریندار بووم و بەبێ هۆشی كەوتمە سەر زەوی. كە هاتمە هۆش خۆم، دیتم نۆرمان داهاتۆتەوە سەر من و بەنیگەرانی سەیرم دەكا. بە قاچی بریندار و دەستی خوێناوی منی لە باوەش كرد و بەراكێش راكێش بردمی. تێ دەگەی؟ بەمە دەڵێن برادەراتی؟ برادەراتی شتێكی جوانە! لە عەشق جوانترە. تاكە لایەنێكی چاكی جەنگ ئەوەیە كە برادەری چاك پەیدا دەكەی و جەنگ هەموو ئەوەی تری ئیشی گاڵتە جاڕییەو هیچی تر. دەزانی، من لەسەر داوای خۆم هاتمە ڤێتنام، بەڵام ئێستا بەجۆرێ لە جەنگ و جەنگان بێزارم نازانم چ وشەیەك بۆ دەربڕینی ئەم بێزارییەم بدۆزمەوە. بریا هەرگیز نەهاتبام. شەرمەزارم كە هاتووم.

– (بابی)، ماوەی چەندی دیكەت لێرە ماوە؟

سێ مانگ، سێ مانگی تەواو نازانم دەكاتە چەند جار مردن. من تا ئەمڕۆ لەبەر برینەكانم لە ئۆردووگا بووم، بەڵام ئێستا حاڵم باشە و لەوانەیە هەر ساتە رەوانەی





جەنگم بكەن. من نامەوێ بگەڕێمەوە جەنگ. خوایە، ئاخر من گەنجم دەمەوێ ماوەیەكی زۆر بژیم. ئاخر ئینسان بۆ ئەوە نایەتە دونیا كە لە تەمەنی بیست و سێ ساڵی دا بمرێ. ئێمە دێینە دونیا بۆ ئەوەی‌تا پیر دەبین بژین و كە پیر بووین لەناو نوێنی خۆمان بمرین.

بەراستی رۆژێكی خۆش بوو: درەختی سەوز و رووباری زوڵاڵ و جارو باریش تاقمە منداڵێكی ڤێتنامی كڵاو قووچ، بە دەم گۆرانی گوتن بەرەو لامان دەهاتن. ئەگەر باش ورد ببواینەوە شتێكی نائاساییمان نەدەدی.

بەڵام من هەستێكی سەیرم هەبوو و هەستی خۆم بۆ (بابی) باس كرد، بەڵام (بابی) وەڵامی نەدامەوە. چاوی پڕ فرمێسك ببوو، نەدرەختی سەوزی دەدی و نە رووباری زوڵاڵ و نە ئەو منداڵە كڵاو قووچانەی كە گۆرانیان دەگوت.

ئەو قەت هیچی نەدەدی. من رۆیشتم و بەتەنیا جێم هێشت. گەڕامەوە لای لۆرییەكە و چاوم بە ئاوێنەی لۆرییەكە كەوت. سێ رۆژ بوو لە ئاوێنەدا تەماشای خۆم نەكردبوو. مەیلەو بە شەرمەوە لەئاوێنەكە نزیك كەوتمەوە و چاوم لە دەم و چاوی خۆم گێڕا. بە واق وڕماوی تەماشای دەم و چاوێكم كرد نەمدەناسی. ئایا دەشێ ئینسان بەماوەی سێ رۆژ ئەوەندە بگۆڕێ. (بابی) هەقیەتی، ئێرە نەدرەختی سەوزی لێیەو نە رووباری زوڵاڵ و نە ئەو منداڵانەی گۆرانی دەچڕن.

## شەو

رۆژاوا بوو كە دەنگی هاوارێك هات: " مردوو! مردوو! " هەر رامان كرد بۆلای گۆڕەپانەكە. هیلیكۆپتەرەكان مردووەكانیان لەسەر زەوی دانابوو. سەد و دە نەفەر بوون و لە تەپۆلكەی (٨٧٥) هێنابوویانن. لەناو كیسەی پلاستیكی زیوینی زنجیرداریان پێچا بوون و بە پەت بەستبوویان. هەموویان بەریز لەسەر زەوی دانابوو، وەكوو ئەوەی هەموویان ئامادەبن بۆ ئەوەی ژەنەراڵ نمایشیان ببینێ. هەندێكیان سیمای بنیادەمیان پێوە مابوو، بەڵام هەندێكی تر پریاسكەی بێ سیما بوون و هەموو بۆگەنی ببوون. ئەو ئەفسەرە گەمژەیەی دەیەویست فلیمەكانمان لێ بسەنێ، رایكردە لامان و هاواری كرد:

– " دوور كەونەوە! دوور كەونەوە! "

من چوومە لایەکی ترو هەناسەیەکی تازەم هەڵکێشا. (بابی)و (نۆرمان)م لەپشت ریــزە لۆرییــەك بینــی، بــەبێ جووڵــە، دەســت لەســەر ســینگ و هێــدم گرتــوو وەستابوون. (بابی) گوتی:

– (چــارلی واتــەرز)یــش لــەناو ئــەم کۆمەڵەیــەدا بــوو، بــەلاّم تــەنیا ســەریان دۆزیوەتەوە.

(چارلی واتەرز) ئەو قەشەیە بوو کە بە (نۆرمان)ی گوتبوو:

((ئەگەر بڕیار بێ یەکێ بمرێ، واچاکە ئەو کەسە من بم، کوڕم.))

(نۆرمان)یش بەدەنگێکی گیراو گوتی: "نەء!"

خــەوم دێ. تــەختێکی ئۆردووگایــان پــێ داوم. زۆر لوتفیــان لەگــەڵ کــردووم، چــونکە کــە لەســەر زەوی دەخــەوین دەنگــی تەقــەی تــۆپ ســەراپای لــەشمان رادەهەژێنێ. (مازۆر)یش لەتەك من لەسەر تەختی خۆی خەوتووە. ئەو بڕوای وایە کە سبەینێ هێرشێکی تر بۆ سەر تەپۆلکەی (٨٧٥) دەست پێ دەکەن و ئەم جارە بێشك ئەمریکییەکان دەیگرن.

<u>(٢٣)ی تشرینی دووەم</u>

<u>شەو</u>

ئــەمڕۆ تەپۆلکــەی (٨٧٥) کەوتــە بــەر دەســتی ئەمریکییــەکان. مــن وا ئــەم بیرەوەرییە لەناو ئەو فڕۆکەیە دەنووسم کە لە (پیکۆ)وە دەمانباتە (سایگۆن).کە رووداوی ئەمڕۆم بیر دەکەوێتەوە پشتم دەلەرزێ، وابزانم هیچ کەس نایەوێ بیر لە بیرەوەرییــەکانی ئــەمڕۆ بکاتــەوە. مــن هــەموو شــتێکم لەمێــشکدا تێکــەڵ و پێکــەڵ بووە. هەموو شتێ زۆر بەخێرایی رووی دا.

ئەفسەرە گەمژەکــە لــەپڕ قیــت بــووەوە و تونــد تونــد دەســتی لێــك داو گــوتی: " هیلیکۆپتەرەکان ئامادەی فڕین بن بۆ ناو ئاگر. ناو ئاگر." هــەر دەتگوت بانگەشــە بۆ شانۆگەری دەکا.

هــەر زوو هیلیکۆپتــەرەکان لــە گۆڕەپانەکــەدا ریزیــان بەســت بــۆ فــڕین و لەگــەڵ فڕێنی هەر هیلیکۆپتەرێ، چڕە دووکەڵێکی رەش لەزەوی بەرز دەبووەوە ئاسمان. ئــەوانیش دەچــوون بــۆ ئــەوەی دوا دڵــۆپی ناپــاڵم بەســەر ڤێتنامییــە باکورییەکانــدا





بڕێژن، بۆ ئەوەی بەڵکو بتوانن ناچاریان بکەن خۆیان بەدەستەوە بدەن.

کەس متەقی لێوە نەدەهات، چاویان لە مۆڵــەق وەستابوو،وەکوو ئــەوەی نــەزانن چ بکــەن. پــێش دوو ســەعات، قەشــە (روی پیتــەرز)ی جــێ نشینی قەشــە (واتــەرز)، دابی دوعا و پاڕانەوەی ڕێك خست و زۆربــەی ســەربازەکان بەشداری ئــەو دابــەیان کــرد. ئــەو شــوێنەی دابەکــەی تێــدا پێــك هــات پــڕ لــە فــافی خوێنــاوی و قوتــووی دەرمانی بەتاڵ و قەوانی رەش هەڵگەڕاوو کلاّوخوودەی کون کون بوو

(جــاك رادل)ی نوێنــەری (N.b.c ) تاکــە کەســێ بــوو کــە تــوانی زات بداتــە بــەر خــۆی و پرســیار لــە خەڵکەکــە بکــا. ئــەم پرســیارە تایبەتییــەی لــە هــەموو کــەس دەکرد:

– " ئایا لەو باوەڕە دای ئەم ئیشە کەڵکی هەبێ؟ "

زۆربەیان وەلاّمیان دەدایەوە:

– " بەڵێ، چونکە ئێمــە ســەربازێکی زۆرمــان لــەپێناوی ئــەم تەپۆلکەیــە لەدەســت داوە و ئاخیری دەبێ ئەم تەپۆلکە لەعنەتییە هەر بگرین. "

هەندێکی تر دەیانگوت:

– " نا " و هیچی تریان نەدەگوت

پێست رەشێ، بێ ئەوەی تەنانەت سەریشی هەڵبڕێ، گوتی:

– " وازم لێ بێنن! سندان لەم هەموو شتانە دا، سندان لەمردنیش دا. "

ئینجا لەپڕ گوێمان لە هاوارێك بوو، دەیگوت:

– " ئێستا لەئێوەم دەوێ بچنە سەر ئەو تەپۆلکەیە و ئەو گەلۆرانە بدۆزنەوە. "

هەموو بالاّی تەپۆلکەکە بوون، وەك ئەوەی بۆ سەیران بچنە سەر ئەو تەپۆلکەیە. دەوری پێــنج دەقیقــە هــیچ رووی نــەدا. ئینجــا گوێمــان لــەدەنگی گوللەیــەك بــوو، پاشان دەنگی گوللەیەکی تر و دووبارە دۆزەخی ئاگر جۆش درایەوە.

گوللــەو تــۆپ و هــاوەن و نــارنجۆك و هەرەســێکی ئــاگر لەقــەد تەپۆلکەکــە شــۆڕبووەوە خــوارێ. کــە دەهاتــە خــوارێ هــەر گــەورەتر و گــەورەتر دەبــوو. ئینجــا دەبــوو بــە هــەزاران پارچــەی تــر.لــە هــەمان کاتیــشدا دادو فوغــان دەهــات، هــەموو هاوارییان دەکرد. هەندێ هاواریان دەکرد و دەیانگوت:

" بۆ پێشەوە! بۆ پێشەوە! " هەندێکی تریش دەیانگوت: " دارەبازە !! دارەبازە!! "

هەندێکی تر جوێنیان دەدا. ئەو رەشەی دەیگوت: " وازم لێ بێنن! سندان لەم هەموو شتانەدا، سندان لەمردنیش دا. " گوللە تۆپێکی پێ کەوت و لە لنگە پێلاوێك زیاتر هیچی نەما. سەربازە قژ سوورەکەش گوللە تۆپێکی پێ کەوت، بەلاّم ئەو یەك لنگە پێلاویشی نەما. تەنیا چەند پشکە خوێنێکی بە کراسی (مازۆر) کەوت و بەس. ئەمە ئەو سەربازە بوو کە لەمنی پرسی:

– " خانم، پێم بڵێ بزانم، راستە سەر ئەم تەپۆلکەیە جێگایەکی ترسناکە؟"

منیش وەلاّمم دایەوە:

– " نا، سەرباز، نا. ئەمڕۆ رۆژێکی خۆشە!... "

جەنگ دەوری شەست دەقیقەی خایاند و وەکوو بیستم، یەکەم پەیامنێر کە توانی خۆی بگەیەنێتە سەر تەپۆلکەکە کچێکی وێنەگر بوو بەناوی (ئورات کازیکاس). هیچ کەس لەسەر ترۆپکی تەپۆلکەکە نەبوو. ڤێتنامییە باکورییەکان شەوی پێشوو چۆڵیان کردبوو و هەموو مردووەکانیشیان بردبووەوە. کاتێ کە ئەمریکییەکان گەیشتنە ئەوێ، جگە لە (ئورات)و لقە داری سووتاو و پارچە لەشی بنیادەم هیچی تریان نەبینی.

لێپرسراوی هەواڵگری لە فەرماندەی پرسی:

– جەناب.. ( p.c ) لەژمارەی کوژراوی ڤێتنامی باکورییەکان دەپرسێ. چەند کەسن؟

– پێیان بڵێ من تەنیا دەتوانم ژمارەی کوژراوەکانی خۆمانیان پێ بڵێم. سەدو پەنجا کەس. (یان دوو سەد و پەنجاو هەشت، باشم لەبیر نییە. دەبێ لە مازۆر بپرسم.

مازۆر بە بلووزی خوێناوی لە تەنیشت من خەوتووە، ناو بەناو موچڕکێکی پێدا دێ. حەز دەکەم بخەوم، بەلاّم لێرە نا. حەز دەکەم بە رەحەتی لەسەر چوار پایەك بخەوم، حەز دەکەم خۆم بشۆم، زۆر حەز دەکەم خۆم لە بەلاّی ئەم جلە سەربازییە رزگار بکەم.





# بەشی دووەم

دەزانی؟ هەندێ جار زۆر حەز دەکەم بگەڕێمەوە بۆ (سایگۆن)، بەلاّم نەك (سایگۆن)ی رۆژانی شۆڕش و ئاژاوە و نەك لە مانگی شوبات و مایس و بەدواوە، بەڵکو (سایگۆن)ی سەفەری یەکەمم. دەزانی؟ یادی دار خورمای سەوز و کلاّوی قووچ و لۆری سەربازی وریگشاو ئەو گەرما قورسە دەکەم کە تووشی خاو بوونەوەیەکی سەیرت دەکا. (سایگۆن) وەکوو چەقۆ لە ژیان رۆچۆتە خوارێ. چۆن کات و شت و هەست کردن بەرامبەر بە مردن، نرخیان زیاتر دەبی، هەر بەو جۆرەش، خواردن زەریفتر و برادەرایەتی پتەو ترو عەشق قووڵتر و شادی زیندوو تر دەبێ. لەبیرەوەرییەکانی رابردوو، یەکەم شەوم لەبیرە کە لە (داکتۆ) گەڕامەوە. ئەو شەوە هیچ رووداوێکی تایبەتی نەقەوما. چوومە ئوتێل، جلی سەربازیم لەبەر خۆم داکەند، خۆم شووشت و چوومە ناو نوێن و هەر زوو خەوم لێ کەوت. ئارام و ئاسوودە بووم کە خۆم نەختێ لەرەحەتی و ئەمینی دا دەدەی. هەستم بەشتێکی خۆش دەکرد کە خۆم لەسەرشۆرکێکی خۆش و رەحەت شووشتووە، لەناو نوێنێکی پاك نووستووم و جلی سەربازیم داکەندووە و فڕێم داوەتە سەر زەوی. ئێستاش ئەو جلە تەڕو گەنی و پیسە لەسەر زەوی کەوتووە. ئێستاش خۆشحاڵم کە ئەو جلەم داکەندووە، وەکوو ئەوەی بەداکەندن و تووڕ هەڵدانی ئەو جلە، ترس ونەفرەت و ناڕەحەتیم لەخۆم دوور خستبێتەوە. تێ دەگەی چ دەڵێم؟ بەلاّم ئەمەش دەزانم کە دەبێ دووبارە بیکەمەوە بەرو دیسان دەبێ بە بێزو نەفرەتەوە دایبکەنم.

بەلاّم ئەم هەستە نابێ دووبارە بێتەوە. نابێ ئیتر بیر لەوە بکەمەوە کە دەبێ جلی سەربازی دابکەنم ، کە هەموو بەد بەختییەك بەم جلانەوە بەسراوەتەوە.

رۆژ هات و چوو، بیرم کردەوە نابێ چیتر بیر لەم شتانە بکەمەوە.

ئەو تەقینەوانەی شاریان هەڵدەتەکاند نەمابوون و ئەو شەڕانەی شاریان دەکردە یەك پارچە سەنگەر هێشتا دەستیان پێ نەکردبوو. ئەو کاتە گەڕان بە شەقامەکاندا ترسی تێدا نەبوو، ئەوە لەگۆڕێ نەبوو مرۆڤ گوللەیەکی پێ بکەوێ یان پێ لە مینێك بنێین و بتەقینەوە.

ژیان، ئەگەر نەبوونی و برسێتی لەگەڵ دا نەبایە، ژیانێکی ئاسایی بوو.

سبەینەی رۆژانی یەك شەممە، خلیسکانەی سەر ئاوت لە رووبار و جۆگاکان دەکرد و پێش نیوەڕۆکەش دەچوویتە مەیدانی ئەسپ سواری و بەسواری ئەسپ، بە رەهوانی یان بەغار سوار سوارانەت دەکرد .

بەرۆژ، دەتتوانی لە قەراخ ئەستێلێك فراوین بخۆی و شەو، شێوت لەچێشتخانەی شار بخۆی، چونکە حکوومەتی سەربازی درەنگ دەستی پێ دەکرد.

چێشتخانەکان خواردنی باش و زۆریان هەبوو، تەنانەت هەندێکیان ئۆرکسترایشیان هەبوو.

بگرە شار هەندێ سەماخانە و یانەی شەوانەیشی لێ بوو.

دوای رۆژاوا، لە پەنجەرەی ژوورەکەمەوە لە شەقامی (تۆدۆ)، جریوە جریوی گلۆپەکانی سەر دەرگای یانەی شەوانەم دەدی . کە شەو دادەهات سەر شۆستەکان پڕ دەبوون لە دڵداری دەست لەناو دەست و جندەو سۆزانی مینی جۆب پۆش و غەوارە و گەوواد.

کەچی بەرە بەری نیوە شەو، هەموو شەقامەکان بگرە شەقامی (تۆدۆ)ش لەتاریکی ئەنگوستە چاودا نقووم دەبوون. شۆستەکان چۆڵ دەبوون و جگە لەدەنگی جێبی پۆلیس، یان دەنگی بۆمبا بارانی دوور، هیچ شتێ کپی و بێدەنگیی شەوی نەدەشڵەقاند. بەڵام کە سبەینە دادەهات هەموو شتێ سەر لەنوێ زیندوو دەبووەوە، مرۆڤ بڕوای نەدەکرد، بەڵام کە دەبووە بەیانی دەتتوانی بۆ تەماشا کردن و شت کڕین بچیتە دوکانی زێڕینگەری پڕ زێڕو زیو و عاج و ئەو بەرگدروانەی بەبیست و چوار سەعات دەستە بەرگێکی تەواویان بۆ دەدووری و دوکانی ئەو سەرتاشانەی هەموو جۆرە پێویستییەکی خەملاندنیان هەبوو.





بەرۆژ، هیچ رووداوێکی خراپ نەدەقەوما، تەنیا جارو بار ناشتنی تەرمێکت دەدی. دەزانی؟ ئەوسا هێشتا ئەوە هەبوو ئەگەر یەکێ لە (سایگۆن) بمردایە، تەرمەکەیان دەناشت. ناشتنی تەرمی ڤێتنامییەکان نمایشێکی شادییە. عارەبانەیەکیان بە ئەستێرەی زۆر و ئەژدیهای رەنگاو رەنگ دەڕازاندەوە و تابووتەکەیان لەسەر دادەنا و دایبابی مردووەکە بێ هیچ شیوەن و گریانێك لەگەڵ تابووتەکە دەڕۆیشتن. هەموو جلی سپییان دەپۆشی و تیپێکی مۆسیقا بە تەپڵ لێدان رۆحی شووم و بەدیان دوور دەخستەوە. کە تەماشات دەکرد وات دەزانی تەماشای کەرنەڤاڵێك دەکەی. سەیرت دەکرد و هەستت بەهیچ کارەساتێك نەدەکرد، چونکە کارەساتەکە لەناو دڵیاندا بوو، لەناو ئەو زیندانانەدا بوو کە فیت کۆنگەکانیان تێدا ئازار و ئەشکەنجە دەدا و دەبوایە بچیتە ناو زیندانەکان و ناسیاوی لەگەڵ پیاوی زەلامکوژی وەکوو (نگوین وان سام) پەیدا بکەی بۆ ئەوەی بتوانی هەست بە کارەساتەکە بکەی!

تەنانەت سەرەتای هاوڕێتی قووڵ و جوانی منیش لەگەڵ ( فرانسوا)، پەیوەندی بە (سایگۆن)ی ئەوساوە هەیە. دوای چوونە (داکتۆ)، شارەزای کەسێتی پتەو و بیری ئازادی ( فرانسوا)بووم و گیرۆدەی بووم.

رەفتاری (فرانسوا) وای کردبوو باش لێك حاڵی دەبووین: ئەمەش رۆژ بەرۆژ لامان گرنگتر و بەسوود تر دەبوو.

(فرانسوا) پێشتر ئەم جۆرەگەشتە دۆزەخییانەی کردبوو، نەك تەنیا بۆ ڤێتنام بگرە لە جەنگی کووریایش پەیامنێری جەنگ بووە و بەدرێژایی جەنگ لەوێ ماوەتەوە. ئەو بەر لەمن جەنگاوەرەکانی ناسی بوو و بەشێوازی رەقی تایبەتی خۆی ئەو پرسیارەی لێ کردبوون کە وەڵامەکەی هێشتا لای من ئاشکرا نەبوو. لە (سایگۆن)، هیچ دەرگایەکی لەروو دانەخرابوو، کەس هیچ داوای رەت نەدەکردەوە و ئەویش ئەم پایەی بۆ یارمەتی و هاوکاری برادەرەکانی بەکار دەهێنا.

من زۆربەی وەخت، بۆ داوای یارمەتییەك، یان وەرگرتنی بیرو رایەك، جارو باریش بۆ ئەوەی مێشکی هەراسانم بحەسێنمەوە دەچوومە نووسینگەکەی کە لەکۆڵانی (پاستۆر) بوو، ئەویش بە هەموو جۆرێ هاوکاری دەکردم و یارمەتی

دەدام.

<u>(٢٥)ی تشرینی دووەم</u>

لێرە، شتێکی وەکوو قرکردنی سەر تەپۆلکەکەو وەکوو مردن ترسناك هەیە، هەموو بڕوا و هەموو هیوایەکی بڕیوە. ئەو شتە ترسناکەش بێ دەنگییەکە، قسە لەگەڵ هەر ڤێتنامییەك بکەی، هەستی پێ دەکەی.

چاوەڕوانی دوورو درێژی شتێ کە هەرگیز نەیاندیوە و نەیانناسیوە، تووشی حاڵەتێکی کردوون هەموو هیوا و هەموو بەخشینێکی تێدا کوشتوون. ئەگەر سەرسامی خۆتیان بۆ دەربڕی هەموو ئەو قسەیەت پێ دەڵێن کە سەربازەکە لە (داکتۆ) کردی:– (( ئەگەر هەر ئێستا گوللە تۆپێکمان تێ بگرن، حەز دەکەم بە تۆ بکەوێ، نەك بەمن! ))

(( وازم لێ بێنن، سندان لە هەموو شتێ دا، سندان لە مردنیش دا...))

ئەمڕۆ دۆستایەتیم لەگەڵ خانمێکی دختۆر پەیدا کرد. دختۆرێکی بیست و شەش ساڵەی ڤێتنامییە. لە خزمەتی فریاگوزاری ئیش دەکا. چەند ڕۆژ بوو تووشی هەڵامەت و باپەڕ ببووم، چوومە لای، بەدەم فەحس کردنمەوە گوتی:

" ئەوە بوو بە شەش ڕۆژ، ئێوە یەکەمین نەخۆشن کە نە بەهۆی برینی جەنگ و نە بەهۆی هەوڵی خۆ کوشتنی سەرنەکەوتوو، دێنە لام. دەزانی؟ ئەم زەمانە خەڵکی (سایگۆن) کارو پیشەیان بۆتە خۆ کوشتن و لەوە بەولاوە هیچی تر ناکەن: بە ژەهر و بە حەبی خەوو بە سێدارە. لە ماوەی بیست و چوار سەعاتی رابردوودا، (١٨) کەسیان هێنایە لام کە هەوڵی خۆ کوشتنیان دابوو، توانیم تەنیا دوویان رزگار بکەم."

پاشان من و (مۆرۆلدۆ)ی بۆ شێوی ئێوارە داوەت کرد و بردینییە چێشتخانەیەك کە فیت کۆنگەکان بەم دواییە مەیلەو تێکیان دابوو و ئەوان نۆژەنیان کردبووەوە.

خواردنەکەی زۆر باش بوو: پەرەسێلکە و قرژاڵ و چووزەرە حەیزەران.

بەڵام چێشتخانەکە لەسەر پایەی دار لەناو ئاو دروست کرابوو، یەکەو راست کەوتبووە بەرامبەر لێرەواری پڕ ئاژاوەی فیت کۆنگەکان و شوێنێکی ئەوەندە





لاچەپ و ئارام نەبوو.

فڕۆکە بە بەردەوامی بەسەر سەرماندا دەسووڕانەوە و گوللەی نوور بەخشییان بۆ لێرەوارەکە دەهاویشت و دەورییەکانیش بەردەوام خەریکی تەقە بوون.

بە دڵەڕاوکێ خواردنەکەمان خوارد، دەترساین نەبادا هەر لەحزەیەك بۆمبایەك بەربێتەوە ناو قاپەکانمان.

(مۆرۆلدۆ) گوتی:

– خانمی دختۆر، نەماندەتوانی شوێنێکی ئارامتر بۆ شێو خواردن بدۆزینەوە؟

خانمی دختۆر شانەکانی هەڵتەکاند و گوتی:

– من راهاتووم، لەوەتی لەدایکبووم جگە لەمە هیچ شتی ترم نەدیوە. من لەناو مەرگ و مردن لەدایك بوویم، تەنانەت تێ ناگەم ئەو ئاشتییە چییە و چۆنە کە ئێوە باسی دەکەن.

– بەڵام خانمی دختۆر، هەر هیچ نەبێ دەتوانی بیهێنیتە بەر چاوت، وانییە؟

– نا، دەزانی‌چییە؟ کە شەڕ لەئیسرائیل داکەوت، من سەیرم بەخوێندنەوەی هەواڵی ڕۆژنامەکانی ئێوە دەهات. تێ نەدەگەیشتم بۆچی ئیشەکەتان ئەوەندە گەورە کردووە، بەلای منەوە ئیسرائیل وڵاتێ بوو دەگەڕایەوە سەر باری ئاسایی خۆی، باری ئاسایی خۆیشی بەلای منەوە، جەنگ بوو!

– ئەی ئازادی؟ ئایا دەتوانی ئازادی بێنیتە بەر چاوی خۆت؟

– نەخێر، من ئازادیم تەنیا لە کتێبەکانی پاسکال و سارتەر خوێندۆتەوە، بەڵام بە تەواوی نازانم چییە، بەراست ئەرێ ئازادی یانی چی؟

ئینجا ئەو پرسیارەم لێ کرد، داخۆ لای کامەیانە: فیت کۆنگەکان یان ئەمریکییەکان؟

زۆر بەساردی وەڵامی دامەوە :

من نەلای ئەوانم و نە لای ئەمان. ئایا ئێوە کتێبەکانی (کامۆ)تان خوێندۆتەوە؟ من هەست دەکەم دەقاو دەق وەکوو (بێگانە) وام. هەموو شتێ بە لامەوە سارد و بێ بایەخە.من بەبێ هیچ جۆرە حوکمدانێك تەماشای جەنگ دەکەم. من وا تەماشای جەنگ دەکەم کە لافاوێکی بەردەوامە و قەت بەری ناگیرێ، یان باشتر

بڵێین وەکوو چۆن ئەسکیمۆ سەیری بەفر دەکا ئاوها: بەلای ئەوەوە بەفر و بەلای منەوە جەنگ یەکێکە لە بنەما سروشتی و سەرەکییەکانی ژیان.

– بەڵام خانمی دختۆر، (بێگانە)یان ئیعدام کرد.

– من تەنانەت ئەم مەسەلەیەشم هەر بەلاوە بێ بایەخە. دەزانی مەرگ لە بەهایەکی ڕێژەیی بەولاوە هیچ بەهای تری نییە. کە دەگمەن بێ، نرخی دەبێ و کە زۆریش بێ، ئیتر نرخی نامێنی. ئەگەر منداڵێك لەرۆما یان لە پاریس بەبن ترومبێل بکەوێ و بمرێ، هەموو عالەم بۆ ئەم کارەساتە دەگری، بەڵام ئەگەر سەد منداڵ بەیەکەوە بە مین یان بە بۆمبا بکوژرێن، خەڵك تەنیا کەمێ بەزەییان لەدڵ دەبزوێ و بەس. یەك منداڵ زیاتر، یەك منداڵ کەمتر چ بایەخێکی هەیە؟ لە ئەڵمانیا چۆن تەماشای تەرمی جوولەکەکانیان دەکرد، ئەوانیش ئاوها تەماشای تەرمی ئەوانە دەکەن. کە نەخۆشێك دێننە نەخۆشخانە، من هەر هەوڵیش نادەم ڕزگاری بکەم، نەختێ مۆرفینی بەدەرزی لێ دەدەم و وازی لێ دێنم بۆ خۆی بمرێ.

– بەڵام نابێ وا بە سادەیی خۆت بەدەست هەموو شتێکەوە بدەی.

– من خۆم بەدەستەوە نادەم، من بێ دەنگ دەبم. تا دەمرم هەروا بێ دەنگ دەبم، تەنیا جارجارە لەدڵی خۆمدا دەڵێم: (بۆ من زۆر هونەرە کە تائێستاکە زیندووم). زۆربەی خەڵکی ڤێتنام لەدڵی خۆیاندا ئەم قسەیە دەکەن. بەلای منەوە ئازار  خواردن هەستێکی تەواو سروشتییە و ئێمە بە ئازار و تووڕەیی ناڕەحەت نابین، تەنیا هەوڵ دەدەین لەگەڵیا بژین. دەچینە سەماخانەکان و سەما و هەڵپەڕکێ دەکەین و ئاهەنگی جیاجیا دەگێڕین و بیر دەکەینەوە چیمان داوە لەوەی کێ مردووە؟ و کێ دەمرێ. تێدەگەی؟

– نا، تێناگەم.

– ئێوە بۆیە تێناگەن چونکە بەباوەڕی ئەوروپایی و بەخۆ و بەدەرزی قوتابخانەی مرۆڤ دۆستیتان هاتوونەتە ئێرە،...بەلای ئێوەوە هەموو کەس یەکسانەو ژیان خۆشە و نابێ نە کەس بکوژی و نەکەس بتکوژێ... هتد.

بەلای منەوە ئەمە هەمووی قسەی پووچە و لەوپەڕی بێ شعوورییەوە هاتووە. گیانەکەم! لەڤێتنام کەس ئەم قسانە ناکرێ، لێرە، خەڵك لەباتی نان و





هەموو شتێکی تر هەر برنج دەخۆن. لێرە، خەڵك بە بەڵگەو بورهان بیر ناکەنەوە. لێرە، ژیان و مردن هەردووکیان یەك مانایان هەیە. ئێوە لاتان وایە کە ژیان و مردن پەیوەندی بە زانستی پزیشکی منەوە هەیە؟ ئایا ئەوەش پەیوەندی بەزانستی پزیشکی منەوە هەیە کە کابرایەکی ئەڵمانی بەناوی (کارل مارکس) کتێبێ بنووسێ و ئێستا لەسۆنگەی بیرو باوەڕی ناو ئەو کتێبەوە، تاقمێکی نەزان شەڕێکی ئایدولۆجی هەڵبگیرسێنن؟

– ئایا بەلای ئێوەوە، ئەم جەنگە خەتای مارکسە؟!

– لەقسەکانی ئێوە دەرهەق بە ئازادی و دیموکراسی، زیاتر نا. داوام لێ مەکەن سەنگەرتان بۆ بگرم، من شتی وام پێ ناکرێ و نامەوێ بیکەم. من نیشتمانی خۆم وەکوو نەخۆشێك دێتە بەرچاو کە خۆرەی نەخۆشییەکەی لەکەسێکی ترەوە بۆ هاتبێ. بەڵام لەبەر ئەوەی چاکبوونەوەی بەدەستی من نییەو لەوانەیە هەر چاکیش نەبێتەوە، بۆیە بەهیچ جۆرێ حەز ناکەم بزانم کێ ئەم نەخۆشییە درمەی بۆ گواستۆتەوە.

بەدرێژایی ماوەی قسەکردنی، زۆر بە مگێز و بە هەڵەشەیی خواردنی دەخوارد. ئێمەش لەخواردن بەردەوام بووین و چیتر بەدەنگی بۆمبا باران و گوللەی نوور بەخش نارەحەت نەبووین. لەو کاتەدا (مۆرۆلدۆ) گوتی:

– ڕاستتان دەوێ، هەندێ جار وا هەست دەکەم لە (ناپولی)م و تەماشای داب و ئاگربازی ئاهەنگی جەژنی (پیدی گروتا) دەکەم.

چەند هەنگاوێ لەولای ئێمە، گوللەیەك بەناو ئاوی رووبارەکە کەوت، ئێمە هەر هێندە نەختێ دڵمان لەگەڵ داخورپا و بەس. پف! ڕاست وەکوو ئەوە وابوو بەردێکی بچووك باوێینە ناو ئاو. کە گوللەکە بە ئاوەکە کەوت بازنەی یەك لەناو یەکی دروست کرد و منیش داهاتمەوە بۆ ئەوەی تەماشای بازنەکان بکەم. سەگێ ترسابوو و بەگوللە کە دەوەڕی!

ڕاستی، بۆی هەیە خانمی دختۆر لەسەر حەق بێ. تەنانەت لە کاتی جەنگی (١٩١٤)ش دا، هەرگیز یەکێکی بە مەرگ حوکمدراو، بەیەکێکی تری بە مەرگ حوکمدراوی نەگوتووە: ( بۆچی ئەوەندە ناڕەحەتی، ژیان وەکوو ڕۆژنامەیەك وایە،

لەپێنج پوول زیاتر ناهێنیٚ. )

(٢٦)ی تشرینی دووەم

ڤێتنامییەك لە (ئاژانسی فرانس پرێس) ئیش دەكا ناوی (چان وان لانگ)ە. ئیشی تاوتووكردنی ژمێریاری و رێكخستنی ئەرشیفی دەنگ و باسەو مێزی كاركردنی لەژووری (پلۆ) یەو ئەوەندە بەكپی و بێدەنگی كار دەكا، هەندیٚ جار هەر هەستیش ناكەین لەوێیە.

هەرجارەی تەماشای ئەو لایە دەكەین كە ئەو لێی دانیشتووە و چاومان پیٚ دەكەویٚ، تاسێك دەمانباتەوە. وەكوو ئەوەی چاوەڕیٚ نەبین كەس لەویٚ دانیشتبیٚ. ئەو قەت لەجێگای خۆی هەڵناسیٚ و قەت قسە ناكاو تەنیاو تەنیا بەپەنجە درێژو باریكەكانی قەڵەمێك لەناو دوێت رادەكات و دەنووسیٚ. كە قەڵەم لەناو دوێت رادەكا، ئەوەندە لەسەرەخۆیە هەست ناكەی هەر هیچ جووڵەی كردبیٚ. بەهیچ شتیٚ ناڕووژیٚ و بە هیچ دەنگ و باسێك ناڕەحەت نابیٚ. دوای نیوەڕۆ، كە هەموومان چاوەڕێی (ئیعدام)كرانی سیٚ فیت كۆنگەكە بووین، تەنیا ئەو، هیچ پەشۆكان و ناڕەحەتی پێوە دیار نەبوو.

دەتگوت مێزی كاركردنی، دیوارێكی نادیاری بەدەورەدا كێشاوە و لەو دیو ئەو دیوارەوە، تەنیا بۆ سەیركردنی (فرانسوا) چاوی دەجووڵێتەوە.

هەمیشە هەوڵی دەدا چاومان بە چاوی نەكەویٚ. روخسارێكی وشك و نەگۆڕاوی هەبوو. كابرایەكی لاواز و رەنگ زەرد بوو. نەتدەتوانی تەمەنی تەخمین بكەی.

تاكە پەیوەندی بە دونیای ئەوێوە لەرێگای (فرانسوا) وەبوو. ئەگەر جارو بار دەمی بكردایەوە بۆ ئەوەی قسەیەك بكا، هەمیشە دەمی قسەی لە (فرانسوا)بوو و لەئاوازی قسەكردنیانەوە دەتزانی زۆر سەیر لەیەك دەگەن. (فرانسوا)،كە هەمیشە بە رەقی و بەتوندی قسەی دەكرد، كاتیٚ كە قسەی لەگەڵ ئەو دەكرد، دەنگی نزم دەبووەوە و دەبوو بە چپەچپێكی خۆشەویستانە. كە قسەی دەكرد، بەزۆری كەس گوێی لەقسەی نەدەبوو، ئەگەر گوێشیان لیٚ بایە قسەكەی بە جووكەجووكی باڵندەی شادومان دەچوو، بە جەنابی (پلۆ) و جەنابی (لانگ) قسەیان لەگەڵ یەكتر دەكرد.





لەوكاتەوە كە زانیم جەنابی (لانگ) مۆمیا نییە و ئینسانێكی زیندووە، كەوتمە مەراقی.

با لەسەرەتاوە بڵێم: (لانگ) سیٚ ژنی هەیە. سیٚ ژن رادەی هەرە زۆرە كەپیاو دەتوانیٚ بەپێی ئاینی بودایی بیانهێنیٚ. هەر سیٚ ژنی تا رادەی پەرستن خۆش دەویٚ، بەڵام ئێستا لەگەڵ ژنی سێیەمیدا دەژی.

رۆژانی جەژن، لەگەڵ هەر سیٚ ژنەكانی، لەماڵی ژنی یەكەمی بەسەر دەبا و كەبیەویٚ برادەرێكی بۆ فراوین داوەت بكا، دەیباتە ماڵی ژنی دووەمی. هەر سیٚ ژنەكە بە هاوكاری فراوین چیٚ دەكەن و تەباو تفاقییەكی تەواویان لە نێودا هەیە. (لانگ)، كە بەم جۆرە بیٚ دەنگ دەبیٚ لەبەر بیٚ شەخسیەتی و خۆ بەكەم زانینی نییە.بگرە زۆر حەز لەناو كۆمەڵ و خەڵك دەكا!

(پلۆ) پێی گوتم:

– تۆ دەبیٚ تائێستا هەستت پیٚ كردبیٚ كە هەرگیز پشت لە دەرگای هاتنە ژوورەوە ناكا و بەتی چاوی نیوە نوقاوی سێرە لە هات و چۆی ئەو كەسانە دەگریٚ كە دێنە ناو ئەم ژوورە.

– نەخێر، (فرانسوا) تائێستا هەستم بەم مەسەلەیە نەكردووە

– داوای لیٚ دەكەم قسەت لەگەڵ بكا.

– ئەمڕۆ بەیانی، جەنابی (لانگ) بەدەنگی وەكوو جووكە جووكی قسەی لەگەڵ كردم. ئاخیری هەستم كرد بەتی چاوی نیوە نوقاوی سێرە لە هەموو هات و چۆیەك دەگریٚ و بە كەمترین دەنگ و قسە گوێی قوڵاغ دەبیٚ.

– جەنابی (لانگ)، ئێوە راتان چییە؟ و چاوەڕوانی چ رووداوێك دەكەن؟

– خانم، چاوەڕیٚ دەكەم دووبارە دەستگیرم بكەن.

– بۆچی، جەنابی (لانگ) چما ئێوە تا ئێستا قەت گیراون؟

– ئۆی، ئەدی خانم!

ئینجا مەسەلەكەی بۆ گێڕامەوە:

فیت كۆنگێك بۆمبایەكی  فڕیٚ دابووە ناو باڕی چێشتخانەیەك و پۆلیسی ژەنەراڵ (لۆن)، كون بە كون لە گەڕەكەكەدا بەدوویدا دەگەڕان، ئاخیری یەكێكیان

دەستگیر کرد کە لەراستیدا هیچ ئاگای لە مەسەلەکە نەبوو.

پۆلیس لەگەڵ خەڵکی گەڕەك کەوتنە لێکۆڵینەوە: ((ئەو پیاوە دەناسی؟ ها؟ دەیناسی؟))، جەنابی (لانگ)یش بۆ ئەوەی یارمەتی ئەو پیاوە بێ گوناهە بدا، وەڵامی پۆلیسی دابووەوە و گوتبووی دەیناسم. پۆلیس کە گوێیان لێ بوو گوتی دەیناسم، گرتیان و بۆ پرسیار و لێکۆڵینەوەی زیاتر بردیانە زیندانی سەرەکیی شار و لەژوورێکا حەپسیان کرد و یەك مانگی تەواو لەبیریان کرد!

لە هەموو ئاژاوە و قڵیشانەوەیەکا، بەزۆری شتی وا روو دەدا. دەتخەنە زیندان و لەبیرت دەکەن.

تەنیا ئەو کاتەی کە ژنی سێیەمی (لانگ) هانای وەبەر (فرانسوا) برد و (فرانسوا)ش چووە لای کاپتن (فام کان تان)، تازە بە تازە هەستیان کرد لەبیریان کردووە:

((خانم، زۆرم بەلاوە گرنگ بوو، چونکە کاتێ ویستیان لێکۆڵینەوەم لەگەڵدا بکەن، بردمیانە ژوورێ لەگەڵ ژوورەکەی کاپتن (تان) دیواریان بە یەکەوە بوو. دەق ئەو کاتە منیان بردە ئەو ژوورە کە جەنابی (بلۆ) هاتبووە لای کاپتن (تان) بۆ ئەوەی داوای ئازادکردنی منی لێ بکا. من گوێم لە هەموو قسەکانیان بوو. بێگومان جەنابی (بلۆ) بەم مەسەلەیە نازانێ))

– جا ئازادیان کردی؟

– بەڵێ، هەر ئەو کاتە ئازادیان کردم.

– باشە، ئەی بۆچی وا تێ دەگەی دیسان دەتگرن.

– لەبەر ئەوەی هەمیشە دەستوور وابووە، ئەگەر یەك جار بتگرن، ئیتر تۆ بەلای ئەوانەوە مەحکوومی. با وادابنێین، رۆژێ هات و کاپتن (تان) پەشیمان بووەوە بەقسەی جەنابی (بلۆ)ی کردووە و بیری کردەوە غەڵەتی کردووە رێی داوە من ئازاد بکرێم، ئەوسا دووبارە دەستگیرم دەکا. من لە جەنگی فەرەنسییەکانیش بووم، بەڵام ئەمریکییەکانم خۆش ناوێ.

– رکت لێ دەبنەوە؟

– بەڵێ، خانم! ئەم هەموو ئیشە لەژێر سەری ئەمریکییەکانە. لەسەردەمی





فەرمانڕەوایی ژەنەراڵ (دیم)، ئەوان هێشتا پێیان بێرە نەکەوتبوو و بارو دۆخ ئەوەندە خراپ نەبوو. دەزانی؟ بۆ نموونە، دەمانتوانی جەمێك بەپێنج روپیە بخۆین، بەڵام ئێستا بە دوو هەزار روپیەش ناتوانی جەمێکی باش بخۆی. لەسەردەمی فەمانڕەوایی (دیم)، خانوو بە ئاسانی دەست دەکەوت، بەڵام ئێستا بەزۆری خانوویەکی پیست بەکرێ دەدەنێ، ئەویش ئەگەر ڤێتنامی بیت. باشترین خانوو ئەمریکییەکان تێیدان. سەوزەی تازە تەنیا ئەمریکی دەتوانن بیخۆن، چونکە بەڵێنیان لەگەڵ سەندیکای سەوزە فرۆشان بەستووە کە سەوزە تەنیا تایبەتی بێ بۆ خۆیان.

دەزانی ئەم زەمانە، تووی فەرەنگی لە (سایگۆن) دەست ناکەوێ؟ ئەمریکی زۆر حەزیان لە تووی فەرەنگییە و ئەم بەرهەمەیان سەر لەبەر بۆ خۆیان قۆرخ کردووە. دەمەوێ بڵێم کە سەراپای باری ئابووریمان تێك و پێك چووە، بەجۆرێ کە لیخوڕێکی ریکشا داهاتی مانگانەی (٤٠) هەزار روپیەیە کەچی ئەندازیارێك داهاتی تەنیا دە هەزار روپیەیە! بازاڕی رەش بازاڕی ئاسایی خستۆتە ژێر رکێفی خۆیەوە، بۆ نموونە، ناتوانی ئەنتی بایەتیك لە دەرمانخانە بکڕی، چونکە دەست ناکەوێ ، ئەگەر بتەوێ بیکڕی دەبێ بچیتە بازاڕی دزان! دەبێ بچیتە لای ئەو دزانەی جلی سەربازیی ئەمریکییان لەبەرە و دەمانچەی ئەمریکییان پێیە."

– جەنابی (لانگ)، رك و نەفرەتی ئێوە لەم شتانەوە هاتووە؟

– ئۆی، نا! تەنیا لەم شتانەوە نەهاتووە، خانم، شتی تریش هەیە!

دەنگی نزم کردو سەرنجێکی لە دەرگای هاتنە ژوورەوە داو گوتی:

– لەبەر ئەوەیە ئەوانە ئینسانی وان ناتوانن وجوودی دوژمن قبووڵ بکەن، ئەوانە ئێمە بە هۆڤی و ناشارستان و گەمژە دادەنێن. هەموو دەرفەتێك دەقۆزنەوە بۆ ئەوەی بە پەست و نزم و کەممان دابنێن. ئینسانی زۆر خۆپەرستن. دەزانی، عالەم ئێستاش ئەمریکییەکان بەمرۆڤی سەردەمی جەنگی دووەمی جیهانی دەزانن. عالەم وا دەزانێ ئەوان ئێستاش هەر منداڵە بێ گوناه و بێ زیانەکەی ئەو سەردەمەن، لەکاتێکا کە ئەمریکییەکان لەڤێتنام بە هیچ جۆرێ لە ئەمریکییەکانی سەردەمی جەنگی دووەمی جیهانی ناکەن.

ئەوانە بێ بەزەیی بوونە. وەرە ئەوکاتە بیانبینە کە گوندێك چۆڵ دەکەن، ئەوسا تێ دەگەی من چ دەڵێم:

( لەگەڵ کۆمەڵە (کووری)یەکی دڵڕەق دەچنە ناو دێیەك و بە بڵندگۆ بەم جۆرە فەرمان بە خەڵکەکە دەکەن : بە ماوەی سی تا چل و پێنج دەقیقە گوند چۆڵ بکەن و سواری لۆرییان بن. ئێمە دەمانەوێ ئاگر لەگوند بەربدەین)

چاوەڕێ دەکەن، ئەو خەڵکە بەسی یان چل و پێنج دەقیقە چ بکەن؟ خەڵکی ئاوایی یەکسەر دەکەونە کۆکردنەوەی کەل و پەلەکانیان، بەلاّم کوورییەکان مۆڵەتیان نادەن. بەپێلەقە و پاڵە سوو و قۆنداغە تفەنگ دەیانهاژۆن.

منداڵ دەقیژێنن و ژن دەزریکێنن. لە گوندان، ڕێزی مردوو و دابی تازی و خێر بایەخێکی زۆری هەیە و هەرگیز میحراب ، کە بۆ مردووان تەرخان کراوە،بەبێ مۆمی داگیرساو جێ ناهێڵن. زۆر جار وا دەبێ لۆرییەکان لەسەر ڕۆیشتنن. یەکێ دا دەبەزێ و بەپەلە پرووزێ دەچێتە میحراب بۆ ئەوەی مۆمەکە داگیرسێنێ و ئەو کاتەی کە خەریکی مۆم داگیرساندنە، کوورییەکان لەولاوە بە چەند گوللە ڕەشاشیش لەناوی دەبەن. کە گڕی ئاگر لەگوند بەر دەبێ، دەبینی چەند تەرمێك کە بە چەکی کورییەکان کوژراون ، لێرەو لەوێ کەوتوون.

– ئێ، ئاخر جەنگ ئەمەیە، جەنابی (لانگ)!

– نەخێر، ئەمە جەنگ نییە، ئەمە ساختەیی و دوو فاقی ئەمریکییەکانە کە پاشان خۆیان بەبێ گوناه پێشان دەدەن. ئەمریکییەکان زۆر باش دەزانن کوورییەکان چ دەکەن، بەلاّم بە روویان هەڵناهێنن! دەزانی، بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوە لەگەڵ زیندانییەکان بکەن و ئیعتیرافیان لێ وەربگرین، دوو زیندانی سواری هیلیکۆپتەر دەکەن. یەکێکیان بە پەت لە هیلیکۆپتەر شۆڕ دەکەنەوە خوارێ. کە دەستی بە هات و هاوار و پاڕانەوە کرد پەتەکە دەپچڕن. زیندانییەکەی تر کە ئەم ڕووداوە دەبینێ، هەرچی بیزانێ دانی پێدا دەنێ بۆ ئەوی تووشی چارەنووسی هاوڕێکەی نەبێ. کە بەتەواوی دانی پێدا نا، ئەوسا ئەویش لەهیلیکۆپتەرەکە فڕێ دەدەنە خوارێ!

– جەنابی (لانگ)، بەلاّم خۆ فیت کۆنگەکانیش ئینسانی ئەوەندە ناسك و لەبار





نین.

– هەڵبەت ئەوەندە ناسك و لەبار نین، بۆ؟ ئێوە لەکاتی جەنگ لەگەڵ ئەڵمانەکان ناسك و لەبار بوون؟ من جاران مرۆڤێکی خراپ نەبووم، بەلاّم دوای ئەوەی زیندانییان کردم بەدکار دەرچووم.

لەزیندان، شەوو ڕۆژ گوێم لەدەنگی هاونیشتیمانییەکانم بوو، لەبەر ئێش و ئازار و ئەشکەنجە هاواریان دەکرد، دەزانی؟ بەدرێژایی ڕۆژ و بەدرێژایی شەو! دەزانی منیش کاردانەوەم چی بوو؟ ناڕەحەت دەبووم، بەلاّم لەبەر ئەوان نا، بەڵکو لەبەر خۆم. هەموو ساتێ لە دڵی خۆمدا دەمگوت: ئێستا دێن و منیش بۆ ئەشکەنجەدان دەبەن.

پاشان گەیشتمە ئەو رایە کە ئاخیری ڕۆژێ هەر دێ، بارو دۆخی ئێستا پێچەوانە دەبێتەوە.

– لەو باوەڕەدانی، ئەوان بیرو رایان بگۆڕن؟

– نازانم. ئێمە ئیتر نائومێد بووین، چونکە هیچ دەسەلاّتمان نەماوە. وەکوو ئیفلیجمان لێ هاتووە. دەزانی بۆچی ئیتر تەقینەوە و خراپەکاری لە (سایگۆن) ناکرێ؟ چونکە هەموو شوێنێ پڕە لە سیخوڕ و زماندز!

بۆی هەیە هەموو کەسێ سیخوڕ بێ: هاوسەرت، برات، تەنانەت کوڕیشت.

من کوڕێکی هەژدە ساڵیم هەیە. رەوانەی قوتابخانەیەکی ناوەخۆم کرد بۆ ئەوەی لەم هەراو ئاژاوەیە دووربێ، بەلاّم دوای ماوەیەك داوای لێ کردم بگەڕێتەوە (سایگۆن) بۆ ئەوەی بەچاوی خۆی ئاژاوە و گۆڕان و وەچەرخانەکان ببینێ و بەشداری شۆڕش و تێکۆشان بکا. ئەو کاتە ترسێکی سەیر دایگرتم.

– لەکوڕەکەت دەترسای؟

سەری دانەواند و لەپڕمەی گریانی دا و فرمێسکی درشتی ڕژایە سەر دەستەکان و دووبارە گەڕایەوە سەر بێدەنگی هەمیشەیی خۆی و لەوە بەدواوە ئیتر هیچ قسەی بۆ نەکردم.

(٢٩)ی تشرینی دووەم

خۆزگە بمتوانیایە بچمە ناو دڵی هەموو خەڵکی ئەم شارە. خۆزگە بمتوانیایە

ژیانی هەموو خەڵکی ئێرە بزانم. خۆزگە وەڵامی (بۆچی)یەکانی ئەم شارەم بزانیایە.

(پلۆ) هەرێی دامیٚ روخسەتم بۆ لە ژانەراڵ (لۆ) وەربگریٚ بۆ ئەوەی دیدار و گفتوگۆ لەگەڵ چەند زیندانییەکی فیت کۆنگ بکەم. گوتی:.

– ئەمە باشترین رێگایە بۆ چوونە ناو رۆحی ئەم خەڵکە، بەلاٚم کە دەڵێم خەڵك، مەبەستم خەڵکی وەکوو خانمی دختۆر ی تۆ نییە، بەڵکو قسە لەپیاوێکی ساغی وەکوو جەنابی (لانگ)ی خۆم دەکەم.

لەوانەیە بەیانی روخسەتی دیدارەکە بدەن. بەراست، بوەستن شتێکتان لە بارەی (پلۆ) پیٚ بڵێم:

(مۆرۆلدۆ) پێی گوتم لە کتێبی ناوداری (عەشق شتێکی شکۆمەندە)، نووسینی (هان سوین)، یەکیٚ ناوی بە (فرانسیس پرن) هاتووە و گوتی من لام وایە ئەو کەسە (فرانسوا پلۆ)ی خۆمانە.

ساڵی (١٩٥٠)، لە (هۆنگ کۆنگ) پەیامنێر بووە و پاشان بۆ کۆکردنەوەی دەنگ و باسی جەنگی کووریا چۆتە ئەو وڵاتە و لەویٚ (هان سوین)و (مارك ئیلیۆت)ی بینیوە.

کتێبەکەی (هان سوین)م پەیدا کردو پەرەکانم ئاوا کرد بۆ ئەوەی ناوی (فرانسوا) بدۆزمەوە، ئەو بەشەم دۆزییەوە کە (مارك ئیلیوت) لەبارەی سەربازە غەمبارەکانی جەنگ نووسیویەتی و خوێندمەوە.

– ئەی شەیتان! ئێمە بۆچی لەگەڵ یەکتر دەجەنگین؟

– حەز دەکەم یەکیٚ بیٚ لە تەکما دابنیشیٚ و پێم بڵیٚ بۆچی دەجەنگیٚ؟

(فرانسوا) دەڵیٚ:

– دەبیٚ لە پیاوان بپرسی بۆچی خۆیان بەکوشتن دەدەن.

شەو

وەخت درەنگ بوو، تەنیا (فرانسوا) لە نووسینگەی کارکردن مابوو، چاوەڕێی دەکرد (کلۆد) خەبەرێکی لە شاری (پلیکۆ)وە بۆ بنێریٚ.

تەلەفۆن لێیدا و (فرانسوا) بە تەنگاوی خۆی بۆ لای تەلەفۆنەکە هەڵدا.





دەسکەکەی بڵند کرد و ئامێری نووسینی نزیکتر کردەوە:

– باشە، کلۆد من ئامادەم.

نازانم (کلۆد) چی گوت، (فرانسوا) دەم و چاوی تێکچوو:

– دڵنیای؟!

ناڕەحەتی دەم و چاوی بوو بە تووڕەیی و بەتوندی پەنجەی لە دوگمەی ئامێری نووسین دا. کە لەنووسینی خەبەرەکە بووەوە و کاغەزەکەی لە ئامێری نووسین دەرهێنا و دای بە لێپرسراوی بلاٚوکردنەوەی خەبەر، من چوومە پێش و ئەم رستانەم لەسەر کاغەزەکە خوێندەوە:

" بۆ پاریس پاریس لەرێگای مانیل ١١٩٠٠ ئای ئێف پی بەپەلە خاڵ ئەمریکییەکان تەپۆلکەی ٨٧٥یان بەردا خاڵ چەتربازە ئەمریکییەکان کە حەفت کیلۆ مەتر دوور لە کەمبۆدیا چاوەدێری ترۆپکی تەپۆلکەکەیان دەکرد پاش ئەوەی هەموو زەخیرەی جەنگی و تفاقی ڤێتنامییە باکورییەکانیان سووتاند گەڕانەوە داکتۆ خاڵ سوپای ئەمریکا هیچ جۆرە روون کردنەوەیەکی لەم بارەیەوە بەئێمە نەداوە خاڵ تەنیا ئەوە مەزەندە دەکریٚ ئەمریکییەکان نەیانتوانیوە لەوەندە زیاتر تەپۆلکەی ٨٧٥ لەدەست خۆیان بێڵنەوە خاڵ جگە لە تەپۆلکەی ژمارە (١٣٨٣) ئەمریکییەکان هەموو تەپۆلکەکانی تریان چۆڵ کردووە خاڵ داکتۆ ئارام بۆتەوە خاڵ))

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە لە جەنگاوەرەکان بپرسم: بۆچی رۆژیٚ، سەر لە سبەینیٚ، دابەشی دەستەی جۆراو جۆر بوون و چوون تەپۆلکەیەك بگرن بەناوی (٨٧٥)و کە دەچوون بیگرن، ریٚ و ریٚ دابی دوعاو پاڕانەوەیان بەجیٚ هێنا و پاشان دەستیان دایە تفەنگ و بەگوێی گەمژەیەکیان کرد کە دەیگوت: " ئێستا دەمەویٚ بچنە سەر ئەم تەپۆلکە و هەرچی گەمژە لەو سەرەوە هەیە بیکوژن!" ئینجا بەناو دۆزەخێکی ئاگردا بالاٚی تەپۆلکەکە بوون و ئیتر ئەوە بوو لە تەمەنی هەژدە بیست ساڵیدا کوژران. ئێستاش تەپۆلکەکەیان بەرداوە، هۆی چییە؟

پێویستە هۆکەی لە خۆیان بپرسی، بیٚ شك بەڵگەیەکیان بەدەستەوەیە بۆ ئەم کارە، وانییە (فرانسوا)؟

پێویستە لەو پیاوانە بپرسی لەپێناوی چی خۆیان بەکوشتن دەدەن.

خەریك بوو دووبارە ئەو نووسینەی دەخوێندەوە کە (کلۆد) بەبرووسکە بۆی ناردبوو.

سەری دانەواند و گوتی:

– پێویستە پرسیارێکی تریشیان لێ بکەی، پێویستە لێیان بپرسی: بۆچی خەڵك دەکوژن؟

ئەم دوو پرسیارە جیاوازییان زۆر نییە.

– بەدی، بۆ نموونە، بەزەیی!

– لەکاتی جەنگ، بەزەیی وشەیەکی پووچە. تۆ تفەنگت پێیەو ئەویش تفەنگی پێیە. تۆ تەقە دەکەیت و ئەویش تەقە دەکا. ئەوەی زووتر تەقە بکا، زووتر بەرامبەرەکەی دەکوژێ. ئەگەر ئەو تۆ بکوژێ، وەکوو ئەوە وایە تۆ ئەوت کوشتبێ.

– بەڵام خەڵکی وا هەیە حەزی لە شەڕکردنە.

– بەڵێ، هەڵبەت! دەزانی هەرچەندە جەنگ رەت بکەیتەوە و هەرچەندە رسواری بکەی، هێشتا هێزێکی تێدایە گرفتارت دەکات و بەرە و خۆی راتدەکێشێ. ئەم هێزە خۆ لێ لادانی نییە. دەزانی، جەنگ وەکوو یاری شەڕە مست وایە. شەڕە مست وەرزشێکی دڕندانەیە. بەشەر وەکوو دڕندە خۆ بە خۆیی لەگەڵ یەکتر دەجەنگێن. بەڵام کە خۆت لەلای ئەڵقەی شەڕە مست دەبینی، وردە وردە حەز لە رووداوی ناو ئەڵقەکە دەکەی و پێت خۆشە بەشداری ئەو یارییە بکەی و یاریکەرەکان هان بدەی. من شەڕە مستیش وەکوو جەنگ لەسەدا سەد ڕسوا دەکەم، بەڵام... شەڕە مست شتێکی تێدایە گرفتارت دەکا و ئەو گرفتارییە لە چەند لەحزەیەك زیاتر ناخایەنێ، پاشان شەرم لەخۆت دەکەیتەوە و پرسیار لەخۆت دەکەی چ شتێکە ئاوها گرفتاری ئەم یارییەی کردووی.

– چ شتێ؟

– کۆتایی مرۆڤێك. کە بە چارەکێ یان رەنگە دەقیقەیێ بەو کۆتاییە دەگا. بەکۆتایی دلێری یان کۆتایی ترس، بەکۆتایی عەقڵ، یان کۆتایی غەم،





بەکۆتایی تێ شکان یان بەکۆتایی شادیی و سەرکەوتن. جەنگیش هەروایە. جەنگ جادوویەکی سەیری تێدایە. لەو کاتەی کە رکت لێ دەبێتەوە، بەرەو لای دەکشێی و تەنانەت بەشداریشی تێدا دەکەی.

– من وا نیم.

– بەدی! تۆش وەکوو ئەوانی تری. کە سەربازەکان بۆ گرتنی تەپۆلکەیەك، دوازدە سەعات، یان بیست و چوار سەعات، یان دوو حەفتە بەترس و لەرزەوە بەناو ئاگردا دەچنە پێش، ئەمە باشترین وەختە بۆئەوەی شارەزای ژیانی پیاو ببی.

هەر لەو کاتەشدا تۆ دەتوانی ئاستی دەسەڵاتی مرۆڤ بەرامبەر بە ئازایەتی و ترس و عەقڵ و خۆ ڕاگرتنی بەرامبەر ئێش و ئازار، بزانی.

(فرانسوا) خۆی فڕێ دایە سەر کورسییەك و قاچی لەسەر مێزەکە درێژ کرد. ناو بەناو ئاوڕی لە ئامێری خەبەر دەدایەوە و تەماشایەکی دەکرد.

ئامێری هەواڵیش، بۆ ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ (مانیل) نەپچڕێ، بەبەردەوامی پەیامەکەی دووبارە لەسەر شریت دەنووسییەوە:

(( ئەمریکی تەپۆلکەی (٨٧٥)یان چۆڵ کرد... ئەمریکی تەپۆلکەی (٨٧٥)یان چۆڵ کرد... ئەمریکی تەپۆلکەی (٨٧٥)یان چۆڵ کرد...)). زۆر ئاشکرایە سەیر کردنی ئەو گەلحۆ وگەلۆرانەی خەڵك دەکوژن و خۆشیان دەکوژرێن کارێکی ناڕێك و نالەبارە، زۆر ئاشکرایە دەبێ بۆ ئەم بەسەرهاتە بگرین. من زۆر جار وام بەسەر هاتووە کە جەنگم دیوە گریاوم: بۆ ئەمریکی و بۆ فیت کۆنگ و بۆ کووری و بۆ چینییەکان.

دەزانی، کاتێ کە گوللەی (کالی پەنجا) بەهیلیکۆپتەرێ دەکەوێ و هیلیکۆپتەرەکە لەفڕینی خۆی بەردەوام دەبێ، ئینسان تووشی حاڵەتێکی سەیر دەبێ.

– ئەگەر مردین!!؟

– ئەگەر مردین... ئیتر هەست بەهیچ شتێ ناکەین و بیر لە هیچ شتێ ناکەینەوە، بەڵام ئەگەر نەمردین و بە سەلامەتی لەهیلیکۆپتەرەکە دابەزین و

باوەڕمان بەخۆمان کرد کەزیندووین و نەمردووین، ئەو حەلە هەست بەشادییەکی سەیر دەکەین.

– لەگەڵ هەموو ئەمەشا تۆ جەنگت قبووڵە؟

– من جەنگم قبووڵ نییە، یان باشتر بڵێین من وەکوو کارێکی نەتوانی خۆی لێ لادەی، ئاوها جەنگم قبووڵە.

دەزانی، هیچ شارستانییەك نەبووە بتوانێ جەنگ بن بڕ بکا. هەر بۆ نموونە، با تەماشای دوا شارستانێتی بکەین، ئەو شارستانێتییە هەرە ناودارەی پێی دەڵێن شارستانێتی گاوری. ئەو شارستانێتییەی لەسەر عەشق بینا کراوە و ئەو شارستانێتییە لە هەموو شارستانێتییەکی دی زیاتر شەڕ و هەرای بەدەمەوە بووە. قەشەکان، بەناوی مەسیحەوە دوعایان بۆ ئاڵاو جەنگاوەران دەکرد و هەر ئەو قەشانەش پێش گوللە باران دوعایان بۆ ئەوانە دەکرد کە حوکمی مەرگیان درابوو.

من هەرگیز قەشەیەکم نەدیوە بیەوێ ڕێگا لەئیعدام کردنی کەسێ، یان بەرپا بوونی جەنگێ بگرێ.

– ڕۆژێ دێ کە ئیتر جەنگ نامێنێ.

– ئەمە قسەی قۆڕە. تەنانەت مارکسیزمیش نەیتوانی جەنگ لەناو بەرێ و ئەویش وەکوو گاورێتی جەنگ بۆ ئەوە بەکار دێنێ تا قبووڵی بکەن. هیچ دەستوور و هیچ فەلسەفەیەك نییە مەبەستی لەناو بردنی جەنگ بێ. لەدونیای ئەمڕۆ، تەنیا هیپپییەکان جەنگ ڕەت دەکەنەوە ، ئەوەتا جلی سەربازی و جل و بەرگی جەنگەکانی پێشوو دەکەن بە جل و بەرگ و باڵا پۆش.

زۆران بۆ کەمان مەڵێ، جەنگ هەر دەبێ هەبێ!

لێپرسراوی دەزگای هەواڵ، بەدەنگی وەك لای لایەی دەزگاکە، خەو بردوویەتییەوە. کاغەزە درێژەکەی ئامێری هەواڵ بە بەردەوامی دەسووڕێ و بەردەبێتەوە سەر زەوی و ئەم خۆ بەدەستەوەدانەمان بیر دەخاتەوە:

" ئەمریکییەکان تەپۆلکەی (٨٧٥)یان چۆڵ کرد... ئەمریکییەکان تەپۆلکەی (٨٧٥)یان چۆڵ کرد... ئەمریکییەکان تەپۆلکەی (٨٧٥)یان چۆڵ کرد " .





تەپۆلکەی (٨٧٥) بەلاش و حەلاش (١٥٨) کوژراو و برینداریکی زۆری دا. ئەویش لەخوت و خۆڕایی.جەنگ هەر دەبێ هەبێ.

(فلیکس) هات لەجێی (فرانسوا) دانیشت بۆ ئەوەی (فرانسوا) من بگەیەنێتەوە ئوتێل. کە ماڵاواییم کرد، گوتی: بڕیارە کەی چاوپێکەوتنی زیندانیانی فیت کۆنگ هەر وەکوو خۆیەتی و بەیانی دەچینە دیدەنییان.

<u>ڕۆژی یەکەمی کانوونی یەکەم</u>

روخسەتی چاوپێکەوتنمان وەرگرت. دەزانی ئەم فیت کۆنگە کێیە؟ ئەمە (نگوین وان سام)ە، ئەو کەسەیە کە پێش دوو ساڵ چێشتخانەی (میکان)ی تەقاندەوە. (مۆرۆلدۆ) زۆر شڵەژاوە. (مۆرۆلدۆ) لەکاتی تەقینەوەی چێشتخانەکە لە سایگۆن بووە و زۆر وێنەی دیمەنی تەقینەوەکەشی کێشاوە.

(مۆرۆلدۆ) گوتی:

– زۆر حەز دەکەم ڕوو بەڕوو تەماشای ئەو خوێڕییە بکەم.

(فرانسوا) وەڵامی دایەوە و گوتی: ئەم خوێڕییەش بەشەرە و دەبێ قبووڵی بکەین.

چیرۆکەکەشی!!؟... بۆ ئەوەی (نگوین وان تام) باشتر بناسین، کە بۆ زیندان دەچووین، (فرانسوا) لەڕێگا ئەم چیرۆکەی بۆ گێڕاینەوە:

سەر لەبەیانی ڕۆژێکی مانگی حوزێرانی رابردوو بوو، کابرایەکی سمێڵ بابڕ بە ماتۆڕ سایکل چووە باخی (گیانداران). چوو کابرایەك ببینێ و کە چاوی پێ کەوت، گوتی: (( من سبەی تەقەمەنیت بۆ دێنم و بۆ دوو سبەی هەموو شتێ ئامادە دەبێ. )) بەرێکەوت، سیخوڕێکی فەرمانگەی پۆلیس گوێی لەگفت و گۆی ئەم دووانە بوو و یەکسەر بە تەلەفۆن ئەم خەبەرەی بەسەرۆکەکەی ڕاگەیاند و هەر ئەو ڕۆژە پێش نیوەڕۆ کابرای سمێڵ بابڕ دەستگیر کرا. دەزانی ڤێتنامی سمێڵ بابڕ کەمە، بۆیە دۆزینەوەی کابرا ئاسان بوو. ئەو کابرایە ناوی (نگوین وان سام) بوو، تەمەنی بیست و شەش ساڵ بوو. پێنج سەعاتی لە مەچەکی دەستی بەستبوو، بۆ ئەوەی بوو هەر سەعاتێ لەسەر بۆمبایەك دابنێتەوە..

فیت کۆنگەکان خۆیان ئەم بۆمبایانە دروست دەکەن.

کە لەفەرمانگەی پۆلیس لێیان پرسی: "ئەم سەعاتانە چین؟" هیچ دەنگی نەکرد. بەدرێژایی شەو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا کرد. ئەشکەنجەیان دا، کارەبایان لە زەکەری داو مستیان لە دەم و چاوی دا، دەسماڵی تەڕیان بەسەر دەم و چاوی دادەدا، تا هەناسەبڕکێی پێ دەکەوت، بەڵام ئەو بێ دەنگ بوو، هیچ قسەی نەکرد. پۆلیسەکان نائومێدبوون و داوای یارمەتییان لە کاپتن (فام کان تان) کرد، کە سەرۆکی تایبەتی بەشی لێکۆڵینەوەی پۆلیس بوو.

کاپتن، بە فەرمان پێ کردنەوە، دەستووری دا:

" بیهێننە لای من! "

کە رۆژ هەڵات، بردیانە لای (فام کان تان). کاپتن پێی گوت:

– لەسەر ئەم کورسییە دانیشە.

ئەو هەر بەپێوە مایەوە و جووڵەی نەکرد.

کاپتن لێی پرسی:

– جگەرەت دەوێ؟

سەری دانەواند. بەهەر حاڵ، نەیدەتوانی جگەرە بکێشێ، چونکە لێوەکانی لە چەند برینێك زیاتر هیچیان پێوە نەمابوو، هەروەکوو دەم و چاو و لەشیشی لەگۆشتی ئەنجن ئەنجن کراو و خوێناوی هیچی تری پێوە نەمابوو.

– ئافەرین! ئاخیری ئەوە گیرای، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من رێزێکی تایبەتیم بۆ تۆ هەیە، لەبەر ئەوەی لەپایەی تۆ دەگەم، تۆ بەراستی قارەمانی.

ئەو هەر بەبێ دەنگی مایەوە.

– تۆ قارەمانی، منیش قارەمانم. ئێمە باش لەیەك دەگەین، هەر بۆیەش من ویستم خۆم لێکۆڵینەوەت لەگەڵدا بکەم.

ئەو هەر بێ دەنگ بوو. بەڵام کاپتن (فام کان تان) نائومێد نەبوو، هێشا وەختێکی زۆری لەپێش بوو بۆ لێکۆڵینەوە. تا ئەو کاتەی (نگوین وان تام) لێوی لێك دەکاتەوە و دان بە تاوانەکانی دەنێ، ئەو وەختی هەر هەیە.

پاش دوو رۆژ، سەعات دەی بەیانی بوو کە (نگوین وان تام) لێوی لێك بووەوە.

– ئێوە چ لەمن دەکەن؟





(کاپتن تام) دەستەکانی لێك کردەوە و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو گوتی: – حوکمی مردنت بەسەردا دەدرێ.

(نگوین وان تام) رووی کرایەوە و چاوی برووسکەی دا.

– یانی مەبەستت ئەوەیە دەمبەنە دادگاو ئینجا لەوێ حوکمی ئیعدامم بۆ دەردەکەن؟

کاپتن (تان) گوتی:

– ئۆی، نا بۆرە پیاو، تۆ وەکوو فیت کۆنگ ناکوژرێی. فڕێت دەدەنە بن پێچکەی لۆرییەکی ئەمریکی و ئەمەش بەجۆرێ دەکەن کە کەس ئاگای لە مەسەلەکە نەبێ. بێگومان بەمنی دەسپێرن رووداوێکی وات بۆ دروست بکەم. ماتۆڕ سایکلێکیش لە تەنیشت شوێنی رووداوەکە دادەنێم و بۆ سبەینێ رۆژنامەکان بە چەند دێڕێك دەنووسن: " نەناسراوێکی سوار ماتۆڕ خۆی لە لۆرییەك داو مرد، پۆلیس خەریکی لێکۆڵینەوەی رووداوەکەیە. "

(نگوین وان تام) هاواری کرد:

– نا؟

– کەواتە دەبێ ئیعتیراف بکەی.

– ئەگەر ئیعتیراف بکەم، دوای دادگایی کردن لەدادگا، گوللە بارانم دەکەن؟

– بەڵێ.

– باشە، مادام وایە ئامادەم ئیعتیراف بکەم.

ئیدی تا سەعات سێی بەیانی رۆژی پاشی، بەبێ وەستان لەسەر یەك قسەی کرد.

لە ئیعتیرافەکەیدا گوتی: بڕیارە سێ مین لە مەیدانی (ئازادی) دابنرێتەوە. مینێك لەژێر لاتەختێکی نزیك پەیکەری شەهیدان، یەکێ لەسەر سەکۆیەکی مەیدانەکە و یەکێکی تریش بە تەواوی لە باڵەخانەی (جوسپائو) چەسپ کراوە. بڕیارە دوو مینەکەی بەرایی بەرە بەری نیوەڕۆ بتەقنەوە، کە کارمەندانی (جوسپائو) بۆ فراوین باڵەخانەکە جێ دێڵن و مینی سێیەمیش چەند دەقیقەیەك دوای ئەوە، دەق ئەو کاتەی کە پۆلیس و ترومبێلی فریاگوزاری دەگەنە شوێنی

رووداوەکـە بـۆ ئـەوەی برینـدارەکان ببـەن. پلانەکـە دەقـاو دەق وەکـوو پلانـی تەقاندنەوەی چێشتخانەی (میکان) وابوو. پاشان پێی گوتن لە چ شوێنێ مینەکان کۆ بکەنەوە.

نـاوی هـەموو ئەنـدامانی دەسـتەکەی خۆیـانی داو لەوانـە نـاوی سـەرۆکی سەرەکیشی ئاشکرا کرد کە ئەوەنـدە جیاوازی لەگـەڵ نـاوی خـۆی نـەبوو. نـاوی (نگوین وان سام) بوو، ئەوەشی گوت کە دۆزینەوەی کارێکی هەر زۆر ئاسانە.

دەتوانن ئەو کاتە (نگوین وان سام) بدۆزنەوە کە بە نەشارەزایی سواری ماتۆڕ سـایکل دەبـێ و بـەردەوام خـۆی بـە دارو دیـوار و تـرومبێلان دادەدا. ئـیتر ئێـستا کاتی ئەوە بوو کاپتن (فان) کاتی خـۆی بـۆ دۆزینـەوەی (نگـوین وان سـام) تـەرخان بکا. دەیتوانی بەگرتنی (سام) ڕێگا لە زۆر تەقینەوە بگرێ لە (سایگۆن).

بـەڵام چـۆن؟ بێگومـان ئیشەکە نـەختێ کـات و سـەبر و پـشوودرێژی دەویـست، کـاپتن (تـان)یـش حەوسـەڵەیەکی زۆری ئـەم جـۆرە ئیـشانەی هەیـە. ئـەو تەپکـە دادەنێتەوە و چاوەڕێ دەکا.

کـاتێ کـە (نگوین وان سـام) بـۆ چاوپێکەوتنی (نگـوین وان تـام) چـووە شـوێنی دیاری کراو بۆ ئەوەی وردەکاری خراپەکاری و تەقاندنەوەکـەی بـۆ روون بکاتـەوە، نەختێ گومانی لەبارو دۆخەکە پەیدا کرد، بەڵام هیچ خۆی تێك نەدا.

چووە لای ژنەکەی کە تازە منداڵی لـەبار چوو بوو و کەوتبووە نەخۆشخانە و لەشـوێنێك شـاردبوویەوە. چـووە نەخۆشـخانە و بـە ژنەکـەی گـوت یەکـسەر بـچێتە حەشارگەی نهێنی دەستەکەیان و هەر لەو نەخۆشخانەیەش تەلەفۆنی بۆ یـەکێ لـە ئەفسەرەکان کرد کە زۆر جێگای متمانەی بوو. سواری ترومبێل بوو و بەرەو ماڵی خوشـکی کەوتـە رێ، لـە گونـدی (لـونگ ئـان) بـۆ ئـەوەی ماوەیـەك لـەوێ خـۆی بشارێتەوە. لـەرێگای مـاڵی خوشـکی بـوو کەتووشـی غەڵـەتێك بـوو. بیری کـردەوە ئەگـەر نەگەڕێتـەوە شـار، ئـەو تفاقـەی بـە زەحمـەتێکی زۆر کۆیـان کردۆتـەوە و لـە عـەمبار دایـان کـردووە، لەدەسـت دەچـێ. گەڕایـەوە (سـایگۆن)، چـووە شـەقامی (بیکۆك). پاش نیو سەعات بە دەستی بەستە لەبنکەی پۆلیس و لـە نووسینگەی کاپتن (تان) بوو. لەگەڵ (نگوین وان تام) روو بەروویان کردەوە.





– خائین! کەم و چرووك!!

تفێکیشی لەچارەی (نگوین وان تام) کرد.

کـاپتن (تـان) بەشـێنەیی بڕیـاری دا خائینەکە ببەنـەوە ژوورەکـەی بـۆ ئـەوەی بـە تەنیایی لەگەڵ نێچیرە تازەکەی بمێنێتەوە.

دەستەکانی (سام)ی کردەوە و داوای لێ کرد دابنیشێ و جگەرەیەکی پێشکەش کرد.

– ئافـەرین! هـەر چـەندە دەسـتگیریان کـردووی، بـەڵام مـن رێزێکـی زۆرم بـۆ تـۆ هەیە.

بێ دەنگی!

– تـۆ قارەمـانی، منـیش قارەمـانم، بۆیـە مـن و تـۆ بـاش لەیـەکتر دەگـەین و هـەر بۆیەش من ویستم خۆم لێکۆڵینەوەت لەگەڵدا بکەم.

– ئێمە بە هیچ جۆرێ لەیەك ناگەین و من هیچ ئیعتیرافێك ناکەم.

– ئاخیری هەر قسە دەکەی! قسە دەکەی!

– من لەمردن ناترسم. من خۆم دەمەوێ بمرم.

– ئاخیری دەمری! دەمری!

– ئێوە لە دادگا دادگاییم دەکەن و پاشان گوللە بارانم دەکەن؟

– نا، گیانە! لەسەر دادگا و دادگایی کردن حیسابی مەکە. هەر ئێستا بۆت باس دەکەم چ بەڵایەکت بەسەر دێنین.

ئینجا چیرۆکی لۆری بۆ باس کرد. بێگومان ئەم جارە بۆ ئـەوەی بگاتـە ئـەنجامی چیرۆکەکەی تەنانەت دوو رۆژیش چاوەڕێی نەکرد.

(نگوین وان سام) ئامادەبوو ئیعتیراف بکا بەو مەرجەی دادگایی بکەن.

دانـی بـە هـەموو شـتێکدا نـا. دە سـاڵ لـە (هـانۆی)، رێنماییـەکانی قوتابخانـەی خراپەکاری، بیست و نۆ تەقاندنەوەو خراپـەکاری لـە یـەکی ئـازاری (١٩٦٥)ەوە تـا دەی حوزەیرانی (١٩٦٧) و تەقاندنەوەی چێشتخانەی (میکان).

بە کوژرانی بیـست و پێـنج کـەس بەیـەك جـار و پـەنجاو هەشـت کوژراوو سـەدو نەوەدو نۆ بریندار لەماوەی دو ساڵ تاوانبار کرابوو.

– کاپتن (تان) دەزانی؟ زۆربەی وەخت، سەرۆکەکانم دەوری دە و هەندێ جار بیست تەقینەوە و خراپەکارییان بەیەك جار لەمن دەویست و پیاوەکانی تر توانای ئەم هەموو کارەیان نەبوو، ئیدی بە ناچاری ئەرك و قورسایی هەموو کارەکە دەکەوتە سەر شانی خۆم.

– تێ دەگەم، گیانە! ئاگام لێیە، تۆ بەردەوام بە!

– من قسەکانی خۆم دەکەم، بەڵام خۆ ئێوە قسەی خۆتان لەبیر نەکردووە؟ ئایا بەراستی دوای دادگایی کردن گوللە بارانم دەکەن؟

– قسەی من قسەیە، گیانە! شکی تێدا نییە تۆ گوللە باران دەکرێی.

دوای چەند دەقیقەیەك (فرانسوا) تەلەفۆنی بۆ کاپتن (تان) کرد و پرسیاری سەعاتی تەواوی چاوپێکەوتنی لێ کرد.

دووی کانوونی یەکەم

سەعاتی چاوپێکەوتنەکە بۆ شەو دیاری کرا. سەعات دەی شەو. یەك سەعات پێش دەست پێکردنی حکوومەتی سەربازی. کە تەکسییەکە گەیشتە بنکەی پۆلیس، هەشت پاسەوان بۆمان هاتن و دەرگاو هەموو کون و کەلەبەری تەکسییەکەیان پشکنی، بۆ چەکی قاچاغ و تەقەمەنی دەگەڕان.

لێخوڕەکە زۆر دەترسا، هاواری دەکرد. پاشان ئێمەیان هەرسێك ریز کرد.

من و (مۆرۆلدۆ)و دیلماجەکە. ئینجا لەژێر لوولەی تفەنگی سەربازانەوە چووینە ناو دۆزەخ.

دۆزەخەکە لە حەوشەیەك و ڕێڕەوێك و ئینجا چەند پایەیەك پێك هاتبوو کە دەچووەوە نووسینگەی کارکردنی کاپتن (تان).

کاپتن (تان) لەپشت مێزی کارکردنی چاوەڕوانی ئێمەی دەکرد.

تائێستا هیچ پیاوی ڤێتنامی وا کەڵەگەتم نەدیبوو، وەکوو بەرازێکی قەڵەو وابوو. دوو دەستی ئەستووری هەبوو، قژی وەکوو قژی ئەمریکییەکان چاك کردبوو. سەرم لە ئەدگاری ئەم پیاوە سوڕما، چونکە چاوەڕێی بینینی پیاوێکی کورتە باڵاو ساختەچی و توندو تیژم دەکرد. هەر دەتگوت سەراپای گیانی خەندەیەکی ساردە، کۆکەیەکی بەستەڵەکە! ئەم کۆکە بەستەڵەکە بە زەردەخەنە





فەرمووی بیرەو چای لێ کردین.

پاشان بۆی باسکردین کە تەمەنی سی و حەوت ساڵەو هەشت منداڵی هەیە و داهێنەری ڕێبازی دەروونناسییە لە لێکۆڵینەوەدا.

– نازانم، داخۆ دەتوانم بەجۆرێ مەبەستم دەببڕم کە ئێوە تێی بگەن، یان نا؟ ڤیت کۆنگەکان لەژێر ئەشکەنجەی جەستەییدا قسە ناکەن و ئیعتیراف ناکەن، چونکە لە ئەشکەنجەی جەستەیی ناترسن، بەڵام ئەشکەنجەی دەروونی هەمیشە وایان لێ دەکا قسەو ئیعتیراف بکەن، چونکە ئەمانە لادێی نەزانن و هیچی تر.

– کاپتن، بیرو ڕات لەبارەی دەروونناسی چییە؟

– ئەوەی من لە لێکۆڵینەوەی (نگوین وان تام)و (نگوین وان سام) پێی گەیشتم ئەوە بوو، ئەوانە هیچ لەمردن ناترسن، تەنیا ئەوەندە هەیە نایانەوێ بەشێوەیەکی کەس نەزانم بمرم، چونکە هەر هەموویان حەز دەکەن بەو پەڕی شانازی و بەسەر بڵندی بکوژرێن.

– کاپتن، ئەشکەنجە لای ئێوە چییە؟

– من هەمیشە ئەشکەنجەی پلە سێم پەسند کردووە، کە کارەبا لە زەکەر دان و هەناسە بڕکێیە بەدەسماڵی تەڕ کە ڕێگای هەناسەدان بە لووت و گوێ و دەم دەگرێ.

– ئێوە پەنا بۆ ئەشکەنجەی جەستەیش دەبەن؟

– تەنیا ئەو کاتەی کارەکە ناچاری بێ و پەلەی تێدابێ . وەکوو کاتێ خەبەرم بۆبێ تەقینەوە و خراپەکارییەك لەسەر جێ بە جێ کردنە، بەڵام شوێنەکەی نەزانم، جا بۆ زانینی جێگای خراپەکارییەکە....

– ئایا خۆیشتان لەکاتی ئەشکەنجەدان ئامادە دەبن؟

بەڵێ!

– کاپتن، ئایا قەت وابووە بەبینینی دیمەنی ئەشکەنجەدان هەست بە بەزەیی بکەن؟

– مەبەستتان لە بەزەیی چییە؟

– ئایا قەت... موتە ئەسیر بوونە؟

– موتە ئەسیر؟

ئینجا پێی گوتم کارەکەی خۆی زۆر بەلاوە خۆشەو ئیشەکەی زیاتر بۆ خۆشی و ڕابواردنە تا کارکردن. باسی کرد کە لەکاتی لێکۆڵینەوەی زیندانیان شەکەتی کاری ڕۆژانەی لەلەش دەردەچێ، بەتایبەتی ئەو کاتەی کە پێویستی بە ئەشکەنجەی جەستەیی نەبێ و تەنیا ئەشکەنجەی دەروونی لەئارادا بێ.

– دەزانی؟ زیندانییەکان، یان نیازی ڕاکردنیان هەیەو یان لەگەڵ یەکتر بەشەڕ دێن و لێك دەدەن. ئەم کارەی ئەوان شەکەت و ماندووم دەکا، بەڵام کاتێ نەرمی لە کارەکەدا بێ، ئیشەکە بەشێوەیەکی ئاسانتر دەڕوا " گیانە، ئەمڕۆ باشی؟ نەختێ ڕەنگت پەڕیوە " ، یان " دەتەوێ فراوین بخۆی؟ شیرو قاوەت بە نانی شیرین دەوێ "، یان " دەڵێی لاواز بووی، پێویستە نەختێ ڤیتامین بخۆی، ها، بگرە! ئەمانە حەبی تاقەتن. بەیانی دانەیەکی لێ بخۆ و شەویش دانەیەك. لەبیر نەکەی، ها! "

چەند شووشە حەبێکی لەسەر مێزەکەی داناوە و زۆر بڕوای بەوە هەیە کە تائێستا ئەم دەك و دەهۆیە سەرکەوتنی بەدەمەوە بووە.

– ئاه، بەڵێ! هەمیشە سەرکەوتوو بوویم، تەنیا یەك جار نەختێ بەزەحمەت توانیم سەرکەوتن بەدەست بێنم، کە لەمانگی مایسی ڕابردوو (هوین تی ئان)ی کچۆڵەی بیست و دوو ساڵەیان گرت و هێنایانە لام. دەزانی زۆر بەرێکەوت دەستگیریان کرد. لەماڵی خۆیانەوە خەریکی بۆمبا دروست کردن بوو، بۆمباکەی لەدەست تەقییەوە و گرتیان. شتێکی کەلەکبازە! دەبوایە لێی بگەڕێم بەبرینی تەقینەوەی بۆمباکە بمرێ. ئەوەندە بریندار ببوو، دەمرد، بەڵام لەباتی ئەوەی بەو حاڵە لێی گەڕێین، ڕەوانەی لای باشترین نەشتەرگەری شارمان کرد و ئەوانیش توانیان لە مەرگ نەجاتی بدەن. ئاخیری کچۆڵەکە ئیعتیرافی کرد، بەڵام بە ئەشکەنجەی دەروونی نا، بەڵکو بە ئەشکەنجەی سەختی جەستەیی.

بێگومان (تان) زۆر هەوڵی دابوو بە ئەشکەنجەی دەروونی بەقسەی بێنێ بەڵام هاوکارەکانی تری کچەیان خستە ژێر ئەشکەنجەی جەستەیی و ئیعتیرافیان لێ وەرگرت.





داوام لە کاپتن (تان) کرد ڕوخسەت بدا پێش ئەوەی چاوپێکەوتن و گفت و گۆ لەگەڵ (نگوین وان تام)و (نگوین وان سام) بکەم، چاوم بەو کچۆڵەیە بکەوێ.

کاپتن ڕازی بوو، دوای نەختێ دەرگا کرایەوە و دوو پۆلیس هاتنە ژوورەوە کچۆڵەیەکی پێ خواس و ڕەشپۆشیان گرتبووە بەینی خۆیانەوە. چاوی کچۆڵەکەیان بە پەڕۆیەکی ڕەش بەستبووەوە، ئەویش دەستی بۆ پێشەوە درێژ کردبوو بۆ ئەوەی زیاتر دڵنیا بێ خۆی بەشتێ دا نەدا.

کاپتن (تان) دەستووری دا:

– پەڕۆی لە چاوان بکەنەوە!!

پەڕۆیان لە چاوی کچۆڵەکە کردەوە. دەم و چاوێکی هێلکەیی ناسك و نازداری هەبوو، نەفرەت لە هەردوو چاوی دەباری. بە سەرنجی پڕ تووك و نەفرەت یەکەم جار سەیری کاپتنی کرد و پاشان تەماشای منی کرد و ئینجا ڕوانییە (مۆرۆلدۆ) دووبارە چاوی بڕییە کاپتن (تان).

کاپتن (تان) دەستووری پێ دا:

– دانیشە!

دانیشت. قاچەکانی خستە سەر یەك و دەستی بەدامەنییەوە گرت.

گران و سەنگین و جوان بوو، لەپاکیزەیەکی جوانی دەکرد کەوتبێتە داوی شێتێکەوە..

گۆناو چەنەگەو هەنیەی هەمووی برینی بۆمبا و ئەشکەنجەی پلە سێ بوو.

کاپتن (فام کان تان) گوتی:

– ئەم خانمە دەیەوێ قسەت لەگەڵ بکا.

کچە هیچ جووڵەی نەکرد، لە تەماشاکردنی کاپتن بەردەوام بوو.

تێ گەیشتی؟

کاپتن ئەم وشەیەی بەهاوار گوت.

کچە دیسان هیچ جووڵەی نەکرد، تەنانەت لێویشی لێك نەکردەوە، لەسەر تەماشاکردنی کاپتن بەردەوام بوو.

ئیشارەتێکم بۆ دیلماجەکە کرد و لەکچۆڵەکە نزیك کەوتمەوە.

– من هیچ پەیوەندی کارکردنم بە کاپتنەوە نییە، (هوین تی ئان)، من پەیامنێرم و هیچی تر. هاتووم چەند پرسیارێکت لێ بکەم.

دیلماجەکەم قسەکانی منی بۆ وەرگێڕا. کچە هەر لەسەر تەماشاکردنی کاپتن بەردەوام بوو، هیچ سەرنجی لەمن نەدا.

– دەزانم تۆ پێت وایە من دوژمنم، بەڵام (هوین تی ئان)، باوەڕت بێ من دوژمنی تۆ نیم. (هوین تی ئان)، پێویستە بڕوا بەقسەکانم بکەی.

(هوین تی ئان) بەهێواشی سەرنجی لەسەر کاپتن (تان) لابرد و بەبێ بایەخی سەیری منی کرد. ئینجا بەدەنگێکی نازك و زۆر کز دەستی بەقسە کرد:

– بڕوا بەقسەکانت دەکەم، بەڵام تۆ هەرکێ بیت، لەمن ناگەی.

– بەدی (هوین تی ئان)، من لەتۆ دەگەم، چونکە من ئەمریکی نیم. خەڵکی وڵاتێکم لەگەڵ وڵاتی تۆدا ناجەنگێ و دەمەوێ شتی چاك لەبارەی تۆوە بنووسم.

(هوین تی ئان) باوەڕ بەقسەکانم بکە!

– باوەڕ بەقسەکانت دەکەم، بەڵام نامەوێ تۆ شتی چاك لەبارەی منەوە بنووسی. نامەوێ وەکوو قارەمانێك ناوم بێنی. من ئیعتیرافم کردووە.

– (هوین تی ئان) بۆچی ئیعتیرافت کرد؟

– چونکە وەخت بوو لەژێر ئەو دەسماڵە تەڕە بخنکێم، چونکە لێیان دام و زۆرم ئێشا، چونکە ئینسانێکی کەمم. هیچی ترم لێ مەپرسە. من تەنیا قسە لەگەڵ ئەو کەسانە دەکەم کە ئەشکەنجەم دەدەن.

– خۆت شێت مەکە (هوین تی ئان)، بۆچی ناتەوێ تێ بگەی کە پێویستە خەڵکی دونیا بتناسن و پێویستە بزانن وڵاتەکەت پێویستی بە چ شتێکە!

ئەم روون کردنەوەی من هیچ سوودی نەبوو، تەنانەت سەرنجی بێ بایەخی گۆڕاو بوو بە سەرنجی سووکایەتی.

– پێویست ناکا خەڵکی دونیا من بناسن. تۆش ئەوەندە هەوەست بە وڵاتی من نایە. ئەوەی ئێستا بۆ تۆ گرنگ بێ ئەوەیە گفت و گۆیەك بۆ گۆڤارەکەت ساز بکەی و من بەپێویستی نازانم ناوی من لەگۆڤاری تۆدا بنووسرێ. تەنیا ئەوەندەم دەوێ لێرە دەربچم و دووبارە لە جەنگ هەڵبچمەوە.





– زۆر حەیفە (هوین تی ئان)، من دەمەویست یارمەتیت بدەم.

– تۆ تەنیا بەیەك شت دەتوانی یارمەتی من بدەی، ئەویش ئەوەیە لێرە دەرمبێنی. ئایا تۆ دەتوانی لێرە دەرمبێنی؟!

– نەء ، (هوین تی ئان)، ناتوانم!

– کەواتە تۆ بۆ من هیچ گرنگ نی. خواحافیز.

کچە قیت بووەوە و بەپێوە وەستا. کاپتن (تان) هاواری لەسەر کرد دابنیشێتەوە. کچە دووبارە دانیشتەوە. کاپتن (تان) پێی گوت: تۆ کچێکی بێ شعووری، بێ ئەدەب و روو قایمی!

کچە بەبێدەنگی گوێی دابووە قسەکانی کاپتن (تان)و بەچاوێکی پڕ نەفرەت تەماشای دەکرد. دووبارە پەڕۆیان لەچاوی بەست و بردیان. پێش ئەوەی لەدەرگا بچێتە دەرەوە، ئاوڕی لەمن دایەوە و گوتی:

– دەزانی؟ من داوای بوردنت لێ دەکەم.

نەمزانی چی وەڵام بدەمەوە.

مەیلەو شەرمەزار بووم. بەبێ دەنگی چاوەڕوانی (نگوین وان سام)ی تۆقێنەرم کرد.

(نگوین وان سام) هاتە ژوورەوە. کابرایەکی وردیلە بوو. پێ خواس و بەرگ رەش بوو. پەڕۆیەکی رەشییان لەچاو بەستبوو. شانەکانی باریك و دەستەکانی لەڕو بچکۆڵە بوون.

کە پەڕۆکەیان لەچاوی کردەوە. روخسارێکی لەڕو حەپەساو و دوو چاوی ئارام و غەمگینم لەپشت پەڕۆکەوە بینی. دەزانی چ بوو؟ چاوم بە چاوی کەوت و زەردەخەنەیەکی بۆ کردم. کە لەبەینی من و دیلماجەکەم دانیشت، دیسان هەر لە زەردەخەنەی خۆی بەردەوام بوو، بێ ئەوەی من بناسێ، هەر زوو هەستم کرد هەوەسم پێ دێ هەر چەندە دەشمزانی بۆتە هۆی مردنی (٥٨) کەس و بیست و نۆ خراپەکاری ئەنجام داوە. منیش... کە هیچم لەبارەی خراپەکاری نەدەزانی، تەنانەت ئەو کاتەی لەگەڵ نازییەکانیش دەجەنگام، وەڵامی زەردەخەنەکەیم دایەوە، رق و کینە گەرووی گرتبووم و ئەم رق و کینەیە تا کۆتایی گفت و

گۆکەمان هەر لە گەرووم مایەوە. سەیرم کرد بەرووی هەموو کەس و هەموو شتێ دەگرژێتەوە، بەرووی کاپتن (تان) و پۆلیسەکانی کاپتن (تان)و تەنانەت بەرووی ئەو مێشەی لەسەر قاچی نیشتبوو و ئەو مردنەی چاوەڕێی دەکرد دەگرژییەوە.

لە سەعات (دە)ی شەو تا (سێی) بەیانی قسەمان کرد.

گفتو گۆکەم تۆمار کردو وا  دەقی گفتوگۆکەتان وشە بەوشە بۆ دەنووسمەوە.

– (نگوین وان سام)، وەختەکەی درەنگە. لەخەو هەڵیانساندی؟

– نەء ، نەخەوتبووم. ژوورەکەم زۆر گەرمە. چاکەتم داکەندبوو، لەسەر حەسیر راکشابووم، بیرم دەکردەوە. دەزانی؟ زۆر جار وابووە لە گەرمان ناتوانم بیریش بکەمەوە. وەکوو کرمێکم لێ دێ لەناو ئارەقەی خۆی نقووم ببێ. باکم بە هیچ شتێ نامێنێ، تەنیا ئارەزووی یەك شت دەکەم: نەختێ هەوای تازە. هەندێ جاریش چاو دەبڕمە ساپیتەو بیر دەکەمەوە. دەزانی بیر لە چ دەکەمەوە؟ بیر لە کوڕەکەم و لە هاوکارەکانم دەکەمەوە. دوێنێ خەونم بینی کە لەناو جەنگەڵێك مردووم و جەنگەڵەکە پڕ درەختی نارگیل و ئەناناس بوو، هەوای وەکوو ئێرە تازەو پاك بوو، دەمتوانی بەچاکی هەناسە هەڵکێشم. ئێرە خۆشە، هەوای پاك و تازەیە.

– جگەرەت دەوێ (نگوین وان سام)؟

– بەڵێ، سوپاس. من زۆر حەزم لە جگەرە کێشانە. کە هەوا خۆش بێ ئارەزووی زۆر شت دەکەی، بۆ نموونە حەز دەکەی جگەرە بکێشی. لەژووری زیندانەکەم لێ ناگەڕێن جگەرە بکێشم. تەنانەت لێ ناگەڕێن کتێب و رۆژنامە بخوێنینەوە، یان قسە لەگەڵ کەس بکەین، بگرە ناتوانین پرسیار لەکەس بکەین داخۆ ئیعتیرافی کردووە یان نا؟ و ئەگەر ئیعتیرافی کردووە، بۆچی کردوویەتی. هەر چۆنێ بێ کەس لەژوورەکەی مندا نییە و من لەژوورەکەما نایەمە دەرەوە مەگەر کاپتن (تان) لەدووم بنێرێ.

– بێ دەنگییەکی کوشندەیە. دەڵێی لەناو گۆڕستانین. وەکوو مەرگی بێ سوود واین. دەزانی؟ من گوللە باران دەکرێم. من خەمی مردنم نییە. بەڵام لەبەر بێ سوودی و بەکەڵك چ نەهاتن نائومێد و ناڕەحەت دەبم.

– (نگوین وان سام)، پێویستە من خۆمت پێ بناسێنم. من پەیامنێرم و بۆ





نووسینەوەی ژیانی تۆ هاتوومەتە ئێرە، ئایا ناڕەحەت نابی؟

– بۆ دەبێ بەم ئیشەتان ناڕەحەت بم؟ من زۆر شتم گوتووە کە نەدەبوایە بیانڵێم و ئێستا ئیتر زۆر بەڕەحەتی دەتوانم باسی ژیانی خۆمت بۆ بکەم. بەڵێ، دەزانم تۆ پەیامنێری. رازیم. بەهەر حاڵ، ئێرە هەوای پاکەو جگەرەکانی تۆش دڵگرن. بەڵام ژیانی من شتێکی زۆر هیچەو نازانم داخۆ بەلای تۆوە شتێکی گرنگە یان نا؟ دەزانی من لادێیم و نازانم شتەکە باس بکەم. تەنیا دەتوانم پێت بڵێم: لە گوندی (بین دونگ) لەدایك بوویم کە سی کیلۆ مەتر لە (سایگۆن) دوورە. تەمەنم سی و شەش ساڵە. تا بۆ جەنگ بەکێش کرام هەر لەسەر زەوی باب و باپیرانم ئیشم دەکرد. سێ هەکتار زەویمان هەبوو. برنجمان دەچاند و ئاژەڵداریمان دەکرد. من گامێشم بەخێو دەکرد.

– خۆشیت لەو کارانە وەردەگرت، (نگوین وان سام)؟

– ئۆو، بەڵێ! جوان بوو، جوان بوو، چونکە ئازادی شتێکی جوانە. جوانە بتوانین هەروە دەر بین و بچینە ناو دەشت و جەنگەڵ. ئەگەر لێم بپرسی حەز دەکەم دووبارە چ ئیشێ بکەم، دەڵێم حەز دەکەم دووبارە ببمەوە لادێی و مریشك و گامێش بەخێو بکەم، باخێکی میوەم هەبێ، زۆر حەز دەکەم باخێکی میوەم هەبێ. لە هەمووی باشتر شینایيە. دەریاش جوانە! دەزانی؟ کاتێ بە کەشتی رەوانەی باکووریان کردم، دەریام بینی، کەناریشم بینی، چەند سپی و ئارام بوو. نەختێ لە دەریا دەترسام، چونکە درەختی تێدا نییە. دونیای بێ درەخت دونیا نییە. حەز دەکەم پێش ئەوەی بمرم ئاوابوونی رۆژ لەناو درەختان ببینم. دەزانی چ کاتێ دەڵێم، ئەو کاتەی رۆژ بەخڕی و سووری وەکوو قورمز دادەکشێتە خوارێ و لەپشت درەختانەوە بزر دەبێ، تەبارە گەنم سەوزە و گوڵە گەنم بەدەم کزەباوە کەروێشکە دەکەن.

– سام، بۆچی دەستت لە شینایی کردن هەڵگرت و بووی بە فیت کۆنگ؟ ئەم بەسەرهاتە چۆن چۆنی رووی دا؟

– باشە، من حەزم نەدەکرد بچمە قوتابخانە، وام پێ خۆش بوو لەناو قوڕو چڵپاو لەگەڵ گاو گۆتاڵەکانم یاری بکەم. بەڵام کە تەمەنم بوو بە شازدە ساڵی،

مامەم گوتی:

– " دەبێ بچیتە قوتابخانە "

ئیتر منی ناردە قوتابخانەیەکی (ڤیت مین). ئەو کاتە ئەو خۆی (ڤیت کۆنگ)بوو و لەگەڵ فرەنسییەکان دەجەنگا. پێی گوتم: (( دەبینی، دەرزت فێر دەکەن.))

مامەم خەزنەداری دەستە (ڤیت مین)ێك بوو. قوتابخانەکەمان راست کەوتبووە ناوەڕاستی دەشتێکی پڕ دڕوو. ئێمە لە قوتابخانەدا سی کوڕو دە کچ بووین. من هەر لە رۆژی یەکەمەوە، تاقەتم لە قوتابخانە چوو، چونکە دەرزی رێزمان و ژمارە و نووسەوەرییان پێ دەگوتین، بەلاّم کە فێری نووسین بووم، حەزم لە قوتابخانە کرد. دەزانی؟ دایکم فێری خوێندن و نووسینی نەکردبووم، نەك هەر تەنیا ئەو، بەڵکو کاکەم و دوو خوشکی بەمێردم و هیچ یەکێ لە ئەندامانی ماڵەوەمان سەوا دیان نەبوو، تەنیا باوکم دەیزانی کەمێ وشەی چینی بخوێنێتەوە. شەموان، دوای نیوەڕۆ مەشقی سەربازیمان دەکرد بۆ ئەوەی بچینە جەنگی فرەنسییەکان. ئێمەی گەنج بەریز دەوەستاین و بەپێ دەڕۆیشتین: " بۆ پێشەوە بڕۆن" " بۆ لای راستە راستە!"، بە چەکی دار مەشقی جەنگمان دەکرد و ئەمە ئەو رۆژگارەی بیر دەخستینەوە کە یاری جەنگ و دوژمنمان لەگەڵ منداڵان دەکرد.

– سام، تۆ زۆر رکت لە فرەنسییەکان دەبووەوە؟

– ئۆی، نا! لە پۆلی دەرزی سەربازیدا فێریان نەدەکردین رقمان لە فرەنسییەکان بێتەوە. دەرزی نیشتمانپەروەرییان پێ دەگوتین و پارێزگار (کانگ ترونگ) و پارێزگار (لەلوی)یان بە نموونە بۆ ئێمە دەهێنایەوە. ئەم دوو سولتانە توانیبوویان داگیرکەرانی چینی لە ولاّت وەدەر بنێن. بێگومان ئەم چیرۆکە سەدان ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە، بەلاّم چیرۆکێکی خۆشە و ئەمە یەکەم جار بوو باسی نیشتمانیان بۆ دەکردم. پێش ئەوە من نەمدەزانی نیشتمانم هەیە، یانی هەر نەمدەزانی نیشتمان مانای چییە؟ تێدەگەی چ دەڵێم؟

– سام، ئایا ئێستا دەزانی نیشتمان مانای چییە؟

– نیشتمان وەکوو دایکمان وایە. بە هەموو گیانی خۆمانەوە قبووڵمانە و تاپێمان بکرێ لێ ناگەڕێین بمرێ. نیشتمان وەکوو زنجەکەتە، ئەگەر یەکێ بیەوێ





بەزۆر لێتی بسەنێ، دەبێ تا مردن لەگەڵی بجەنگی، جا ئەو کەسە هەر کەسێ بێ: روسی، چینی، فرەنسی، ئەمریکی...

سێ ساڵ لەم قوتابخانەیە مامەوە، ئەوسا توانیم بچمە قوتابخانەیەکی تر. ساڵی یەك مانگ پشوومان هەبوو، من ئەم مانگە دەچوومەوە لای دایبابم.

ساڵی (١٩٥٢)، تاقی کردنەوەی بەرگریم کردو چوومە ناو دەستەی (٣٠٩)و بۆ دواجار چوومەوە ماڵێ. تەنیا یەك رۆژ لە ماڵی خۆمان مامەوە و لەو ماوەیەدا دایکم هەمیشە هەر دەگریاو دەیگوت: کوڕم دەزانم ناتبینمەوە!

بەراستیش جارێکی تر نەمدیتەوە. بەلاّم ئەو رۆژە، دایکم لەسەر شەرەفی من مراوییەك و سێ مریشکی سەربڕی و زیافەتێکی گەورەی کرد. ئەو رۆژە زۆرمان خوارد.

– سام، ئایا لەبیرتە کە یەکەم جار چوویتە جەنگ؟

– ئۆی! کە لەدایکم جیا بوومەوە، یەکسەر چوومە جەنگ. ساڵی (١٩٥٢) بوو. دەستەکەی ئێمە لەو جەنگەدا سێ کوژراوو شەش بریندار دا. من بەچاوی خۆم کوژراوەکانم دی و بەدەستی خۆم سەعاتم لە مەچەکیان کردەوە. ئاخر دەزانی؟ من نەدەبوو لەو شەڕەدا بجەنگم، چونکە لەو شەڕەدا ئیشی من سەعات لەدەست کردنەوە و کۆکردنەوەی چەکی کوژراوەکان بوو.

لەو شەڕەدا فرەنسیش زۆر کوژران. بەراستی شتێکی ترسناك بوو.

دەزانی، کاتێ کە ئەوانی دی دەجەنگان، من زۆر نەدەترسام، چونکە کەڕەناچییەکان بەردەوام کەڕەنایان لێ دەداو ئێمە زۆر وروژابووین، بەلاّم کاتێ کە جەنگ تەواو بوو و دەنگی کەڕەنا بڕاو من خۆم بەرامبەر ئەم هەموو مردووانە بینی، قسەی دایکمم بیر کەوتەوە کە دەیگوت: مردوو بە شەو زیندوو دەبنەوە و لاقمان رادەکێشن و دەمانبەنە دونیای خۆیان. کە ئەم قسانەم بیر دەکەوتەوە، مووچڕکم پێدا دەهات و سامم لێ دەنیشت. ئینجا شەو داهات و بۆ مەرگی هاوڕێکانم گریام. ئینجا بیرم لەو شتانە کردەوە کە لەکاتی جەنگدا ماوەم نەبوو بیریان لێ بکەمەوە. پرسیارم لەخۆم دەکرد: پیاو بۆ دەبێ خۆی بەکوشتن بدا؟

– باشە، (سام)، هیچ وەلاّمت دەستگیر بوو؟

– نەخێر، هیچ وەڵامێکم بۆ پرسیارەکەم دەست نەکەوت.

– باشە.

– ئیدی بیرم لێ نەکردەوە. رۆژگار هات و چوو، منیش لە بینینی مردوان راهاتم. لەزۆر شتی تریش راهاتم. بۆ نموونە: لەبرسی بوون، لە رۆیشتنی بە پێ خاوسی، لە نووستنی بەر باران و ئازار خواردن. ئێمە زۆر ئەزیەتمان دەخوارد. تەنانەت ئەو کاتانەی کە سەلامەتیش بووین، هەر ئازارمان دەکێشا. بۆ نموونە، دوای هەموو شەڕێك، فەرماندە داوای لێ دەکردین بۆ لەبیرکردنی مردووەکان سەماو هەڵپەڕکێ بکەین و گۆرانی بڵێین.

کاتی خۆشی ترمان ئەو ساتە بوو کە لادێییەکان مراوی زل و قەڵەویان پێ دەداین، هەروەها ئەو ساتەبوو کە بۆ یارمەتی دەچووووینە ماڵی خەڵك و بۆ ماسی گرتن لەدەم رووبار دەوەستاین و بیرمان لە سەردەمی ئاشتی دەکردەوە، تەنانەت ئەگەر نەشمانتوانیایە بیر لەو ئاشتییە بکەینەوە کە هەرگیز نەماندی و نەمانناسی. دەزانی، من لە جەنگ بەولاوە هیچ شتی ترم نەدیوە. بەڵام من پێم وایە کە ئاشتی ئەوکاتەیە کە ئیتر مردن نەبێ و وڵاتەکەم بەرەو پێش بچێ و خەڵك شادو بە کەیف بن و منیش زەماوەند لەگەڵ کچێکی جوان بکەم!

– (سام)، تۆ پێشتر ناسیاویت لەگەڵ کچی جوان بووە؟

– نا.

– (سام)، کەی بۆ یەکەم جار لەژیانتا کچێکی جوانت ناسی؟

زۆر باش لەبیرمە.!

لەو لەحزەیە رووی سوور هەڵگەڕاو دەستی بەرووییەوە گرت. ئینجا دەستی هێنایە خوارێ و ئاوڕی لە لای کاپتن (تان) دایەوە، دەتگوت دوای یارمەتی لێ دەکا، بەڵام کاپتن (تان) گوتی:

– باشە، دە وەڵامی بدەوە. پێی بڵێ کەی بوو کە بۆ یەکەم جار کچێکت ناسی.

– باشە... من تەمەنم بیست و سێ ساڵ بوو... کە یەکەم کچم ناسی... یانی ماوەیەك بوو لە جەنگدا بووم. بەڵام ئەگەر وابڵێم راست نییە. ئەو هی من بوو، چونکە خۆشم دەویست، چونکە دەمەویست زەماوەندی لەگەڵ بکەم، بەخەیاڵم دا





نەدەهات لەگەڵی رابوێرم. کاپتن (تان) ئێمە دەبێ رێزی ئافرەت بگرین چونکە ئەوانیش شان بەشانی ئێمە دەجەنگن. چەندین سەدەیە بەچاکی حیسابمان بۆ نەکردوون، بە چاوێکی وا سەیرمان کردوون، نەمزانیوە ئەوانیش تەواو لەگەڵ پیاوان یەکسانن. دیسان قسەت لەبارەی ئەم کچەوە بۆ دەکەم. ئەو کاتە ناسیم کە دەستەکەمان لە بەشی (چوگی)، لەپارێزگای (نیتۆ) گیرسایەوە.

ئەو رۆژە دووی شوباتی (١٩٥٤)بوو، من لەگەڵ یەکەم سەرنج خۆشم ویست، چونکە هەم کچێکی جوان بوو، هەم کچێکی چاکیش بوو. تا ئەو رۆژە کچی وا جوانم نەدی بوو. بڕیار بوو لە کانوونی یەکەم زەماوەند بکەین، بەڵام لە تەمووز کۆنفرانسی (جنێف) کراو منیان رەوانەی باکوور کرد. پێم گوت: (چاوەڕێم بکە، زۆر درێژە ناکێشێ.) بەڵام ئەم چاوەڕوانییە دە ساڵی رەبەقی خایاند، دە ساڵ، تێ دەگەی؟ لەو دە ساڵەدا هەر بە وەفاداری مامەوە بەرامبەری، سەیری هیچ کچێکم نەکرد، هیچ کچێك! کە گەڕامەوە دەق وەکوو رۆژی یەکەم خۆشم دەویست.

– ئایا پێویستی دەکرد جێی بێڵی و بیچیتە جەنگ؟

– پێویستی نەدەکرد. بەزۆر بوو. دەستوور وابوو بگەڕێینەوە (هانۆی).

دەزانی کە گەڕامەوە (هانۆی) بۆچی رێنماییەکانی خراپەکاریم بۆ خوێندن هەڵبژارد؟ چونکە ئەمە تاکە رێگایەك بوو دەمتوانی پێی بگەڕێمەوە باشوور و لەگەڵ ئەو کچەی خۆشم دەویست زەماوەند بکەم. دەزانی دەرزەکان زۆر ناخۆش بوون. تەواو وەکوو دەرزی قوتابخانە وابوون. ئەگەر بکەوتبای دەبوایە دووبارە دەرزەکە بخوێنی. چۆنیەتی مین دانانەوە و بەکارهێنانی نیترۆ گلیسرین و تەقاندنەوەی بەندەر و فڕۆکەخانە و شاریان پێ دەگوتین. بەراستی ئیشێکی سەخت بوو. بێگومان من لەبەر ئەوە نارەحەت نەبووم کە دەچووینە باکوور، نا، چونکە برنج دووبارە چووزەرەی دابوو و زەوی خاوەن موڵکەکان بەسەر هەژاراندا دابەش کرابوو و منیش کرێیەکی باشم لەئیشەکەم وەردەگرت. بیری لێ بکەوە، مانگێ سەد و بیست و پێنج روپیەو هەفتەی کیلۆ گۆشتێك. دەمتوانی بەو پارەیە زەماوەند لەگەڵ کچە گراوییەکەم بکەم. من هەمیشە تەنیا بووم. ئەوانەی لە باشوورەوە هاتبوون ژمارەیان زۆر نەبوو، منداڵەکانی باکووریش زۆر گاڵتەیان

لەگەڵ نەدەکردین. بیری لێ بکەوە، تەنانەت روخسەتیشیان نەدەداین زەماوەند لەگەڵ کچی باکوور بکەین و لەم بارودۆخەدا من ئەگەر بشمویستایە خیانەت لەگەڵ دەزگیرانەکەم بکەم، بۆم مەیسەر نەدەبوو.

– ئۆی! چ سوکناییەك بوو کەساڵی (١٩٦٤) بۆ خراپەکاری رەوانەی باشووریان کردم.

– دەزگیرانەکەی خۆت بینی؟

– نا، بەسەر رووداوێکی دڵتەزێن دا کەوتم. بۆم نووسی کە گەڕاومەتەوە و دەمەوێ زەماوەندی لەگەڵ بکەم، وەڵامی دامەوە کە چەند ساڵە شووی کردووە و دوو منداڵیشی هەیە.

– زۆر نارەحەت بووی، (سام)؟

– زۆر! من دەزانم ئەو ئەمەی لەنیاز خراپی نەکردبوو. تێ دەگەی؟ لەوانەیە وای بۆ چووبێ کە من مردووم. بۆیشی هەیە دایبابی لەبەر گوێیان خوێندبێ کە من لادێیم و ئەو بەرگدرووە. تێ دەگەی؟ هەر چۆنێ بێ، نەمویست ئیتر چاوم پێ بکەوێ.

– زەماوەندت لەگەڵ یەکێکی تر کرد؟

– نا، زۆر کارم لەپێش بوو دەبوایە رایانپەڕێنم. دەبوایە زۆر باش فێری نەخشەی شاری (سایگۆن) بم و باش شارەزای کووچەو کۆڵانەکان بم. دەبوایە ئەوانی تر فێر بکەم چۆن بۆمبای تەوقیت دابنێنەوە و چۆن ئیشیان پێ بکەن. دەبوایە خۆمان بۆ خراپەکاری ئامادە بکەین. هەر چۆنێ بێ، بڕیارم لەگەڵ خۆم دا تازە هەرگیز زەماوەند نەکەم، تا ئەو کاتەی کە گەڕامەوە (کوچی) بۆ لای دەستەکەمان، هەر لەسەر قسەی خۆم مامەوە.

– (سام)، باسی ئەو ژنەم بۆ بکە کە زەماوەندت لەگەڵ کرد؟

– کچێکی دەستەکەی خۆم بوو. وەکوو خۆم جەنگاوەر بوو. بەڵام شتێ هەیە دەبێ لەپێشەوە بۆت باس بکەم. لە دەستەکانی ئێمە بەزۆری یەك ژن بەرامبەر پێنج پیاو دەوەستێ.

ڕێیان نەدەداین لەگەڵیان جووت ببین مەگەر زەماوەندیان لەگەڵ بکەین. تەنانەت





ڕێیان نەدەداین بۆ گەڕان لەگەڵیان بچینە ناو جەنگەڵ، مەگەر ئەو کاتەی بۆ دیاری کردنی ڕێ و شوێنی دوژمن دەچووین. ئەم کچە بۆ دەوریە و دێدەوانی هەمیشە لەگەڵ من دەهات. من بەخەیاڵمدا نەدەهات هەر دەستیشی لێ بدەم. رۆژێ بە دەورییە دەرچووین بۆ یەکەم جار بەچاکی تەماشام کرد و بەو تەماشا کردنە شادییەکی سەیرم بەسەردا هات و لەو کاتەدا هەستم کرد ئیتر بیر لەو کەسانە نەکەمەوە کە خیانەتیان لەگەڵ کردووم و ئیتر هەموو شتێ بۆ من وەکوو یەك وایە. بیرم کردەوە ئەمە سەد جار لەوانی دی باشترە. لەپڕ هاوارم کرد و پێم گوت:

– ئەرێ پێم بڵێ بزانم مێردم پێ دەکەی؟

– وەڵامی دامەوە و گوتی:

– بەڵێ، سوپاست دەکەم.

ئینجا گەڕاینەوە ئۆردووگا کەمان و بە فەرماندەکەمان گوت بڕیارمان داوە زەماوەند بکەین. ئەویش روخسەتی زەماوەندی داین.

من ناتوانم سەرو سیمای ژنەکەمت بۆ باس بکەم. یەك ساڵ لەمن بچووکترە و لەمن کەڵەگەتتر و قەڵەو ترە. رووی خڕو پێستەی ئەسمەرەو کچێکی زۆر جوان نییە، تەنیا ئەوەندەی جوانە دوو چاوی شادو خەندانی هەیە. بەڵام کچێکی ناسك و زۆر میهرەبانە، خاتوونە و لەشەڕدا ئازاو دلێرە. خۆشم دەوێ چونکە خۆشی دەوێم، خۆشم دەوێ چونکە کوڕێکم لێ هەیە و خۆشم دەوێ چونکە وڵاتی خۆی خۆش دەوێ، چونکە وەکوو من هیچ خێر و خۆشی لەژیانی خۆی نەدیوە.

– (سام)، باسی زەماوەندی خۆتم بۆ بکە!

– ئێمە لە حەشارگەی نهێنی خۆمان زەماوەندمان کرد. لەناو زنجێکی لادێی کە کەوتبووە ناو لێرێکی دار (هوئا). یەکی مانگی مایس بوو، فەرمانده مارەیی بڕین. ڕێو رەسمەکە زۆر بەخێرایی و زۆر بە سادەیی بەڕێوە چوو.

گوتارەکەی بەم جۆرە دا: " من ژن و مێردایەتی ئێوە رادەگەیەنم. "

پاشان کاغەزەکانمان مۆر کردو ئاهەنگێکی خنجیلانەمان کرد. ژنەکەم جلی سەربازی داکەند و جلی تایبەتی بووکێنی کردە بەر: پانتۆڵێکی ئاوریشمی رەش و چاکەتێکی سپی لە قوماشی پانتۆڵەکە، بەڵام من بەبەرگی سەربازی بووم،

بێگومان جلکەکە پاك و ئوتوو کراو بوو. چەند دیارییەکیشمان لەبرادەرانەوە بۆ هات: جگەرە و شیرینی و دەسماڵی گوڵچین و کارتی پیرۆزبایی.

بەڵام هەر ئەو شەوە شەڕێکمان لەپێش بوو، دەبوایە من و ژنەکەم بچینە شەڕ، گوایە ئەو شەوە شەوی دەست پێکردنی مانگی هەنگوینیمان بوو! ژیانێکی خۆش نەبوو، بەڵام هەرچی بوو خۆمان هەڵمانبژاردبوو. دەزانی تا کوڕەکەمان لەدایك نەبوو، ئێمە هیچ ماڵمان نەبوو؟

– سام باسی کوڕەکەتم بۆ بکە.

– ئۆی! کاتێ کە ژنەکەم دووگیان بوو، زۆربەی برادەرانمان دەیانگوت:

لە دونیایەکی ئاوها دڕندانەو گەلۆرانە، هێنانە دونیای منداڵ بەکەڵك چ دێ؟

منیش وەڵامم دەدانەوە:

– بۆ ئەوەیە منداڵەکەم ژیانی لەژیانی من باشتر بێ. بۆ ئەوەیە ئەو لە ڤێتنامێکی ئازاددا بژی، بۆ ئەوەیە چونکە پاش تەواو بوونی جەنگ دەبێ منداڵ بێنە دونیا بۆ ئەوەی بتوانن سوود لە بەری ڕەنج و دەردەسەری ئێمە وەربگرن.

کاتێ کە کوڕەکەم هاتە دونیا، ئەوەندە کەیفخۆش بووم لە خەنی خۆشییان گریام. دەزانن من قەت ناگریم. تەنانەت کاتێ کە لەباکوور بووم و خەبەریان دامێ دایکم مردووە، نەگریام، یان کاتێ کە گەڕامەوە باشوور و پێیان گوتم باوکم مردووە، نەگریام. بەڵام کاتێ کە کووڕەکەم لەدایك بوو، گریام.

– (سام) ئێستا کوڕەکەت لەکوێیە؟

– نازانم، لەگەڵ ژنەکەمدا لە حەشارگەی نهێنین. حەشارگەی نهێنیش هەمیشە شوێنەکەی دەگۆڕێ بۆ ئەوەی دوژمن نەیاندۆزێتەوە. بەهەر حاڵ، کەڵکی چییە بزانم لەکوێیە؟ تازە ئیتر چاوم پێ ناکەوێتەوە. وای چەند حەز دەکەم بیبینم و بیلاوێنمەوە. حەز دەکەم ئەویش بەو هەستەی من بزانێ، حەز دەکەم نووسینەکانی تۆ بخوێنێتەوەو بزانێ چاوەڕێی چی لێ دەکەم. حەز دەکەم ئاقڵ دەربچێ و ئەو شتانەی من نەمخوێندوون و فێریان نەبووم، ئەو بیانخوێنێ و فێریان ببێ. دەزانی؟ حەز دەکەم کوڕەکەم ببێ بەفڕۆکەوان، بەڵام فڕۆکەوانی جەنگی نا، بەڵکو ئەو فڕۆکەوانەی فڕۆکەی ئاسایی داژوا. بەمن بێ ئەو شتانەی





بەسەر من هاتوون، هەرگیز بەسەر ئەو نەیەن، هەرگیز ناچار نەبێ خەڵك بکوژێ، یان خۆی بکوژرێ و بمرێ بێ ئەوەی بۆ دواجار کوڕەکەی لەباوەش بکات و ماچی بکات. ئای چەند خەمی بۆ دەخۆم. دەزانی؟ لە هەموو شتێ زیاتر خەمی بۆ دەخۆم، تەنانەت لە (ئازادی)ش زیاتر خەم بۆ ئەو دەخۆم.

کاپتن (تان) بەهێمنی دانیشتبوو بە کاغەزەکانی دا دەچووەوە، ئەو کاتە تەماشای کردین و قەڵەمەکەی لەسەر مێز دانا و هەر بەو دەمە ساردەی زەردەخەنەیەکی کرد و بە (نگوین وان سام)ی گوت: من زۆر باش دەزانم ژن و کوڕەکەت لەکوێن و هەر کاتێ بمەوێ دەتوانم دەستگیریان بکەم و لەوانەیە بەم زوانە ناچاربم دەستگیریان بکەم.

نگوین وان سام جگەرەیەکی هەڵگرت و دایگیرساند، ڕەنگە بۆ ئەوەی بووبێ تا ئارام بێتەوە، یان دەشێ بۆ ئەوەی بووبێ تا بەری فرمێسکی بگرێ، نازانم.

لەپڕ جگەرەکەی فڕێ داو دەستی بەدەم و چاوییەوە گرت و لەسەرەخۆ گوتی:

– نا... نا...

ئینجا دەستێکی بۆ قژی بردو پەنجەکانی بەناو قژی دا هێناو چۆکی دەلەرزی، دەستەکەی تری توند بەچۆکییەوە گرت بۆ ئەوەی لەرزینەکەی رابگرێ.

دەم و چاوی سپی سپی هەڵگەڕابوو و لێوی هێشتا زەردەخەنەی بەسەرەوە بوو.

من تووڕە بووم و بەسەر کاپتن (تان)دا قیژاندم بۆ ئەوەی بەس بکا. تەنانەت وابزانم مستێکی توندیشم لەمێزەکە دا. کاپتن (تان) گوتی گوایە من زۆر هەست ناسکم ، بۆیەش ئەم کارەم بە هەند وەرناگرێ چونکە ژەنەراڵ (لۆن) رایسپاردووە ئاگادارم بێ.

پاشان (سام)ی ئیزن داو بە منی گوت دەشێ شەوێکی تر بۆ تەواو کردنی گفت و گۆکە چاوم پێ بکەوێ. (سام)ڕۆیشت و لەبەر ئەوەی چاویان بە پەڕۆیەکی ڕەش بەستبووەوە، بە ڕاڕایی هەنگاوی دەنا.

<u>(٣)ی كانوونی یەكەم</u>

مۆرۆلدۆ گوتی:

– بەڵام تۆ هیچ پرسیارت لەبارەی تەقاندنەوەی (میكان) لێ نەكرد؟

– نا، پرسیارم لێ نەكرد. نازانم چ شتێ وای كرد ئەم پرسیارەی لێ نەكەم. كەبیرم كردەوە دووبارە چاوم پێ دەكەوێتەوە، موچڕكم پێداهات.

ڕەنگە لەبەر ئەوە بێ (فرانسوا) پێی گوتبووم لەوانەی لە ڕووداوەكەی (میكان) كوژران، چوار كەسی دەناسی. لەوانە دوویان فلیپینی بوون، لەرادیۆ ئیشیان دەكرد و دووەكەی تر ژن و مێردێكی فەرەنسی بوون، لە نەخۆشخانەی (گرال) ئیشیان دەكرد. فلیپینییەكان بڕیار بوو هەر ئەو شەوە سواری فڕۆكە بن و لە (سایگۆن) بڕۆن، بەڵام فڕۆكەكەیان دوا كەوت و ناچار بوون ئەو شەوەش لە (سایگۆن) بمێننەوە.

ژن و مێردە فەرەنسییەكە، پێش نزیكەی مانگێك بەخۆو بە منداڵەكانیانەوە هاتبوونە (سایگۆن)و زۆریش دەترسان، بەتایبەتی ژنە فەرەنسییەكە زۆر لەو ئاژاوەو تەقینەوە و خراپەكارییانە دەترسا كە ڕۆژانە لە (سایگۆن) روویان دەدا.

مێردەكەی ئەفسەر بوو و بۆ بەڕێوەبردنی كاروباری نەخۆشخانە گوازرابووەوە بۆ (سایگۆن)و ئەویش بە سووربوونەوە داوای لە ژنەكەی كردبوو ئەو شەوە بەشداری ئەو ئاهەنگە بكا كە كارمەندە ڤێتنامییەكانی نەخۆشخانەكە لەسەر شەرەفی ئەوان سازیان دابوو.

یەكەمین بۆمبای كلیمۆری (نگوین وان سام) بەمێزەكانی ریزی پێشەوەی چێشتخانەكە كەوت و دانیشتووەكانی سەر ئەو مێزانەی بریندار كرد، بێ ئەوەی پێیان بكەوێ. ئەوانیش لەترسان هەستان و هەر رایان كرد بۆ ئەو ڕێڕەوەی (میكان)ی بە كەناری ئاوو وشكاتی دەبەستەوە، نازانم پێم گوتن یان نا كە (میكان) چێشتخانەیەكە كەوتۆتە ناو ئاوی رووبار؟

ئەوان تازە گەیشتبوونە ڕێڕەوەكە، كە كلیمۆری دووەم راستەوخۆ لەوێ تەقییەوە و ژنە فەرەنسییەكە یەكەم كەس بوو كوژرا. بەكۆمەڵە ساچمەیەكی زۆر پارچە پارچە بوو. (نگوین وان سام) خۆی كلیمۆرەكانی دروست كرد بوو ناوی پڕ





ساچمە كردبوون. ئەو ساچمانەی بە كاری هێنابوون لەو جۆرە ئاسنانە بوون كە لەكۆنكرێتی ئاسنین بەكار دێن و بە حەوسەڵەیەكی زۆرەوە كردبووی بە پارچە ساچمەی یەك دوو سانتیمەتری.

(مۆرۆلدۆ) دووبارە گوتی:

– بەڵام تۆ لەبارەی تەقاندنەوەی (میكان) هیچ پرسیارت لێ نەكرد؟

(فرانسوا)ش گوتی:

– پرسیاری لێ بكە داخۆ دوای ئەوەی ئەو خەڵكەی لە (میكان) كوشت، هەستی بە چی كردووە؟

– بەڵێ، بێگومان دەبێ ئەم پرسیارەی هەر لێ بكەم.

<u>(٤)ی كانوونی یەكەم</u>

دوێ شەو دیسان چاوم پێ كەوت. ئەم جارە كاتی چاوپێكەوتنەكە نیوە شەو بوو.

كاپتن (تان) بیرەیەكی بۆ بانگ كردم و دوای چەند دەقیقەیەك (نگوین وان سام) هاتە ژوورەوە. كە پەڕۆیان لەچاوی كردەوە و توانی بمبینێ، وای بۆ چووم، شادو خۆشحاڵ بوو. یەكسەر دەستی تامەزرۆی بۆ لای من درێژ كرد بۆ ئەوەی جگەرەیەكی بدەمێ. پاكەتە جگەرەكەمم هەموو دایێ و لەبەر ئەوەی ڕێیان پێ نەدەدا بیباتە ژوورەكەی خۆی، بەو دوو سەعاتەی لای من بوو، هەموو جگەرەكەی كێشا.

ئەمەش قسەكانی ئەو شەوەمان، تۆمارم كردووە:

– (سام)، دەمەوێ باسی تەقاندنەوەی (میكان)م بۆ بكەی. حەز دەكەم بۆم باس بكەی، كاتێ ئەم هەموو خەڵكەت لەوێ كوشت و بریندار كرد، هەستت بەچی كرد؟

ڕەنگی سوور هەڵگەڕا، بەڵام هەر زوو دەسەڵاتی بەسەر خۆی دا گرت و گوتی:

– هەستم كرد... فڕۆكەوانێكی ئەمریكی كە بۆمبا بەسەر گوندێكی ڤێتنامی دەستە پاچەدا بەردەداتەوە هەست بەچی دەكا، منیش هەستم بەو شتە كرد. جیاوازیمان تەنیا ئەوەیە، ئەو لەسەرڕا بۆمبا فڕێ دەدا و نابینێ چ بەسەر ئەو

خەڵکە دێنیٚ، کەچی من دیتم چیم کردووە. خەڵکەکە بە سەختی شەق و پیل ببوون و کەوتبوونە سەر زەوی:

ژن و پیاوو منداڵ. تەواو وەکوو تەواو بوونی شەڕ وابوو کە مردوو بەسەر زەویدا بڵاو دەبنەوە. چاوی خۆم نوقاند. باوەڕم نەدەکرد من بە تەنیا ئەو هەموو کارەم کردووە. دەزانی؟ تەقاندنەوەی (میکان) یەکەمین کردەوەی من بوو.

– ئینجا؟

– ئینجا هەموو شتیٚ بڕایەوە، ئینجا بیرم لە برادەرە کوژراوەکانم کردەوە. لەهاوڕێکانم کە ئەشکەنجە درابوون، لەو ڤیت کۆنگانەی ڤێتنامییە باشوورییەکان سەریان بڕیبوون و ... و ... لەزاریان نابوو. کەبیرم لەم شتانە کردەوە، دووبارە زاتم هاتەوە بەر، چونکە هەر کاتیٚ  گومان لە دروستیی کارەکانمان پەیدا بکەین، دەبیٚ دووبارە بیر لەم شتانە بکەینەوە بۆ ئەوەی دووبارە زاتمان بێتەوە بەر.

ئەرکی سەرەکی من ئەوەبوو لەگەڵ ئەمریکییەکان و هاوکارەکانیان بجەنگم. بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستەش، بە ناچاری مرۆڤی بیٚ گوناهیش دەکوژران. لەم رووداوانەدا، چەند بێگوناهێك هەر بەردەکەویٚ و دەکوژریٚ. تۆ دەبیٚ بزانی دەستڕێژی گوللەو بۆمبا فڕێدان لەفڕۆکەوە و دانانەوەی چەند مینێك لە چێشتخانەیەك کە خەڵك خواردنی لیٚ دەخۆن، هەمووی وەکوو یەك وان و هەمووشیان لەیەك گەلۆرییەوە هاتوون.

– (سام)، ئایا تۆ قەت پیاوێکی بەدین و ئایینی بووی؟

– بەڵیٚ، کاتیٚ کە منداڵ بووم دایبابم فێری ئایینی (بودا)یان کردم، چونکە خۆیان بودایی بوون. هەندیٚ شتیشم لە بارەی ئایینی کۆنفۆشیوس بیستووە، هەروەها لە بارەی کاتۆلیکیش، یەك جاریش بەشداری ریٚ و رەسمی ئاهەنگی جەژنی (نۆئێل)م کرد. هەندیٚ شتیشم لەبارەی ئەو خودانە بیستووە کە ریشێکی زێڕینی هەیەو ناوی عیسای مەسیحە، هەروەها ئەو خودانەی باڵی هەیە و بەسەر هەوردا دەفڕیٚ. من وای بۆ دەچم عیساش وەکوو پارتیزانێکی ڤیت کۆنگ بەشێوەیەکی دڕندانە کوژراوە، بەڵام بەرامبەر بەمە ئەو کەسانەی کوشت کە خراپەیان لەگەڵ کردبوو و رەوانەی دۆزەخی کردن بۆ ئەوەی لەناو مەنجەڵی





گەورەی پڕ رۆنی قرچاوەدا بسوتێن. قەشە ئەمانەی بۆ باس کردووین. پیاو چاکەکانیش رەوانەی بەهەشت دەکا بۆ ئەوەی بۆ خۆیان لەویٚ هەڵپەڕکیٚ بکەن و گۆرانی بچڕن.

من بڕوام بەم شتانە نییە. بەلای منەوە ئینسان یەك جار دەمریٚ و هەموو فرمێسکی خۆی لەم دونیایە دەرێژیٚ و ئەگەر جگە لەمە بیر لە هیچ شتی تر بکەینەوە، یان لە هیچ شتی تر بترسین، شتێکی منداڵانەیە.

– (سام)، ئایا بەزەییش شتێکی منداڵانەیە؟

– ئۆی، نا! بەزەیی هێزێکی پیاوانەیە. دەزانی؟ کاتیٚ کە یەکیٚ ئیشێکی خراپ دەکا وەکوو ئەوەی سەری ڤیت کۆنگێك ببڕیٚ و پاشان... لەناو دەمی مردووەکە بنیٚ، من رق و تووڕەیم دەگاتە ئەو پەڕی و نەفرەتێکی سەیر دامدەگریٚ. ئەو نەفرەتە چۆن زوو لەناخەوەم سەرهەڵدەدا، ئاوهاش زوو لەناو دەچیٚ و جێگا بۆ بەزەیی چۆڵ دەکا. هەستیشم بەرامبەر ئەمریکییەکان بەم جۆرەیە:

لەکاتی جەنگ رقم لێییانە، بەڵام دوای جەنگ ئیتر هەست بەهیچ نەفرەتێك ناکەم بەرامبەر یان، بیردەکەمەوە ئەوانیش بیٚ گوناهن چونکە هەر چۆنیٚ بیٚ ئەوانیش بەشەرن. بیردەکەمەوە، وایە هەندێکیان لەسەر داوای خۆیان هاتوون، بەڵام زۆربەیان نازانن بۆچی دەجەنگن. شتێکی کوشندەیە کە نازانن بۆچی دەجەنگن و بۆچی دەکوژرێن.

دەزانی، ئەگەر جەنگ نەبوایە و وڵاتەکەم ئەم هەموو ئازارەی نەکێشایە، خێرو خۆشیم بۆ هەموو  کەس دەخواست، بەڵام وڵاتە بەدبەختەکەم هەمیشە لەژێر پێی بێگانان بووە: یەکەم جار چینی، پاشان فرەنسی و ئێستاش ئەمریکی. ئێمە ش دەبیٚ هەر بیانکوژین و بیانکوژین و بیانکوژین.

– (سام)، تۆ چی لەبارەی ئەمریکییەکانەوە دەزانی؟

– من لەو قسانەوە دەیانناسم کە لەباکوور لێم بیستوون، باکورییەکان باس دەکەن کە لە رۆژی یەکی مایس، ئاهەنگێك لە ئەمریکا ساز دەکریٚ پێی دەگوتریٚ جەژنی کرێکاران. ئەی بۆچی ئەمریکی دژی ئاهەنگی یەکی مایسی ئێمە دەوەستن؟ و لەسازدانی ئەم ئاهەنگە تووڕە دەبن؟ لە باکوور بیستم، کە ئەمریکا

سەربەخۆیی وەرگرت نەیویست بە موستەعمەرەی بەریتانی بمێنێتەوە، ئەی بۆچی ئەمریکی تێ ناگەن کە ئێمەی ڤێتنامیش، ڤێتنام تەنیا بە هی خۆمان دەزانین؟ دەزانی؟ من پێم وانییە ئەمانە ئینسانی بەدکار بن، بە پێچەوانەوە، من پێم وایە هەموو کەس لە هەر کوێ بێ یەکسانن و بەلای منەوە ئەوانەی سەرپەرشتی خەڵکەکەیان لە ئەستۆ دایە ئەوان بەدکارن، چونکە پارەیان هەیە و هەرگیز نایانەوێ ماڵیان بە بۆمبای ناپاڵم بسووتێ. هەر بۆیەش خەڵکی رەوانەی ئەم جەنگە شوومە دەکەن و خۆیان بەوپەڕی ئاسودەیی لەناو نوێنی گەرم و نەرم دەخەون.

— (سام)، تۆ کۆمۆنیستی؟

— ئۆی، بەڵێ! من ساڵی (١٩٦٤) چوومە ناو حیزب. وای ئەو رۆژە، رۆژێکی چەند گەورە بوو! دەزانی، چوونە ناو حیزب کارێکی ئاسان نییە. من (هوشی مینە)م زۆر خۆش دەوێ. ببوورن کاپتن (تان)، دەزانم ئێوە حەز ناکەن گوێتان لەم قسانە بێ، بەڵام هەر چۆنێ بێ ئەم جەنابی (هوش مینە)یە دڵنەوایی و رێنماییمان دەکا. (هۆشی مینە) پیاوێکی زۆر ئازایە، هەرگیز بە گومان و دڕدۆنگ نییە لەو کارانەی دەیانکا، تەنانەت لەپێناوی حیزبدا ژنیشی نەهێناوە.

—سام دەمەوێ پرسیارێکی ناخۆشت لێ بپرسم.بۆچی کاتێ کە دەستگیریان کردی، ئیعتیرافت کرد ؟ سام ، من چیرۆکی لۆریم بیستووە .باوەڕ ناکەم ئەمە بەڵگەیەکی بە جێ بێ بۆ ئیعتیراف کردنی تۆ .

— دەزانم، هەقی تۆیە. دەزانم من ئیشێکی زۆر خراپم کردووە. راستی من خۆم بۆ مردن ئامادە کردبوو. مردن چارەنووسی هەموو ڤیت کۆنگێکە. بەڵام مردنی بەشوورەیی نا. من ئامادە نەبووم بۆ ئەو جۆرە مردنە، بەڵام کەبیستم (تام) ئیعتیرافی کردووە، منیش سست بووم و ئیعتیرافم کرد.

تۆ ئەگەر بزانی ئینسان ناتوانێ بەرگەی ئەشکەنجەی جەستە بگرێ، ئەوسا دەزانی من بۆچی ئیعتیرافم کردووە. ئەوەش بزانە، ئینسان لەبەر ئەوەی ناتوانێ بەرگەی ئەشکەنجەی رۆحی بگرێ، دیسان ئیعتیراف دەکا. هەندێ جار، رۆحی ئینسانیش وەکوو جەستەی دەگری، ئەویش ئەو کاتەی جەستە جگە لە شانازی





مردنی سەربەرزانە ، هیچی تری بۆ نامێنێتەوە. چێژی مردنی خۆش وسەربەرزانەشیان لەمن سەندەوە. من ئیعتیرافم کردووە و شەرمەزارم.

دەزانی؟ لەو کاتەدا لەدڵی خۆمدا دەمگوت: (( بەدبەخت سام! تۆ لەژیانتا رۆژی خۆشت کەم دیوە. تۆ تەنیا کاتی سەردانی دایبابت کرد، کەیفخۆش بووی، کە دایکت مراوی بۆ سەربڕیت، کەیفخۆش بووی، کە کوڕەکەت لەدایك بوو، کەیفخۆش بووی. کەیف خۆشی تۆ ئەو شتانە بوو و بەس . تۆ هێشتا گەنج بووی چاوەڕێی گیران و مردنت دەکرد، تۆ لە سەرەتای منداڵیتەوە، لەرەنج و فیداکاری بەولاوە هیچی ترت نەدی. .تۆ دەبوایە بەلانی کەمەوە بە سەربەرزی و بە شانازییەوە بمری، دەبوایە بە گوللە باران بمری)).

— (سام)، تۆ لەو باوەڕەدای بەم جۆرە مردنە دەتکەن بە قارەمان؟

— نەء، ، تەنیا گوللە باران بەس نییە بۆ ئەوەی قارەمانێکت لێ دروست ببێ. قارەمان شتێکی ترە. قارەمان پیاوێکی ئازاو دلێرو ئاقڵە، پیاوێکە هەرگیز راستی لەخۆی ناشارێتەوە. قارەمان کەسێکە بەبێ هیچ ناڕەحەتییەك خۆی بدا بەدەست مردنی ژێر پێچکەی لۆرییەوە. وانییە کاپتن (تان)؟

کاپتن (تان) لەباتی ئەوەی وەڵام بداتەوە باوێشکێکی درێژی هاتێ و تەماشایەکی سەعاتی دیواری کرد وەکوو ئەوەی بیەوێ تێمان بگەیەنێ کە خەوی دێ و دەبێ پەلە لەقسەکانمان بکەین. بە جوولەیەکی دەست ئارامم کردەوەو دوا جگەرەم بۆ سام داگیرساند .

— (سام) وەختمان زۆر نەماوە و دەتگێڕنەوە ناو ژووری زیندانەکەت و ئیتر هەرگیز یەکتر نابینینەوە. تەنیا یەك پرسیاری ترم لەتۆ هەیە. ببوورە ئەگەر پرسیارەکەت بەلاوە گەلۆرانە بێ. ئایا تۆ هەرگیز بەخۆشی راتبواردووە؟

— بوەستە بیری لێ بکەمەوە: کاتێ کە منداڵ بووم، زۆر بەخۆشی لەگەڵ سەگەکەم رامدەبوارد، سەگێکی زۆر ئاقڵ بوو، کە بێگانەیەك لەزنجەکەمان نزیك دەکەوتەوە، سەگەکەم نەیدەگرت تەنیا پێی دەوەڕی، بۆ ئەوەی ئێمە ئاگادار بکاتەوە. ساڵی (١٩٤٨) چوومە سینەما زۆر خۆشیم لەبینینی فلیمەکە وەرگرت، هەرچەندە چیرۆکی فلیمەکە لەبارەیجەنگی ئەمریکییەکان و ژاپۆنییەکان بوو،

هەمیشە هەر ئەمریکییەکانیش لە جەنگدا دەیانبردەوە.

دوای ئەم فلیمە، جگە لەفلیمێکی تر هەرگیز هیچ فلیمێکی ترم نەبینی. ئەم فلیمەی دوایش خۆش و دڵکێش نەبوو. فلیمەکە دەرزی خراپەکاری فێر دەکردین. یەك جاریش لە (سایگۆن) چوومە سێرك، بێگومان پێش تەقاندنەوەی چێشتخانەی (میکان).

بە تەنیا چوومە سێرك چونکە پەست و غەمبار بووم . زۆر خۆشیم لێ وەرگرت چونکە شتی جوانم تێدا دی: سوار ماتۆڕێك بەبێ ئەوەی بەربێتەوە بەخێرایی بەدەوری مەیدانی سێرکدا دەخولایەوە، سێ پیاو سواری یەك چەرخەیەك ببوون، پێچکەکەی زۆر گەورە بوو، هەر دەخولانەوە و هی تر...

رابواردنی من ئەوەندە بووە و هیچ رابواردنی ترم نەبووە. من هەرگیز نەچوومەتە کۆڕی سەماو هەرگیز فێری گۆرانی خۆش نەبووم. تەنیا یەك گۆرانی فێر بووم ئەویش لەبارەی جەنگ بوو، شیعرەکەی بەم جۆرە بوو:

" برا، دەبێ بجەنگی
دەبێ باشوور ئازاد بکەی
ئەگەر ئەمەت بەلاوە سەخت و دژواریش بێ... "

– (سام)، تۆ حەزت لە مۆسیقایە؟

– ئۆی، بەڵێ، بەتایبەتی ئەو لایلایانەی بۆ خەواندنی منداڵان دەیچڕن. چاوم دەنووقێنم و گوێ دەدەمە ئەم گۆرانییانەو هەستی لاواندنەوەیەك دامدەگرێ.

– ئەی حەز لەشیعر دەکەی، (سام)؟

– من زۆر حەز لەشیعر دەکەم. ئێمەی باکووری شیعر زۆر دەخوێنینەوە. رۆژێ شیعرێکی خۆشم لەکتێبێکدا بینی، لاپەڕەکەم لێ کردەوە، هەمیشە پێم بوو، بەڵام لەپڕ بزرم کرد. لەوانەیە کە گیرام بزرم کردبێ یان رەنگە لێیان سەندم، بەڵام شیعرەکەم لەبەرە. دەتەوێ بۆت بخوێنمەوە؟

– بەڵێ، (سام)!

ئەم شیعرەی بۆ خوێندمەوە:

" ژیانی بێ عیشق





وەکوو ژیانی بیابان وایە،
وەکوو مردن وایە لەبەر برسێتی و تینوێتی،
وەکوو هەزاران دەردی لەمانە گەورەتر وایە،
وەکوو گریانی تەنیاییە لەتاریکیدا
وەکوو ئەوە وایە نەزانین بۆچی هاتووینەتە دونیا
لەراستیدا، خۆشەویستی مانا بە ئەقڵ دەبەخشێ.
هاوڕێ، دەزانی عیشق زۆر جۆری هەیە:
عیشقی دیموکراتی
عیشقی سەرکردەکانت
عیشقی ژنی جوان و منداڵەکانت
عیشقی هاوکارەکانی جەنگت
ئەم هەموو عیشقانە جوانن
چونکە لە عیشق دروست کراون.
چونکە یەکترمان خۆش دەوێ
بۆ ئەوەی بتوانین لە جەنگدا سەرکەوتوو بین.
بۆ ئەوەی بتوانین گوڵ بە بەر بێنین
بۆ ئەوەی بتوانین لەگەڵ منداڵەکانمان لەژیان بەردەوام بین.
بەڵام هاوڕێ،
نەکا عیشق شەڕکردنت لەبیر بباتەوە
چونکە ئەگەر وای لێ بێ
ئیتر عیشق لەسەر ئەم زەمینەدا نابێ."

– سوپاست دەکەم (سام)، حەز دەکەی خۆزگەی چیت بۆ بخوازم؟

– خۆزگەم بۆ بخوازە بە سەربەرزی بمرم، خۆزگەم بۆ بخوازە بتوانم بەچاو قایمی تەماشای دوڕ چاوی ئەوانە بکەم کە گوللە بارانم دەکەن و بەخۆم بڵێم:
( من لەپێناوی ئەو کارانەی بۆ نیشتمانەکەم و بۆ (هۆشی مینە) کردوومن، دەمرم.)

منیش خۆزگەی ئاشتی و سەرکەوتن بۆ ولاتی تۆ دەخوازم. خۆزگە دەخوازم هەرگیز جەنگ ولاتەکەت نەخاتە لەرزە، خۆزگە دەخوازم ساخ و سەلامەت بی و تەمەنت درێژ بێ.

ئینجا دەستی لەسەر سینگی داناو داهاتەوە و ئیکلامی کێشا.

پەڕۆ رەشەکەیان لەچاوی بەستەوەو بردیان. کاپتن (تان) دووبارە باوێشکی داو چەند پاسەوانێکی راسپارد بمگەیەننەوە ئوتێل. شەقامەکان چۆڵ و گەرم بوون و تەنیا بۆمبا بارانی شەوانە بێدەنگی شەوی دەشڵەقاند و مانگ لە ئاسمان دەدرەوشایەوە، ئەو مانگەی خەڵکانێك داگیریان کردووە بۆ ئەوەی پانتایی زەوییەکانیان فراوانتر بکەن.

بیر لە قسەیەکی دوێنێی (فرانسوا) دەکەمەوە، کە گوتی:

– (مانگ، خۆزگەو ئارەزووی ئەو کەسانەیە کەمانگیان نییە.)





# بەشی سێیەم

دەزانی؟ زەحمەتە مرۆۋ بزانێ چ کاتێ هەستی دڵەڕاوکەو عیشق و هەڵچوونی کت و پڕی لەلا پەیدا دەبێ. وەکوو نەخۆشییەکی کت و پڕ لەناخەوە هەستی پێ دەکەی و تا نیشانەکانی نەخۆشییەکەت لێ دەرنەکەوێ، هەستی پێ ناکەی. وەکوو سەرە گێژە وایە. هەر بەم جۆرەش من لەناکاو هەستم کرد گرفتاری جەنگ بوویم و قسەی (فرانسوا)م بیر کردەوە کە دەیگوت: " جەنگ وەکوو موعجیزە ئینسان بۆ لای خۆی رادەکێشێ".

" نازانم من چ کاتێ ئەم کشانەم تێدا پەیدابوو، بێ شك ئەو کاتە نەبووە کە (فرانسوا) ئەم قسەیەی پێ گوتم، بێ شك ئەو کاتەش نەبووە کە لە (داکتۆ)بووم و بێ شك ئەو کاتەش نەبووە کە چاوپێکەوتنم لەگەڵ (نگوین وان سام)دا دەکرد.لەوانەشە لەکاتی چاوپێکەوتنەکەی (نگوین وان سام)، یان لە (داکتۆ)بووبێ ، یان (فرانسوا) بە رێکخستنی چاوپێکەوتنەکەم لەگەڵ (نگوین وان سام)دا، ئەم کشانەی لەناخی من دروست کردبێ. (( هیچ شتێ لە جەنگ باشتر نییە بۆ ناسینی پیاو، وا دیارە ئینسان لەو پەڕی توند و تیژیدا، پتەویی خۆی بەدەست دێنێ، یان دەیدۆزێتەوە)) نازانم.

تەنیا دەتوانم ئەوەندە بڵێم من ئەو کاتە یەکەمین نیشانەی هەستی بەرەو جەنگ کشانی خۆمم بەدی کرد، کە لە (نگوین وان سام) جیابوومەوە، ئەو کاتەی جێبەکەم بە شەقامی چۆڵ و هۆڵ دا دەیبردم و دەنگی بۆمبا باران بێ دەنگییەکەی دەشڵەقاند.

تەماشای ئەو سەربازانەم کرد کە بە یاوەریی من هاتبوون. ئەوانە لەگەڵ هەر جوولانەوەیەك و بە دیتنی هەر سێبەرێکی سەر شەقام، دەم و چاویان سرك دەبوو و تێك دەچوو. دەم و چاوی ئەوانەم لەگەڵ دەم و چاوی (نگوین وان سام)

بەراورد دەکرد ئەو کاتەی کەمینی دادەنایەوە، (نگوین وان سام) ئەو کاتەی لەناو جەنگەڵ تەقەی دەکرد، (نگوین وان سام) کە رووبەرووی حوکمی ئیعدامی سوپا دەبووەوە. ئینجا هەستم کرد حەز دەکەم لەڤێتنام بمێنمەوە.پاشان هەستێکی سەیر دایگرتم. دواترخاوبوونەوەیەکی وڕووژێنەروئینجا تووشی ئەو جۆرە سەرەگێژەو سەر سووڕانە بووم کە لەکاتی روو بەروو بوونەوەی قارەمانێك تووشی دەبین. کەس ناتوانێ بەرامبەر (قارەمانێتی) بێ کاردانەوە بێ. شوێنی سەرەکی (قارەمانێتی) جەنگە. بێگومان دەشێ قارەمانێتی لە پەیوەندی عاشقانەشدا هەبێ، لە رووداوێکی پڕ مەترسیشدا هەبێ، بگرە دەشێ لە کارێکی نەکردەنیشدا هەبێ، من نکووڵی لێ ناکەم. بەڵام (قارەمانێتی) لە هیچ جێگایەك وەکوو (قارەمانێتی) مەیدانی جەنگ نابێ، بەتایبەتی ئەوەی کە نرخەکەی لەکڕینەوە نایە، مەبەستم مردنە!

(فرانسوا) دەیگوت: دەتوانین شەڕ لەگەڵ شەڕە مست بەراورد بکەین، چونکە لەشەڕە مستیشدا هەر دوو لای یارییەکە چی لە توانایاندابێ دەیکەن و هیچ لە خۆیاندا ناهێڵنەوە، بەڵام (فرانسوا) ئەوەی لەبیر کرد بڵێ: ئەو ساتەی پیاو هەموو توانای خۆی بەکاردێنێ، ساتی مردنە. ئەم بیرکردنەوەیە تووشی ورووژانی کردم. من جەنگ بە کوشتنێکی شایەنی مەحکووم کران ناشوبهێنم، بەڵکو بە کارێکی قارەمانێتی دەزانم کە پێویستی بەروون کردنەوە و ناساندن هەیە من هەموو لایەك و سووچ و کەلێنێکم پشکنیوە، تا بەخۆکوشتنی راهیبەیەکیش دەگا. بۆ خۆم ئەمەم لە جەنگێکی هەوایی تۆژییەوە و دەق لەکاتی دەست پێکردنی ئەم جۆرە هەستە بوو کە پیاوێکم ناسی و پاشان بوو بەمایەی ئەوەی ئەنجامێك لەم هەستەما بەدەست بێنم.

<u>(٦)ی کانوونی دووەم</u>

پەڵەیەکی رەشی پاشماوەی ئاگرێك لەسەر بانێژەی پەرستگای (تونین) هەیە. لەشێوەی جەستەی مرۆڤێك دایە چوار مەشقی دانیشتبێ، وەکوو ئەوە وایە پەڵەکە روو لە پەیکەری بودای گەورە دانیشتبێ. تەنانەت هەوڵیشیان دابوو بیشۆن و پاکی بکەنەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی بەردەکەی لەگەڵ سووتا بوو، پەڵەکە





لێ نەدەچووەوە.

راهیبە بودایییەکان کاتێ کە بە بەردەم ئەم پەڵەیەدا تێدەپەڕن، ئیستێك دەکەن و بەرێزەوە دەست لەسەر سینگ دەوەستن. ئەم پەڵە رەشە پاشماوەی خۆ سووتاندنی (هوین تی می)یە کە مامۆستایەکی گەنجی (سایگۆن)ی بوو. سەعات پێنجی رۆژێکی یەك شەممەی هاوینی رابردوو خۆی سووتاند. تەنەکە بەنزینێکی بەدەستێکیەوە گرت و دەستە شقارتەیەك و سەبەتەیەکی پڕ میوەی بەدەستەکەی ترەوە گرت و چووە ناو پەرستگا. کەس هەستی پێ نەکرد.

ئەو راهیبە پیرەی هەمیشە لە پەرستگا بوو، ئەو کاتە سەری بە زەنگەکە کردبوو و خەوی لێ کەوتبوو. راهیبەکانی تریش لە ژوورەکانی خۆیان بوون.

بەهەر حاڵ، خۆ ئەگەر (هوین تی می)شیان بدیبایە پێیان سەیر نەبوو چونکە ئەو هەمیشە پێش بەیانی بۆ دوعا کردن دەچووە ئەوێ و هەموو دەیانناسی. (هوین تی می) زۆر بەهێواشی سەبەتە میوەکەی لەبەر پێی بوودا دانا. سەبەتەکە ئەنبەه و مۆز و ئەناناسی تێدابوو. ئینجا کاغەزێکی لەسەر میوەکان دانا شتێکی لەسەر نووسی بوو . ئەوسا بەتەنیشت راهیبەی خەوتوودا رۆیشت و دەرگای بانێژەی کردەوە و تەنەکە بەنزینەکەی هەموو بەسەر خۆیدا کردو ئاگری لەخۆی بەردا.

ئاگرەکە کڵپەیەکی کردو دەنگێکی وای لێوەهات، راهیبەی پیری لەخەو راپەڕاند.

راهیبەی پیر زەنگی لێ دا. قیژەی هاوارێك هات و دوای چەند دەقیقەیەك هەموو راهیبەکان داڕژانە ئەوێ. راهیبەی گەورە هێمن و لەسەرەخۆ بوو، بەم جۆرە دەستووری دەدا:

– دەسماڵی تەڕ بێنن.

ئاگرەکە هەر هالاوی لێ هەڵدەستا و دەم و چاوو جەستەی (هوین تی می) لەناو ئاگرەکە دیاربوو چۆن ئازاری دەکێشا. چاوی زەق ببووەوە، لێوەکانی لێك کردبووەوە دەتگوت دەیەوێ شتێ بڵێ. واپێ دەچوو بەرگەی ئازارەکەی پێ نەگیرێ، بەڵام هەر بەرگەی دەگرت و بەچاو سەیری راهیبەی گەورەی دەکرد.

دەستێکی بڵند کرد، دەتگوت دەپاڕێتەوە رێی کارەکەی لێ نەگرن، دەق بەو شێوەی کە بۆ دوعاکردن دەست پان دەکەینەوە. ئیتر هیچ جوولەی نەکرد تا بەپشتدا کەوت و سەری لار بووەوە سەر پەیکەری بوودا.

راهیبەی گەورە دووبارەی کردەوە:

– دەسماڵی تەڕ! دەسماڵی تەڕ!

ئەم جارەیان بەبێ ئۆقرەیی دووبارەی دەکردەوە.

دەسماڵیان هێنان، بەڵام ئێستا (هوین تی می) پەنجەکان و بەشێکی قۆڵی راستەی و هەندێ ولمەگۆشتی دەم و چاوی لەدەست دابوو و ئیتر هەناسەی نەدەهات.

راهیبەی گەورە گوتی:

– خوا لێی خۆش بێ!

ئینجا چووە لای سەبەتە میوەکەو کاغەزەکەی هەڵگرت. لە کاغەزەکەدا نووسیبووی:

(( من شێت نیم، بەدبەختیش نیم. ژیان خۆشەو حەزم دەکرد بمتوانیایە تا کۆتایی عومرم بە خۆشی بژیم، بەڵام دەزانم دەبێ لەپێناوی نیشتمان و لەپێناوی ویژداندا ئەم ئیشە بکەم. لێپرسینەوەی ئەم ئیشەی من لەئەستۆی ئەو کەسانەدایە کە ئێستاش فەرمانڕەوایی ڤێتنام دەکەن.))

(تیچ نو هوئە)ی راهیبەی گەورە، بەدەنگی نووساوو، سەرنجی غەمبارەوە ئەم چیرۆکەی بۆ گێڕامەوە؟

مووی پشت ملی تاشی بوو، جلێکی شینی لەبەر بوو تازە لەباتی جلە زەردەکەی کردبوویە بەر. دڵۆپە ئارەقەی وەکوو فرمێسك بەروودا دەهاتە خوارێ.

پاش نیوەڕۆیەکی زۆر گەرم بوو. دەنگی دوعای راهیبەی پیر لە میحراب دەهات و دوای هەر دوعایەك چەکوشێکی لە زەنگەکە دەداو زەنگەکە دەنگێکی نزم و گیراوی لێوە دەهات.

(نو هوئە)ی راهیبەی گەورە، بە ئارامی لەسەر کورسییەکەی دانیشتبوو وەکوو شاژنێك وابوو لەسەر عەرش دانیشتبێ. تەمەنی پەنجاو چوار ساڵە. لەتەمەنی





سی و پێنج ساڵییەوە بۆتە راهیبەو سەرۆکی هەموو راهیبەکانی ڤێتنامە کە ژمارەیان دەگاتە شەش هەزار کەس.

رەزامەندیی لەسەر داوای خۆکوشتنی راهیبەکان بەدەست ئەوەوەیە. تا ئێستا دەوری سەدو پەنجا داوای خۆ کوژیی لەرا هیبەکانەوە پێ گەیشتووە.

لەو سەدو پەنجا کەسە، دە کەسیان سەر بە هەمان پەرستگان.

لەو کاتەدا، یەکێ لەو دە کەسە هاتە ژوورەوە، کە لەبەر گەرما باوەشێنی لە خۆی دەکرد. راهیبەی گەورە گوتی ژمارەی خۆ سووتاندنی ژنان لەهی پیاوان زیاترە و ساڵ بەساڵیش پتر دەبێ.

لە سەردەمی (دیم)، حەفت کەس ئاگریان لەخۆیان بەردا: شەش راهیب و یەك راهیبە.

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی (کی)، سێزدە خۆ سووتاندن رووی دا: نۆ راهیب و چوار راهیبە.

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی (وان تیو)ش هەشت خۆ سووتاندن: یەك راهیب و حەفت راهیبە. چوار کەسەکەی ئاخیری مۆڵەتیان لە راهیبەی گەورە وەرنەگرتبوو. یەکەمیان لەسێی تشرینی یەکەمی رابردوو لە(کانتۆ)، دووەمیان لە هەشتی تشرینی یەکەم لە (سادك)، سێیەمیان لە چواری تشرینی دووەم لە (سایگۆن) و چوارەمیان لە بیست و دووی تشرینی دووەم لە (ناترانگ)و راهیبەی گەورە ئەو کاتە بە خۆسووتاندنی ئەوانەی زانی کە بۆ وەرگرتنەوە و ناشتنی تەرمەکان ئاگاداریان کردەوە، چونکە ناشتنی تەرمیش یەکێ بوو لە ئەرکەکانی خۆی. بەڵام راهیبەی گەورە توانی تەنیا دوو تەرم وەربگرێتەوە، چونکە لێپرسراوانی دەوڵەت دوو تەرمەکەی تریان ناشتبوو لەبەر ئەوەی پێیان خۆش نەبوو خەڵکێکی زۆر بۆ تەماشای جەستە سووتاوەکان کۆ ببوونەوە، بەتایبەتی کە خەڵکەکە بە دابی زیارەت کردن بە دەوری جەستەکاندا دەخولانەوە.

بەهەر حاڵ، رۆژنامەکان ئیشی خۆیان کرد و شتی زۆر و پڕ ژاوەژاویان لەبارەی ئەم خۆ سووتاندنەوە نووسی. بەڵام ئەو خەڵکەی لەم دەنگ و باسە ئاگادار دەبوونەوە، یان هەر گوێیان پێ نەدەدا، یان بە ناڕەحەتی دەیانگوت:

" دیسان یەکێکی تر خۆی سووتاندووە؟ هەر دەڵێی ژن باشتر دەسووتێن!"

کاتێ (هوین تی می) خۆی سووتاند، هەموو دەیاندی چونکە بانێژەی پەرستگا یەکەو راست کەوتبووە بەرامبەر کۆڵانێکی پڕ خانوو و باڵەخانە. دەوری سی کەس لەبەر پەنجەران وەستابوون و تەماشای دیمەنی خۆ سووتاندنەکەیان دەکرد. منداڵ کە ئاگرەکەیان دی، بەسەر شۆستەکاندا هەر رایاندەکرد و بەم جۆرە گۆرانییان دەگوت:

" وا...دە...سوو...تێ، وا...دە...سوو...تێ!"

– بەڵام، راهیبەی گەورە، ئایا ئەم ئیشانە سوودیان چییە؟

– ئەم ئیشە تەنیا سەرپێچییەکە لەو دەوڵەتەی کە من رەتم کردۆتەوە.

ئەمریکی کارو باری دەوڵەت بەڕێوە دەبەن و ئەم کارەش یەکەم نیشانەی بەدبەختی ئێمە مانانە. ئێمە لە سەردەمی فرەنسییەکانەوە بەداگیر کراوی دەژین، ئێستاش ئەمریکی هاتوون دەق وەکوو فرەنسییەکان رەفتارمان لەگەڵدا دەکەن و ژێر دەستەیان کردووین. خۆ سووتاندن چەکێکی کوشندەیە دەیانخاتە ترس و بەزەیی و وا لە تاوانبارەکانیش دەکا بیر بکەنەوە و بەخۆدا بچنەوە.

– راهیبەی گەورە، بەلای تۆوە ئەم خۆ سووتاندنە تا ماوەی چەندی تر بەردەوام دەبێ؟ لەو سەدو پەنجا کەسەی داوای خۆ سووتاندنیان کردووە، چەندیان داواکەیان قبووڵ دەبێ؟

– هەر چەند کەسی پێویست بکاو ئەگەر پێویست بکا، هەر هەموویان. تەنیا یەك هۆ هەیە وا دەکا هەندێ جار رەزامەندی لەسەر داواکەیان نەکەم، ئەویش ئەوەیە پێم وایە دەبێ ژمارەی قوربانییەکان سنووری بۆ دابندرێ. بەزۆری گەنجن ئارەزوو دەکەن بەم رێگایە خۆیان بکەنە قوربانی و بەلای منەوە راست نییە هەمیشە هەر گەنج ببنە قوربانی. من بڕوام وایە شەهادەت هەرگیز نابێ لە ئەنجامی هەست و سۆز و وروژانی توندی گەنجێتییەوە بێ. شەهادەت دەبێ بەو پەڕی ئارامیی ویژدانەوە بکرێ، بۆیە دەبێ کەسانی بە تەمەنتر بیکەن کە باشتر لەمانای ژیان گەیشتوون. من کە دەبیسم یان دەبینم گەنجەکان بەبێ مۆڵەت وەرگرتن خۆیان سووتاندووە، زۆر نارەحەت دەبم. ئەمەم





بەو راهیبانەش گوت کە لەم پەرستگایەدا بێ ئۆقرە چاوەڕێ دەکەن من مۆڵەتیان بدەم، پێم گوتن:

– (( سەبرتان هەبێ و چاوەڕێ بکەن، ئاخیری نۆرەی ئێوەش دێ.))

بەڵام زۆربەیان مۆڵەت لەمن وەرناگرن، وەکوو ئەو (هوین تی می)یە، کە بەبێ مۆڵەت ئەم جۆرە ئیشەی کرد.

– کەواتە ئێوە لە خۆ سووتاندنێك زیاترتان دیوە، ئەو کاتە هەستتان بە چ دەکرد؟

زۆر بەناسکی بزەیەکی هاتێ و گوتی"

– ئۆی، ئێوە دەبێ بزانن کاردانەوەی من بەرامبەر بەرووداوی وا وەکوو کاردانەوەی ژنێکی ئاسایی نییە. من تەنیا ژنێك نیم و بەس، من راهیبەم. مردن بەلای منەوە تراژیدی نییە. کە جەستەیەك دەمرێ، دەیسوتێنین، یان فرێی دەدەینە ناو لێری پڕ درندەو جانەوەر، یا دەیهاوێژینە ناو دەریای پڕ ماسی بۆ ئەوەی ماسی و گیانەوەری تر بیخۆن، تەنیا ئەو کاتە مردووەکانمان دەنێژین کە ئاگرمان نەبێ بیانسووتێنین، جانەوەری درندەو ماسی نەبن بیانخۆن.

ئێمە ئەشکەنجەی جەستەییمان قبووڵ نییەو دەتوانین زۆر چاك بەرگەی هەموو ئەشکەنجەیەکی جەستەیی بگرین تەنانەت ئەگەر ئەشکەنجەکە زۆر بەئازاریش بێ، چونکە باوەڕمان بە راستەقینەی جەستەیی نییە.

– راهیبەی گەورە، ئایا لەو باوەڕەدای سووتان بە زیندوویی، ئازاری زۆر بێ؟

– ئۆی، بەڵێ! راست نییە کە دەڵێن ئەوەی لەسەر مردن بێ، هەر لە سەرەتای سووتانەوە بەگاز ژەهراوی دەبێ و ئیتر هەست بەهیچ ئێش و ئازارێك ناکا. بەپێچەوانەوە، تا کۆتایی خۆ سووتاندنەکە ئەو هەر بەزیندوویی دەمێنێتەوە و تەنیا ئیرادەی بەهێزی خۆیەتی کە ئاوها راست و پتەو رایدەگرێ و هەر ئەم ئیرادەیەشە لێ ناگەڕێ داوای یارمەتی لە کەس بکا. من (هوین تی می)م لەبیرە. زۆر ئازاری دەخوارد. دەسماڵی تەڕ درەنگ گەیشت و ئەو هەر ئازاری دەکێشا.

ئاخیری لە راهیبەی گەورەم پرسی:

– ئایا ئێوە ئامادەن خۆتان بسووتێنن!

– ئۆی! بەڵێ! هەڵبەت. ئەمەش یەکێکە لە ئەرکەکانی خۆم.

بەهەر حاڵ من هەستێکی تایبەتیم بەرامبەر بەم کارە هەیە. دەزانی؟ کاتێ کە راهیبێك یان راهیبەیەکی زیندوو خۆی دەسووتێنێ، نە هەست بەبەزەیی دەکەم و نە هەست بە نەفرەت دەکەم، بەڵکو بەجۆرێکی سەیر هەست  بەرێز و گەورەیی دەکەم بەرامبەریان، تەنانەت ئێرەیی بە کردەوە و ئیرادەیان دەبەم، چونکە خۆت دەزانی، مردنی باش لەژیانی خراپ، باشترە. ژیانی خراپ سەختترین فیداکاری کردەنییە. زۆر حەز دەکەم لە دابی خۆ سووتاندنی راهیبێك یان راهیبەیەك ئامادەبم، دەبێ شتێکی سەرنجراکێش بێ.

<u>(٧)ی کانوونی یەکەم</u>

(فرانسوا) دژی ئەمەیە. ئەو دەڵێ مرۆڤ بەبینینی ئەم دیمەنە تووشی تۆقان دەبێ. (فرانسوا) ساڵی (١٩٦٦) حاڵەتێکی خۆ سوتاندنی دیبووو بەدیتنی ئەو دیمەنە زۆر ناڕەحەت ببوو، بگرە هەوڵی دابوو کابرا نەجات بدا:

ئەم رووداوە ئەو کاتە قەوما کە بوودایییەکان ناکۆکییان کەوتبووە نێوان. من و (تیچ تام چوو) لەدانیشتنێکی رۆژنامەوانی دەهاتینەوە، بە شەقامی (کونگ لی)دا تێدەپەڕین، لەپڕ هەستمان بە هالاّوی گەرمایەك کرد و بڵێسەیەکی بەرزمان بینی. من لەئاگرەکە نزیك کەوتمەوە، دیتم راهیبێکی گەنج لەناو ئاگرەکە دانیشتووە، پێش نەختێ لەگەڵ راهیبەکانی تردا دیبووم. لەناوەندی شەقامەکە، بەچوار مەشقی لەناو قۆرتێك دانیشتبوو. چەند کوڕیژگەیەك لە دەوروبەری شەیتانییان دەکرد و چەند ژنێك لەسەر چۆك دانیشتبوون دەگریان و دەیانلاواندەوە و دوو راهیبەش بەبێ ئۆقرەیی تەماشای دیمەنەکەیان دەکرد. رێی هات و چۆ گیرابوو. راهیبەکە بەبێ جووڵە لەناو ئاگر دەسووتاو هەموو وا تەماشایان دەکرد کە دەتگوت بەم کارەی رازین، بەلاّم ئەو لەناکاو تەکانی دایە خۆی و ناڕەحەتی پێشان دا. من کە ئەو حاڵەتەی ئەوم بینی، رام کردە لای و یەخەم گرت و رامکێشا، پارچە جلێکی لەگەڵ دەستم هات. پەمۆی هیدرۆ فیلی لە دەوری کراسەکەی دانابوو بۆئەوەی باشتر بەنزین بۆخۆی رابکێشێ. پارچە کراسەکەیم فڕێ دایە لایەك، راهیبەکە رووی ئارام بووەوە. بۆ چەند لەحزەیەك وام هەست کرد





پەشێمان بۆتەوە و دەیەوێ بەرەنگاری ئاگرەکە بێتەوە، بەلاّم ئەو تەنیا هەوڵی دا پێستی قۆڵی فڕێ بدا کە وەکوو دەستکێشی لێ هاتبوو. لێی کردەوەو دووبارە بەچوار مەشقی دانیشت.

ئەو پارچە کراسەی من لێم کردبووەوە، راهیبەیەك لەسەر زەوی هەڵی گرتەوە و بەشێنەیی لەسەر سەری راهیبەکەی دانا.

من دووبارە پەڕۆکەم لابردو فڕێم دایە لایەك، ئەویش دووبارە هەر بەو ئارامییە پەڕۆکەی هەڵگرت و لەسەر سەری راهیبەکە داینا. دانان و لابردنی پەڕۆکە بەم جۆرە بەردەوام بوو. راهیبەکە دووبارە وای پێشان دا کە ئارەزووی لەمردن نییە و دووبارە تەکانی دایە خۆی. من و چەند رۆژنامەنووسێکی تر ئاگرەکەمان کوژاندەوە. راهیب و راهیبەکان لەناو ئاپۆرەی خەڵکەکە رۆیشتن و لەبەر چاو بزر بوون. تەکسییەکمان بانگ کرد و راهیبەکەمان خستە ناو تەکسییەکە، ئەویش زەردەخەنەی دەهاتێ و قسەی هەلەق و مەلەقی بەسەر زماندا دەهات. رەنگی پێستەی لەشی وەکوو رەنگی مسی لێ هاتبوو، بەلاّم بەشی خوارەوەی لەشی برینی پێوە نەبوو. پێمان وابوو نامرێ، بەلاّم دوای سی و شەش سەعات مرد و دختۆرەکان گوتیان مژاری سڕکەری بەکار هێناوە.

– ئایا ئەوانە زۆربەیان مژاری سڕکەر بەکار دێنن؟

– بەلای منەوە بەڵێ. وابزانم هیچ ئیرادەیەك لەدونیادا نییە بتوانێ ئینسان ئاوها بێ جووڵە لەناو ئاگر رابگرێ، مەگەر مێشکیان شووشتبێتەوە. ئەگەر بەراهیبێکی حەفتا ساڵی و راهیبەیەکی حەڤدە ساڵی بڵێین ئازادی ڤێتنام بە قوربانی دان و خۆ گۆری کردنی ئێوەوە بەندە، ئامادەن خۆیان بکەنە بریانی.

ئەمە تیوری (فرانسوا)یە. ئەم زەمانەی ئایینی بوودایی پەلی هاویشتووە و ئەمانە لەماوەی چوار ساڵی رابردوودا، سەرکەوتنێکی وایان بەدەست هێناوە هەرگیز شتی وایان بەبیردا نەدەهات، بەلاّم پاشان گلۆڵەیان کەوتە لێژی. ئەوان ئایینەکەیان هیچ سەنگی سیاسی نییە. لەم بەینەدا گەورەترین و باشترین دەرفەتیان لەدەست دا کە مێژوو یان چارەنووس بۆی رەخساندبوون. ئەو دەرفەتەش جێ بە جێ کردنی پلانی سوپای سێیەم بوو لەڤێتنام. وەکوو ئەو

دەسەڵاتەی کاتۆلیکەکان لە وڵاتانی ئەوروپا بەدەستیان هێنا. هۆیەکەشی هەر زۆر سادەیە. ڤێتنام وڵاتێکە هەرگیز بوودایی نەبووە. لە شازدە ملیۆن دانیشتوانی ڤێتنام تەنیا یەك ملیۆنیان سەر بەرێبازی (کائودای)ن و دەستەیەکی تریش سەر بەرێبازی (هوئاهائو)ن. دوو ملیۆن کاتۆلیك هەن و پێنج سەد هەزار کەسیش سەر بەو رێبازە ئاییینەن کە لافاو و کێوی سەر زەوی وەکوو خودان دەپەرستن و خەڵکەکەی هیچ ئاییینیان نییە، تەنیا لە کەنیسەکانا مۆم بۆ مردووان دادەگیرسێنن.

ساڵی ١٩٦٣، لەڤێنام، راهیبێك بەناوی (تری کانگ)، لە شاری پیرۆزی (هوئە) دژی دەوڵەت گوتاری داو لەوە بەدواوە ئاییینی بوودایی جێگای خۆی لەناو خەڵك کردەوە. (هوئە) بوودایی زۆر تێدایەو گوتارەکەی (تری کانگ) ئاژاوەی نایەوە. پۆلیس کەوتە ناوو هەشت راهیب کوژران و (تری کانگ)یش بە کوژرانی راهیبەکانی، داوای جەنگی لە (دیم)کرد. یەکەمین خۆ سووتاندن بۆ ئەو مێژووە دەگەڕێتەوە. یەکەمین کەس کە خۆی سووتاند راهیبێك بوو لە خەڵوەتخانەی (کراسوی) لە (سایگۆن). بێگومان (تری کانگ) ئاگاداری رووداوەکە بوو و زۆر چاك دەیزانی دەبێ چ بکات، چونکە هەر لە شەوی خۆ سووتاندنەکەدا، نەناسیاوێك (کە زۆر لەگوینە (تری کانگ) خۆی بووبێ)، بە تەلەفۆن وێنەگرێکی لە رووداوی خۆ سووتاندنەکە ئاگادار کردەوە. ئەو وێنەیە بە سەراپای دونیادا بڵاو بووەوە و دونیاش زۆر بۆ ئەم دیمەنە دڵتەزێنە گریاو ئەمریکییەکانیش ترسان چونکە هەرگیز لەعومری خۆیان شتی وایان نەدی بوو. (کابوت لاج)یش کە هەوەسی بە (دیم) نەدەهات، دەرفەتەکەی قۆزتەوە و گوتی خەڵك بۆیە دەستیان داوەتە ئەم ئیشە چونکە هەوەسیان بە (دیم) نایەو ئەویش سەبارەت بەمە کاری گرنگی وای بە بوودایییەکان سپارد کە بەخەونیشیان دا نەدەهات، ئیتر دەسەڵاتی بوودایییان دەستی پێ کرد. دەسەڵاتێکی کوشندە، لەسەر جەستەی سووتاو دروست ببوو: خۆ سووتاندنێکی ترو یەکی تر، دیسان یەکی تر و دیسان یەکی تر و یەکی تر. شەشەمین خۆ سووتاندن هی راهیبەیەکی گەنجی هەژدە ساڵی بوو. هەموو جارێکیش وێنەی ئەم دیمەنانەیان دەگرت و هەموو جارێکیش





پەیامنێرانی نیویۆرك تایمز و ئاسۆ شێتید پرێس و ڤی. پی. ئای بە هەراو زەنا بڵاویان دەکردەوە و بە سەراپای دونیا رادەگەیەنرا. ئەم سێ پەیامنێرە چالاك و پیشەوەرە نەیاندەزانی سەفیرەکەیان، وەکوو چۆن دەرهێنەرێك ئەکتەرەکانی بە خەڵك دەناسێنێ، ئاوها خەریکی ناودار کردنی راهیبەکانە.

تەنانەت ئەوەندەشیان نەدەزانی کە بوودایی نین ئەم هەموو خۆ پیشاندانە رێك دەخەن، بەڵکو ڤیت کۆنگەکانیش دەستیان لەم کارانەدا هەیە. خاتوو (نهۆ) بە غەڵەت نەچوو بوو کە قیژاندی: " بوودایی سووری ژێر جلی زەردن. "

هەر چۆنێ بێ، بوودایی بێ دەستی خۆیان هاتنە ناو کارو باری کۆمەڵایەتی و دەسەڵاتێکی وایان پەیدا کرد، بە رووخانی (دیم) شکایەوە. بێگومان سوپاو ئەمریکییەکانیش لەم مەسەلەیەدا هاوکارییان دەکردن، بەڵام زۆری پێ نەچوو کە لەراستی و کرۆکی بابەتەکە گەیشتن. ئەوسا ئەمریکییەکان بەرەڵایان کردن و وازیان لێ هێنان. (تری کانگ) لە لایەك و (تام چوو) لەلایەکی ترەوە کەوتنە چالاکی نهێنی و دیسان جەستەی سووتاوی بەرگ زەردو بەرگ شین لە شەقامەکان دەرکەوتن بەڵام ئەم جارەیان هیچ وێنەگرێ وێنەی نەدەگرتن.

– ئەمرۆ هیچ دەنگ و باسی تازە نییە؟

– نەخێر، تەنیا بریانێکی تر!

– ژنە یان پیاوە؟

– پەه!

(فرانسوا) دەرهەق بوودایییەکان زۆر توندەو بە هەندیان نازانێ. بەلای منەوە بە رووکەش زێدەڕەویی دەکا، بەڵام ئەوەش دەزانم کە هیچ بەزەیی بە سەرۆکەکانیان دا نایەتەوەو بڕوای وایە ئەوانە "هەموو گەندەڵ و هەموو نەزان و هەموو پایە پەرست و هەموو پیاوی (سیا)ن و هەمیشە سواری ترۆمبێلی زلی ئەمریکی دەبن، خۆم دیومن." دەزانی، ئەو زەمانەی بە خۆ سووتاندن دەڵێن (بریان).

ئەگەر ژەنەراڵ (لۆن) ئاگادار بکەنەوە کە لەسووچێکی شار، یەکێ خەریکە خۆی دەسووتێنێ، پیاوەکانی خۆی بەلێفەی تەڕ و کەرەستەی ئاگر کوژاندنەوە رەوانەی شوێنی رووداوەکە دەکا.

تۆ تەنیا هەوڵ بدە دیمەنەکە بێنیتە بەر چاوی خۆت:

یەکەم جار ئەو کەسەی خۆی دەسووتێنێ، ئینجا پۆلیس و پاشانیش جێبەکە، کە بەتیژی دێ و دەگاتە شوێنی رووداوەکە و سیڕەی دێ ئیستاپ دەگرێ. ئینجا کەفێکی سپی دژاگر راهیبەکە دادەپۆشێ! دەق وەکوو لیبۆکێ، کە بۆ گاڵتەجاڕی کریمی کێکیان بە دەم و چاوی دا کردبێ. توخودا، بەکرێمی سەر دەم و چاوییەوە بیبینە!... تەنیا یەك شت هەیە مەرگ رادەکێشێ، ئەویش گەلۆرییە.

بەڵام کە ببینی کابرایەك بەنزین بەخۆی دا دەکا و تەڵە شخارتەیەك دادەگیرسێنێ و خۆی پێ دەسووتێنێ، کە ببینی کابرایەك بەبێ هاوارو بەبێ پەشیمانی دەسووتێ، کەببینی ئەو کابرایە لەپێناوی ئامانجێکی پیرۆز، لەپێناوی ناڕەحەتی کەسێتی، خۆی دەسووتێنێ، ئەو کاتە گەلۆرییەکە قبووڵ دەکەی، چونکە من پێم وایە ئەم کابرایە قارەمانە. بەقەدەر ڤیت کۆنگێ، یان سەربازێکی ناو سەنگەری شەڕ، قارەمانە.

من پێشتر دەمگوت ئاسمانگەڕەکان مرۆڤی قارەمانن، بەڵام ئێستا لەو بڕوایەدام کارەکەی ئەوان کارێکی قارەمانانە نییە، چونکە ئەوان کە دەچنە سەر مانگ بەباشترین پێویستیی پاراستنی سەلامەتی و هونەر کاریی نائاسایی دەچن، کە ٩٩,٩٩٪ ی جێی متمانەن و بە هاوکاری سەدان زاناو هونەرکار و کەرەستەی هونەری دەست بە سەفەرەکەیان دەکەن. خۆ ئەگەر بەختیش پشتیان تێ بکا و لەسەر مانگ بمرن، ئایا مردن لەبەر چاوی هەزاران کەس، قارەمانییە؟ لەکاتێکا کە هەموو خەڵکت لەگەڵدا بێ و پێت هەڵبڵێن و تەنانەت بۆشت بگرین. نەخێر! من لەڤێتنام قارەمانم ناسی!!

ئەی برادەرانی ئاسمانگەڕ، ئەنگۆ قارەمان نین، قارەمان ئەو ڤیت کۆنگەیە، کە بە پێ خاوسی لەپێناوی خەون و ئامانجەکانی خۆی دەجەنگێ، قارەمان ئەو سەربازەیە، کە لەجەنگێکا وەکوو سەگ بە تەنیا خۆی حەشارداوە و پاشان بەوپەڕی مەترسییەوە دەچێ تەپۆلکەیەك داگیر دەکا کە هیچ جۆرە نرخ و بەرژەوەندییەکی بۆ ئەم تێدا نییە و پاشانیش دەمرێ. قارەمان ئەو راهیب و ئەو کەسانەن کەخۆیان دەسووتێنن و هیچ باکیشیان پێ نییە کە بەهۆی کەفی ئاگر





کوژێنەوە سیمایەکی پێکەنیناوییان دەبێ.

<u>(٨)ی کانوونی یەکەم</u>

لەهەموو شوێنێ زیاتر، لەم پەرستگایانە قارەمانەکە هان دەدەن. پەرستگاکانی ڤێتنام وەکوو پەرستگای ئاسایی نین. نە گۆشەگیرییان تێدا هەیە و نە غەم.

من ئەم پەرستگایانەم وەکوو پەرستگاکانی (بانکۆك)و شارەکانی تری ئاسیا هێنابووە بەر چاوی خۆم، بەڵام کەچووم لەباتی وێنە خەیاڵییەکانم، خانووی بچووك و خراپووچکەم بینی، کەوتبوونە ناو کۆڵانی تەنگ و تریسك و پیس و پۆخڵ و شەقامی بۆگەن. زەحمەتە لەگەڵ سەرنجی یەکەمدا بتوانی ئەم پەرستگایانە لە خانووەکانی دی جیابکەیتەوە، چونکە رووکاری دەرەوەیان زیاتر بەخانوو دەچێ تا پەرستگا. دەبێ باش تەماشای دەورو بەری بکەی بۆ ئەوەی تابلۆکەی ببینی کە لەسەری نووسراوە: (پەرستگای تنین) یان (پەرستگای کزا لوی)

ژیان لە دەوروبەری پەرستگا بەردەوامە: بەدەنگە دەنگ و هەراو زەنا، بەدەنگی پاسکیل و ریکشا، بەبانگەشەی فرۆشیارەکان و بە حەپەی سەگ و بەقڕیوەی پێکەنینی منداڵان کە راوی یەکتر دەنێن و لەبن دیواران دەمیزن.

دەزانم، دەق وەکوو(سایگۆن)ی سەردەمی فرەنسییەکان وا بوو، دەستووری تایبەتی خۆی هەبوو، ئەورووپییە دەوڵەمەند و جیهانگەڕەکانی بۆ خۆی رادەکێشا: نە دەبابە هەبوو، نەجێبی رەشاش هەڵگر، نە سەنگەری فەردە قوم، بەپێچەوانەوە خەڵکانێکی کڵاو قووچت دەبینی بە خۆشی و شادی دەهاتن و دەچوون و ئەگەر باڵات بەرز بایە شەپۆلی کڵاوی قووچت دەبینی بەلێژایی کووچە و شەقامەکاندا شۆڕ دەبووەوە.

هەر کۆڵانێك بازاڕی تایبەتی خۆی هەبوو. فرۆشیارەکان لەسەر زەوی دادەنیشتن و کەل و پەلەکانیان لەسەر زەوی بڵاو دەکردەوە: ماسی تازە، یان هێشتا زیندوو، مریشکی سوور کراوە، برنجی لێنراو، هێلکەی کوڵاو، ئەناناس و ئەگەر گوێت بە بانگەشەیان نەدایەو لەوێش نەرۆیشتبای، تەشك و دامەنیان دەگرتی و بەپێکەنین و شێلگیری بۆلای خۆیان رادەکێشای. ئیتر لەناو ئەو هەراو

هۆریاو شادی و خواردنە زۆرەوە، هیچ بیرت لەمردن نەدەکردەوە و مردنیش تۆی هەر لەبیر نەبوو. ئەمڕۆ بەیانی بە دوای (تری کانگ)دا چوومە پەرستگای (کزالوی). بۆ چوونە پەرستگاکە، دەبوایە بەناو سوالکەر و سەگی دڕو زبلٚ و زالٚ و قۆرتی جێ تەقینەوەی بۆمبادا بڕۆی. ئەو شوێنەی ئێستا قۆرتە، پێش دوو سالٚ جەنابی (تین مین) ترۆمبێلەکەی لێ راگرتبوو و کە هات، سوار بوو و گڕی دا، ترۆمبێلەکە تەقییەوە و ئەویش دلٚ و ریخۆلٚەی بەگۆڕێ وەربوو. هەلٚبەت بەریخۆلٚەی دەستکرد ژیانیان راگرتووەو هەموو کەس دەزانێ ئەو بۆمبە ڤیت کۆنگەکان لەوێ دایان نەنابووەوە، کارەکە کاری ئەوان نەبوو.

ژوورەکەی (تری کانگ) دوو دەرگای هەیەو هەر دەرگایەك سێ چوار راهیبی پاسەوانی لێیە. کە چاومان پێ دەکەوێ، زەحمەتە بیرمان بۆ ئەوە بچێ ئەمە بنکەی سەرەکیی نەخشە رشتنی خۆ سووتاندن بێ. (تری لانگ)سالٚی ١٩٦٦، کە لەناو بالٚیۆزخانەی ئەمریکا گرتبوویان و حوکمی مەرگیان دابوو، بەسەر دیواردا ئاودیو بوو و هەلاٚت. رووی لە سیمای مرۆڤێکی وای نەدەکرد رۆژێ بێ و خۆی بکوژێ. دەم و چاوی خڕو پڕ پەلٚەی جۆراو جۆر بوو، نیگای پڕ ساختەیی و ریایی بوو و زەردەخەنەی وەکوو زەردەخەنەی جانەوەرێکی دڕندە وابوو.

نەتدەزانی ئەو زەردەخەنەیە چی لەبن دایە، لەگەلٚ ئەوەشدا رووی ئارەزوویەکی زۆری ژیانی پێوە دیار بوو. ئەوەندە بەسە، کە ئاگای لەتۆ نەبێ، تەماشای بکەی!

ژوورەکەی چوار پایەك و مێزێکی تێدایە. مێزەکە وێنەیەکی گاندی لەسەرە و هەروەها ژوورەکە کورسییەك و چرایەکی خەوتن و رادیۆیەکی دوا مۆدێل و ئامێرێکی هەوا گۆڕی و قوتوویەك چوکلاتی تێدایە. کە سەیری ئەم شتانە دەکەی، لە بارودۆخ و پلەو پایەکەی دەگەی! ئەوەندە بەسە، گوێی لێ بگری باسی بەرنامەی کاری داهاتووی بکاو روونی بکاتەوە بۆ ئەوەی بزانێ چ جۆرە مرۆڤێکە. ئەو خۆی بەلاوە هێزی سێیەمی ڤێتنامە و هەولٚ دەدا پێم بسەلمێنێ نە کۆمۆنیستەو نە لایەنگری داگیرکەرانە: ئایا ئەمە بە کەسێکی وا دەچێ بیر لەمردن بکاتەوە؟ ئەوەی بیەوێ لەپێناوی نیشتمانی خۆی بمرێ بەسەر دیواری بالٚیۆزخانەی ئەمریکادا هەلٚنایە. دەرگای ژوورەکەی لەژوورەوە قوفلٚ نادا،





بەرنامەی درێژخایەن بۆ دوا رۆژی خۆی دانانێ و کاتی خۆی بەخواردنی چوکلات بەفیڕۆ نادا. ئەوەی بیەوێ بمرێ، لەناو یەك دەریا شکۆ و ئارامی و قنیات و بێدەنگی و بەخشش نقووم دەبێ و دوور لە لەزەت و پیلەکە و پارێز کاری ژیانی بەسەر دەبا.

پاشان پرسیاری خۆمم لێ کرد:

– جەنابی پایە بەرز (تری لانگ)، ئایا خۆ سووتاندنی بوودایییەکان بەردەوام دەبێ؟ ئایا ئێوە بڕواتان بەم جۆرە فیداکاری و قوربانی دانە هەیە؟

بەم جۆرە وەلاٚمی دامەوە:

– تا قڕکردنی خەلٚکی بێ تاوان بەردەوام بێ، خۆ سووتاندنی بوودایییانیش بەردەوام دەبێ، بەلاٚم من خۆم چیدی رێگە بەخۆ سووتاندن نادەم، مەگەر پێویست و ناچاری بێ.

ئەمڕۆ هەرچی بوودایی راستەقینە هەیە ئامادەیە خۆی بسووتێنێ، بەرگە گرتنی بیست لترە بەنزین و دە دەقیقە ئێش و ئازار، بۆ گەیشتنە ئامانجێك و نەجاتدانی میللەتێك، کارێکی زۆر ئاسانە. کاتۆلیکەکان پێویستە چاك لەقسەی من بگەن. من دەزانم کاتۆلیکەکان کاتێ کە بەرامبەر میحرابی پەرستگا شەهیدانیان پەسن دەدەن، بیر لە چ دەکەنەوە، بەلاٚم ئەوەش زۆر باش دەزانم کاتێ کە شەهیدەکانیان لەخاچ داوە، یان بوونەتە خۆراکی شێران، هەستیان بەچی کردووە!

– " باشترین ئیش کە مۆرڤ بتوانێ لەژیانیدا بیکا ئەوەیە بە غەمگینی کۆتایی بە ژیانی خۆی بێنێ "

ئەمە دەقی ئەو قسەیە بوو کە پێی گوتم.

نیوەڕۆ، لەگەلٚ (مازۆر) و (کاترین)و پەیامنێرانی تر بۆ فراوین چوومە سەر بانێژەی کۆنتە نینتال. هەوای گەرم و قورس بوو. خۆر ناسك و دونیا هەلٚم بوو. هەموو لە خاو بوونەوەیەکی خۆش و بە لەززەتدا بوون ، بەلاٚم من نەمدەتوانی بەشداری ئەم لەززەتەیان بکەم.

(مازۆر) بەدەنگێکی بەرز پرسی:

– ئەوە تۆ چیتە؟ بیر لەچی دەکەیتەوە؟.

گوتم:

– لەهیچ!

بەلاّم من بیرم دەکردەوە و ئەویش چ بیرکردنەوەیەك!

بیرم لەو وەلاّمەو لە رووداوی دوای وەلاّمەکە دەکردەوە. دوای ئەو وەلاّمە، (تری کانگ) داوایەکی لیّ کردم. پرسی داخۆ دەتوانم نامەیەك بۆ رۆما ببەم؟ منیش پیّم گوت:

(هەڵبەت).

ئەویش دەستی بە نووسین کرد و زۆر بەشیّنەیی و بەدەم بیرکردنەوە نامەکەی نووسی، ئینجا پەڕە کاغەزەکەی لە دەفتەرەکە کردەوە و بە غەمباری دایە من.

– (تری کانگ)، جەنابی پایە بەرز، من ئەم کاغەزە بدەمە کیّ؟

– ئەگەر پیّتان دەکریّ بەڵکو بیدەن بە پاپا.

– پاپا!؟

– بەڵیّ... پاپا رابەریّکی بە دەسەلاّتە. چۆن گویّ دەداتە قسەی کۆمۆنیستەکان، ئاوهاش گویّ لە داگیر کەران دەگریّ. تەنانەت، دەتوانیّ دانیشتن و لیّکۆڵینەوەی نهیّنی بۆ براندنەوەی ئەم جەنگە ریّك بخا، بگرە دەتوانیّ پشووی (نۆئیّل) و جەژنی (تەت) زیاتر بکا. هەر کاتیّ پاپام بیردەکەویّتەوە و هەست دەکەم کەسیّکمان هەیە گویّ لە قسەکانمان بگریّ و تیّمان بگا، نائومیّدیم دەڕەویّتەوە.

گفتم بە (تری کانگ)دا نامەکە بگەیەنمە پاپاو ئینجا زۆر توند دەستی یەکترمان گوشی و کاغەزەکەیم لەگەڵ کۆمەڵە کاغەزەکانم خستە ناو چەکمەجەی میّزەکەم و قوفڵم دا.

(مازۆر) بە سوور بوونەوە گوتی:

– دڵنیام تۆ شتیّکت بەسەر هاتووە!

منیش گوتم:

– نەخیّر، نەخیّر! هیچ، هیچ!

– باشە، ئەی بیر لە چ دەکەیتەوە؟





– بیر لە هیچ ناکەمەوە ، مازۆر.

زۆر حەز دەکەم چاوم بەو ژەنەراڵ (لۆن)ە بکەویّ کە بە کەفی ئاگر کوژیّنەوە خۆ سووتیّنەرەکان دەخاتە سەر شکڵیّکی گاڵتەجاڕی.

لەو رۆژەوە کە خەبەری ئیعدام کردنی سیّ ڤیت کۆنگەکەیان پیّداین، ناوەکەیم هەر لەبیرە.

بچمە هەر شویّنیّك و هەرچی ببیسم، دیسان ناوەکەی لەمیّشکی خۆم دووبارە دەکەمەوە: ژەنەراڵ (لۆن). نازناوی (تۆڤانی سایگۆن)یان پیّداوە و بە دڵڕەقترین پیاوی ڤیّتنامی دەزانن.

(١٠)ی کانوونی یەکەم

ئەمڕۆ، من و (مۆرۆلدۆ) بەرگی سەربازیمان لەبەر کرد و لەگەڵ (باری زورتیان) چووینە دیدەنی دەلتای (مکۆنگ). رۆژیّکی زۆر بەخیّر و بەرەکەت بوو. یەکەم ئەوەبوو زۆر شتمان لە بارەی ئەم جەنابی (زورتیان)ە بەدەست هیّنا کە لە باڵیۆزخانەی ئەمریکا کار دەکات و سەرۆکی (جوسپائو)یەو سەرەڕای ئەمەش بە یەکیّ لەپیاوە هەرە گرنگەکانی (سایگۆن) دەژمیّردریّ. ئەم جەنابی (زورتیان)ە پیاویّکی پەنجاو چوار ساڵەیە، بە بنەچەکە ئەرمەنییە، لووتیّکی زل و ورگیّکی گەورەی هەیەو بڕوای وایە کە ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبیّ ئەم خەڵکە گەمژەو داماوە فیّری ژیان و شارستانی بکا کە هەرگیز بۆنی دیموکراسی و بەرنامەی تەکنیکیان نەکردووە، بڕوایشی وایە کە ئەمریکا بە هاوکاریّکی گەورەی ڤیّتنام دادەنریّ نەك تەنیا لە جەنگ بەڵکو لەبواری ئابووریشدا: کە ئیّمە لەجەنگ سەرکەوتین، ئەوسا ڤیّتنام دەگاتە دەوڵەمەندیی و تازەکاریی ژاپۆن. بەقەدەر ئەوەی کە ژاپۆن قەدری ئیّمە دەزانیّ، ئەوەندەش قەردارمانە، چونکە ئیّمە بووین ژاپۆنەکانمان فیّر کرد چۆن پارەی خۆیان لە دروست کردنی کارخانەو کارخانەداری سەرف بکەن. لە سەرانسەری ڤیّتنام دا، کارخانە و باڵەخانەی هەور بڕ و ئۆتۆبان دروست دەکریّ و دەلتای (مکوك)یش دەبیّ بەشتیّکی وەکوو (فلۆریدا)...)

ئەم جەنابی (زورتیان)ە تیّ ناگا کە خەڵکی (مکونگ) بەهیچ جۆریّ حەز ناکەن

ململانە لەگەڵ خەڵكی (فلۆریدا) بكەن و تەنیا ئارەزووی ئەوە دەكەن كە بەئاشتی و ئارامی برنجی خۆیان بچێنن و بیدروونەوە و بە پەلووكەدار بیخۆن. ئەو بڕوای وایە خەڵكی ڤێتنام زۆر گەمژەو نەفامن، تەنانەت چاكەو خراپەیش لێك ناكەنەوە. ئەو لەوە ناگا كە خەڵكی ڤێتنام تەنیا لەپێناوی خەونی بەهەشتیی خەیاڵیی خۆیانە كە بەرگەی كاول بوونی نیشتمان و قڕبوونی مندالآن و برسێتی دەگرن، یان ئەگەر لەم شتانەش بگا، گوێی پێ نادا. بەهەر حاڵ، ئەوەی لەو ناوەدا ژیانی خۆی لەدەست دەدا، هەڵبەت ئەو نییە، چونكە ئەو خۆی لە ڤیلایەكی زۆر قەشەنگ دەژی كە نازانم چەند ژوور و چەند خزمەتكاری هەیە.

كاتی جەم، هەر خواردنێكی مگێزی لێ بێ بۆی دێنن، بگرە دەتوانێ مۆڵەتی رجیم كردنیش بەخۆی بدا! بەهیچ جۆرێ گیانی لە مەترسی دا نییە. لەوانەیە گەورەترین مەترسی بۆ ئەو، ئەم سەفەرە بێ كە بۆ (مكۆنگ) دەیكا، بێگومان ئەویش بە فڕۆكەی تایبەتی خۆی دەیكا.

دەوری سەعات (دە)ی بەیانی، بەفڕۆكە بچووكەكەی ئەو، هەڵفڕین و كەوتینە رێ. نزیكەی یەك سەعات بەسەر مەرەزەی سەوز و بریقەدار دا فڕین و پاشان لە (كانگ نگای) دابەزین.

جەنابی (زورتیان) بۆ ئەوە چوو بوو لەوێ سەر لەو كوێرە دێیانە بدات كە ڤیت كۆنگە راكردووەكان بەخۆو بە ماڵەوە تیا دەژیان. لەوێ، جێبێك چاوەڕێی دەكردین. بەترۆمبێل بەتەنیشت دەشتی سووتاوی بەر خۆرەتاودا تێپەڕین و گەیشتینە كوێرە دێكان، بەلآم كە گەیشتینە جێ، هیچ گوندمان نەبینی، تەنیا گۆڕەپانێكمان بینی شوورەی تەلبەندی بۆ كرابوو و نەفەری رەشاش بەدەست لە دەوروبەری وەستابوون و پاسەوانییان دەكرد. گۆڕەپانەكە چەند خانوویەكی داری تێدا بوو.خانووەكان پڕ نوێن و چەرچەف بوون، نوێنەكان لەسەر زەوی راخرابوون. پیاوی غەمبار و ژنی منداڵ لەباوەش، لە تەنیشت خانووەكان وەستا بوون. ئەم دیمەنە ئۆردووگای كۆكردنەوەی دیلەكانی بیر خستمەوە. بە جەنابی (زورتیان)م گوت: ئەم خانووانە وەكوو ئۆردووگای كۆكردنەوەی دیلەكان وان. كەگوێی لەم قسەیە بوو، بە هەموو گیانی ناڕەحەت بوو و بە هەموو گیانی هەوڵی





دا بۆم روون بكاتەوە كەمن بە هەڵەدا چوویم:

– دەزانی، رەشاش بەدەستەكانمان تەنیا زێرەوانی و چاوەدێری ڤیت كۆنگەكانیان لە ئەستۆدایەو شوورە تەلبەندەكەش بۆ ئەوەیە رێ نەدا ڤیت كۆنگان هاوڕێ جەنگییەكانی خۆیان بكوژن، یان تەمێ خواردوویان بكەن.

وەكوو باوكێكی نەرم و میهرەبان، كە بیەوێ شتێ لەكچە گەمژەو كەودەنەكەی خۆی بگەیەنێ، ئاوها قسەی لەگەڵ دەكردم. هەر بەو سیما میهرەبانە باوكانەشی سەری لە ماڵەكان دەداو دەستی دڵنەوایی بەسەر سەری منداڵە بچووكەكاندا دەهێنا و زەردەخەنەی بۆ ژنە ناشیرینەكانی ئەوێ دەكرد.

بەیارمەتی دیلماجەكەی بە ڤیت كۆنگە راكردووەكانی دەگوت: (پیرۆزباییتان لێ دەكەم چونكە بە هەر حاڵ ئێوە كاتێ كە لەگەڵ ئێمە دەجەنگان، سەربازیی ئازاو دلێر بوون.)

سەربازە راكردووەكان بە دڕدۆنگی و ناڕەحەتی تەماشایان دەكرد. وەكوو ئەوە وابوو زۆر شەرمەزار بن. هەموویان تەمەنیان نزیكەی سی و پێنج، چل ساڵ بوو و هەموویان لەو پیاوانە بوون كە بیست ساڵی تەمەنی خۆیان بە جەنگ  بردبووە سەر و ئاخیریش خۆیان بەدەست دوژمنەوە دابوو و لای خۆیانەوە كۆتاییان بە جەنگ هێنابوو.

بەڵێ، ئەو رۆژە رۆژێكی پڕ خێرو بەرەكەت بوو، بەتایبەتی كە لەزاری ئەمریكییەك خۆی بیستمان، ژیان لەوێ ئاسان نییە: كوێرەدێی (كانگ نگای) پڕە لە ڤیت كۆنگ و هەموو كۆڵآنەكان مینیان لێ دانراوەتەوە. دەورییەكان بەرۆژ مینەكان هەڵدەگرنەوەو شەو ڤیت كۆنگەكان دووبارە مین دادەنێنەوە...

لەو كاتەدا، ئەو جێبەی سواری ببووین لەپڕ ئیستاپێكی توندی گرت و لێخوڕەكە هاواری كرد كە پێنج مەتر لەپێش خۆیەوە قۆپەنە خۆڵێكی تازە هەڵگەڕاوەی دیوەو بۆی هەیە بۆمبێكیان لەژێر دانابێتەوە.

لێخوڕەكە بە هەڵەدا نەچوو بوو. لێخوڕەكە ترسا نەوەك بۆمبا لەژێر پێچكەی ترۆمبێلەكەی بتەقێتەوە.ئیدی، هێدی كشایەوە دواوە و ئەوسا هەناسەیەكی رەحەتی هەڵكێشاو ئێمەش هەناسەیەكی ئۆخەمان هەڵكێشا.

دوای ئەوە (كانگ نگای) مان جێ هێشت و بەرەو (ئان كزوین) كەوتینە رێ كە كەوتبووە لای باشوور. وەكوو ئەوە وابوو لەسەر رووی مانگ بڕۆین، چونكە ژێر پێمان پڕ قۆرت و چاڵ بوو، قۆرتەكان جێی بۆمبا بارانی فڕۆكەی جەنگی بوون، ئەو فڕۆكانە هاتبوون بۆ ئەوەی رۆژێ بێ و ڤێتنام بگابە دەوڵەمەندیی و دەسەڵات و تازەكاری ژاپۆن و پاشانیش وەكوو ژاپۆن قەرزاری ئەمریكا بێ. دوای گۆی مانگ چووینە سەر گۆی مەریخ!و تەپۆلكەی داری وشك و سووتاوی وەك خەڵووزمان بینی.

بەڵێ داری سووتاو! بەو ئومێدەی رۆژێ بێ و ڤێتنام ببێ بە خاوەنی كارخانەی زۆر و باڵەخانەی هەور بڕی بێ ژمارەو ئۆتۆبانی دوور و درێژ و پێشبڕكێ لەگەڵ (فلۆریدا) بكاو وەكوو ژاپۆن دەوڵەمەند و دەسەڵاتدار بێ و پاشان وەكوو ژاپۆن ببێ بە قەرزاری ئەمریكا!

جەنابی (زورتیان) دیمەنی درەختە سووتاوەكانی بەئێمە نیشان داو گوتی گوایە بۆیە جەنگەڵەكەیان سووتاندووە تا ڤیت كۆنگەكان خۆیان لەناو چڵ و چێوی درەختەكان نەشارنەوە، بەڵام نەیگوت ئەو درەختانە لانی كەم تا بیستساڵی تر ناڕوێنەوە و نەشیگوت كە نەنیدریدار سنیك و ئەرسنیورسیدوم و ئەرسیتامس و مەنگەنیز و كلسیوسیانامید و هی تر رەشەولاغ و گامێشیان كوشتووەو خەڵكیان سووتاندووە و ئەگەر نەشیانسووتاندبن كوێریان كردوون، یان تووشی نەخۆشیان كردوون و جاری واش بووە كوشتوویانن. پاشان گۆی مەریخیشمان جێ هێشت و گەیشتینە جەنگەڵێك هێشتا هەر جەنگەڵ بوو. كە گەیشتینە ئەوێ، لەپڕ دووشتی رەش لەئاسمانەوە دەركەوتن، فڕۆكەی ئەمریكی بوون، لەسەر تەنكێش وەرچەرخان و نزیكتر كەوتنەوەو ناپاڵمی سووتێنەریان بەسەر جەنگەڵەكەدا بەردایەوە وپاشان چڕە دووكەڵێكی رەش لە جەنگەڵەكە بەرزبووەوە ئاسمان.

– جەنابی (زورتیان)، ئەوە ئەمانە چییان بۆمبا باران كرد؟

– وابزانم لۆرییەكی ڤیت كۆنگەكان بوو، برنجی بار كردبوو. بێ گومان دەزانن مەسەلەكە چۆنە، وانییە؟





– بەڵێ، جەنابی (زورتیان)، دەزانم.

لە ڤێتنام برنج لەمانگی كانوونی یەكەم دروێنەی دێ و دروێنە تا كانوونی دووەم بەردەوام دەبێ. هەر لەبەر ئەمەشە ڤیت كۆنگەكانی باكوور لەو كاتەی ساڵ دەست بەسەر دەلتادا دەگرن بۆ ئەوەی برنجیان دەست بكەوێ. برنج بۆ ئەوان لە چەك و تەقەمەنی پێویستتر و گرنگترە، چونكە برنج نەبێ بەبرسێتی دەمێننەوە. لە (هانۆی) چەك و تەقەمەنییان بۆ رەوانە دەكەن، بەڵام برنج نا.

برنج لە دەلتا دەچێنن و ژمارەی ئەو ڤیت كۆنگانەی برنج دەچێنن دەگاتە بیست هەزار كەس. ئەمانە بێ چەك و بێ پاسەوان سەفەر دەكەن و تەنیا فەردە برنج هەڵدەگرن. ئەم رێگایە بەپێ دەبڕن. بەناو رێگا شوێن ونەكانی ناو جەنگەڵدا دەڕۆن. لە ئەیلوول بەرێ دەكەون و لەمانگی ئادار دەگەڕێنەوە. ئەم سەفەرەیان ناو ناوە (جەنگی برنج).

جەنگێكی شاعیرانەیە! ڤیت كۆنگ برنج بەخێر لەهیچ كەس وەرناگرن، بەڵكو بەناوی دەیەك وەری دەگرن. هەر لادێییەك لەسەریەتی سی تا شەست لەسەدی برنجی خۆی بە ڤیت كۆنگەكان بدا بەرامبەر بەمەش كاغەزێك بەمۆری دەوڵەت وەردەگرێ بۆ ئەوەی دوای تەواوبوونی جەنگ ئەو كاغەزە پێشان بداو پارەی برنجەكە وەربگرێ.

هەندێ جار وا دەبێ فەردەكان بایی هەموو برنجەكە ناكەن، لەم حاڵەتەدا، ڤیت كۆنگەكان ئەو برنجەی فەردەی لەبەر دەبڕێ، پارەكەی لە لادێییەكان وەردەگرن،لادێییەكانیش ئەم كارەیان قبووڵە، جاچ لە پێناوی خۆشەویستی نیشتمان بێ و چ لەترسان؟

" من لەداری دونیادا تەنیا ئەم تاكە سەرەم هەیەو دەمەوێ بیپارێزم"

بەڵام لە هەمووی خراپتر ئەوەیە تەنیا ڤیت كۆنگەكان نین دەست لە كاروباری برنج وەر دەدەن، دەوڵەتی ڤێتنامی باشووریش دەست لەم كارە وەردەدا و دەست بەسەر لەسەدا دە تا بیستی برنج دا دەگرێ.

لەهەندێ گونددا، لادێییەكان دەكەونە بەرمامەڵەی هەردوو لا و لە ئەنجام دا هیچ برنجێكیان بۆ ئازووقەی خۆیان و خێزانەكەیان نامێنێتەوە.

ئەمریکی، بۆ ئەوەی گرێی ئەم گرفتەی گوندییەکان خاو بکەنەوە، چاندنی برنجیان قەدەغە کردووەو بۆ خواردنی رۆژانە برنج لە (کالیفۆرنیا) دێنن، فەردە برنجەکان لەسەریان نووسراوە: ( برنجی بەرهەمی لۆس ئەنجلوس ).

بەڵام ئەوان زیاتر حەز لە برنجی زەوی خۆیان دەکەن، چونکە برنجەکە ناسکتر و بەتام و بۆ ترەو زەوی وایان هەیە برنجی لێ بچێنن‌و کە برنج بچێنن ماسی و مار ماسیشیان دەبێ و ئەوانیش مار ماسی لەبرنج زیاتر دەخۆن. لە ئەنجام دا کردیانە ئاژاوە و برنجیان چاند. برنجەکەیان دوورییەوەو سزا دران.

جۆری سزادانەکە، لە هەر گوندێکا جیابوو: لە هەندێ گونددا، بە هیلیکۆپتەر یان فڕۆکەی جەنگی ئەو لادێییانەیان بۆمبا باران دەکرد کە برنجیان دەچاند. دەزانی، ئەوانە کە فرۆکە یان هیلیکۆپتەری دوژمنیان بە ئاسمانی سەر مەرەزەکانیانەوە دەدی چییان دەکرد؟ خۆیان لەناو ئاو نقووم دەکرد و تاپێیان بکرایە هەناسەیان هەڵنەدەکێشا. هەندێ جار لە مەترسی دەرباز دەبوون و بڕێ جاریش دەمردن و زۆربەی جارەکان کە فرۆکەکان ئەرکی خۆیان تەواو دەکرد و دەڕۆیشتن، دوو سێ تەرم لەسەر ئاو و لەناو مەرەزەی برنج دەردەکەوتن و لادێییەکان، بەبێ گریەو زاری، تەرمەکانیان دەناشت و لەبرنج چاندنی خۆیان بەردەوام دەبوون.

بەڵێ، جەنابی (زورتیان) مەسەلەکە ئاگادارم.

پارچە زەوییەکی بچووك لە (ئان کزوین) هەیە فڕۆکەی لێ دەنیشێ.

شەش ئەمریکی تۆقاو لەم گوندەدا دەژین. خەڵکی ئەم گوندە لە (٩٨٪) یان ڤیت کۆنگن و ئەم شەش ئەمریکییە ئێستاش نەیاندەزانی بە چ بەخت و موعجیزەیەك بەزیندوویی ماون و ڤیت کۆنگەکان نەیانکوشتوون. پێیان گوتین:

– بڕۆن، تا زووە بڕۆن! هەر بزانە شەو داهات و ئەوانیش بە زۆری لەژێر پەردەی تاریکی شەو، پەلاماری ئێرە دەدەن.

ئەویش بەلووتی زل و ورگی گەورە و بەو بڕوایەی کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ شارستانێتی بۆ ئەم وڵاتە بێنێ و هی تر... گوێی دابووە ئەم قسانە.





– هێور بنەوە! قسەی خۆتان بکەن!

جەنابی (زورتیان) پیاوێکی جددییە، سەربازێکی راستەقینەیە و لەکاتی جەنگی دووەمی جیهانی، لە ئۆقیانووسی ئارام دا زۆر جەنگاوە. هەر لەبەر ئەوەش کە شەو داهات و تاریك کەوتە عەردی، هێشتا خەندەی بەسەر لێوەوە بوو، کەوتە بەڵگە هێنانەوە بۆ ئەوەی کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ناتوانێ ڤێتنام جێ بێڵێ:

– ئەگەر ڤێتنام خۆی بەدەست ئێمەوە بدا، (لاوس)یش خۆی بەدەستەوە دەدا و پاشان (کەمبۆدیا) و ئینجا (سام)و دواتریش (ئەندەنووسیا)...

من ئەم قسانەم باش دەزانی، زۆر جار بیستبووم و ماوەیەکی زۆر پێش ئێستا بۆ یەکەم جار بیستم. پێش سەردەمی (دین بین فو) بەزمانی فرەنسی گوێم لێ بوو.

<u>(١١)ی کانوونی یەکەم</u>

هەموو رۆژێ سەعات پێنجی دوای نیوەڕۆ، دانیشتنێکی رۆژنامەوانی لە (جوسپائو) رێك دەخرێ. پەیامنێرەکان دەچنە ناو ژوورێکی وەکوو هۆڵی شانۆ و ئەفسەرەکانیش دەچنە سەر سەکۆیەکی وەکوو دەپی شانۆ و دەنگ و باسی تازە رادەگەیەنن. گرنگترین دەنگ و باسی ئەمڕۆ پەیوەندی بە دەلتای (مکۆنگ)ەوە هەبوو. دەنگ و باسەکە ئەمەبوو: دەستەیەك لەپیادەی سەربازیی بیست و پێنجەمین لەگەڵ دەستەیەك ڤیت کۆنگی برنج هەڵگر لێکیان داو لەو شەڕەدا، حەڤدە ئەمریکی و چل و هەشت ڤیت کۆنگ کوژران.

برنج هەڵگرەکان توانییان رابکەن. هەڵبەت دوای ماوەیەك تەرمەکانیان دۆزییەوە بارانی ناپاڵمیان بەسەردا رژابوو. ببوونە رەژوو و کەوتبوونە ناو فەردە برنجی سووتاو.

زۆرم مەراقە بزانم کاتێ کە یەکێ لەو بەرزاییەوە بۆمبا بەسەر برنج هەڵگرێك دا بەردەداتەوە، هەست بەچی دەکا، هەر بۆیەش بڕیارم دا بەشداری لە هێرشێکی هەواییدا بکەم.

(پیتەرز)، ئەفسەرێکی هێزی ئاسمانییە، بەڵێنی پێدام لە یەکەم دەرفەتدا بۆ هێرشێکی هەوایی ئاگادارم بکاتەوە.

(١٢)ی کانوونی یەکەم

(پیتەرز) قسەی خۆی هێنایە جی. هێرشە هەواییەکە بۆ سبەی بەیانی پێشنیار کراوە. فڕۆکەکەمان جێتێکی مۆدێل زۆر نوێیە(A.٣٧) ، تەنیا چەند مانگێکە لە ڤێتنام خراوەتە کار.

– ئەرکەکە بۆ (دەلتا)یە. بێگومان مەبەست لە بۆمبا بارانەکە کوشتنی برنج هەڵگرەکان نییە، بەڵکو تێکدانی بنکەیەکی ڤیت کۆنگەکانە، حەزتان لێیە؟

– بەڵێ، پیتەرز!

– هەڵبەت ئەوە دەزانن کە هێزی ئاسمانی هیچ جۆرە لێپرسینەوەیەك بەرامبەر بە ئێوە لەئەستۆ ناگرێ.

– بەڵێ، وایە!

داوای لێ کردم رۆژی پاشی سەعات حەوتی بەیانی لە گۆڕەپانی (بین هوئا) ئامادە بم و ئینجا لەپڕ لێی پرسیم داخۆ بەراستی ئێستاش هەر ئارەزووم لێیە بەشداری ئەم هێرشە هەواییە بکەم؟یان نا ؟!

کە وەڵامم دایەوەو گوتم: هەڵبەت ئارەزووم لێیە.

بە حەپەساوی و سەرسامی سەیری کردم.

(مۆرۆلدۆ) وا تێ دەگا من شێت بوویم و هەمیشە دەڵێ گوایە ئەگەر من لەم هێرشە هەواییە بمرم، هەموو بەرۆکی ئەو دەگرن کە بۆچی لێگەڕاوە بەشداریی ئەم هێرشە هەواییە بکەم. کە قسەکانی گۆڕاو کردییە ورتە ورت، فرانسوا بەدەم پێکەنینەوە گوتی:

– مەترسی تێدا نییە. ئەوەندە بەسە بزانی چەتری رزگاری بکەیتەوە.

جێتی (A.٣٧) کورسی هەڵدەری تێدایە. هەر کورسییەك لە هەردوو لاوە شیشەیەکی پێوەیەو بە ئاماژەیەکی فڕۆکەوانەکە شیشەی دەستە راست دەجووڵێتەوە. یەکەم جار بەرەو خوارەوە دەچێ، ئینجا بەرەو سەرەوەو پاشان هەردوو شیشەکە بەیەکەوە دەجووڵێن و دەرگا دەکرێتەوە و دەکەوینە ئاسمان.

چەتری رزگاری لەخۆیەوە دەکرێتەوە.

(مۆرۆلدۆ) پرسی:





– ئەی ئەگەر نەکرایەوە؟

– ئەگەر نەکرایەوە، دەسکێکمان لەبەر دەمە دایدەگرین.

– ئەگەر دیسان هەر نەکرایەوە؟

– کە گەیشتیتە سەر زەوی پێیان دەڵێی و ئەوانیش چەترێکی تری رزگاریت بۆ دێنن! ئایا تۆ ئەم چیرۆکە خۆشە دەزانی؟!

– بەڵێ، من هەمیشە بەم چیرۆکە خۆشە پێکەنینم دێ، بەڵام ئەمشەو نەء. .

بێگومان لەترسان نییە کە پێ ناکەنم، بەڵکو تەنیا بیر لەو ئەرکانە دەکەمەوە کە (پیتەرز) دەبێ جێ بە جێیان بکا. زرانیم دەلەرزێ!

– فرانسوا، ئەرکی ئەمڕۆ چییە؟

– بۆمبا باران کردنی جێگایەکە. تۆ لە تەنیشت پیاوێکی گەمژە دادەنیشی، گەمژەیەکی وایە ، چوار ساڵە جگە لە داگرتنی دوگمەی بۆمبا هاویشتن قەت هیچ ئیشی تری نەکردووە. بەیانیش دوگمەیەك دادەگرێ و خۆت دەبینی بۆمبا چۆن دادەڕژێتە خوارێ.

– فرانسوا، زرانیم دەلەرزێ.

– ئەی، کەواتە بۆچی دەچی؟

– ئاخر دەمەوێ بزانم کە یەکێ بۆمبا بەسەر یەکێکی تردا بەردەداتەوە، هەست بەچی دەکا؟.

– دەتەوێ هەست بەچی بکا، کە خۆی هەستی نییە!

– شتی وا نابێ.

– دەبینی! بەهەر حاڵ. بەیانی زووتر لە خەو رادەبم بۆ ئەوەی بەوەختەوە بتگەیەنمە فڕۆکەخانەی (بین هوئا).

بەم جۆرە چاکەو خۆشەویستی خۆی بەرامبەر بەمن پێشان دا. لەپڕ هەموویان سۆزو میهرەبانییان لەگەڵ نواندم:

(مازۆر) بۆ شێو داوەتی کردم. لەکاتی شێو خواردن، ئامۆژگاری کردم و باسی تاقی کردنەوە هەواییەکانی خۆی بۆ کردم. پاشان بەسەرهاتی سوار بوونی ئەو هیلیکۆپتەرەی بۆ کردم کە دەستڕێژی لە ڤیت کۆنگەکان دەکرد.

ئەو چێشتخانەی شێومان لێ خوارد چێشتخانەیەکی چینی بوو، (مازۆر) کراسێکی نوێی لەبەر کردبوو. (فلیکس) بۆ دوو رۆژ پاشتر، دەواتی فراوینی کردم. (وینچنزۆ تۆرنتا) داوای لێ کردم کە لەو هێرشە هەواییە گەڕامەوە، یەکسەر سەر لە باڵیۆزخانەی ئیتاڵیا بدەم و گوتی:

– توخوا کە هاتی بە هەموو شتی خۆتەوە وەرە!

بەراستی ئینسان رۆحێکی پووچی هەیە. هەموو بڕوایان وایە کە من دەکوژرێم و کەس بەبیری دا نایە ئەوە منم کە دەچم خەڵك دەکوژم.

(١٣)ی کانوونی یەکەم

دوای نیوەڕۆ

دەمەوێ موو بەموو مەسەلەکەتان بۆ باس بکەم. هەر لەسەری سەرەتاوە، واتە لەمڕۆ بەیانی سەعات شەشەوە.

سەعات شەش، فرانسوا بە خەواڵوویی هاتە دووم. بەدەم باوێشکەوە دەرگای ترومبێلی بۆ کردمەوە بۆ ئەوەی سوار بم. لەرێگادا، باسی فرۆکە و ڤیت کۆنگ نەبێ، باسی هەموو شتێکی کرد. بەردەوام قسەی دەکرد بۆ ئەوەی لەپشت سوکان خەو نەیباتەوە.

لەپڕ لە (بین ئوها) هەستی کرد من پۆتینم لەپێدا نییەو پێڵاوی حەوانەوەم لەپێیە. لە نشکەوە لە خەو راپەڕی و هاواری کرد و گوتی ئەگەر پێویست بکا بە چەتری رزگاری دابەزی، بەم پێڵاوانە پێت ورد و خاش دەبێ، ئینجا گوتی: جەنگ گاڵتەی ژنان نییەو تازە بۆ گەڕانەوە و لەپێ کردنی پۆتینی سەربازیی زۆر درەنگ داهاتووە. ئینجا بە تووڕەیی و بێ ئەوەی خواحافیزیم لێ بکا، رۆیشت.

چوومە باڵەخانەی (٥٤)، بڕیار بوو لەوێ چاوم بە (پیتەرز) بکەوێ.

دوو ئەفسەر لەوێ بوون. بەشادومانی پێشوازییان لێ کردم و پاشان داوەتیان کردم قاوەیەك بخۆمەوەو داوایان لێ کردم نەختێ سەبر بگرم تا (پیتەرز) دەردەکەوێ، ئینجا دەستیان بە گفتوگۆی خۆیان کردەوە:

– پێم گوت: مەگەر تائێستا نەتزانی بوو ڤێتنام وجوودی دەرەکی نییە؟ ئێستا هۆیەکەت پێ دەڵێم. بزانم، کاتێ کە ژنەکەت کاغەزت بۆ دەنووسێ لەسەر زەرفەکە





چی دەنووسێ؟

ئایا دەنووسێ: (سایگۆن)، (ڤێتنام)؟ نەء، . دەنووسێ: ( apo liam ) واتە پۆستەی سەربازیی و ئینجا ژمارەیەکیشی لە تەنیشت دەنووسێ. بۆچی؟

ئەویش وەڵامی دامەوە: چونکە ناو نیشانی سوپایی بەکورتی دەنووسن.

منیش گوتم: نا، لەبەر ئەوەیە چونکە (سایگۆن)، وجوودی نییە، ڤێتنام وجوودی نییە. بەهەر حاڵ، ئەگەر بنووسێ (سایگۆن)، (ڤێتنام) کاغەزەکەت هەرگیز بەدەست ناگا.

کابراکەی تر گوتی:

– قسەیەکی باشت کرد، قسەیەکی جوانت کرد.

دووەمیان باشترە، پێم گوت: با بەڵگەیەکی باشترت بۆ بێنم. تۆ لە (فرانسیسکۆ)ی، نیوەڕۆیە و (١٢)ی کانوونی یەکەمە، وەکوو ئەمڕۆ. سواری فڕۆکە دەبی و دێیتە (سایگۆن). گەشتە هەواییەکەت بیست و چوار سەعات دەخایەنێ و دەگەیتە (سایگۆن). ئێستا سەعات چەندە؟

نیوەڕۆیە.

چ رۆژێکە؟

(١٢)ی کانوونی یەکەمە. بۆچی؟

بۆچی؟

ئەویش گوتی:

– چونکە سەعات بەپێی وڵاتی جیاواز، دەگۆڕێ.

گوتم: نەء، لەبەر ئەوەیە چونکە تۆ ئەو سەفەرەت هەر نەکردووەو هەرگیز بە شوێنی مەبەست نەگەیشتووی. هەر بۆیەش (سایگۆن) وجوودی نییە. گیانە، هەر بۆیەش هیچ ڤێتنامێ وجوودی نییە.

کابراکەی تر گوتی:

– ئۆی ئەمەش زۆر جوان بوو، ئینجا؟

– ئینجا تا (PDB) بەرێم کردو رۆیشتم، دوای نەختێ ساروخێکی پێ کەوت و مرد. لە (سایگۆن)ی (ڤێتنام)، مرد. ئەو شوێنەی هەرگیز وجوودی دەرەکی نییە.

– دوێنێ دوو نەفەری تریش لە (P.D.B) کوژران.

– بەڵێ!

ئاوڕی لێ دامەوە و سەرنجی نیشتە سەر پێڵاوی حەوانەوەم و تێی نز بووەوە:

– دەتەوێ بەم پێڵاوەوە بچیتە هێرشی هەوایی؟

– ئاە، ... دەزانی... من...

– مەگەر شێتی.. ئەی ئەگەر ناچار بووی بە چەتری رزگاری خۆت هەڵاوێی؟

– ئاە... من... باشە ...

– سەردەستە، خێرا پۆتینێك بۆ ئەم ژنە شێتە پەیدا کە!

– بە مەزەندەی خۆم یەکسەر چووە نووسینگەی ژەنەراڵ بۆ ئەوەی پۆتینێکم بۆ پەیدا بکا، بەڵام کەس پۆتینی بە قەدەر پێی منی نەبوو. هەموو پۆتینەکان ئەگەر بە پێڵاوی خۆشمەوە لەپێم کردبان، هێشتا بۆ پێی من گەورە بوون.

پاشان لەگەڵ سەردەستەکە چووینە ژووری مەشق. سەردەستەکە زۆر شادو بە کەیف بوو، پێی گوتم:

– تکایە دانیشە. ئەم کورسییە دەق وەکوو مۆدیلی (A.٣٧) وایە. چەتری رزگاری فڕۆکەکە دەدۆزیتەوە. مەسەلەی دەسك و شیشەکە دەزانی؟ باشتریش.

ئێستا فەرماندە دەیەوێ بفڕێ. ئەم چاکەتە لەبەرکە. زۆر قورسە، وانییە؟

– با، قورسە! دەست بخەرە گیرفانەکان. ئەها، بەم جۆرە! هەرچی بۆ خۆهەڵدان پێویستتان بێ، لەناو گیرفانتان هەیە.

ئەمە دەزگای قسە کردنە. کە گەیشتنە سەر زەوی، دەبێ یەکسەر بیخەنە کار. ئاوها ئیشی پێ بکەن! ئەمەش چراوگە: ئەمە سوور و ئەمە زەرد و ئەمەش شین. ئەمەش هەگبەی کەرەستەی فریاگوزارییە. ئەمەش تۆڕێکی بچووکی ماسی گرتنە.

– تۆڕی بچووکی ماسی گرتن؟

– بەڵێ، بۆ ئەو کاتەیە ئەگەر لەدەو ئاو کەوتیتە خوارێ و درەنگ بە هاناتەوە هاتن و برسیت بوو، بتوانی بۆ خۆت ماسی پێ بگری!

دەبینی ئێمە بیرمان لە هەموو شتێ کردۆتەوە! ئەی پێڵاوت؟





– من لەم پێڵاوە زیاترم نییە... لەو باوەڕەدای ناچاربین بە چەتری رزگاری دابەزینە سەر زەوی؟

– لەوانەیە ناچار نەبن. دەزانی، (ئاندی) فڕۆکەوانێکی زۆر چاکە. تا ئێستا دوو سەدو هەشتاو پێنج ئەرکی جێ بەجێ کردووە. فڕۆکەوانێکی پیشەوەرە. دەزانی، مەبەستم لە (ئاندی) فڕۆکەوانی ئەو فڕۆکەیەیە کە ئێوە لەگەڵ ئەم هێرشە هەواییەی دەچن. فڕۆکەوانێکی شارەزایە. بێ گومان ئەمڕۆ بە ئەرکێکی سادە دەرناچێ. ئەمڕۆ هێرشێکی ستوونیتان هەیە. دەزانی یانی چی؟ ئۆی، ئەوەتاش (ئاندی)!

(ئاندی) گەنجێکی بەخۆوە بوو. قژو سمێڵی زەردی سووربباو بوو. بە هەنگاوی شێنەیی لێمان نزیك کەوتەوە. کراسێکی بۆرو مەیلەو شینی لەبەر بوو، جگەرەیەکی نیوە کێشراوی بەدەستەوە بوو.

– گوتتان ستوونی؟!

– لە هەموو ستوونێ ستوونی تر! زۆر خۆشە. ورووژێنەرە!

ها، ئەمانە بگرە ، بێ شك پێویستت پێ دەبن. ئەوسا پێنج شەش کیسەی پلاستیکی تایبەت بە رشانەوەی لە دەستم نا.

لەو کاتەدا، کابرای گەنج گەیشتە تەنیشتمان. جگەرەکەی گواستەوە دەستەکەی ترو بەبێ ئۆقرەیی چاوەڕێی کرد بە منی بناسێنن.

سەردەستەکە پێی ناساندم:

– کاپتن (ئاندی)، سەر بە (ئوسکادرانی) شەش سەدو چواری هێزی ئاسمانییە. کاپتن، ئەمڕۆ ئەم خانمە نەفەری ئێوەیە.

– سلاو،

دەم و چاوی هێمن و ئارام بوو، شەرمی پێوە دیار بوو. نیگای ئارام و وەکوو ئاوی مەنگ وا سەوز بوو. دەم و چاویشی هەر ئارام بوو. گۆنای ئێسکن و قژی زەردی سووربباو بوو. تەمەنی سی ساڵ دەبوو.

– ئەگەر ئامادەی، با بڕۆین!

– بەڵێ، کاپتن.

پێش ئەوەی بڕۆین، فڕۆکەوانێك هاتە لامان، فڕۆکەوانەکەی پێ ناساندم.

گەنجێکی قژ خورمایی چاو ڕەش و بێ دەنگ بوو.

– سەرهەنگ (مارتیل)! فڕۆکەی دووەم داژوا. بێ گومان ئەم ئەرکە دەبێ بە دوو کەس ئەنجام بدرێ، بەڵام ئەو بە تەنیا فڕۆکەیەکی تر داژوا.

(مارتیل) زەردەخەنەیەکی هاتێ. هەردوو جێتی (A.٣٧) ئامادەبوون بۆ فڕین و بۆمبا کانیشیان لە جەستە بەستبوون. فڕۆکەکان دەتگوت لە بۆمبا دروست کراون. بۆمبا کانیان لەبن باڵی فڕۆکەکان چەسپ کردبوو. لەهەر لایەکەوە دوو بۆمبای ناپاڵمی حەفت سەدو پەنجا کیلۆیی و بۆمبایەکی ئاسایی پێنج سەد کیلۆییان قایم کردبوو. بۆمبا ناپاڵمەکان دەوری سێ مەتر درێژ و پەنجا سانتیمەتر ئەستوور بوون و نزیکەی هەر هەموو گۆڕەپانەکەیان داگرتبوو. ئەو پەڕی دە سانتیمەتر لە زەوی جیاببوونەوە و ڕەنگە کەمتریش. وات دەزانی ئەمانە لەگەڵ یەکەم تەکانی فڕۆکە بە زەوی دەکەون و دەتەقنەوە.

(ئاندی) بەمیهرەبانیی گوتی:

– ئۆی، نا. مەترسی تێدا نییە.

چووینە ناو فڕۆکەکەو لەسەر کورسییەکان دانیشتین. کورسییەکان پێکەوە نووسا بوون. کورسی من لەلای ڕاستەو کورسی ئەو لەلای چەپە بوو. قایشمان بەست. قایشی چەتری ڕزگاریشمان بەست. کڵاومان لەسەرناو ڕووبەندی ئۆکسجینمان لەسەر دەممان دانا.

هەستم دەکرد جێگای پێکەنینم. دڵی خۆم بەوە خۆش کرد کە: (بەوەی باشە، هیچ ناسیاوێ بەم سەرو سەکووتە نامبینێ)

پاشان بیرم کردەوە: (ڕۆژێکی چەند خۆشە! خۆشترین ڕۆژە تا ئێستا لەڤێتنام دیبم. بەراستی ڕەوا نییە لەڕۆژێکی وا خۆش خەڵك بکوژین.)

لەناو کڵاوەکەمەوە گوێم لەدەنگێ بوو...

– گوێت لە دەنگمە؟

– بەڵێ!

– ئامانجمان خوارووی (میتۆ)یە. مەبەستم بۆمبا بارانەکەیە. تێکدانی





شوێنێکی حەوانەوەی ڤیت کۆنگەکانە.

– باشە.

– ئەگەر بەرێکەوت بە گوللە پێکراین، من هەوڵ دەدەم فڕۆکەکە بخەمە سەر باری ئاسۆیی و ئینجا کە بەپەنجە ئیشارەتم کرد، یەکەم جار تۆ خۆت هەڵاوێ و منیش هەوڵ دەدەم یەکسەر دوای تۆ خۆم هەڵاوێم... باشە؟

– باشە!

– ئەگەر یەکتریشمان بزر کرد، مەترسە. دوێنێ تەنیا بە دە دەقیقە فڕۆکە ونبووەکەیان دۆزییەوە.

– دوێنێ؟

بەڵێ: تا ئێستا دوو فڕۆکە لە جێ بەجێ کردنی ئەم ئەرکەدا، بێ سەرو شوێن چوونە.یەکێ دوێنێ و یەکێ پێرێ. بەڵام فڕۆکەوانەکەی دوێنێ لە مەترسی دەرچوو.

– ئەی ئەوەی تر؟

– ئەوەی تر مرد.

سەرنجێکی لەپێڵاوەکەم داو مەکینەکانی بە گەڕ خست. مەکینەکان کردیانە گڕە گڕو بۆمبا ناپاڵمەکان جووڵانەوە. زەوی فڕۆکەخانە لەژێر پێمان ڕای دەکرد و دوور دەکەوتەوە. بەرەو ئاسمانی شین هەڵفڕین.

– خۆشە، وانییە؟

– بەڵێ، کاپتن.

– من ئەم فڕۆکەیەم زۆر خۆش دەوێ. فڕۆکەوانی ئەم فڕۆکەیە هەستی وەکوو هەستی لێخوڕی ترۆمبێلی پێشبڕکێ وایە. ئایا تا ئێستا هیچت لەبارەی (TAY.٣٧) بیستووە؟

– نا

ئەو لەمەش باشترە. ئەگەر مەکینەیەکی لەکار بکەوێ، زۆر بە ئاسوودەیی دەتوانی بە مەکینەکەی تر لە فڕینی خۆت بەردەوام بی، وەکووئەوەی هەر هیچ رووی نەدابێ.

– ئۆی! بەراست؟

– بەڵام (A.٣٧) یش وەکوو (TAY.٣٧) باشە.

مایلەو هەڵەوەڕی گرتبووی. زۆر قسەی دەکرد. ئاوازی دەنگیشی گۆڕابوو. ئیتر هیچ نیشانەی ئارامی پێوە دیار نەبوو. لەشوێنێکی خوارووی (میتۆ) تاقمە ڤیت کۆنگێکی شەکەت سەیری ئاسمانی شینیان دەکرد.

– کاپتن، بە چەندج دەقیقەی تر دەگەینە لای ئامانجەکەمان؟

– دەوری سی دەقیقەی تر.

– ئەمانە سی دەقیقەیان ماوەو ئیتر دەمرن. یان ئەوەتا ئێمە دەمرین و یان بۆیشی هەیە ئێمەو ئەوان بەیەکەوە، لەیەك چرکە ساتدا بمرین.

سی دەقیقەی ترو ئاسمان شینەو (ماتیل) لە تەنیشتمانەوە دەفڕێ. دەستمان بۆ هەڵدەشەقێنێ. سی دەقیقە چەند درێژە دەکێشێ؟

زۆر درێژە ناکێشێ.

بە چاوترووکانێك گەیشتینە سەر ئامانجەکەمان.

(ئاندی) گوتی:

– ئەوا گەیشتین.

هەموو شتێ بەخێرایی رووی دا. فڕۆکەکە بەشێوەیەکی ستوونی بەرز بووەوە. رووی کردە لای دەستە راست، ئینجا بەرەو ئەو درەختانە چوو کە چرکە بەچرکە تا دەهات هەر گەورەتر دەبوون و گەورەتر دەبوون. ئێستا دەمتوانی لقەکانیان لێك جیا بکەمەوە، ئێستا ئەوا گەڵای درەختەکان بەفڕۆکەکەمان دەکەوێ. بۆمبای لای راستەش لەگەڵ ئێمەدا لەزەوی نزیك دەکەوتەوە، بۆمبایەکی رەش و درێژ بوو. ناپاڵم بوو. هەر ئەو جارە بوو دیتم و نەمدیتەوە.دەق لەو کاتەدا کە لەدرەختەکان نزیك کەوتینەوە، ئیتر نەمدیتەوە. ئینجا لەرزێکم پێدا هات و هەستم بەخۆم کرد سووك بوویم.

ئەم فڕینە سەرگێژکەرەیە تەواو بوو، درەختەکان نەمان و هەستم کرد لەجێی درەختەکان بەردێك دەبینم، بەردێ دەستی پێ نەکەوێ. ئاسمانی شین قورس بوو. تا دەهات هەر قورستر و قورستر دەبوو، ئەوەندە قورس بوو، هەستم کرد





خەریکە وردو خاشمان دەکا. وردو خاشمان دەکا، لە کاتێکا کە چاومان بەسراوەتەوە و دەستمان کار ناکاو مێشکمان لە هەموو شتێ بەتاڵ بووە، تەنیا ئەوەندە ماوە : (وای خودایە!). من هەرگیز بە خەیاڵم دا نەدەهات ئاسمان ئەوەندە قورس بێ، خودایە! وابکەی ئاسمان سووکتر بێ.

ئاسمان سووکتر بوو و (ئاندی) هاواری کرد، گوتی:

– شتێکی بەرز بوو. تۆش زۆر بەباشی بەرگەت گرت. ئافەرین! بەماوەی نۆ چرکە، لەسی هەزار مەترەوە گەیشتینە دوو سەد مەتر و ئەویش بەخێرایی (G XIS) و ئێوە بەرگەتان گرت.

– سوپاس، کاپتن!

– چاوت چۆنە؟ باشە؟ باش دەبینی؟

– بەڵێ، کاپتن!

جارێکی تر، هەوڵ بدە ماسوولکەی ورگت گرژ بکەی، هەروەها ماسوولکەی دەستەکانیشت.

هەوڵ بدە ماسوولکەی دەست و ورگت زۆر توند بکەی و بیگوشی، دوگمەی لای دەستە راستت دابگرە. ئەمە ئۆکسجینە، ئۆکسجینی ساف و خوڕ هەڵمژە.

– بەڵێ، کاپتن.

– ناپاڵمەکان دا دەڕژان و هیچ قسە نەبوو.

– کاپتن، ئەرێ هەموو شتێ بەچاکی بەرێوە چوو؟

– زۆر باش بوو. دەق وەکوو کچێکی فەرمانبەر دار نیشانەی خۆی پێکا. ئەم دووکەڵە رەشەی ژێر پێمان دەبینی؟ ئێستا نۆرەی (مارتیل)ە.

(مارتیل) کەوتە کار. وەکوو تەنیا پنتێکی شین وا بوو لە ئاسمانی شین. ئەویش بۆمبای خۆی بەردایەوە. بۆمبای (مارتیل)یش یەکەو راست بەو شوێنە کەوت کە دەبوایە پێی بکەوێ. چرە دووکەڵێکی رەش لە شوێنی بەربوونەوەی بۆمباکە بەرزبووەوە ئاسمان. (مارتیل) دووبارە بەرزبووەوە تەشقی ئاسمان و دیسان لە ئاسمانی شین دا بوو بە پنتێکی شین ، بوو بە پەروانەیەکی سەرگەردان!:

(نگوین وان سام، پێم بڵێ بزانم، کاتێ ئەو هەموو کەسانەت دی کە

کوشتبووتن، هەستت بە چی کرد؟

– هیچ. فڕۆکەوانێکی ئەمریکی کە بۆمبا بەسەر گوندێکی ڤێتنامی دەستەپاچەدا بەردەداتەوە هەست بەچی دەکا، منیش هەستم بەوشتە کرد. جیاوازییەکە تەنیا ئەوەیە ئەو لە حاڵەتی فڕین دایەو ئەنجامی کارەکەی خۆی نابینێ. چ کەسێ پێشتر ئەم قسانەی بۆ کردووم؟

– ئەها، ئاسمانگەڕێك! (والتەر شیرەر). ئەو ڕۆژە، لە کیپ کەنەدی، کە باسی جەنگی کووریامان دەکرد، گوتی:

– ئێمەی فڕۆکەوان، بێ ئەوەی دەست و چاومان پیس بکەین، خەڵك دەکوژین. بێ ئەوەی هیچ شتێ پیس بکەین، هەر هیچ شتێ؟

(ئاندی) گوتی:

– وریابە، وا دووبارە دادەبەزینە خوارێ و ئێستا بۆمبای لای خۆم داوێم.

بۆ جاری دووەم کارەکە دووبارە بووەوە. هەروەها بۆ جاری سێیەم و جاری چوارەم و جاری پێنجەم و جاری شەشەم و هەموو جارێ بە نۆ چرکە لە سێ هەزار مەترییەوە دادەبەزین دەگەیشتینە دوو سەد مەتری و هەموو جارێکیش هەستمان دەکرد تازە ئیتر بەرز نابینەوە، بەڵکو بەرەو خوارتر دەچین و زەوی کون دەکەین و لەوێ دەگیرسێینەوەو ئیتر کارمان بەوەدا نییە داخۆ ڕۆژ کوێرمان دەکات و ئاسمان وردو خاشمان دەکا. جاری دووەم ترسام. وام کەوتە بەر چاو ڤیت کۆنگ تەقەمان لێ دەکەن، دەمەویست رابکەم، بەڵام بۆ کوێ؟ ئینسان لەسەر زەوی بێ دەتوانێ رابکا، دەتوانێ خۆی دەرباز بکا، دەتوانێ خۆی بشارێتەوە، بەڵام لە ناو فڕۆکەدا لە هەموو شوێنێ زیاتر هەست دەکەی لەناو تەپکە دای. جاری سێیەم خۆم بەدەستەوەدا، تەنیا ئاگام لەوەبوو کە (ئاندی) بۆمبای دەهاویشت.

دووبارە بۆمباکانی لای منی هاویشت. منیش هەموو شتێکم بینی و شوێنی بزووتنەوەکانی کەوتم.

(ئاندی) دوگمەکەی داگرت، بۆمباکە تەکانی داو خۆی لە فڕۆکەکە جودا کردەوە و بەشێنەیی بە فڕۆکەکەدا شۆڕبووە و ئینجا سەری بردە پێش و بەدوامان دا





هات، تا وای لێ هات بەتەنیا ڕێی خۆی گرت و ڕۆیشت. جاری چوارەم و جاری پێنجەم و جاری شەشەم. ئیتر راهاتم، دەمتوانی بە ئارامی سەیری ئەم نمایشە بکەم. ئینسانەکانی نمایشەکە، تارمایی وردیلە بوون، لە تەنیشت لۆری و فەردە قوومەکان رایان دەکرد. هەندێك ئاگریان تێ بەربووبوو، دەستیان رادەوەشاند بۆ ئەوەی ئاگرەکەیان بکوژێننەوە. پاشان یەکێکم بینی لەناو ئاگر دەگەوزی و درۆیە بڵێم هەستم بە بەزەیی یان بە تاوان کرد بەرامبەری. من تەنیاخەریك بووم دوعام دەکرد (ئاندی) بە سەرکەوتوویی ئەرکەکەی جێ بەجێ بکا. ئەمانە بکوژێ و خۆی نەکوژرێ. ئیتر کاتم نەبوو بۆ ئەوانە بگریم، ئارەزووشم لە گریان نەبوو. پاشان لە بەرزایی سێ هەزار مەتر هەستم کرد سپ و ساغم. کە (مارتیل)م بینی دادەبەزییە خوارەوە، هەستم بە جۆرە چزەیەك کرد، بەڵام چزەکە بە ئازار نەبوو. تەنانەت لەچزەی لەلەش راچوونی دەرزیش کەمتر بوو. ئەم دەرزییە ویژدانی چاکی خۆم نەبوو، ئیرادەیەك بوو لەویژدانی ئاوەزمەوە سەری هەڵدابوو.

– کاپتن، لە ئیشەکەمان بووینەوە؟

– ئۆی، نا! ئێستا دەبێ دابەزینە خوارێ و لەنزیکەوە تۆپخانەکەیان ببینین و بۆمبا بارانی بکەین. دەیبینی؟

شەو

ئەمڕۆ دەمەوێ نووسین بنێمە لاوە، چونکە تووشی دەردە دڵ بوویم. بێ گومان دەردەکە ئەوەندە گران نییە، تەنیا نەختێ لەرز و دڵەکوتێم لێیە. دختۆر گوتی: ئەم دۆخەت زوو کۆتایی دێ و دەبڕێتەوە. هۆی ئەم حاڵەتە بۆ ئەو کردەوەیە دەگەڕێتەوە کە ئەمڕۆ سەر لەبەیانی ئەنجامم دا.

دختۆر بڕوای وابوو دەبێ (ئەلیکترۆ کاردیۆ گرام)ێك بکەم، ئینجا تووڕەبوو و گوتی:

– ئای ئەمریکینە! ئەم ئەمریکییانە تەنیا بایەخیان بە پێڵاوەکەت داوەو هەقیان بەسەر دڵتەوە نەبووە.

دختۆرێکی فەرەنسی بوو.

بەهەر حاڵ، هەرچی بوو، تازە ڕۆیشت. ئێستا لەکوێ نووسینەکەم بڕی بوو،

لەویٚ دەگەڕێمەوە سەری. دەبیٚ بۆتان باس بکەم کە (ئاندی) خەبەری دامیٚ بۆ جاری حەوتەم دادەبەزینە خواریٚ، هەستم بەچی کرد؟ ئێستا پێتان دەڵێم:

پێش هەموو شتیٚ هەستێکی نائومێدی دایگرتم و ئینجا تووشی وروژان هاتم. کت و مت وەکوو یەکیٚ لە گیانەڵادا بیٚ و بەرەو پیری مەرگ بچیٚ. هەر چۆن بیٚ، پاشان هەستم کرد هاویشتنی ساروخ بەرقەوە چ مانایەك دەگەیەنیٚ:

دەبین بە جەستەی بیٚ جووڵەو زۆر بە ئاسانی هەستی پێشوومان دەگۆڕیٚ. جا نازانم چۆنی بڵێم، هەستم کرد دەرزییەکم لەلەش چەقی. ڕەنگە وابیٚ.

(ئاندی) بەپێکەنینەوە گوتی:

– ئای، ئەم جارە ئیشەکە دژوارە، بۆ خۆت دوعا بکە!

منیش لە وەڵامدا گوتم:

– (ئاندی) بە ماوەی بیست چرکەی تر تۆ دەبی بە خودانی من!

ئەوسا دابەزینە خواریٚ. کە بەرەو خوار دەچووین، تا دەهات بەشێوەیەکی باشتر و باشتر دەمبینین. ژمارەیان زۆر نەبوو. پێنج شەش کەس بوون. ئەوانیش وەکوو تەرمەکانی (داکتۆ) جلی خاکییان لەبەر بوو، وەکوو تەرمەکانی (داکتۆ) وردیلە بوون و وەکوو تەرمەکانی (داکتۆ) کڵاو خوودەی ئاسنینیان لەسەر نەبوو. هەموویان لەشێوەی یەك دەستەدا بوون. دوو کەسیان ڕەشاشیان پیٚ بوو، ئەوانی دی تفەنگ. دەرکەوت چاوەڕێی ئێمەیان دەکرد. بەبیٚ جووڵە وەستابوون. تەنانەت لەبیرمە لەو کاتەدا بیرم کردەوە چۆن دەبیٚ ئەوانە ئاوها بەبیٚ سەبری لەسەر زەوی چاوەڕێی فڕۆکە بکەن؟.

زۆر بەقووڵی، لەناخەوە ستایشم کردن. یەکەم جار تەقەیان نەکرد. پاشان دەستیان بە تەقە کرد. دیتم گوڵە ئەستێرەمان بۆ دەهات. سەرەتا یەکدیگر دەبوون و پاشان لێك دەبوونەوە. کە دیتم تەقە دەکەن، چیتر ستایشم نەکردن. هەستم بە رق وقین کرد بەرامبەریان. لەو کاتەدا دەستم بەدوعا کرد. لەخوا پاڕامەوە، ئەو خوایەی ماوەیەك (ئاندی)م کردە جیٚ نشینی. گوتم:

خودایە، تۆ بکەی (ئاندی) ئەوانە بکوژیٚ).

کاتیٚ کە خەریکی ئەم دوعا خراپ و ناشیرینە بووم، دیتم (ئاندی)ش خەریکی





تەقە کردنە. دوگمەیەکی بۆری داگرت و گوڵ ئەستێرەی وەکوو ئەو گوڵە ئەستێرانەی بۆیان دەهاویشتین لە زارکی کالبێری ٧,٢٦ دەردەچوون.

دیتم ڤیت کۆنگێکی تفەنگ بەدەست بەپشتدا کەوت، ئینجا ئەو ڤیت کۆنگەی ڕەشاشی پیٚ بوو. پاشان هەموو بەیەکەوە بەربوونەوەو لەگەڵ بەربوونەوەی هەر یەکیٚ هەستی شادی و ئارامییەکی فراوان سەراپای گیانی دادەگرتم.

ڕاستییەکەی بەلامەوە هیچ گرنگ نەبوو، مرۆڤیٚ لە گیانەڵادا بیٚ. ئیتر هەستم بە دەردو ئازاری بەرزبوونەوەی فڕۆکەکە بۆ تەشقی ئاسمان نەدەکرد، ئیتر کوێر بوونم بەهۆی خێرایی بیٚ وێنەی فڕۆکەو پاڵە پەستۆی بەهێزی دەنگەوە،بۆ من لەگۆڕیٚ نەبوو، ئیتر بۆ جاری هەشتەم دابەزینە خوارەوە و دڵنیا بوون داخۆ هەموومان کوشتوون یان نا، بۆ من لەگۆڕیٚ دا نەبوو. تەنانەت پیرۆزبایشم لە (ئاندی) شادو سەرکەوتوو کرد.

– زۆر بەرز بوو! (ئاندی)! ئەوە بوو شەڕ! زۆر بەرز بوو! زۆر بەرز! زۆر بەرز!

ژمارەیەکی زۆر لە گۆڕەپانی فڕۆکەخانە چاوەڕێیان دەکردین. کە دابەزین، کیسەی پلاستیکی بەتاڵیان هەڵدایە ئاسمان و کردیانە ئاهەنگ و شادی بۆ ئەوەی پێشانی بدەن من لەکاتی هێرشە هەوایییەکەدا نەڕشاومەتەوە.

(ئاندی) دووبارە بووەوە مرۆڤێکی شەرمن و خاوەن دەنگ و سەرنجێکی ئارام:

هیچ نیشانەیەکت لە دەم و چاوی دا نەدەدی دەری بخا پێش چەند لەحزەیەك، یەك تاقمە ڤیت کۆنگی لەوجوود سڕیوەتەوە.

چووین بۆ ئەوەی قاوەیەك بخۆینەوە. لێم پرسی داخۆ تا ئێستا چەند جار ئەرکی وەکوو ئەوەی ئەمڕۆی جیٚ بەجیٚ کردووە، گوتی: بەتێکڕایی ڕۆژیٚ دووجار. پاشان بۆی باس کردم کە ساڵی (١٩٦٢) چۆتە هێزی ئاسمانی و ساڵی (١٩٦٧) لەسەر داوای خۆی هاتۆتە جەنگی ڤێتنام و گوتی: (ڤالی) برای بیست و سیٚ ساڵەیشم لە بەشی پیادەی سەربازیی چوارەمی شاری (پلیکۆ) خزمەت دەکا. داماو (ڤالی)!!

– بەراست ئەوە چۆن دەتوانیٚ لەناو ئەو هەموو قوڕو پیسییەدا بژی. من حەز دەکەم لەناو نوێنێکی پاك و ڕێك و پێك دا بخەوم!

– کاپتن، تۆ بۆچی هاتیتە ڤێتنام؟

– چونکە دەمزانی فڕۆکەیەکی (A.37) م دەخەنە بەر دەست و بێ گومان مووچەیەکی باشیشم دەدەنێ. حەفتەی دوو سەدو شەست و پێنج دۆلار. ئەمە جگە لە حساب کردنی خەڵات، چونکە دوای جێ بەجێ کردنی هەر ئەرکێك خەڵاتمان دەکەن.

– ئایا تۆ بیر لە مردن ناکەیتەوە؟

– من بە مردن ناڕەحەت نابم. مردن بەشێکە لەکاری ڕۆژانەی من... بەشێکە لەژیانی من.

– مردنی خۆت یان مردنی خەڵکی تر!

– جیاوازیی نییە. لەوەختی شەڕ، مردن شتێکی ناشەخسییە.

(مارتیل) هاتە لامان و دووبارە قاوەمان گاز کرد. (مارتیل) کەنەدییە. لە جەنگی کووریاش بەشدار بووە و ساڵ و نیوێکە لەسەر داوای خۆی هاتۆتە ڤێتنام.

– بۆچی فەرماندە؟

– چونکە دەمزانی، هەر ڕەوانەی ئێرەم دەکەن. منیش خۆم داوام کرد بۆ ئەوەی مووچەیەکی زیاتر وەربگرم.

– ئەی تۆ بیر لە مردن ناکەیتەوە؟

– کێ لەو بەرزاییە کاتی ئەوەی هەیە بیر لەمردن بکاتەوە؟خۆت دەزانی، ئێمە دەبێ ئیشی خۆمان جێ بەجێ بکەین.

– فەرماندە! تۆ دوای جەنگی کووریاو پێش جەنگی ڤێتنام، چ ئیشێکت دەکرد؟

– لە کارگەیەکی دروست کردنی مەمکدان کرێکاریم دەکرد. لە ترۆمبێلێکی بارکردنی مەمکدان کارم دەکرد.

من ئێستا بەدڵێکی ناڕەحەت لە ژوورێکی ئوتێلی (ئاستور)ی گەڕەکی (تۆدۆ)دام. هەر چەندە لەکوشتنی دوازدە پیاویش بەشدار بوومە، سەرەڕای ئەوەش خەریکم بیرەوەری خۆم دەنووسمەوە. جگە لەکوشتنی ئەوانە، سێ لۆری و چوار قەڵاشمان تێك و پێك دا. (ئاندی) بەڵگەنامەیەکی پێدام ئەم زانیاریەی





لەسەر لەسەر نووسرابوو:

(ئەمە دانەیەکی ئەسڵی بەڵگەنامەیەکە، جەخت دەکا کە...)

ئەوەشیان تێدا نووسی بوو کە خێرایی فڕۆکەکەمان گەیشتبووە (GA).

بەڵگەنامەکەم هەڵگرت بۆ ئەوەی نیشانی برادەرە ئاسمانگەڕەکانی خۆمی بدەم تاپێم هەڵبلێن.

لە (فرانس پریس) یش (مازۆر) ستایشی کردم: پیرۆزبایی لێ کردم و زەردەخەنەیەکی خۆشەویستانەی کەوتە سەر لێو. (مۆرۆلدۆ) بەخیلی پێوە دیاربوو: (منیش ئەم تاقی کردنەوەیە دەکەم!). تەنیا فرانسوا هیچی نەگوت. دەمزانی ئەو خەڵکی دابەشی دوو دەستە کردووە: ئازاو بێ کەڵك. ئیدی بە خەبەری چوونە هێرشی هەوایی من ، نە گەرم داهات و نە سارد!

– هم، ببوورە کە ئەمڕۆ بەیانی تووڕە بووم، ئاخر بە پێڵاوەکەت زۆر ناڕەحەت بووم.

– دەزانم، فرانسوا!

– ئەم (ئاندی)یەی تۆ پێشتر مەمکدانی دروست دەکرد؟.

– نا، (ئاندی) نەبوو، ئەوەی تر بوو.

– پاش جێ بەجێ کردنی هەر ئەرکێکیش خەڵاتی دەکەن؟ وانییە؟

– بەڵێ، وایە!

– تۆ لەو بڕوایەدای بەو کارەی ئەنجامی داوە ویژدانی بریندار نابێ و هیچ هەست بە ناڕەحەتی ناکا بەرامبەر ئەو کوشتارەی ڕۆژانە دەیکا؟

– بەڵێ، هەڵەی من بوو کە پێشتر بەجۆرێکی دی بیرم دەکردەوە.

– هم! منیش کاتی خۆی یەك جار تووشی ئەم جۆرە هەڵەیە بووم. ئەو کاتەی پەیامنێری جەنگی بووم لە کووریاو زۆر لەئێستا گەنجتر بووم. منیش وەکوو ئەمڕۆی تۆم کرد.

ئامانجمان تاقمێکی کووریای باکوور بوو. (ئاندی)ی ئەو ڕۆژەی من، یەك نەفەر نەبێ ئەوانی تری هەموو کوشت و پاشان دابەزییە خوارێ تا ئەوەی ئەوەی ماوە ئەویش بکوژێ. کابرا تیژ غاری دەداو بەردەوام سەری وەردەسووڕاند بۆ ئەوەی

تەماشامان بکا. دەستێکی بە دەم و چاوییەوە گرتبوو و دەستەکەی تری لە هەوادا دەجوولاندەوە، وەکوو ئەوەی ڕێ لە پەلاماری ئێمە مانان بگرێ. بەربووەوە، نازانم چەند گوللەی پێ کەوت. کە گەڕاینەوە بە (ئاندی) خۆمم گوت:

– دیتت چۆن وریای خۆی بوو؟

گوتی: کێ؟

دیار بوو تەنانەت ئامانجەکەی خۆیشی سەرنجی ڕانەکێشابوو.

– بەڵێ!

ئەرکێکی پێ سپاردرابوو، ئەرکەکەی خۆی جێ بەجێ دەکرد و هیچ شتی بەلاوە گرنگ نەبوو. بە هەر حاڵ جێ بەجێ کردنی ئەم ئەرکەشی ڕێی چوونە بەهەشتی لێ نەدەگرت، چونکە هەر چۆنی بێ ژن و منداڵی خۆی خۆش دەویست و یەك شەموانیش دەچووە کەنیسە.

– هەڵبەت.

– هەندێ جار حەز ناکەم پەیامنێر بم. پێم خۆشە وەکیل بم. هەمیشە حەزم کردووەو حەزدەکەم وەکیل بوومایە بۆ ئەوەی تەوازۆ بۆ هەموو هەڵس و کەوت و هەموو قسەی خەڵك بنێمەوە و وەڵامی (بۆچی)ی ڕووداوەکان ڕوون بکەمەوە.

<u>(١٥)ی کانوونی یەکەم</u>

ئێستا خەریکی بەسەر بردنی دوا ڕۆژانی خۆمم لە ڤێتنام. مانگێ زیاترە لێرەم و ئێستاش هەموو شتێ وەکوو شانۆگەرییەکی گاڵتەجاڕی تووشی سەرسامیم دەکا.

دوێنێ ژەنەراڵ (لۆن)، هەر ئەو ژەنەراڵ (لۆنە)، دوو کەسی دەستگیر کرد کە بەرەی ئازادی میللی ناردبوونی و دەیانەویست گفتوگۆ لەگەڵ سەفیری ئەمریکا بکەن. ئەو دووە پرۆفیسۆرێکی زاناو یاریدەدەرەکەی بوون.

لەوەدەکا هەر کۆمۆنیستیش نەبووین. کە ویستیان لە دەرگای باڵیۆزخانە پێ باوێنە ژوورەوە، دەستگیری کردن. پاشان دەرکەوت (سیا)ئەم چاوپێکەوتنەی ڕێك خستبوو.

بینای باڵیۆزخانەکە وەکوو قەڵایەکی مکووم و پتەو وایە، ڕێکخستنی





چاوپێکەوتنێکی وا لەوێ شتێکی زۆر نموونەیی بوو، بەڵام بەداخەوە ژەنەراڵ لۆن هەموو شتەکەی تێك دا. بریا ئەو کارمەندەی (جوسپائو)ت بدیبایە چۆن لەم ڕووداوە نارەحەت ببوو و مستی لەمێزەکەی دەدا. مەیلەو شێت ببوو، هاواری دەکرد: " گەمژەینە! ". لەگەڵ هەر مستێ کە لەمێزەکەی دەدا، تەلەفۆنەکەی لەشوێنی خۆی هەڵدەقۆزییەوە. بەردەستەکەی دەرگای ژوورەکەی داخستبوو بۆ ئەوەی دەنگە دەنگ و گاڵە گاڵی نەچێتە دەرەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا، دەنگی هەڵقۆزینەوەی تەلەفۆن و ئەو جوێنانەی دەیدا، بەچاکی دەکەوتە بەر گوێ: " گەمژەینە! گەمژەی بێ شعوورینە! " بێ شك بەرەی ئازادی میللی ئەمریکییەکانی بە لێپرسراوی ئەم دەستگیرکردنە دەزانی و ئاشکرا دیار بوو کە چاوپێکەوتنەکانی دوای ئەمە ناکرێن، (باری زورتیان) هەمیشە دەیگوت:

– – " سوێند دەخۆم باڵیۆزی گەورەمان ئاگای لەم مەسەلەیە نەبووە. خۆت دەزانی دەوڵەتی ئەمریکا هاوکاریی ڕاستەوخۆی لەگەڵ ڤێتنام هەیەو بەبێ ئاگاداری ڤێتنام هەرگیز ڕێگا نادا هیچ چاوپێکەوتن و گفتوگۆیەك لەگەڵ هیچ ڤیت کۆنگێك بکرێ."

وای ئەم (باری زورتیان)ە ئینسانێکی سەیرە! نەختێکیش لەوکابرا ڤێتنامییە دەکا کە ئێستا وا لەبەرامبەر من دانیشتووە: (نگوین نگوك لینگ) کە وەزیری ڕاگەیاندن و سەرۆکی هەواڵگری ڤێتنامی و برادەری ژەنەراڵ (لۆن) و دەوڵەمەندێکی وەکوو (کزروس) وایە. تەنیا جل و بەرگی ویاکۆندۆتی ڕۆمی، یان باند ستریتی لەندەنی لەبەر دەکا و یەك شەموانیش لەو دەراوانەی ڤیت کۆنگ پاسەوانی دەکەن ئاوە خلیسکە دەکاو جگە لەژێر پانتۆڵی پیر کاردن هیچی تر لەپێ ناکا. ئەم ئیشانەی ئەو، لە ژنان خۆش دێ و خۆیشی زۆر خۆشی لە ژنان دێ! ژنی خۆش دەوێ جا لەهەر نەتەوەیەك بێ، چونکە دەزانێ نزیکەی بەهەر هەموو زمانەکان قسە بکا: فرەنسی وەکوو فرەنسییەك و ئینگلیزی وەکوو ئینگلیزێك و ئەلمانی وەکوو ئەلمانییەك و نەختێ ئیتاڵی و کەمێ ئەسپانی و تۆزێ چینی و بڕێ ڕووسی دەزانێ. ئایا دەبێ هەر لەبەر ئەوەش نەبێ کە منی بۆ شێوی ئێوارە داوەت کردووە؟ نزیکەی نیو سەعات دەبێ لەسەر مێزی شێو

دانیشتووین و لەم نیو سەعاتەدا هیچ قسەی گرنگمان نەکردووە.

من ئەو هەڵدەسەنگێنم و ئەویش بە پەرۆشیی ئاساییانەی خۆی لەمن دەڕوانێ. بەڵام کە باسی دەستگیرکرانی دوو نەفەری بەرەی ئازادی میللیم کرد، رووی کرایەوەو کەوتە سەر بارێکی شادو چالاك. چاوی کوسکەی کرد و تووشی ورووژان هات.

– دەستگیر کردنی دوو ڤیت کۆنگ، لەکاتی چوونە ناو باڵیۆزخانەی ئەمریکا، هەلەیەکی تری دەوڵەتی ئەمریکایە. دەبێ دەرز لەم کارەی ئێمە وەربگرن بۆ ئەوەی لەمەو دوا چاو بەرەفتارەکانیاندا بخشێننەوە و بیریان بکەوێتەوە کە ئێمە کۆماری (دۆمینیکان)نین.

– جەنابی (لینگ)، تۆ واتێ ناگەی کە ئێوە نەختێ بەد نمەك بن؟

مێشێکی راو کردو زەردەخەنەیەکی ئارامی بۆ کرد.

– دەزانی، بەد نمەکی هەرگیز لەنێوان ژن و مێرددا نییە.

– جەنابی (لینگ)، مەبەستت ئەوەیە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو ڤێتنام پەیوەندی ژن و مێردایەتییان لەگەڵ یەك بەستووە؟

دیسان مێشێکی بە ئەنگوستی گچکە هەڵفڕاند و گوتی:

– ئاە، بێگومان! ئەمە زەماوەندێکی لێوەشاوەیە.بەڵام هەر چۆنێ بێ زەماوەندە! خۆت دەزانی ڤێتنامی عادەتیان نییە بە خۆشەویستی زەماوەند بکەن. زەماوەندی ئێمە تەنیا بۆ بەرژەوەندییە. بڕواشمان وایە ئەم جۆرە زەماوەندە زۆر درێژە دەکێشێ و بەختەوەری بە دەمەوەیە. لەوانەیە هەندێ جار بەختەوەرییەکەمان درەنگ پێ بگا، بەڵام ئاخیری هەر دێ. بەهەر حاڵ، ئەمەش وەکوو هەموو زەماوەندێك کێشمە کێش و بگرە شەڕیشی لەگەڵ دایە.

– جەنابی (لینگ)، لەم زەماوەندەدا، کێ ژنەو کێ مێردە؟

زەردەخەنەیەکی شەیتانانەی کەوتە سەر لێوەکان:

– ئاشکرایە. ژنەکە ڤێتنامە. دەبینی ژنان لە ڤێتنام هەمیشە پانتۆڵی رەش و درێژ لەپێ دەکەن و مێرد هەرگیز بەبێ ئاگاداری ژن، میوان داوەت ناکاتە ماڵەوە، بەتایبەتی کە میوانەکە دوژمن بێ.





– ئایا لەبەر ئەوەبوو ژەنەراڵ (لۆن) دوو ئەندامی بەرەی ئازادی میللی دەستگیر کرد؟ بۆ پاراستنی داب و نەریتی میللی بوو؟

– خانم، ژەنەراڵ (لۆن) پیاوێکی زۆر بەڕێزە. دەڵێن ئەمریکییەکان داوای سەری ژەنەراڵ (لۆن)یان لە دەوڵەتی ڤێتنام کردووە و ژەنەراڵ (لۆن)یش کە ئەم هەواڵەی بیستووە، ئیستیقالەی داوە، بەڵام ژەنەراڵ (کائۆکی) ئیستیقالەکەی رەت کردۆتەوە و گوتوویەتی:

– " ژەنەراڵ (لۆن)، ئێمە زۆر پێویستمان بەتۆ هەیە. "

من هەر دەبێ ئەم ژەنەراڵ (لۆن)ە بناسم. ئەگەر دژواریش بێ.

هەر پەیامنێرێ مکووڕ بووبێ چاوپێبکەوتنی لەگەڵ بکا، وەڵامی داوەتەوە:

" جەنابینە، بێ دەنگی زێڕە! "

<u>(١٦)ی کانوونی یەکەم</u>

لە دەرفەتێك دەگەڕام بۆ ئەوەی چاوپێکەوتنێك لەگەڵ ژەنەراڵ (لۆن) بکەم، بەڵام نەمدەزانی لە چ رێگەیەکەوە بۆی بچم و مۆڵەت لە چ کەسێ وەربگرم.

تەنیا یەك (بێگانە) لە (سایگۆن) هەیە، هەر کاتێ بیەوێ دەتوانێ چاوی بە (لۆن) بکەوێ، ئەویش (فرانسوا پلۆ)یە. دۆستایەتیی ئەم دووانە لەچییەوە هاتووە؟ بێگومان ئەگەر بشێ پێی بگوترێ دۆستایەتی، کە من خۆم لێی بە گومانم. بەڵام کاتێ کە بە (فرانسوا)م گوت حەز دەکەم گفتوگۆیەك لەگەڵ (لۆن) بکەم، یەکسەر وەڵامی دامەوە: " بۆت رێك دەخەم! "

پاشان تەلەفۆنی بۆ کرد و بە زمانی (ئارگۆ) قسەی لەگەڵ کرد. قسەکەیان درێژەی کێشاو ئاخیری کاتی چاوپێکەوتنەکەی بۆ دوو سبەی بەیانی بۆ وەرگرتم. من ئێستاش سەرم لەم کارەی ئەو سوڕماوە کە چۆن وا خێرا جێ بەجێ بوو. ئایا هەر ژەنەراڵ (لۆن)یش بوو مۆڵەتی چاوپێکەوتنی دابووم لەگەڵ (نگوین وان سام)؟ ئایا فەرمانی لەسەردانی سێ ڤیت کۆنگەکەش هەر ژەنەراڵ (لۆن) دەری کردبوو، کە بڕیار بوو ئەو رۆژە لەگەڵ سپێدەی بەیانی گوللە باران بکرێن؟ نازانم. (فرانسوا)و (لۆن) بەینیان زۆر خۆشە!

ویستم باشتر تێ بگەم هۆی لەیەك نزیکی ئەمانە چییە؟ بەتایبەتی کە (فرانسوا)

به چاوێکی خۆشەویستیش تەماشای ڤیت کۆنگەکان دەکا! بەڵام (فرانسوا) لە وەڵامی من دا هەر ئەوەندەی گوت:

– وابزانم ئینسانێکی باش و میهرەبانە و تەواو!

– ژەنەرال (لۆن) میهرەبانە؟!

– بەڵێ، میهرەبانە!

تا زیاتر ئاشنایەتی لەگەڵ ئەم جەنگەدا پەیدا دەکەم، زیاتر هەست دەکەم تا ئێستا پیاوەکانم نەناسیوە.

ئەم جەنگە وای کرد کە بیانناسم.

(١٧)ی کانوونی یەکەم

سەعات (دە)ی بەیانی، بۆ چاوپێکەوتنەکە دیاری کرابوو، بەڵام ئەو سەعات دووی دوای نیوەڕۆ هات.

لەناکاو بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس شڵەژا. پۆلیسەکان کەوتنە راکەراک. لە هەموو لاوە فەرمانی جیا جیا دەردەچوو. لەم هەراو هۆریاو ژاوەژاوەدا پیاوێکی وردیلەم بینی جلی پۆلیسی لەبەر بوو و کۆمەڵێ بەڕێزەوە یاوەرییان دەکرد. بە هەنگاوی زۆر خێرا دەڕۆیشت. حەوشەی بڕی و لەپلیکانە سەرکەوت و چووە نووسینگەی ئیش کردنی خۆی. دوای نیو سەعات بردمیانە ژوورەکەی. کە دەرگای ژوورەکەم کردەوە، پیاوێکی وردیلەم بینی لەپشت مێزی ئیش کردنی دانیشتبوو و خەریکی لاواندنەوەی گوڵە سوورەکانی ناو گوڵدانی سەر مێزەکەی بوو.

لەعومری خۆم پیاوی وا ناشیرینم نەدی بوو. سەرێکی بچووکی بەسەر شانی بچووك و لاوازەوە بوو. لە دەم و چاوی تەنیا دەمی دیار بوو، ئەویش زۆر گەورە و نائاسایی بوو. دوای دەمی ملی دەهات چونکە چەناگەی ئەوەندە بچووك بوو، هەر دەتگوت بێ چەناگەیە.

ئەی چاوەکانی؟! بەراستی، چاوەکانی چاو نەبوون. پێڵووەکانی زۆر لێك دوور بوون، بەڵام لووتی لووتێکی زۆر زل بوو، ئەوەندە پانیش بوو لەناو گۆناکانی بزر ببوو. کە تەماشامان دەکرد، هێڵنجمان دەهاتێ. کابرا، بە شێنەیی و بەبێ هیچ پەلە پەلییەك، دەستی لە لاواندنەوەی گوڵەکان هەڵگرت. نەختێ لە جێگای خۆی





قیت بووەوە و بەهێدی دوو پەنجەی نایە ناو دەستم. پەنجەکانی ئەوەندە نەرم و ناسك بوون ، هەستت دەکرد دەست لەدوو تیلمە ئاوریشم دەدەی.

هیچ تەوازۆی بۆ دواکەوتنەکەی نەهێنایەوە. تەنیا ئەوەندەبوو چاك و چۆنی کردو دووبارە دەستی بە لاواندنەوەی گوڵەکان کردەوە. زۆر بەکاوە خۆ، یەك یەك دەستی لە پەلکە گوڵەکان دەدا. پاشان بێدەنگییەکەی شکاند. منیش لە باتی هێڵنج هاتن، غەم و نیگەرانی دایگرتم ، چونکە دەنگیشی دەنگێکی ئاسایی نەبوو. زیاتر بە خوڕە خوڕ، یان لرخەلرخی کەسێکی بەر ئاوزینگان دەچوو کە بەدەم کزەباوە بکەوێتە بەر گوێمان. ئەستەم بوو ئەم جۆرە دەنگە لەم جۆرە دەمە بێتە دەرەوە! وشەو رستەکانی وەکوو ئێمە مانان دەرنەدەبڕی، بەڵکو دوای هەر وشەیەك ئەوەندە دەوەستا ئینسان وای دەزانی وشەی پاشی هەر دانابڕێ.

– ئا، خانم! سەیرکە، ئەم گوڵانە چەند جوانن! من ئەشقی گوڵم، دەبێ هەمیشە گوڵی تازە لەناو گوڵدانی سەر مێزەکەم دابنێن، تەنانەت دەبێ هەر گوڵەو دڵۆپە شەونمێکی لەسەر بێ، تەنیا یەك دڵۆپە شەونم!... من مرۆڤێکی رۆمانتیکیم! دەزانی؟ گوڵ و مۆسیقا... هەموو شەو گوێ لە مۆسیقا دەگرم: برامس، شۆپەن... ئاوازەکانیان بە پیانۆ لێ دەدەم و خۆم بەئاوازدانانەوە خەریك دەکەم.

زاری بەجۆرێ لێك بووەوە، وەك ئەوەی بیەوێ بگرژێتەوە.

– بێگومان ئاوازی لەئاسا بەدەر دانانێم. من بابایەکی رۆمانتیکم...

ناتوانم بەبێ جوانی و ناسکی بژیم و کاتێ کە بەبیرم دێتەوە سەربازم و دەبێ خەریکی مەسەلەو کارو باری جەنگ بم... ئاخ، من سەربازم! ئاخ خانم! ئێوە نازانن من ئەم ئیشەم چەند بەلاوە ناخۆشە... سەربازەکان ئاژەڵی مەشقدراون و هیچی تر. خانم، حەز دەکەی شتێ بخۆیتەوە؟ من دەمەوێ ویسکییەك بخۆمەوە.

– سوپاس، بیرەیەك.

ویسکی هات و بیرە نەهات، چونکە داوای بیرەی نەکردبوو. لەدڵی خۆمدا گوتم: بێ شك دیارە لەبیری کردووە من داوای بیرەم کردووە.

– وەکوو بیستوومە، تۆ خەڵکی (فلۆرەنسا)ی! ئاه (فلۆرەنسا)!

(ڤینیس)! من لە (سایگۆن) زیاتر شارەزای ئەو شارانەم. ئەو شارانەم وەکوو

گوڵە سوورەکانی خۆم خۆش دەویٚ و هەمیشە لە خەیاڵی خۆما هەموو شەقام و هەموو خانووەکانیان دەلاوێنمەوە.

کاتیٚ لە (فرەنسا) دەمخوێند و پیاسەم بە ئەوروپای جوان دا دەکرد، بەزۆری دەچوومە (فلۆرەنسا)و (ڤینیس). دەزانی، لە (فرانسە) لە زانکۆیەکی کاتۆلیکی بووم و هەموو تاقی کردنەوەکانی خۆم لەو زانکۆیە کرد. لینسانسی سروشتناسی، دپلۆمی دەرمانسازی، دپلۆمی ئەندازیاری،.

بەراست ئەمە هەمووی سودی چی هەیە؟

بە قورتە قورتێکی قایم قوومە ویسیکییەکی هەڵقۆڕاند.

– بەراست خانم، ئەم هەموو دپلۆم و لیسانسە سوودی چی هەیە؟ هەر بۆ ئەوەی ببم بە سەرۆکی پۆلیس؟

دایبابم یازدە منداڵیان هەیە. من منداڵی هەرە گەورە و هەرە گەمژەکەیانم. سیٚ خوشکم دختۆرن، دوو براشم هەر دختۆرن. سیٚ خوشکم دەرمانسازن، دوو برای تریشم هەر دەرمانسازن. ئەی من؟ وای شتێکی چەند تۆقێنەرە! لە تەمەنی سی و حەوتساڵی دا، ژەنەرال و سەرۆکی پۆلیسی شارم. هەڵبەت ئەو شتانەت بیستووە کە خەڵك دەرهەق بە من دەیڵێن:

جوێندەر، بوختانکەر، هەمیشە سەر خۆش، ژنباز! بەراست، خانم، ئێوە چیتان لەبارەی منەوە بیستووە؟ بۆم باس بکەن!

– زۆر شت، ژەنەرال! بەتایبەتی کە دەڵێن تۆ مرۆڤێکی زۆر بیٚ رەحمی!

– خانم، من ...بیٚ رەحمم؟ تۆ چ دەڵێی؟ ئایا پیاویٚ ئاوها عاشقی گوڵ بیٚ، بیٚ رەحم دەبیٚ؟ ئەگەر ئێستا ئەم قسەیە بە پۆلیسەکانی بەر دەستم بڵێی، بیٚ شك دەستگیرت دەکەن، وا دەزانن شێت بووی. ئەوان هەمیشە بەمن دەڵێن:

– ئێوە لەم کارەتانا لەرادە بەدەر دڵنەرم و میهرەبانن، پێویستە توند و رەقتربن! منیش هەمیشە لە وەڵامدا گوتوومە: ( ئەدەب! رۆڵەکانم ، ئەدەب! بیٚ رەحمی قەت چارەی هیچ دەردیٚ ناکا. گرنگترین شت ئەدەب و ژیانی راست و دروستە.

– ژەنەرال، ئایا ئەشکەنجەدانیش بەشێکە لەژیانی راست و دروست!

– ئۆی خانم، ئێمە هەندیٚ جار پێویستە جددی بین... ئۆی! پێویستە پێویستە،





بەلاّم ئەوانەی باسی ئەشکەنجە دەکەن، زینیدانییانی نوقستان و شێواویان دیوە، بەلاّم زیندانییانی ئیمە هەرگیز وانین. خۆت دەزانی چەند مشت و زللەیەك، پێی ناگوتریٚ ئەشکەنجە. ئەمانە شتی زۆر کەم و هیچن.

– ئەی کارەبا لە زەکەر دان؟ ئایا ئەمەش شتێکی کەم و هیچە!؟ ژەنەرال؟

– ئای، خانم! خۆت دەزانی شتی وا نەختیٚ پێویستە. ئەی ئەوە نییە دەزانین منداڵ نابیٚ لێی بدریٚ. لەگەڵ ئەوەشدا لەمنداڵی شەیتان و چەتوون دەدەین؟ بۆیە لێیان دەدەین تا بزانن نابیٚ جارێکی تر ئیشی کرێت بکەن.

ڤیت کۆنگیش وەکوو منداڵی شەیتان و چەتوون وان. من زۆر لەمێژە دەیانناسم، باشیشیان دەناسم. لە زەمانی (ڤیت مین) و فرەنسییەکانەوە. ئەو سەردەمە منیش بەشداریی ئاژاوەو پشێویم دەکرد.

– ژەنەرال، لەگەڵ کام دەستە ئاژاوەت دەنایەوە؟

– خانم، بەروخسەتت با ئەم نهێنییە تەنیالای خۆم بیٚ.

ئینجا نەختیٚ بێدەنگ بوو.

– خانم، حەز دەکەی شتیٚ بخۆیتەوە؟ ها؟ زۆر باشە! ویسکی یان بیرە؟ من خۆم ویسکی دەخۆمەوە.

– سوپاس، بیرەیەك!

ئەم جارەش ویسکیان هێنا، بەلاّم بیرە هەر دیار نەبوو، چونکە ئەم جارەش داوای بیرەی نەکردبوو.

– ژەنەرال؟ ئایا بوودایيش بەلای ئێوەوە وەکوو منداڵی شەیتان و چەتوون وان؟

– ئەمانە گەندەڵیی ترسناکن. گەندەڵیی بەنگکێشن. خانم دەتەویٚ خۆت شتەکە تاقی بکەیتەوە؟ من پێشتر ئەم تاقی کردنەوەیەم دیوە. سەگێکی زیندوو بگرە. بەنزینی بەسەردا بکەو ئاگری تیٚ بەردە. لەپڕ وەکوو بوودایيەکان دەبیٚ بە قارەمان. دەبیٚ ئەم تاقی کردنەوەیە هەر بکەی، زۆر خۆش و دڵ خۆشکەرە.

– ژەنەرال، ئایا تۆ خۆت بوودایی؟

– ئەم پرسیارەت وەکوو ئەوە وایە پرسیار بکەی ئاخۆ بڕوام بەخوا هەیە؟

– ژەنەرال، تۆ بڕوات بەخودا هەیە؟

– نەء، خانم!

– ئەی باوەڕت بە چ هەیە، ژەنەراڵ؟

– بەچارەنووس، خانم! ئاخ لەو ئێش و ژانە!

لـەپڕ دەم و چـاوی وێـك هاتـەوە، لەبـەر ژانـی لەشـی، زاری بـەو هـەموو زڵی و گەورەییەوە لێك بووەوە و ددانی زەرد و پیسی لە بەینی لێوەکان دەرکەوت.

– داوای بوردن دەکەم... زامەکەم!

کە ددانـە زەردو پیسەکانی گـڕ کـردەوە ، ماوەیـەك بـەبێ جووڵـە مایـەوە، ئینجا زۆر بـە نـەرم و بـەهێمنی، وەکـوو نـەرمی تـەونی جاڵجاڵۆکـە، دەسـتی خسـتە سـەر ورگـی و لاواندییـەوە و هـەر بـەو دەنگـە لرخـە لرخـەی کـە لـەدەنگی مرۆڤـی بـەر ئاوزینگـانی دەکـرد، باسـی کـرد کـەزامی دوازدە گرێـی هەیـە. ئەمـەش بـۆ ناڕەحەتیی و گیروگرفتی ئیش و کارەکانی دەگەڕێتەوە. پاشان پرسیاری کرد داخۆ من کاری پۆلیسیم پێ خۆشە یان نا؟

کابرا لە بنەماڵەیەکی ملیۆنێر هاتۆتە دونیا، کوڕێکی نازیمۆکی بنەماڵەکەیە. بێ گومـان پێویسـتی بـە مووچـەی کـەمیی دەوڵـەت نییـە. مووچـەکەی مـانگی تـەنیا بیست و پێنج هەزار روپییەیە، لەو کرێیە کەمترە کە خۆی بە لێخوڕی ترومبێلەکەی دەدا، ئەی کەواتە بۆچی بۆتە پۆلیس؟

چۆن بووە رووی کردۆتە ئەم کارە؟

پێش سێ ساڵ، رۆژێ لەفڕۆکەیەك دابەزی کە لـە بۆمبـا بـارانی ڤێتنـامی باکوور دەگەڕایەوە، پێیان راگەیاند بچێتە دیدەنی ژەنەراڵ (کا ئو کی)، ژەنرال (کی)ش پێی گوت دەبێ ببی بە سەرۆکی پۆلیسی شار. ئایا دەیتوانی ئەم داوایە رەت بکاتەوە؟

ئای چ فیداکارییەکی گەورەیە!...

– وای خوایە، بە قبووڵ کردنی ئەم کارە، چ فیداکارییەکی گەورەم کرد!

– بەراسـت ژەنـەراڵ، بـۆ ئـەو سـێ ڤیـت کۆنگـەی بڕیـار بـوو لەسـەریان بـدرێ، ئاخیری چ بڕیارێکتان دا؟

– ئەوانە گوللە باران دەکرێن، خانم! جا ئەمریکیی پێیان خۆش بێ یان پێیان





خۆش نەبێ.

هەندێ جار، جێ بەجێ کردنی یاسا تا ماوەیەك دوای دادگایی کردنەکە، دوا دەخرێ، بەڵام هەر چۆنێ بێ جێ بەجێ دەکرێ.

– ئایا ئێوە ئاژاوەی ئەوروپاتان لەبیر کردووە؟

– ژەنەراڵ، بێگومان تۆ ناتەوێ جەنگی ڤێتنام لەگەڵ ئاژاوەی ئەوروپا بەراورد بکەی، وانییە؟

– بۆچـی نامـەوێ، خـانم! بۆچـی نامـەوێ! بـەرگری ڤیـت کۆنگـەکان کـت و مـت وەکـوو بـەرگری ئەوروپییـەکان وایـە. تـەنیا جیاوازییـان ئەوەیـە ئەوروپییـەکان بردیانـەوەو ڤیـت کۆنگـەکان دەدۆڕێـن. ببـوورە، کـە رسـتەی (دەدۆڕێـن)م بەسـەر زمانـدا هـات. مـن هـەرگیز ئـەم رسـتەیەم بەسـەر زمانـدا نایـەت. جـەنگی ڤێتنـام جـەنگێکی سـەیرە. ئـەم جەنگـە بـە سـەرکەوتنی لایـەك و بـە بـەزینی لاکـەی تـر کۆتایی نایە، تەنیا بە شەڕ نەکردن و راگرتنی شەڕ کۆتایی دێ.

غەمێکی گەورەی لەدەم و چاوەوە دەرکەوت. لەسەرە خۆ قسەی دەکردو دەنگی وەکوو دەنگی ئەو کزە بایە وابوو کە گەڵای درەخت دەلەرێنێتەوە: نەرم و هێمن و ئارام. هەستت دەکرد گریانی دێ، تەنانەت گریانی لەقوڕگی مابوو. ئایا ئەم پیاوە قەت گریاوە؟ رەنگە، رەنگە ئەو کاتە بگری کە یەکێ گوێی لەدەنگی ژان و تەنیایی ئەو بێ و بێ ئەوەی لێی بترسێ دەستی لاواندنەوەی بەسەردا بێنێ.

– ئاه ! ژەنەراڵ، ناترسی بتکوژن؟

– لـە (سـایگۆن)، کـەس لـە مـردن ناترسـێ! مـن وەکـوو یـەکێ وام کـە بەسـەر پەتێکی باریك دا بڕواو لەوانەبێ لەهەر لەحزەیەکا، بەربێتەوە. من هەموو رۆژێ گیـانم لـە مەترسـی دایـە. دەزانم زۆر کـەس دەیانـەوێ بمکوژن، بـەڵام سـەرکەوتوو نابن.

دووبارەی دەکەمەوە من ڤیت کۆنگەکان زۆر باش دەناسم. ئەوانە ئاژەڵن. ئاژەڵن و خەسڵەتی مرۆڤانەیان گرتووە، بەڵام بەهەر حاڵ ئاژەڵن!

– ژەنەراڵ، ئەوانە برای ئێوەن!

– برای دوژمنن، خانم! هیچ دوژمنێ لەبرای دوژمن ترسناکتر نییە.

خانم، حەز دەکەی شتێ بخۆیتەوە؟ من دەمەوێ دیسان ویسکییەك بخۆمەوە. ویسکی دەرمانی دەردی رۆحمە. برینم قووڵتر و دەردم زیاتر دەکا. ئەی تۆ بیرە دەخۆیتەوە یان ویسکی؟

– سوپاس، بیرە!

بەڵام ئەم جارەش بیرە هەر نەهات.

– لەشوێنی خۆم هەستام و روخسەتم خواست بۆ ئەوەی بڕۆم، کە چاوم بە پێڵوە نیوە کراوەکانی کەوت، تروسکاییەکی خۆشەویستیم تێدا بینی.

بێ گومان باش دەیزانی من بە ئەنقەست گوێم بە نەهاتنی بیرەکە نەدا. هەڵبەت بۆیەش وام کرد تا تێی بگەیەنم شەیتانی و مزیڕی ئەم کابرایە تا چ رادەیەکە!

ئەو زۆر باش دەیزانی وەختێ کە هاتم چۆن خەریك بووم لەتینوان هیلاك دەبووم. هەر جارەی ئەو بادەی ویسکی بۆ دەمی دەبرد، من بە هەموو گیانی خۆم رقم لێ هەڵدەستا.

بەڵام ئەو ئەگەر گوێی بە بێدەنگی من بدایە، من ئیتر نەمدەتوانی ئەو وێنەی ژەنەرال (نگوین نگوك لون) بکێشم کە لە خەیاڵی خۆم دروستم کردبوو. یان بۆی هەیە ویستبێتی تووڕەو بێزارم بکا؟

ئایا خەڵك تا چ رادەیەك تینووی عەشق و خۆشەویستین، ئەویش تا ئەو رادەیە تینووی رق و بێزارییە؟ نازانم. رەنگە لەبەر ئەوەبێ کە ناشیرین بوو. یان رەنگە لەبەر ئەوەبێ کە جوانیی خۆش دەویست.

– زۆر سوپاست دەکەم خانم، دیدەنییەکەت بۆ من زۆر بەرز بوو خانم!

– هەروەها بۆ منیش ژەنەرال!

لەجێگای خۆی هەستا بۆ ئەوەی بەڕێم بکا، لەو کاتەدا چاوم بەتابلۆیەك کەوت لەلای دەستە راستی مێزەکەیەوە بەدیواری هەڵواسی بوو. شیعرێك بوو. بەم جۆرە نووسیبووی:

( لەناو هەراو زەنای خەڵك،  خۆت بە ئارامی راگرە.

لەبیرت بێ ئاشتیی، لەناو کپ و بێدەنگیی خۆتدا نەبێ، لەشوێنی تر دەست ناکەوێ.





هەمیشە لەگەڵ هەموو شتێك بەو دژی هیچ شتێك مەبە.

بە هێمنی و بێدەنگی، راستەقینەی ویژدانی خۆت دەرببڕە.

بەدڵی کراوە و ویژدانی ئازادەوە گوێ لە ئامۆژگاری خەڵك بگرە،

با ئەوان لەتۆ گەمژە و نەزانتریش بن.)

هەندێ جار بیر دەکەمەوە: ئاخۆ من بە هەڵە نەچوو بووم لێ گەڕام ئاوها گاڵتەم پێ بکا. ئایا چارەنووس ئەم دیدەنییە مان تازە ناکاتەوە؟ بۆی هەیە رۆژێ بێ و روو بەرووی بێ بەڵێنی و سەرپێچی بێتەوە. کێ دەزانێ؟ بۆی هەیە دووبارە بیبینمەوە و بە دیداری شادو خۆشحاڵ ببم.

<u>(١٨)ی کانوونی یەکەم</u>

من و (مۆرۆلدۆ) بەیانی (ڤێتنام) جێ دێڵین، ئیتر زۆر ناڕەحەتم. تەنانەت گەیشتوومەتە ئەم ئەنجامە کە جێ هێشتنی ڤێتنام کارێکی راست نییە.

هەست دەکەم ئەم ئیشە جۆرە راکردن و مەیدان چۆڵ کردنێکە. وای بۆ دەچم تاوانێکی گەورەیە بچمە دونیایەکی وا بەیەك مەرگ بێتە گریان و دەنگی تەقەی تۆپی تێدا نەبێ.

تەنیا ئێمە ئێرە جێ دێڵین. تازە دەزانم ئەوانەی بە مانگ و بە ساڵ لەڤێتنام ماونەتەوە، بۆچی نایانەوێ بەجێی بێڵن. بێگومان بۆ هێور کردنەوە و خاوکردنەوەی دەمار یان، جارو بار حەفتەیەك دەچنە (بانکوك)و (هۆنگ کۆنگ)، بەڵام دووبارە دەگەڕێنەوە ڤێتنام و ئەم هاتنەوەشیان لەبەر ئەوە نییە بڕیارو بەڵێنیان بەرۆژنامەی خۆیان داوە، بەڵکو تەنیا لەبەر ئەوەیە هۆگری ڤێتنام بوونە.

بەلای منەوە، تراژیدیاو ترس و زۆرانبازی لەگەڵ مەرگ، جۆرە جادوویەکی تێدایە، تەنانەت  کارەساتی جەرگبڕیش رێ لەوە ناگرێ مرۆڤ بۆ خۆی رابکێشێ.

لەسەر بانیژەی ئوتێلی کونتەنینتال، یەکەو راست بەرامبەر باڵەخانەی ئەنجوومەن دانیشتبووین، قاوەمان دەخواردەوە و من بیرم لەم شتانە دەکردەوە. نهۆمی یەکەمی باڵەخانەی ئەنجوومەن ژوورێکی سەیری تێدایە، پەنجەرەی کراوەتەوە و لە پەنجەرەکەوە ناوەوەی ژوورەکە دیارە: کەرەستەی رازاندنەوەی تابووتێك و قوماشی رەش و مۆمی داگیرساو. دوێنێ، (بوئی کوانگ سان)ی

رابەری دەستەی (کو–مین– تانگ) یان لە ماڵەکەی خۆی کوشت و ئێستا تەرمەکەیان گواستۆتەوە ئەوێ. تەمەنی چل و پێنج ساڵە.

دوو پیاو لێی بەژووریێ کەوتوون، تەقەیان لێ کردووە و سنگ و ملیان هەڕشاندووە. ئەمریان بە ژنەکەی کردووە لەناو متبەق نەیەتە دەرەوە. پاشان چەند دێڕێکیان بە ئامێری چاپ نووسیوە و لەسەر مێزی کارکردنیان داناوە. دروشمی بەرەی ئازادی میللیشیان لەژێر نووسینەکە کێشاوە.

لەنووسینەکەدا هاتووە: لەبەر ئەوەی (بوئی کوانگ) ڕێی داوە کوڕەکەی لە (سیا) کار بکا، بەسزای خۆیمان گەیاند. هیچ کەس بڕوای بە ناوەڕۆکی نووسینەکە نییە. بگرە ئەمریکییەکانیش بڕوایان وایە دەقی نووسینەکە درۆیەکی زەقەو هیچی تر. ئەوان دەڵێن: ڤیت کۆنگ هەرگیز دوای کوشتنی هیچ کەسێ، نووسین جێ ناهێڵن. لێپرسراوانی دەوڵەت (بۆئی کانگ)یان کوشتووە، چونکە ویستوویەتی پەیوەندی بە بەرەی ئازادی میللییەوە بکات و لەبارەی ئاشتییەوە گفتوگۆیان لەگەڵ بکات. لەوانەیە ئەمە راست بێ و لەوانەیشە راست نەبێ. هەر چۆنێ بێ، گرنگ نییە. گرنگ ئەوەیە کوژراوێکی تریش هاتە سەر کوژراوەکانی شار، ئەو شارەی ژیانی ئینسانی تێدا لە مستە برنجێك هەرزانترە. ئەو کاتەی چاوم بڕیبووە مۆمەکان و لەسەر شووشە سەیری تیشکدانەوەی مۆمەکانم دەکرد، هەستم بەخۆم کرد زیندوو تر و چالاکترم.

(مۆرۆلدۆ) گوتی:

– وای چەند پەلەمە بۆ سوار بوونی فڕۆکە: (بانکۆك)، (کەراچی)، (تاران)، (رۆما).

– دەتوانی بێنیتە بەر چاوت کە ئێمە دوو سبەی پاش نیوەڕۆ لەئیتاڵیا بین؟

– بەڵێ.

– بەم خەیاڵەش خۆشحاڵ نابی؟

– نەء.

ئای (مۆرۆلدۆ)ی بێ نەوا، چەند تەنگاوە بۆ ئەوەی وێنەکانی چاپ بکاو باسی ڤێتنام بۆ هاوکارەکانی بکا. ئەو چل رۆژەی ڤێتنام، بۆ ئەو، تەنیا کارەسات و





بەسەرهاتی پڕ مەترسی بوو،کەچی ئەو چل رۆژەی ڤێتنام، بۆ من، پڕ پەند و پڕ هەست و سۆز بوو.

– دەزانی، بەو شتانەی لێرە دیمن و فێریان بووم، گۆڕاوم و تازە ئیتر مرۆڤەکەی جاران نیم.

– لێرە چ شتێ فێر بووی؟

– شتێکی زۆر سادە، پاشان پێت دەڵێم.

دوای نیوەڕۆ، گەڕاینەوە (فرانس پرێس)و ماڵاواییمان لە برادەرەکانمان کرد کە تا دوا رۆژ هەر بەبرادەری باش مانەوە: (مازۆر) جانتاکەی خۆی بە یادگاری دامێ، (فلیکس) دەسماڵێك و (فرانسوا) قومقومەیەك و لێفێکی کەوڵە بەورو شاڵێکی بارانی دامێ و بوتڵە شامپانیایەکیشی بە سەلامەتی ئێمە شکاند بەو مەرجەی ئەگەر من دووبارە هاتمەوە ڤێتنام، بوتڵە شەرابێکی کیانتی ئیتاڵی بە دیاری بۆ بێنم. هەموو هەوڵیان دەدا خۆیان بەشێوەی ئاسایی پێشان بدەن، بەڵام هەر هەموویان ناڕەحەتییان بە دەم و چاوەوە دیار بوو. ئێمەش ناڕەحەت بووین. ئەوروپا و ئەمریکامان پێ لەمانگیش دوورتر بوو. وەکوو ئەوەی بەشەکەی تری دونیا دونیایەکی تر بێ و هیچ پەیوەندی بە ڤێتنامەوە نەبێ.

(مۆرۆلدۆ) دوای ئەوەی بادەی دووەمی شامپانیای هەڵدا، گوتی:

– ئێستا دەشێ بزانین تۆ لە ڤێتنام چی فێر بووی؟

من هیچ وەڵامم نەدایەوە، چونکە لێم مسۆگەر بوو لەقسەم ناگا.

لە جەنگی ئەم وڵات و ئەم شارەدا، فێر بوم کە:

" موعجیزەی لەدایکبوونمان خۆش بوێ! "

# بەشی چوارەم

دەزانی؟ هەندێ جار وا دەبێ کە لە خەودای، خەون دەبینی. خەون دەبینی لەناو خانوویەکدای پڕە لە گڕ و بڵێسەی ئاگر، یان زەلامکوژێك راوت دەنێ و تۆش لەبەری را دەکەی: ئەو نارەحەتییانەی تۆ لەو کاتەدا هەستیان پێ دەکەی، راستن و تۆ ئەزیەت دەخۆی، دەلەرزی و بەتوندی قاچەکانت رادەوەشێنی. بەڵام ئاخیری لەخەو رادەبی و دەبینی لەژووری خۆتی، لەناو کەل و پەلەکانی خۆت و لەناو نوێنی خۆتای، لەو پەڕی ئاسوودەیی دای. نە خانوو دەسووتێ و نە زەلامکوژت بەدواوەیە و ئەم هەموو دیمەنانەت لەخەیاڵی خۆت دیوە و لەم هەموو رووداوە تەنیا چەند دڵۆپە ئارەقەیەکت بەتەوێڵەوە ماوە.

دەزانی، رێت بکەوێتە ولاتێ کە لەشەڕ دابی، هیچ جیاوازی نییە لەگەڵ ئەوەی رێت بکەوێتە ولاتێ کە لە ئاشتی دابی. تۆ (سایگۆن) جێ دێڵی و کاتێ لەناو فڕۆکەدای و بەسەر هەوردا دەفڕی، دیسان تەرم و تەقینەوە و بڵێسەی ئاگر و کارەسات دەبینی. ئەگەر فڕۆکەکەت بەرەو رۆما، یان پاریس، یان نیویۆرك بچێ، هەوڵ دەدەی چیدی خەیاڵبازی نەکەیت و پاشان لەدڵی خۆتدا بیر دەکەیتەوە: ئەی کوا تەرم و تەقینەوە و بڵێسەی ئاگر؟ ئەمانە لەهیچ شوێنێ نین، ئەمانە تەنیا لە خەونی خۆتدان.

ئەی ئەم جانتایە؟ ئەم جانتایەی فەرمانبەری گومرگ لەگەڵ جانتاکانی تر دەیپشکنێ؟ هیچ!! دڵۆپە ئارەقەیەکە بەسەر تەوێڵتەوە ماوەتەوە و هەر زوو بە ئاوو هەوای خۆش و بارو دۆخی چاك دەبێ بە هەڵم و لەناو دەچێ. رەنگە ئەمەش تاکە هۆیەك بێ کە خەڵك جەنگیان قبووڵە. ئەگەر لە دوورەوە سەیری بکەن، بڕوای پێ ناکەن. تەنانەت بیریان بۆ ئەوە ناچێ کە بۆی هەیە شتی وا وجوودی دەرەکی هەبێ. بەهەر حاڵ، من هەستم ئاوها بوو، کاتێ کە خەریك بووم لەشوێنی





کارەسات و رووداوەکان دوور دەکەوتمەوە. تەنانەت باوەڕم بە جەنگیش نەبوو، هەر بەبیریشم دا نەدەهات داخۆ جەنگ هەیە؟ یان نا؟

بەڵام هەر چۆنێ بێ، باسی جەنگ دەکراو بە هەر جۆرێ بێ بەچاوو گوێم دا دەچووە خوارێ.

زۆر بەزەحمەت نامەی (تری کانگ)م بە پاپا پۆلیسی شەشەم گەیاند. ئەویش شەوێکیان بە جوببەی سپی لەسەر رووی تەلەفزیۆن دەرکەوت و پەنجەی بڵند کرد و بەشێوەی نیمچە هەڕەشە و نیمچە بەخشندە گوتی:

– چەندین دەنگمان لە باشووری رۆژهەلاتی ئاسیاوە دەکەوێتە بەر گوێ..."

لەو شەوە بەدواوە، جگە لەم شێوەو حاڵەتە، بەهیچ شێوە و حاڵەتی تر لە تەلەفزیۆندا نەمبینی. هەندێ جار بەجوببەی کەوڵە قاقوم و مەخمەل دەردەکەوت و هەندێ جاریش لەسەر تەختێکی زۆر بڵند دادەنیشت. کەئەم دیمەنانەم دەدی، دیمەنەکانی ڤێتنامم بیر دەکەوتەوە: کارەساتەکانی (سایگۆن) و سەربازەکان و بۆمبا بارانەکان و شەپۆلی ئەو خەڵکەی بەکلاوی قووچەوە رایان دەکرد.

جەنگ وەکوو خەون رەگ و ریشەی لەدڵ و مێشکم داکوتاوە، بێ ئەوەی حیساب بۆ نووسین و پەیامی حەفتانەی رۆژنامەکەم بکەم، یان بێ ئەوەی قەوانی بەتاڵی شەڕی (داکتۆ)م بیر بکەوێتەوە. ئەم کلاوەو ئەم جانتایەم بۆ جوانی بەژوورەکەمەوە هەڵواسیوە.

<u>(نامەی پیپ</u>

" وا لەسەر تەپۆلکەی (١٣٨٣) نامەت بۆ دەنووسم. ئاهەنگی جەژنی (نۆێێل)مان بەدەم دەنگی تۆپەوە گێڕا: دەزانی، تەقە وەستان تەنیا لە رۆژنامەدا هەیەو بەس. گوللە تۆپێك بە تۆپخانەکەمان کەوت و (لاری) کوشت. (لاری)ت لەبیرە؟ ئەو کوڕەی نوقڵی دەخوارد. کاپتن (شر) ماوەی ئیش کردنی لێرە تەواو بووەو بەم زووانە دەگەڕێتەوە ئەمریکا. بەرۆیشتنەوەی دڵتەنگم.

منداڵەکانی ترۆپکەی (١٣٨٣) بە زۆری هەر باسی تۆ دەکەن: تۆ نازانی، کاتێ کە لە هیلیکۆپتەر دابەزیت، چ کارێکت لێ کردن. تۆ سەرەڕای جوانی و ناسکیت، بە ژن نەدەچووی، بەڵام وەك ژن قسەت دەکرد. دەزانی، ئەوە یەکەم جار بوو،

یەکێ سۆز و میهری بەرامبەر دەنواندن و جەنگی بەکارەساتێکی گەورە دەزانی. هەموو سەلامەت لێ دەکەن. (تینری)ش بیری خستمەوە پێت بڵێم وێنەی مۆرکراوی (جولی کریستی) ت بیر نەچێ.

ئیتر دەبێ لێرەوە جێت بێڵم و بە دەورییە بچمە دەرەوە. ئایا دەبێ رۆژێ بێ و بتبینمەوە؟ هەر دەبێ بتبینمەوە.

بەدڵێکی پڕ خۆشەویستی

"پیپون کە پێی دەڵێن پیپ"

نامەیەکی جوان بوو، بەڵام لەبەر چاوم وەکوو وێنە کۆنەکانی سەردەمی قوتابخانەم وابوو. بەداخ و خەفەتەوە بیرم لە (لاری) کردەوە کە بۆی باس دەکردم هەر جارێ بەشداری هێرشێك دەکا، دوعا دەکا و دەپاڕێتەوە و دەڵێ: خوایە وامەکە بمرم!

ئەوەش بڵێین (تینری)م هەر لەبیر نەمابوو.

کە وەڵامی نامەی (پیپ)م دەنووسی وەکوو ئەوە وابوو وەڵامی نامەی برادەرێکی ئازیزی هاو پۆلم بنووسم کە ساڵەها بوو نەمدی بوو و بوون و نەبوونی بەلامەوە وەکوو یەك وابوو.

(داکتۆ) زۆر دوور دیارە، بە قەدەر دووری تەم و شێی (سایگۆن) دوور دەکەوێتە بەر چاو. بەفر باخی خانووەکەی داپۆشیوم و زەمبەلیلك بەسەر فیچقەکاندا شۆڕ بۆتەوە.

لەژووری فراوین، قەیتانی زێڕین و زیوینی درەختی نۆیێل دەبریقێتەوە، بێ ئەوەی پرسیار لە بارەی ژیان، یان مردن بکەن. خوشکە بچکۆڵانەکەم کەل و پەلی بچووکی یاری بە درەختەکەوە هەڵواسیوە.

لە کۆتایی کانوونی دووەم گەڕامەوە نیویۆرك و لەوێ هەندێ شت قەوما، وای کرد لە جیێ هێشتنی ڤێتنام پەشیمان ببمەوە. پەشیمان بوونەوەکە لەسۆنگەی ئەوەبوو دیم خەڵکەکە بەرامبەر بە مەسەلەی ڤێتنام زۆر کەمتەر خەم بوون.. ئەوان کە گوێیان لە وشەی ڤێتنام دەبوو تووشی حاڵەتێك دەبوون وەکوو ئەوەی ڤێتنام





شوێنێکی کوێستانی یان جێگایەکی ئاوو هەوا خۆش بێ.

هەر بۆ نموونە، شەو کەچوومە دەرمانخانەی شەقامی دووەم:

— ئۆی، ئەوە تۆی؟ وام دەزانی کڕیارێکی باشی وەکوو تۆم لەدەست داوە!

— نەخێر، چوو بوومە ڤێتنام.

— خۆشت رابوارد؟

یان ئەو رۆژەی لە (مدیسن ئیسکوار) چوومە بانقەکەم:

— زۆر لەمێژە نەمدیوی؟

— چوو بوومە ڤێتنام.

— بەراست؟ خەفەتێکی گەورەیە!

یان دوای نیوەڕۆ کە قسەم لەگەڵ لێخوڕی تەکسییەك کرد، گوتی:

— ئەوە چاوەڕێی چ دەکەن! بۆچی بۆمبایەکی ئەتۆمی بەسەر سەری ئەو پێست زەردانەدا بەرنادەنەوە و مێشکی هەموو لایەك ئاسوودە ناکەن؟

— ئاخر لەوانەیە بۆمباکە بەسەری ئەمریکییەکانیش بکەوێ، چونکە لەوێ هیچ سنوور و سەنگەرێك دیار نییە.

— کێ وا دەڵێ؟

— من وا دەڵێم. من خۆم مانگ و نیوێك لە ڤێتنام بووم.

— ئەرێ راستە ئاوو هەوای ڤێتنام زۆر گەرمە؟!

ئیدی دڵتەنگ بوو.

گراهام گرین لەو بڕوایەدایە بەشی هەرە زۆری جەنگ لە بێ جووڵەیی و کارنەکردن و چاوەڕێ کردن بەسەر دەچێ. قسەکەی راستە، بەڵام لەبیری چووە ئەوەشی بخاتە سەر کە ئەو کاتەی بێ جووڵەو بێ کارین و چاوەڕێ دەکەین، بیریشمان بێ جووڵەو بێ کارەیەو بۆ هیچ شتێ نیگەران نییە. چونکە، خۆت دەزانی، تۆ لەناو جەنگ هەرگیز دانانیشی تەماشا بکەی، بەڵکو هەمیشە لەسەر دەپێی شانۆیت و بەشداری شانۆکە دەکەی. تەنانەت ئەگەر لەسەر بانیژەی قاوەخانەی کۆنتە نینتالیش خەریکی قاوە خواردنەوە بیت، چونکە بۆی هەیە مینێك بەربێتەوە سەر ئەو بانیژەیە، یان نارنجۆکێك هەڵدەنە سەر مێزەکەت. هەر

لەبەر ئەم ئەگەرانەش وا هەست دەکەی لە کەشێکی تەواو قارەمانێتی دای. پاشان هەست بە هەندێ شتی ناڕەحەت دەکەی. دەزانی، ئەو کاتەی لە نیویۆرك خەریکی کاری سەخت و چاوپێکەوتن و ناڕەحەتی تر بووم، هەستم بە شتی وا نەدەکرد. لەنیویۆرك هیچ بەسەرهاتێکی باڵکێش رووی نەدا. هەستم دەکرد وەکوو مێروولەیەك وام لەناو ملیۆنان مێروولەی تر ون بووبێ: چوست و چالاك و رێك و پێك و تەنانەت بەبێ کەمترین گومان و دڕدۆنگی دەرهەق بەزیندوێتی.

ئەو پەنجەرانەی لە پەنجەرەی ژووری خۆمەوە دەمدیتن، هەموو بەیەك دەچوون. گڵۆپی غاز بە ئاسانی دادەگیرسا، پێویستی نەدەکرد هەموو جارێ شخارتە دەربێنی و دایبگیرسێنی. برادەرەکانم هەموو مرۆڤی شارستان و باش بوون، هەموویان دەستەبەریی ژیانیان هەبوو.

لەم سەرو وەزع و بارو دۆخە دەروونییەدا نامەیەکی (فرانسوا)م پێ گەیشت. نامەکە بە پولی پۆستەی سەربازی نەهاتبوو وەکوو ئەو پوولەی لەسەر زەرفی نامەکەی پیپ بوو، بەڵکوو بە پوولی ڤێتنامی هاتبوو. کە ئەم نامەیەم بینی ناڕەحەتی دایگرتمەوە. نامەیەکی کورت بوو، (فرانسوا) بەزمانپاراوی خۆی نووسی بووی. منی وەلانا بوو کە ڤێتنامم جێ هێشت بوو، باسی دیمەنێکی (سایگۆن)ی کاتی جەژنی بۆ کردبووم :

"... لێرە، هێمنی و ئارامییەکی وایە باوەڕ ناکرێ. بە مەزەندەی من ڤیت کۆنگەکان خەریکی خۆ رێك خستنن بۆهێرشێکی گەورە. کارمەندێکم بۆ وەرگرتنی هەواڵ داناوە، شەویش هەر لە نووسینگە دەخەوێ بۆئەوەی یەکسەر یەکەمین هەواڵم پێ بگەیەنێ. (زورتیان) زۆر سەرقاڵە، بە پێچەوانەی (لۆن) کە رۆژ بە رۆژ خراپتر دەبێ. وابزانم من تاکە پەیامنێرێکم دەتوانم چاوم بە (لۆن) بکەوێ. دەزانم تۆ بەم قسەیەم سەخڵەت دەبی، چونکە ئەم کابرا گەمژەیە کایەیەکی خراپی پێ کردی، بەڵام دەزانم تۆ باش لە هەڵس و کەوتەکەی گەیشتی. ئەو حەزی لە ڕقە وەکوو چۆن خەڵکی تر حەزیان لە خۆشەویستییە، چونکە پیاوێکی زۆر کرێتە. کرێتە بەڵام لە خەڵکی دی خراپتر نییە. من بەمرۆڤێکی بەرزی دەزانم چونکە زۆر ئازایە. (زورتیان) و (وست مورلند) یش بەلامەوە مرۆڤی بەرزن. بگرە





هەموو شتێکی ئێرەم بەلاوە بەرزە. (والتەر) گۆتەنی هەرچی بەلای ئینسانەوە بەرز بێ، بەلای منیشەوە بەرزە. یان رەنگە ئەمە قسەی (مۆنتێنی) بێ. نازانم، بەراست ئایا دەزانی (مۆنتێنی) نووسەری هەرە ئازیزی بەر دڵی منە؟! ئەگەر ئەو رووداوانەی لەوانەیە لە (سایگۆن) بقەومێن، قەومان و تۆ هاتیتەوە ئێرە، بوتڵە شەرابە (کیانتی)یەکە لەبیر نەکەی.

هاوڕێت: "پلۆ..."

وەکوو یەکێکی برسی، زۆر بە تامەزرۆیی نامەکەی (فرانسوا)م خوێندەوە. خەریکە رووداو گەلێ لە (سایگۆن) روودەدا و من لەوێ نیم.

ئاخ! خۆزگە بیانوویەکم دەست کەوتایە بۆ ئەوەی لەو شارە نزیك ببمەوە. بۆ نموونە وەکوو ئامادەکردنی راپۆرتێ لە (هۆنگ کۆنگ)، یان لەجێگایەکی نزیك (سایگۆن)، بۆ ئەوەی ئەگەر لەوێ شتێ رووی دا یەکسەر خۆمی پێ بگەیەنم.

پاشان (نیویۆرك تایمز)م کردەوەو هەواڵەکەم خوێندەوە. نووسی بووی:

دوو سەعات دوای جەژنی (تەت)– سەری ساڵی تازەی ڤێتنامییەکان– نۆزدە ڤیت کۆنگ پەلاماری باڵیۆزخانەی ئەمریکایان دا. رۆکێتی (بی–٤٠)و بازووکەی سی و پێنج شەستیان پێ بوو. دیواری باڵیۆزخانەکەیان کون کردبوو و پێدا چووبوونە ناو باخەکەو تا بەیانی دەستیان بەسەردا گرتبوو.

شەڕ سەعات نۆی بەیانی دەستی پێ کرد. هەر نۆزدە ڤیت کۆنگ کوژران. بەڵام شەڕ لە هەموو شەقام و گەڕەکەکانی شار دەستی پێ کردووە.

هەواڵەکانی بەیانی، خەفەتبارتر بوون. هێرشەکە تەنیا بۆ سەر (سایگۆن) نەبوو، بەپلانێکی زۆر تۆکمەو پتەو بەڕێوە دەچوو: کوشتار لە (دانانگ) و (دالتا) و (میتو) و (هوئە) و سی و پێنج شوێنی تری ڤێتنام دەستی پێ کردبوو. لە (سایگۆن)، سەراپای گەڕەکی (چولون)و بەشێکی زۆری گەڕەکی (گیادین) و (فوتو) کەوتبووە بەر دەستی ڤیت کۆنگەکان. هیچ فڕۆکەیەك نەیدەتوانی لە فڕۆکەخانەی (تان سون نوت) بنیشێ. لە فلیمی دەنگ و باسی تەلەفزیۆن تەنیا هەندێ کاول و بڵێسەی ئاگر و جەستەی خەڵتانی خوێن و پەرستگای رووخاومان

لە کۆڵان و شەقامەکان دەدی. وێنەیەکی ترسناکی کابرایەکم بینی، زۆر باش دەمناسی: ژەنەرال (لۆن) بوو. خەریك بوو زۆر لەنزیکەوە گوللەی بە ڤیت کۆنگێکی دەست بەستەوە دەنا.

ئەم دیمەنە، بەسێ وێنە قۆناغە جیاجیاکانی کارەکەی (لون)ی پێشان دەدا

لەوێنەی یەکەمدا، ڤیت کۆنگێکی گەنجمان دەدی، پانتۆڵێکی کورت وبلووزێکی دامەیی لەبەر بوو، یەکێ نازانم چی دەچرپاندە گوێی و بەرەندە و پاڵە سوان دەیبرد. لەوێنەی دووەمدا، ژەنەرال (لۆن)مان دەدی وەڕەوەڕەکەی دەرهێنابوو و نیشانەی لە لاجانگی راستەی ڤیت کۆنگەکە گرتبوو.مەبەستی سەرەکی لەم وێنەی دووەمینەدا بوو، چونکە لەو کاتەدا گیرا بوو کە گوللەکە لە لاجانگی ڤیت کۆنگەکە چوو بووە خوارێ. ڤیت کۆنگەکە چاوی بەسرابووەوە و بەدەم ئێش و ئازارەوە لێوەکانی توند بەیەکەوە قڕساندبوو.

لەوێنەی سێیەمدا، (لۆن)مان دەدی خەریك بوو شەشاگرەکەی (وەڕوەڕەکەی) لەبەردەمی خۆی دادەنا. پشتی لەئێمە بوو. ڤیت کۆنگەکەش لەسەر قیڕی شەقامەکە خەڵتانی خوێن ببوو و لەدوا پەلەقاژەدا قاچی بەرزبووەوە ئاسمان.

(لۆن)و سوورە گوڵ و دڵۆپە شەونمی سەر هەر گوڵێ. (لۆن)و پیانۆکەی و (نوکتۆرن) ەکانی (شۆپن)، لۆن و ئەو شیعرەی لەچوارچێوەی گرتبوو:

( لەناو هەراو زەنای خەڵك،  خۆت بە ئارامی راگرە.

لەبیرت بێ ئاشتیی، لەناو کپ و بێدەنگیی خۆتدا نەبێ، لەشوێنی تر دەست ناکەوێ.

هەمیشە لەگەڵ هەموو شتێك بەو دژی هیچ شتێك مەبە.

بە هێمنی و بێدەنگی، راستەقینەی ویژدانی خۆت دەرببڕە.

بەدڵی کراوە و ویژدانی ئازادەوە گوێ لە ئامۆژگاری خەڵك بگرە،

با ئەوان لەتۆ گەمژە و نەزانتریش بن.)

بەڵام ئایا دەتوانی بێنیتە بەر چاوت کە من رۆژێ لەرۆژان دیومە گریاوە؟

باشە چۆن دەبێ (فرانسوا) ئەمە بەمرۆڤ بزانێ؟ ئەمە چ کارێکی قارەمانانەیە ئەم کارەساتە تازەیەی ناوەتەوە و ڤێتنامی خستۆتە ناو بڵێسەی ئاگر؟





نیگەرانییەکەم گۆڕاو بوو بە بێ ئۆقرەیی. هەر زوو ڤیزەو بەڵگەی پێویستم ئامادەکرد و سواری یەکەمین فڕۆکە بووم و بەرەو (بانکۆك) و (هۆنگ کۆنگ) کەوتمە رێ.

تەنیا یەك جانتاو یەك کامێراو یەك تۆماری دەنگ و یەك بوتڵە شەرابی (کیانتی)م لەگەڵ خۆم برد. (فرانسوا) بەبرووسکە پەیامێکی بۆ ناردم و گوتی: هاتنە (سایگۆن) تەنیا بەفڕۆکەی سەربازی دەبێ. بەهەر حاڵ ئەو ناوی منی داوەتە دەست لێپرسراوانی ئەمریکی لە تایلەند.

دەمتوانی لە بەرەبەیانی رۆژی حەوتی شوبات دەست بە سەفەرەکەم بکەم، بەڵام لەم سەفەرەدا چوار رۆژم لەدەست چوو. حەفتەیەك بوو رووداوەکانی ئەم دواییە دەستی پێ کردبوو. فڕۆکەخانە پەیامنێری تریشی لێ بوون:

ئەمریکییەك و ئەڵمانییەك و سێ فرەنسی. فڕۆکەکە نە کورسی تێدابوو و نە ئاودەست. لەسەر عەردی فڕۆکەکە دانیشتبووین و  میزمان لەناو پەرداخ دەکرد.

پیرترین پەیامنێر کابرایەکی رەنگ پەڕیو بوو، ناوی (مارسیل) بوو. ئاگاداری هەموو روداوەکانی ئەم دواییە بوو. یەکێ لە هەواڵە نوێکانی ئەوەبوو کە (کاترین) و (مازۆر)یان لە شەقامی (هوئە) دەستگیر کردووە.

ئەوانە نیوەی رێگایان بە هیلیکۆپتەر و نیوەکەی تریان بە ترۆمبێل بڕی بوو تا خۆیان گەیاندبووە (هوئە). ئینجا لەوێ لەترسی ئاگر و بۆمبا باران پەنایان بۆ کەنیسەیەك برد بوو و کە لەوێ هاتبوونە دەرێ، تووشی ڤێتنامییە باکورییەکان ببوون، ئەوانیش هەردووکیان (کاترین و مازۆر) دەستگیر کردبوو و بردبوویانن. موعجیزە بوو کە گرتبوویانن، ئیعدام و گوللە بارانیان نەکردبوون.

خەڵك لە (سایگۆن) لەبرسان دەمرد، بەلاش نەبوو (مارسیل) ئەم هەموو کێك و نوقڵەی لەگەڵ خۆی هێنابوو. (مارسیل) باسی کەوتنەوەی پەتایەکی درمیشی دەکرد، دیسان بەلاش نەبوو هەندێ داوو دەرمانی لەگەڵ خۆی هێنا بوو. دەنگی ئەوەندە تیژ بوو کەقسەی دەکرد گوێم لەگەڵ دەئێشا. وەختەکە زۆر بەسستی دەڕۆیشت. ئەگەر بەفڕۆکەی بازرگانی لە (بانکۆك) بچووینایە(سایگۆن)، لەبەر ئەوەی بەسەر (کەمبۆدیا)دا تێدەپەڕین. تەنیا یەك سەعاتی دەخایاند، بەڵام

بەفڕۆکەی سەربازی چوار سەعات و نیومان پێ چوو.

من لە شەکەتییان لەهۆڵ و دۆڵ چوو بووم. لەبەر ئەوەی هەر بیرم دەکردەوە کە گەیشتم ئاخۆ چ ناڕەحەتی و چ دیمەنێکی جەرگبڕ بەچاوی خۆم دەبینم، زۆر غەمبار و دڵتەنگ بووم و لەو بارە ناخۆشەش نەمدەتوانی (مارسیل) بێ دەنگ بکەم کە هەژدەر هەژدەر قسەی دەکرد. سەرەڕای ئەوەش هەستم دەکرد پێویستم بەوەیە خۆی لێ نزیکتر بکەمەوە، چونکە هەرگیز نابێ بەبێ دۆست و برادەر بچینە دیدەنی جەنگ. ئەگەر برادەرێکمان لەگەڵدا نەبێ، کەسمان دەست ناکەوێ پێی بڵێین: (دەترسم!)

دەوری سەعات دووی پاش نیوەڕۆ گەیشتینە (سایگۆن). شار بڵێسەی ئاگر و چڕە دووکەڵی رەشی لێ بەرز دەبووەوە و لەهەندێ گەڕەکی شار ، ڤیت کۆنگ ئالای سوور و شینی خۆیان هەڵدابوو.

فڕۆکەوانەکە رووی کردە ئێمە و گوتی: پێش نیشتن نەختێ بەدەوری شاردا دەگەڕێین.

لەبەر ئەوەی فڕۆکەخانە کەوتبووە بەر گوللە باران، ئەم گەڕانە ناچارییە دەوری چل دەقیقەی خایاند و من هەستم کرد لەچل سەعات زیاترە.

پاشان فڕۆکەکە لە گۆڕەپانی فڕۆکەخانە نیشت و دەنگی تیژی (مارسیل) گوێ و دڵی رووشاندم، گوتی: (خوا چەپاڵەمان بدا)

یادداشتی دۆزەخیم دووبارە دەستی پێ کردەوە.

<u>(٧)ی شوبات</u>

<u>شەو</u>

نیشتن لە فڕۆکەخانەی (تان سون نوت) کارێکی ئاسان نەبوو. شەڕ لە دەوروبەری فڕۆکەخانە هێشتا هەر بەردەوام بوو و لای خوارووی رۆژاوای فڕۆکەخانە لەبەر دەنگی تەقە دەهەژا. هەر هێندە دابەزین، یەکسەر رامان کردە لای فەردە قومەکان بۆ ئەوەی خۆمان لە گوللە پەنا بدەین. ژمارەیەکی زۆری سەرباز لە تەنیشت فەردەکان وەستا بوون، هەموو تووڕەو نائومێد بوون.

کە بە سەرۆکەکەیانم گوت دەبێ یەکسەر بچمە (سایگۆن)، سیمایەکی سەیری لە





دەم و چاوی پەیدابوو. رەنگە وایزانیبێ من نازانم مەسەلەکە زۆر ترسناکەو بۆئەوەی بچینە (سایگۆن) دەبێ بە رێگای (گیادین)دا بچین و رێگای (گیادین)یش لەبەر دەستی ڤیت کۆنگەکان دایە. ئەمڕۆ بەیانی، جێبێکی ئەمریکی بە نارنجۆکێك پەلەخا. بەڵام سەرباری هەموو ئەمەش، توانیم لۆرییەکی بچووك و پاسەوانێکی چەکدار پەیدا بکەم و دوای نیو سەعات رێگای چۆڵی (گیادین)مان گرتبووە بەر و دەڕۆیشتین. بەماوەی دە دەقیقە کەمتر گەیشتینە شار. لێخوڕەکە ترۆمبێلەکەی لە بەردەم ئوتێلی کونتە نینتال راگرت و بەبێ دەنگی کەل و پەلەکانی منی داگرت و لەسەر شۆستە دایناو کە سوپاسم کرد، بەتووڕەیی لە بەینی درزی ددانەکانییەوە گوتی: (راستە مەترسیمان نەما، بەڵام من دەبێ ئێستا دووبارە بەهەمان ریگادا بگەڕێمەوە.)پاشان جوێنێکی زۆر ناشیرینی دا. تا لەژیاندا ماوم ئەو هەست و ئەو دیمەنەم لەبیر ناچێ کە لەو شەقامە چۆڵە وەسابووم و کەل و پەلەکانم لەسەر شۆستە کەوتبوون. یەك زیندەوار چییە، تەنانەت یەك سەگیش لە شەقامەکە نەدەکەوتە بەرچاو. دوکانەکان داخرابوون. پەردەی پەنجەرەکان دادرابووەوە. هەموو شتێ لەبێدەنگی دا نقووم ببوو، هیچ جووڵەی لێوە نەدەهات. تەنیا دەنگی خشەی گەڵا دارێك دەهات، بەدەم (با)وە لەسەر زەوی دەجووڵایەوە.

ریکشاو ترومبێل و پاسکل و خەڵکی هەرزەگۆ کە (سایگۆن)یان دەکردە شارێکی زیندووی پڕ جم و جۆڵ و جۆش و خرۆش، هەر هەمووی کپ و بێدەنگ بوو. سەیری هەر شتێکت دەکرد، هەستت دەکرد، دوای کۆچ و رەوێکی گشتی خۆت بەتەنیا لەشار ماویتەوە.

کەل و پەلەکانی خۆم کۆکردەوە و لەمپەری ئاسنینی سەنگەراسای دەرگای ئوتێلم کردەوە و چوومە ژوورەوە. لەوێ تەنیا دەرگاوانەکەم بینی. داوای ژوورێکم لێ کرد. سەری باداو گوتی: ((نییە!)). بەناچاری شت و مەکەکانی خۆم پێ سپاردو تەنیا بوتڵە شەرابە (کیانتی)یەکەم هەڵگرت و رووم کردە شەقامی پاستۆر بۆ نووسینگەی بەڕێوەبەرایەتی (فرانس پرێس). حەزم دەکرد بەلێوی قڕمساوەوە گوێم لە دەنگێ بێ، هەر دەنگێ بێ! دەنگی تانك و دەنگی گوڵە

ئەستێرە کە قیڕی جادەیان هەڵتەکاند بۆ من وەکوو ئاوازی مۆسیقا وابوو.

ژمارەیەك سەنگەر لە دەوروبەری (فرانس پریێس) هەبوو، دوو پاسەوان زێرەوانییان دەکرد. ئەوانە، بێ ئەوەی داوای کاغەزێ یان بەڵگەنامەیەك بکەن، سێ تەقەیان لەسەر یەك کرد.

یەکێ لە گوللەکان لەبەر پێم بەزەوی کەوت:

( پەیامنێر!پەیامنێر)

ئەم هاوارە نەجاتی دام.

ئینجا بەپەلە پرووزێ چوومە لای پلیکانە و بەدوای برادەرەکانم دا گەڕام.

کت و مت وەکوو منداڵێ وابووم کەدایکی بزر کردبێ.

ژووری نووسینگە، جگە لە فەرمانبەری سەر ئامێری نووسین و جەنابی (لانگ)، کەسی تری لێ نەبوو. جەنابی (لانگ) گوتی: هەموو چوونەتە (جوسپائو) و ئینجا کەوتەوە بێدەنگی نەشکستەنی هەمیشەیی خۆیی.

بەهەر حاڵ، ئەوێ لەوە باشتر بوو کە بەتاقی تەنێ لە سەرشەقام بم. ئینجا بوتڵەکەم لەسەر مێزی (فرانسوا) داناو دانیشتم چاوەڕێم کردن. نازانم ماوەی چەند لەوێ چاوەڕێم کرد. زۆر کفت و ماندوو بووم. لەپڕ دەرگا بووەوە و (فرانسوا) هاتە ژوورەوە: پیس، ریش هاتوو، لەڕو لاواز، پانتۆڵ و بلووزە شینەکەی بەجۆرێ پێدا شۆڕ بووەوە هەر دەتگوت هی یەکێکی ترە. روومەتی داقۆپا بوون و لووتی باریکتر و لاوازتر دیار بوو. کەچاوی بە بوتڵی (کیانتی) کەوت و بزەیەکی سەیری کەوتە سەر لێو. پاشان منی بینی و ئیتر هەستم کرد بەدەستێ قژم دەلاوێنێتەوە، ئینجا بە دەنگێکی پتەو گوتی: (ئافەرین! ئافەرین!).

لەوە زیاتر هیچم لەبیر نییە چونکە وەکوو کچێکی بچکۆلانە لەپڕمەی گریانم دا. وابزانم زۆر گریام چونکە کە (فلیکس) و (مازۆر) هاتن، من هێشتا هەر لشمە لشمم بوو. دیار بوو (مازۆر)یش گۆڕابوو. ئەو خۆی هەمیشە پاك و پۆشتەو کەشخە بوو، کەچی ئێستا بەناڵەباری جلی کردبووە بەر، بەڵام هەر زوو زەردەخەنەیەکی کرد و بووەوە ئەو (مازۆر)ەی کە دەمناسی. ماچی کردم و گوتی: (ئەوە لێرەیە، بەسپ و ساغی گەیشتووە!)





نەختێ قسەی ئاساییمان کرد، ئینجا مەسەلەی جێ و رێی من هاتە پێشەوە، ئاخیری (فلیکس) چارەیەکی دۆزییەوە، گوتی: نهۆمی ژێرەوەی ئەم باڵەخانەیە بەشێکی تێدایە وەکوو ئوتێل وایە، پێشتر سەربازی ئەمریکی تێدا بوو، بێ گومان دەتوانین ژوورێك لەوێ پەیدا بکەین.

بەهەر حاڵ ئەگەر لەوێ ژوورێکم دەست بکەوێ، دەتوانم بە ئازادی و بە خەیاڵی ئاسوودەوە بچمە (فرانس پریێس) بێ ئەوەی ترسی گوللەم هەبێ. ئێستا هەموو شتێ بە ئاسایی دەڕوا، بەڵام تا مۆخی ئێسکم هێشتا هەر ساردە.

کە شەو داهات، تەقینەوەی بۆمباو نارنجۆك هاویشتن دەستی پێ کرد. ئێستا گوێم لەو گوللە تۆپانەیە کە لەرێگای (گیادین) دەیهاوێژن. هیلیکۆپتەرێك قونبەلەیەکی نوور بەخشی بەسەر گەڕەکەکەی ئێمەدا بەردایەوە، هەموو گەڕەکەکەی روناك کردەوە. بەدوای ڤیت کۆنگەکان دا دەگەڕێن.

بەرۆژ، ئەمریکییەکان ڤیت کۆنگەکان بۆ گوندەکان دەردەپەڕێنن و کە شەو دادێ ڤیت کۆنگەکان دەگەڕێنەوە شوێنی پێشووی خۆیان. (مارسیل) راستی دەکرد کە دەیگوت:

– لەشار مەیلەو نیمچە گرانییە. کۆگا و عەمبارەکانی شار بەتاڵ بوونە. نرخی یەك هێلکە مریشك گەیشتۆتە دەوری شەش فرانك و بۆ مستە برنجێك دەبێ سرەیەکی دوورو درێژ بگرین و پاشانیش بۆی هەیە ئاومان بۆ چێشت لێنان دەست نەکەوێ.

هەر ئەوەندە نییەو بەس، بۆی هەیە نەخۆشی درمیش بڵاو بێتەوە. ئیتر دەرمان دەست ناکەوێ. راستی، ئەوەی ئەم خەبەرە ناخۆشانەی پێدام، مەبەستم (مارسیل)ە، ئەویش هەر لەم ئوتێلەیە. کاتێ کە بە داڵانەکەدا دەڕۆیشتم، دەنگێکی تیژم کەوتە بەر گوێ، بەڵێ! خۆی بوو!!

<u>(٨)ی شوبات</u>

هێشتا بەیانی نەداوە، بەڵام کێ لەبەر دەنگی ئەم گوللە و ئەم تۆپانە خەوی لێ دەکەوێ؟ ئاخیری بڕیارم دا لەناو پێخەف بێمە دەرەوە. دوێ شەو (فرانسوا) ئەم قسانەی بۆ کردم و منیش تۆمارم کردن و ئێستاش لەگەڵ بیستنی دەنگی دوور و

شەکەتی، هەست بە شتێکی سەیر دەکەم. (فرانسوا) خۆی بەردایەوە سەر کورسییەك، لەشەکەتییان پرزەی لێ بڕابوو.

– هەر وەکوو بۆم نووسیت، ئێمە چاوەڕێی ڕووداوێکمان دەکرد، ئەمریکی لە ئەگەری ڕووداوەکە ئاگاداریان کردینەوە. من چەند کەسێکم ڕاسپارد بەنۆرە شەو لەژووری نووسینگەدا بخەون. دوو حەفتە تێپەڕی، بەلاّم هیچ ڕووی نەداو بە فەرمانبەرە ئێشکگرەکانم گوت بڕۆن، چونکە وام دەزانی بەهەڵە خەبەرەکەیان پێداوین. ئینجا شەوی جەژنی (تەت) هات! دەزانی (تەت) گەورەترین جەژنی ڤێتنامییە: هەم ساڵی تازەیە و هەم جەژنی (پاك)ەو هەم جەژنی (نۆئێل)ە... هەموو جەژنەکانیان لەم جەژنەدا کۆبۆتەوە.

ڕاگرتنی تەقەیان ڕاگەیاند و ژمارەیەکی زۆری سەرباز گەڕانەوە ناو خاو خێزانی خۆیان و ئۆردووگا مەیلەو چۆڵ بوو. کۆڵانەکان قەرەباڵغیان تێ کەوت. خەڵکەکە غرووریان کەوتێ بۆ کەنیسەکان و شەوان دەبوو بە ئاگربازییەکی زۆر.

هەر کەسە بەپێی توانای خۆی هەوڵی دەدا ناڕەحەتی لەدڵ دەربکات، کەس بە بیری دا نەدەهات شەڕ لە (سایگۆن) ڕووبدا، لەکاتێکا کە لە (دانانگ) و (تاترانگ) و (پلیکۆ) و (کانتۆم) شەڕ هێشتا هەر بەردەوام بوو.

یەکەم تەقینەوەی زۆر بەهێز، ئەوەبوو کە سەعات (٣) بەیانی بەخەبەری  هێنام. لەدڵی خۆمدا گوتم: (نە ، شتی وا نابێ!) تەقینەوەکە بە هەراو ژاوەژاو دەستی پێ نەکرد، بەڵکو یەکەم جار گوێمان لەدەنگی کەڕەنایەك بوو، پاشان لەسەر خانوو و دوکانەکانی ناو شار بوو بەتەقینەوە..

یەکەم جار، وەکوو چۆن هەموو جارێ لەگەڵ تەقینەوەی هەمیشەیی بەئاگا دێم، ئاوها بەئاگا هاتم، بەلاّم دوای تەقینەوەی یەکەم، تەقینەوەیەکی ترو یەکی ترو دیسان یەکی تر: ساروخ و هاوەن. پەنجەرەکان دەهەژانەوە. دەرگای ئاسنی باخچەکەمم کردەوە. سواری ترومبێلەکەم بووم. دەنگە دەنگ لەدەورو بەرم دەهات. یەکەم جار وامزانی دەنگی تەرقەیە، بەلاّ م دەنگی تەرقە نەبوو، بەڵکوودەنگی گوولله بوو بە درەختەکانی دەورو بەرم دەکەوت. دەرگا ئاسنەکەم پاڵ دا، لەو کاتەدا گوللەیەك بە درەختی تەنیشتم کەوت و بەربووەوە سەر قیڕی





جادەو ئینجا گوللەیەکی ترو دیسان گوللەیەکی تر. تەقەیەکی زۆر بوو!!.

لەسەر زەوییەکە، لە قەوانی بەتاڵ گەڕام، چەند دانەیەکم دۆزییەوەو زانیم ئەوانە بە تفەنگی (ئەی کەی ٤) و (ئێم١٦)تەقە دەکەن...

ئاخیری بە ترومبێلەکەم ڕۆیشتم و ئینجاپاسەوانێك گوللەیەکی لەپێشەوەی ترومبێلەکەم دا بۆ ئەوەی ناچارم بکا بوەستم. ڕاوەستام. لە بەرامبەر من، دوو ئەمریکی خۆیان لەجێبێکی گڕ گرتوودا فڕێ دایە خوارێ و لەتەنیشت جێبەکە بەربوونەوە سەر زەوی و هەر لەوێ مردن. هەرچەندە تەقەیان لێ دەکردم، ناچاربووم لەسەر گێڕ کشامە دواوە و ئینجا پێچم کردەوە بۆ شەقامی باستۆر. شەقامەکە چۆڵ و هۆڵ بوو. دوو پاسەوانی ئەمریکی، لەبن دیواری باڵیۆزخانەی ئەمریکا، لەتەنیشت ژوورە دارەکانیان، کوژرابوون. دەنگی گوللەو تەقینەوە لەناو باڵیۆزخانە دەهات. هەستم کرد ڤیت کۆنگەکان هەوڵ دەدەن دەرگا دارە زلەکەی باڵیۆزخانە بە تەقاندنەوەی نارنجۆك بشکێنن. بە هەڵەداوان چوومە لای ئامێری هەواڵ، بۆ ئەوەی یەکەم دەنگ و باس ڕەوانە بکەم. کە لە ڕەوانەکردنی دەنگ و باسەکە بوومەوە و لەتەنیشت ئامێرەکە هەستام هاتمە تەك پەنجەرە، دیتم سەربازی ئەمریکی هاتوون بەرگری لە باڵیۆزخانە دەکەن. ئەمانە تەقەیان لە هەموو لایەك دەکرد: تەقەیان لە سەفارەت دەکرد، لە ترومبێلەکان دەکرد، تەنانەت گوللەیان بەتاریکی شەویشەوە دەنا.

بەرەبەری بەیانی بوو، زانیمان شەڕ تەنیا هەر لە باڵیۆزخانە نییە، ڤیت کۆنگەکان لە سەراپای شاری (سایگۆن) شەڕی وەکوو ناو باڵیۆزخانەیان دامەزراندووە. هەموو لا تێگەیشتن کە مەسەلەکە زۆر گەورەو ترسناکە. شەڕەکە زۆر ورد و تەواو بوو!، بەوپەڕی هونەر و توانای ستراتیجی سەربازیی دەکرا. (لۆن)م بیرکەوتەوە کە دەیگوت:

(هیچ ڤیت کۆنگێ ناتوانێ بێتە (سایگۆن)... ). ئەوانە بە ماوەی دوو ڕۆژ هاتبوونە ناو (سایگۆن). لە (٢٩) تا (٣٠)ی کانوونی دووەم. گوایە ژمارەیان دە هەزار کەس بووە، بەلاّم بەهەر حاڵ لە شەش هەزار کەس کەمتر نەبوون. بەدەستەی سێ نەفەری هاتبوونە ناو (سایگۆن):

بەپێ، بە پاسکیل، بەپاس، یان بە سواری لۆریی دزراوی ئەمریکی، بەڵام زۆربەیان بەپێ هاتبوون. باشترین جل و بەرگ و کراسی پاك و سۆلی نوێیان لەپێ کردبوو. بەشێوەی ئاسایی، ڤیت کۆنگ هەموو سۆلی (هوشی مینە) لەپێ دەکەن کە خۆشترە و باشتر دەتوانن پێی رابکەن. خەڵك ئەم جۆرە سۆلانەیان زۆر باش دەناسی و دەیانزانی تەنیا ڤیت کۆنگ لەپێی دەکەن.

ڤیت کۆنگ ناچاربوون بۆ هاتنە ناو (سایگۆن)، سۆلی ژاپۆنی لەپێ بکەن کە ئەو رۆژگارە لە (سایگۆن) باوی هەبوو. دەزانی، ئەم جۆرە سۆلانە لەسەر شێوەی (٧)ن و قەیتانیان دەکەوێتە بەینی دوو پەنجەی پێ و پاژنەی پێیان رەهایە. ئەگەر رانەهاتبی پێی بڕۆی، لەپێت دادەکەلێ. جا ئەوان بۆئەوەی سۆلەکەیان لەپێ نەبێتەوە، بەداوێك لەگۆزینگی پێی خۆیان دەبەست. لەگەڵ ئەوەشدا هەر نەیاندەتوانی بەڕەحەتی بڕۆن. زۆربەیان سۆلەکانیان لەپێ کردبووەوە و بەپێ خواسی دەڕۆیشتن، سۆلەکانیان بەدەستەوە بوو، یان بەملی خۆیانەوە کردبوو. هەریەکە توێشە بەرەیەکیشی بەدەستەوە بوو، تەنیا بای دوو رۆژ خواردنی تێدابوو. ئەگەر پۆلیسەکانی (لۆن) نەختێ نزیکتر بوونایە، دەبوایە ئەم مرۆڤە غەوارانە سەرنجیان راکێشابان کە بەناو کۆمەڵانی خەڵکی شادومانی جەژندا دەگەڕان. دەبوایە زۆر زوو بە سۆلی بەمل هەڵواسراوو بەتوێشە بەرەی خواردنەوە بیانناسینایە.

ئەوان هەموو لادێی بوون و زۆربەیان یەکەم جاریان بوو شاریان دەبینی. ئەوان هیچیان لەبارەی (سایگۆن)و بارو دۆخی هات و چۆی ناو (سایگۆن) نەدەزانی و لەعومری خۆیان هەرگیز باڵەخانەی وا بەرزو ترومبێلی ئەوەندە زۆر و شەقامی وەها پان و بەرینیان نەدی بوو. ئەوانە تەنیا شارەزای شینایی و ڕێگای خۆڵ و مەرەزە بوون و تەنیا یەك شتیان دەزانی: دەیانزانی هاتوون (سایگۆن) ئازاد بکەن. رابەرەکانیان گوتبوویان: (دەچین بۆ ئەوەی (سایگۆن) ئازاد بکەین). تەنانەت هەر بیریشیان لێ نەکردبووەوە داخۆ لەم کارەدا سەردەکەون، یان نا؟! ئەوان چەند ساڵ بوو لەپێناوی ئەم ئامانجەدا دەجەنگان و هیچ باکیان بەمردن نەبوو.





تاقمەکانیان ژنیان کەم تێدابوو. نزیکەی هەر ژنێك بەرامبەر پێنج پیاو دەوەستا.

ژنەکان جل و بەرگی میللییان لەبەر بوو: پانتۆڵ و کراسی رەش و بۆ ئەوەی یەکتر بناسنەوە، قەیتانێکی سووریان لەقۆڵی چەپەیان بەستبوو. هەندێکیان بە قولابە قەیتانەکانیان قایم کردبوو و هەندێکی تر بەداوێك. ژمارەیەکی کەمیشیان تیلمە پەڕۆیان بەستبوو.

سەعاتی سفریان دوو و پەنجا دەقیقەی سەر لەبەیانی رۆژی (٣١) ی کانوونی دووەم بوو.

ماوەیەك پێشتر چەك و تفاقیان هێنابووە ناو شارو زۆربەی چەکەکانیان بە عارەبانەی گوڵ هێنابوو کە سبەینان بۆ گوڵ فرۆشتن دەهاتنە بازاڕ. ئینجا چەکەکانیان لە ماڵان و لەناو گۆڕستانان شاردبووەوە و کاتێ کە خەڵك بەئاهەنگ و سەیری ئاگربازی سەر گەرم بوون، چەکەکانیان لە حەشارگەکان هێنابووە دەرێ. ئەگەر رۆژێ بێ و  یەکێ فیلمێ لەبارەی ئەو رۆژە دەربێنێ، بێ شك کار لە هەموو کەس دەکا. ئەوان، سۆلەکانیان پێی ئەزیەت دەدان، بۆیە وەکوو مێروولە بەشێنەیی و بەهێمنی جێی خۆیان دەگۆڕی، لەکاتێکا کە هەریەکە قەیتانێکی سووری بە بازووەوە بوو و توێشە بەرەیەکی بە کەمەرییەوە کردبوو.

خەڵکەکە هەمووشاد و کەیفخۆش بوون و تەماشای ئاگربازییان دەکرد، لەولاوەش ئەوان هێدی هێدی لەئامانجی خۆیان  نزیك دەکەوتنەوە. ئامانجیان ئەم شوێنانە بوو: بەڕێوەبەرایەتی مەڵبەندی پۆلیس، ئۆردووگاکان، زیندانەکان، باڵیۆزخانەی ئەمریکا و رەنگە بەڕێوەبەرایەتی رادیۆش بێ.

نزیکەی لە هەر هەموو ئەرکەکانیان شکستیان هێنا. بۆیە شکستیان هێنا چونکە خەڵکی لادێ بوون و شارەزای تەڵەو داوی شاری گەورە نەبوون.

ئەوانە ماوەیەکی زۆری کاتی خۆیان لە باڵیۆزخانەی ئەمریکا بەفیڕۆ دا، چونکە دەیانتوانی دەرگا دارە گەورەکەی باڵیۆزخانە بشکێنن، یان بیکەنەوە، لەبەر ئەوەی قوفڵ و تۆپەکانی دەرگاکە لەقوفڵە نوێکان بوو و ئەوان شارەزای  چۆنیەتی کردنەوەی نەبوون. نەیاندەزانی بە دەستە کلیلێك زۆر بەڕەحەتی دەتوانن دەرگاکە

بکەنەوە، کەچی لەباتی بەکارهێنانی دەستە کلیلێك دەیانەویست بەشان دانە بەرو پـاڵ پێوەنـان و ئینجـا بـە گوللـەی (B.٤٠) بیکەنـەوە. نـەیانتوانی تەنانـەت هـەر تـوخنی کۆشـکی دەوڵـەتیش بکـەون، تـەنیا ئەوەنـدەیان پـێ کـرا لەخانووەکـەی بەرامبەر کۆشك سەنگەریان دامەزراند. ئەوەبوو پاشان هـەر هەموویان کوژران و قـەت یـەکێکیان لێ دەربـاز نـەبوو. شـەش کەسـیان رایـان کـرد: پێـنج پیـاو و ژنێك. پاش دوو رۆژ ئەوانیشیان گرت. باڵەخانەی بەرێوەبەرایەتی رادیۆیان نیمچە کاول کرد، بەڵام نەیانتوانی دەستی بەسەرا بگرن.

ئەگەر دەستیان بەرادیۆ بگەیشتایە، ئەوەندە بەس بوو میکرۆفۆنێك بەدەستەوە بگـرن، ئیـدی بـە چـەند وشـەیەك، تـەنیا چـەند وشـەیەك دەیـانتوانی سـەرکەوتن بەدەست بێنن. ئەوەندە بـەس بـوو لـەرادیۆ بڵێن: (شـار لەبـەر دەسـتی خۆماندایە، هاوشارینە، راپـەڕن!). بـەڵام ئـەوان لـەلادێوە هـاتبوون و هیـچیان لـەبارەی شـەپۆلی رادیۆ و میکرۆفـۆن نـەدەزانی. ئـەوان تـەنیا یـەك شتیان دەزانـی: بمـرن و بڕایـەوە. بگـرە ئەوەندەشـیان نـەدەزانی کـە شـار، مـاڵی دەوڵەمەنـد و ئاسـوودە و سـەر بـە ئەمریکییـەکانی تێدایـەو خـاوەنی ئـەو ماڵانـە ئامـادەنین هاوکـاری ڤیـت کۆنگـەکان بکەن.

ڤیت کۆنگ شەو دەچوون لەدەرگایان دەدا و بە زەردەخەنـەوە دەیـانگوت: (ئێمـە نەفەری بەرەی ئازادی میللین، بۆ ئازادی و رزگاری ئێوە هاتووین).

ئەوانیش بەتوندی دەرگایـان بـە روو دادەخـستن، ئەگـەر رێگەشـیان بـدابان بچنـە ژوورەوە، یـان ئەگـەر پێـشوازییان کردبـان، تـەنیا بـۆ ئـەوەبوو بیاندەنـە دەسـت پۆلیسی (لۆن).

تەنانەت قەشەیەکیش ناپاکی لەگەڵ کردن. بەتەلەفۆن پۆلیسی ئاگـادار کـردەوە، بگـرە بەچـاوی خۆیـشی سـەیری گوللـە بـاران کرانـی کـردن. کـاتێ کـە لەقەشـەکەم پرسی:

– باوە، ئەوە چۆن توانیت ئیشی وا بکەی؟

وەڵامی دامەوە:

– چۆن؟ من هەمیشە لایەنگری یاسا بوویم.





من قەت نەمدەتوانی بێنمە بەرچاوم کە (فرانسوا) هەستی بـرووژێ، بـەڵام کـاتێ کە قسەی قەشەکەی دەگێڕایەوە، ئاگری لەچاوی دەباری و دەنگی گیرابوو. ئینجا مـستێکی تونـدی لـەمێزی بـەردەمی داو رووی بـۆلای دیـوار وەرگێـڕا و پاشـان کـە رووی کردەوە لای من، دیتم چاوی خۆی بە یاخەی بلووزە شینەکەی دەسڕییەوە. من هەوڵم دا سەیری نینۆکەکانم بکەم، ماوەیـەکی زۆر لەنینۆکـەکانم رامـام، پاشـان سەری بابەتێکم کردەوە کە بەلامەوە زۆر گرنگ بوو.

– دیارە (لۆن) یش نازانێ چۆن چۆنی رەفتار بکا.

– نەء.

جارێکی تر (لۆن)ت دیتەوە؟

– من نامەوێ جارێکیتر چاوم پێ بکەوێ.

– بیر دەکەمەوە، بۆچی ئەو جۆرە ئیشەی کرد؟

– بەڵام من، نا. ئیتر بەلامەوە گرنگ نییە. بەهەر حاڵ ئەوە ئیشەکەی کردووە!

– لەوانەیە مەست و سەرخۆش بووبێ.

– لەوانەیە!

– حەزدەکەم بزانم.

– پرسیار لەخۆی بکە. لێی بپرسە: بۆچی پیاوێکی قۆڵ بەسراوت کوشت؟

– ئەی ئەگەر بەڵگەیەکی ماقووڵی بۆ هێنامەوە؟.!

– ناتوانێ هیچ بەڵگەی ماقووڵی بۆ ئەم کارەی بەدەستەوە بێ.

– ئەی ئەگەر ئەم جارە چاوت پێ کـەوت و ویـستی دەسـتی درێـژ بکـا بـۆ ئـەوەی دەستت بگوشێ؟!

– من ئیتر قەت دەستی ناگوشم.

بەڵام تۆ هەردەم ئەوت خۆش ویستووە!

– بەڵێ، راستە!

ئەوسا چوو لەبـەردەم ئـامێری نووسین دانیـشت، تـەنیا بـۆ ئـەوەی تـێم بگەیـەنێ چیتر لەسەر ئەم باسە ناڕۆم.

(فلیکس) بۆی باس کـردم کـە ئەوانـە زۆر خـراپ بەینیـان تێکچـووە. راسـت نییـە

(فرانسوا) دەڵێ دوای ئەو رووداوە (لۆن)م نەدیوە. چەند جارێك یەكتریان دیوە. بۆ نموونە بەر لەدوو رۆژ، بەرێكەوت روو بەرووی یەك هاتن، بەڵام كاتێ كە (لۆن) بۆ (فرانسوا) چوو و دەستی درێژ كرد بۆ ئەوەی تۆقەی لەگەڵ بكا، (فرانسوا) پشتی تێ كردو (لۆن)ی لەجێگای خۆی، بەبێ جووڵە و بەدەستی درێژ كراوەوە، جێ هیشت.

دوای نیوەڕۆ

(لۆن) بوو، ڤیت كۆنگەكانی لە گەڕەكەكانی: گیادین و چولون و گوواب و فوتو هوئا دەستگیر كرد. ئەوان پەنایان بردبووە بەر ئەم گەڕەكە هەژار نشینانە، چونكە باشتر دەیانتوانی لەگەڵ هەژاراندا بژین و باش لەزمانی یەكتر دەگەیشتن. (لۆن) چووە ناو هەژارەكان بۆ ئەوەی ڤیت كۆنگەكان دەستگیر بكا. رۆژانی یەكەم تەكنیكێكی تایبەتی بەكار هێنا. هەر رۆژە دوو سێ نەفەری لێ دەگرتن و بەوەڕوەڕەكەی خۆی دەیكوشتن. بەڵام پاشان زانی ناتوانێ هەموو ماڵەكان بپشكنێ، بۆیە بڕیاری دا ماڵەكان بۆمبا باران بكا. رووداوەكە بەم جۆرە بەڕێوەچوو:

بەبڵندگۆ چووە ناو ئەو گەڕەكانەو فەرمانی بەخەڵكەكە كرد خانووەكانیان چۆڵ بكەن. ئەوپەڕی دوو سەعات مۆڵەتی دان و دوای دوو سەعاتەكە دەستی بە بۆمبا باران كرد و بوو بە دۆزەخ.

ساروخ و هاوەن و چەكی قورس! ئینجا دۆزەخەكە ئارام بووەوە. (لۆن) دەستوورێكی تری دا: ئەم جارە فرۆكە كەوتنە ئاسمان: بۆمبای پێنج سەد كیلۆیی و بۆمبای ناپاڵمی حەفت سەدو پەنجا كیلۆیی و نارنجۆكی سووتێنەر! سەر لەبەری گەڕەك بە ڤیت كۆنگەوە ئاگری گرت.

تەنیا ڤیت كۆنگەكان خانووەكانیان چۆڵ نەكردبوو. بە جەهەننەم كە ئەوەندەی وەخت بەبەرەوە نەبوو پیرو كەڕو بریندار و منداڵە بچووكەكان بتوانن رابكەن! بە جەهەننەم، ئیتر ئەمەیە جەنگ!!

ئەمڕۆ سەر لەسبیانێ دیم. ئەمڕۆ سەر لەسبیانێ لەگەڵ (مازۆر) دیم. دوور بەدووری تەماشام كرد، چونكە نەمویست بمبینێ و بیەوێ تۆقەم لەگەڵ بكا.





كراسی گوللە بەندی لەژێر بەرگی پۆلسی لەبەر كردبوو. هەر وەكوو حاڵەتی هەمیشەیی خۆی، بە نەرم و هێمنی و لەسەرەخۆ دەڕۆیشت. بەچاوێكی وەكوو چاوی (ماری ئەنتوانێت) سەیری خەڵكی دەكرد كە دەیگوت: (نانیان نییە، باشە، با كێك بخۆن!)

خەڵكەكە بەدەم هاژوانی رەشە ولاغەكانیان رایان دەكرد، بەرازەكان رایان دەكرد، سوار پایسكلەكانیش رایان دەكرد لەكاتێكا كە سەتڵە ئاویان بە هەردوو سەری دار حەیزەرانەوە كردبووو بەشەكەتی و ناڕەحەتی لەژێر كڵاوی قووچیان چەمابوونەوە.

ئەمانە وەكوو رووبارێك وابوون، تووشی سكرییەك هاتبێ و ئیتر نەزانێ بۆ كێ بچێ؟ و لەكوێ بوەستێ؟ رایان دەكرد. هەموو رایان دەكرد، بەڵام بۆ كوێ؟ گەڕەكی (گیادین) نیوەی كاول ببوو، لە كەلاوەی وەكوو خەڵووز سووتاو، یان لەدیوارێكی رووخاو و چوارچێوەی دەرگایەك، یان لە كورسی و قەنەفەی سووتاو بەولاوە هیچی تر نەدەكەوتە بەر چاو.

تاكسی وەكوو خەڵووز سووتاو و پاسی وەرگەڕاو و مەكینەی درومانی وردو خاش، لەوناوە كەوتبوو. ئەمە ستالینگرادە، یان بەرلینی كاتی جەنگی دووەمی جیهانی؟!.

تەرمیش!! پێ ڕانەدەگەیشتن هەمووتەرمەكان هەڵبگرن و بیانبەن بیاننێژن، ژمارەیەكی زۆریان لەبەر هەتاو كەوتبوون و دەم و چاویان بەپارچە پەڕۆیەك، یان پارچە رۆژنامەیەك داپۆشرا بوو. هەوا بۆن بۆگەنییەكی وای لێ دەهات، ئینسان رشانەوەی دەهات.

– بۆن دەكەی؟
– بەڵێ!
– بۆنەكە لەكوێ دێ؟
– لە تەنیشت ئەم بەردە.
– نەء، ، لەبن ئەم پارچە پەڕۆیە دێ، لەوانەشە لەژێر ئەم رۆژنامەیە بێ.

منداڵێكی رووت و قووت لەژێر رۆژنامەكە بوو. تەمەنی دەوری چوار ساڵ

دەبوو. سێوێکی نیوەخوراوی توند بەدەستی راستەوە گرتبوو، جەستەی هەڵدەفابوو و هیچ جۆرە برینێکی پێوە دیار نەبوو. ڤیت کۆنگێك پارچە پەڕۆیەکی پێ دادرابوو. بە تیلمە سوورەکەی یەکسەر دەتزانی ئەمە ڤیت کۆنگە. زەبرەکە بەلای سەری کەوتبوو. یانی سەری پێوە نەمابوو، بەلاّم گوڵێکی سووریان لەسەر دڵی دانابوو. بەڵێ، گوڵێکی سوور! هەر خوا خۆی دەزانێ ئەم گوڵە سوورەیان لە چ شوێنێکی (گیادین) پەیدا کردبوو! هەر خوا خۆی دەزانێ چۆن زاتیان کردبوو ئەو گوڵە سوورە لەسەر دڵی ئەو ڤیت کۆنگە بێ سەرە دابنێین!

پێش سەعاتێك، لەگەڵ (مازۆر) چوومە (گیادین). پاشان چوومە سەردانی پەرستگای (تری کانگ)، یان باشتر بڵێم ئەو جێیەی دەبوایە پەرستگای (تری کانگ)ی لێ ببینم. تەنیا ئاسکەلتی پەرستگاکە مابوو. هەمووی کون کون ببوو و جێی تەقینەوەی لەدەورو بەری دیار بوو. پاشان ئەو پایانەم بینی کە دەچوونە ژوورە بچکۆلانەکەی ئەم و دواتریش بەشێکی ژوورەکەیم بینی: ئەو بەشەی مێزو وێنەی ماڵەوەی لەسەر بوو. هەڵبەت وا مەزەندە دەکەم ئەمە بەشێکی ژوورەکە بێ چونکە (لۆن) بەهەر شوێنێ دا بڕوا، ئیتر دیوار لەدیوار جیا ناکرێتەوە.

(لۆن)و گوڵی سوور و دڵۆپە شەونمی سەر هەر گوڵێك! لۆن و پیانۆکەی و نۆکتۆرنەکانی شۆپن! (لۆن)و شیعری لە چوارچێوە گیراوی!!

– ئاخر ئەوە بۆچی وای کرد؟ بۆچی؟

(تری کانگ) بەوە تاوانبار کرابوو کە ڤیت کۆنگەکان بۆ خەبات و تێکۆشان هان دەدا.

– ئەی ئێستا (تری کانگ) لەکوێیە؟

– بزر بووە. لەوانەیە خۆی لە پەرستگاکانی تر شاردبێتەوە.

ئینجا چووینە (چولون)و سەرمان لەو شوێنانەدا کە ڤیت کۆنگ کردبوویان بە سەنگەر. هەموو خەڵکی گەڕەکی (چولون) لەگەڵ ڤیت کۆنگەکان دا بوون:

ئەوان ئەنوا و خواردن و خواردنەوەیان دەدایە ڤیت کۆنگەکان. (چولون)، دوو رۆژ پێش جەژنی (تەت)، خۆی بۆ ئەم شەڕە ئامادە کردبوو. لە (٢٨)ی کانوونی دووەم، تاقمە کچێکی گەنج چەکیان بەسەر خەڵکەکە دابەش کرد. (چولون) بنکەی





سەرەکی شەڕەکە بوو. لەسەر دیوارەکان نووسرابوو:

(هاتن قەدەغەیە، لێرە دەستوور دەستووری ئێمەیە!)

سەراپای (چولون) کاول بوو، بیستم (لۆن) گوتبووی: (هیچ کەسێ لە (چولون) گوێی بە فەرمانی چۆڵ کردنی ئێمە نەدا).

ئەوانە یاخی بوون و سەرپێچییان بە رادەیەك بوو تەنانەت (لۆن)یش لە بۆمبا باران کردن و قڕکردنیان تووشی دڵەڕاوکە ببوو.

بوو بە شەڕی تەن بەتەن، ئینجا شەڕی ماڵەو ماڵ و پەنجەرەوپەنجەرە. ڤیت کۆنگەکان چەکی سووك و خۆشیان بۆ ئەو جەنگە هەڵبژاردبوو: دەچوویتە هەر کۆڵانێ وات دەزانی چۆڵ و ئارامە، کەچی لەپڕ تەقەی گوللەیەك دەهات.

دەرفەتت نەدەما تەنانەت خۆیشت بە عەردی دادەی، ئیتر دەقڵیشایەوە و دەبوو بە تەقینەوە.

– وریا بن، خۆتان بە عەردی دادەن!

– بەسەر عەردی!

– ئینجا یەك گەواڵە تۆزو غوبارت دەچووە ناو چاوو یەك رێژنە خۆڵ و بەردت بەسەردا دەڕژا.

–خۆ بریندار نەبووی؟

نەخێر، ئەی تۆ؟

– منیش بریندار نەبوویم، بەلاّم ئەم دوو نەفەرە بریندار بووین.

ئەوانە پەیامنێری (ئێن بی سی) بوون. یەکی زەبری بەقاچی و ئەوەی تر بەورگی کەوتبوو. گرتنی ئەم وێنانە و ناردنی وێنەکان بۆ دوکانداری شەقامی دووەم یان بۆ سەرۆکی بانقی (مدیسون ئەسکویر) و بەرەو روو بوونەوە لەگەڵ کەمتەرخەمی و بێ بایەخی ئەوان وئەوەی ئاخۆ ڤێتنام ولاّتێکی گەرمە، یان نا، زۆر بەگرانی تەواو دەبێ.

(لۆن)م بینی بەشێوەی نەرم و ئارامی هەمیشەیی خۆی، بەرەو ئێمە دەهات. پاسەوانێك خەبەری دایە کە ئەو رۆژە شەش ڤیت کۆنگ دەستگیر کراون. ئەو شەش نەفەرە لادێی بوون، تەمەنیان لەنێوان (١٤) تا (١٨) ساڵی دابوو. پانتۆڵی

کورتیان لەپێ بوو و سۆڵی ژاپۆنییان بەداو لەپێیان بەستبوو. ئەوەی لە هەموویان گەنجتر، ورگی خۆی گرتبوو و خوێن لەبەینی پەنجەکانی دەچۆڕایەوە. (لۆن) بەوردی یەك یەك لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کردن، ئەوانیش بە زەردەخەنەی بێ باکانە وەڵامی پرسیارەکانی (لۆن)یان دەدایەوە.

ئینجا پەڕۆی ڕەشیان لەچاو ببەستن و هەموویان لەبن دیوار ڕاگرتن. زەردەخەنەی بێ باکانەیان هێشتا هەر بەسەر لێوەوە بوو. تەنانەت کوڕیژگە بریندارەکەش زەردەخەنەی بەسەر لێوەوە بوو و چك چکەی خوێنی ورگی ببوو بە شوڕە شوڕ. بەدەستەکانی توند ورگی دەگوشی، کە پاشان بەربووەوە سەر زەوی و گیانی سپارد، هێشتا زەردەخەنەی هەر بەسەر لێوەوە بوو. ئەوسا سەربازەکان بڵندیان کرد و کت و مت وەکوو فەردە زبڵ فڕێیان دایە ناو لۆرییەك و کەوتە سەر تەرمەکانی تر، بۆئەوەی بیانبەن هەموویان لەناو قۆرتێك بنێژن، یان بیانسووتێنن.

– (مازۆر)، بابڕۆین، ئەمڕۆ تێر شتمان بینی.

– لە ڕادەبەدەر شتمان بینی، گیانە، لەڕادە بەدەر!

– (فرانسوا) گوتی ڤیت کۆنگەکان لەم شەڕەدا سەرکەوتوو نەبوون. ئایا تۆش بڕوات وایە ئەوانە بەڕاستی سەرکەوتوو نەبوون؟

ماوەیەك بێ دەنگ بوو، ئینجا گوتی:

– نازانم، دڵنیا نیم!

<u>شەو</u>

منیش نازانم، یان جارێ نازانم. لە (تان سون نوت)یش وەکوو (چولون) و (گیادین) و (گوواب) شەڕ بەردەوامە. لەوێ ئەوانەی دەجەنگن منداڵی پانتۆڵ کورت نین، ئەوانەی شەڕەکە دەکەن، ڤێتنامی باکوورین بەجلی سەربازیی پاك و ئوتوو کراوەوە. ئەوئەفسەرە ئەمریکییەی لێپرسراوی پاراستنی فڕۆکەخانە بوو، گوتی: (هەرچەندە ڤیت کۆنگ دەکوژین، تەواو نابێ. هەموشیان جلی سەربازیی پاك و ئوتووکراویان لەبەرە.)

ئەوانە لە (بین هوئا) دەستیان بەسەر ئیش و کاردا گرتووە، شارەکانی تریش





مەیلەو کەوتۆتە بەر دەستی ئەوان. پەلاماری شەش شاریان داوە و سی و یەك بنکەی پارێزگارییان داگیرکردووە. کەسیشیان لەلایەن فەرمانبەرانی دەوڵەت دەستگیر نەکراوە. (کانگ تری)و (فوکو) و (کانتو) و (میتو) و (کنتوم) و (بین هوئا) و هەروەها (ترا نانگ) و (دانانگ)یش لەبەر دەستی خۆیان دان. واتە لە (دەلتا)وە تا هەوراز بیابان و لەوێوەش تا باکوور و سەراپای (هوئە): ئاڵای زەرد و سوور و شینی بەرەی ئازادیی میللی لەم شارانە هەڵدراوە. بەڕاست ئەوە چۆن توانییان دەست بەسەر ئەم هەمووشارانەدا بگرن؟ ئەمە نهێنییەك بوو کەس نەیدەزانی.

ئەوان بەرامبەر بە ئەمریکییەکان وەکوو مێرووی نەخۆش وابوون بەرامبەر فیلێکی سپ و ساغ. لەگەڵ ئەوەشدا دەستیان بەسەر ئەم شارانەدا گرت و بەراستی کارەکەیان شایەنی ستایشە. بەڵام پاشان فیلەکە بە لووتی درێژی هەمووی کوشتن، ئەگەرچی هەر نەیتوانی بە تەواوی خۆیان لێ ڕزگار بکا، چونکە ژمارەیەك مێروولە چوونە ناو لۆچی ورگ و گوێ و لووتی درێژ و چاوەکانی و هەوڵیان دا خۆیان لەشوێنێ بشارنەوە کە لە لووتی درێژی دوور بێ. خۆیان شاردەوە و زاوزێیان کرد.

تەنیا لیوای سی و سێیەمی بیست و چوارەمینی سەربازی پیادە نەبووکە لە ڕووی ئەمانە ڕاوەستان، بەڵکو سەدو شەست و نۆ دەستەی تری سەربازی بۆ شەڕ بەگەڵیان کەوتن.

ئێستا لێپرسراوانی ئەمریکی، یان ڤێتنامی باشووری، ئیشی ئەوانیان پێ خۆش بێ، یان پێیان ناخۆش بێ، ڕوون کردنەوەی ڕاستی مەسەلەکە کارێکی ئاسان نییە:

(فرانسوا) گرفتێکی نابووەوە، لەدوویان ناردبوو، ناڕەزاییان بەرامبەر بەو هەواڵانە دەربڕی بوو کە لەبارەی ئەو ڕووداوە بۆ پەیامنێرەکانی تری ناردبوو.

چاویشیان لەو ڕاپۆرتە نەپۆشی کە (مازۆر) لەبارەی (هوئە) نووسی بووی!

لە ڕاپۆرتەکەیدا نووسیبووی کە خەڵکی ڤێتنامی باکوور لە (هوئە) بە گەرمی پێشوازییان لێ کردووە و ئەوانە هەر بەو ڕادەیەش پێشوازی لە ڤیت کۆنگەکان

دەكــەن و رايانــدەگرن و هــەموو جــۆرە خــواردن و خواردنەوەيــەكيان پێــشكەش دەكەن. قسەيان لەگەڵ (فرانسوا) مەيلەو توند و ناحەزانە و ناڕەزاييانە بوو:

– (مازۆر) پەيوەندی لەگەڵ دوژمن بەستبووە.

– نەخێر، جەنابينە، ئەوان (مازۆر)يان گرتبوو.

– (مازۆر)، لەجێگايەكا، لەناو بارەگای سوپای دوژمن بووە.

– (مازۆر) پەيامنێرە.

– (مازۆر) راپۆرتی درۆ و دەلەسەو دوور لە راستی نووسيوە.

– چی ديبێ ئەوەی نووسيوە.

– ئايا ئێوە لێپرسينەوەی رەفتاری ئەو دەگرنە ئەستۆ؟

– من لێپرسينەوەی سەراپای ئەو هەواڵانە لە ئەستۆ دەگرم كە ئەو نووسيونی و منيش بەپاريسم گەياندوون.

پاشـان پێيـان گـوت: ئەگـەر جـارێكی تـر ئيـشی وا دووبـارە بێتـەوە، دەزگـای (فرانس پرێس) دادەخەين و خۆت و پەيامنێرەكانی ترت لە ڤێتنام دەردەكەين.

بێگومان رەنگە ئەوان ئاوها بەتوندی نەيگرن، بەڵام دەركردنی (مازۆر) لەڤێتنام شتێكی حەتمی بوو. چونكە ئەوان زات ناكەن بەداخستنی ئاژانسێكی بيانی خۆيان تووشی رسوايی بكەن. لەبيانوويەك دەگەڕێن بۆئەوەی (مازۆر) دەربكەن. سەير لەوەدايە هيچ باسی (كاترين) ناكەن كە هەر لە سەرەتای رووداوەكەوە لەگەڵ (مازۆر) دابوو.

هەرچۆنێ بێ، (كاترين) ئيش بۆ ئاژانسێكی ئەمريكی دەكا و تەنانەت هەندێ هەواڵی بە وێنەوەشی لەبارەی (هوئە)وە بۆ گۆڤاری (لايف) ناردووە.

جياوازی زۆرە، وانييە؟

من تەماشايان دەكەم. (فرانسوا) وەكوو شێرێكی تووڕە بە بەردەوامی لە هات و چۆ دايەو بەردەوام تەلەفۆن دەكا. (مازۆر) لەكونجێك هەڵترووشكاوە و بە هەناسە ساردی سەری دانەواندووە. (كاترين)، بەو دەم و چاوە پڕ برينەی، جارو بار دێ و دەچێ و ناڕەحەت ديارە، بەڵام چاوی وەكوو جاران لەسەر رەوشی بێ باكی خۆيان ماون. لە بيست و سێ ساڵی دا .پەندێكی باشی لەشەڕ وەرگرتووە





(تەقەيە، هەر كەسە دەتوانێ با ڕابكا!)

<u>(٩)ی شوبات</u>

<u>بەيانی</u>

لەناو ئێمەی پەيامنێريشدا، كۆمێدی و تراجيدی تێكەڵ بوونە. دوێنێ شەو، كاتێ كە ئێمە باسی رووداوەكەی (مازۆر)مان دەكرد، ڤيت كۆنگەكان دوو پەيامنێريان دايە بەر گوللە. ئەم روداوە لە (چولون) قەوما.

دوو پەيامنێرەكە (كيم هيون كوك)ی پەيامنێری بڵاوكراوەی (كۆريا تايمز)ی سيئۆل و (پارك رو يو)ی پەيامنێری سەفارەتی كووريا بوون.

(يو تان سون)ی ڤێتنامی، كە بۆ (سی بی ئێس) كار دەكاو بەموعجيزە لەو گوللە بارانە نەجاتی ببوو، ئەم هەواڵەی پێ راگەياندين. رووداوەكە بەم جۆرە بوو:

(– كيم– تازە لەڕێگای (بانكۆك)ەوە گەيشتبووە (هۆنگ كۆنگ) و دەيەويست بەبن و بۆتكەی مەسەلەی (چولون) بكەوێ. چووە دوو (پارك رو يو)ی برادەری دێرينی و داوای لە (يو) كرد لەگەڵيان بچێ، چونكە خۆی باش شارەزای (چولون) نەبوو. بەم جۆرە بەسێ قۆڵی چوونە (چولون).

كت و كت وەكوو من و (مازۆر) و پەيامنێرەكانی دی. پاشان گيران و بردياننە ناو خانوويەك چوار نەفەری گيراوی تری تێدا بوو. بەدرێژايی رۆژ لەو خانووە گليان دانەوەو لێكۆڵينەوەيان لەگەڵ كردن. شەو، ئەفسەرێكی ڤيت كۆنگ لەگەڵ تاقمە سەربازێك چوونە خانووەكەو دەستووريان دا ئەو حەفت گيراوە قۆڵ بەسراوە لە خانووەكە بچنە دەرەوە.

پاشان ناچاريان كردن ماوەی يەك سەعات بەجادەدا بڕۆن و ئينجا كە گەيشتنە جێگای مەبەست، ئەفسەرە ڤيت كۆنگەكە هەمووی لە تەنيشت ديوارێك راگرتن و گوللە بارانی كردن. كەنۆرە گەيشتە سەر (سون)، (سون) گوللەی پێ نەكەوت، بەدرۆ خۆی بەردايەوە سەر زەوی و خۆی وەكوو مردوو لێ كرد. پاشان كە ئەفسەرە ڤيت كۆنگەكە ويستی گوللەی بەزەيی لێ بدا، دەق لەو كاتەدا هيليكۆپتەرێكی ئەمريكی هات و لەسەر زەوی نيشت و ئەفسەرە ڤيت كۆنگەكە

بەخۆو بە تاقمەکەی هەڵاتن و (سون)یش کە دیتی ئەوان هەڵاتن، چوو خۆی لەناو بەرمیلێکی بەنزین شاردەوە و هەر لەوێ مایەوە تا دەورییەك دۆزییانەوە).

من نازانم بەڵام بە مەزەندە واتێ دەگەم ڕووداوەکەی (سون) فرت و فێڵێکی لەبنە. بۆ نموونە وەکوو ئەوەی لەبەر هاتنی هیلیکۆپتەر گوللەی بەزەیی لێ نەرداوە. بەهەر حاڵ، گرنگ ئەوەیە (کیم) و (پارك) کوژران و ئەوە یەکەمین جاریشە ڤیت کۆنگ پەیامنێر دەکوژن. تا ئێستا ئەگەر پەیامنێرێکیان گرتبێ، بەسپ و ساغی ڕەوانەیان کردۆتەوە. بەلای منەوە ئەم ڕووداوە پەیوەندی بەناکۆکییەکەوە هەیە لەگەڵ کورییەکان، چونکە ڤیت کۆنگ زۆر ڕقیان لەکورییاییەکان دەبێتەوە بەتایبەتی دوای ئەو کارەساتەی حەفتەی ڕابردوو لە (چولون) ڕووی دا. کە بەبیرم دێتەوە و یادی ئەم کارەساتە دەکەمەوە، حاڵم تێك دەچێ. حەفتەی ڕابردوو، لە (چولون)، منداڵێك بەدزی چوو بووە ناو ئۆردووگای کورییەکان و خەریکی دزینی هەندێ خواردن بوو، کورییەکان گرتیان و بیست و چوار سەعات بەکوشتنییەوە خەریك بوون. دەزانی چۆن؟ گوللەیان لە پاشەڵی ڕادەکرد، بەڵێ، باش حاڵی بووی، گوللەیان لە پاشەڵی ڕادەکرد. ئەو منداڵە تەمەنی تەنیا هەشت ساڵ بوو.

وای خودایە، ئەوە مرۆڤ بۆچی و چۆن ئەم جۆرە ئیشانە دەکا! مرۆڤی خاوەن دوو دەست و دوو پێ و یەك دڵ. ئەو مرۆڤەی بەئاسایی و سروشتی دەکەوێتە بەر چاوو نەخۆشی دەروونی پێوە دیار نییە: ئیشی وا ئەگەر لەکاتی ئاشتی ڕووی بدایە، دادوەر و دەروونناس و قەشەکان هەموو هاواریان لێ هەڵدەستا. بەڵام لەکاتی جەنگ، کەس ئەمەی بەلاوە گرنگ نییە. هیچ کەس، نە دادوەرو نە دەروونناس و نە قەشە. هیچ کەس وشەی شێتایەتی یان کوشتنی بەسەر زاردا نایە. مرۆڤ دەچێتە سەر مانگ، چارەسەری شێر پەنجە دەکا، شانازی بەوە دەکا کە مرۆڤەو درەخت یان ماسی نییە.

من هەندێ جاری وا هەیە حەزدەکەم درەخت یان ماسی بوومایە!

شەو

من خەریکی نووسینی ئەم شتانە بووم، سێ پۆلیسی ڤێتنامی بەژووریێ کەوتن





و سۆراغی (مازۆر)یان کرد.

بەداخەوە (مازۆر) لەوێ بوو. کاغەزێکیان دایە مۆری ژەنەراڵ (لۆن)ی پێوە بوو: ئەمری دەرکرانی بوو! لەم ڕۆوە تا پێنج ڕۆژ ماوەی هەیە.

(مازۆر) بەناڕەحەتی لێوەکانی بەیەکەوە قرساند. زەردەخەنەیەکی غەمگینی بۆ کرد. کاغەزەکەی دایە دەست (فرانسوا)، ئەویش یەکسەر چاوی بڕییە مۆری ژەنەراڵ (لۆن)و بەتووڕەیی و بە ددانی قرساوەوە گوتی: (گەمژەیە!!)

ئینجا بە (مازۆر)ی گوت بچێتە بەڕێوەبەرایەتی مەڵبەندی پۆلیس و هەوڵ بدا ماوەی دەرچوونەکەی درێژ بکاتەوە بۆئەوەی ئەو بتوانێ لەم ماوەیەدا پەیوەندی بە جەنەراڵ (کی) بکات و ئەمری دەرکردنەکە هەڵبوەشێنێتەوە.

منیش لەگەڵ مازۆر چووم. سێ پۆلیسەکە بەجێبی خۆیان ئێمەیان گەیاندە ئەوێ.

لە ڕێگادا لەگەڵمان ڕووخۆش و میهرەبان بوون، بەڵام هەر هێندە گەیشتینە بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس هەموو نیشانەی ڕووخۆشی و میهرەبانی ناوچەوانیان ڕەوییەوە. یەکەم جار چووینە لای پۆلیسێك، پانتۆڵێکی کورتی لەپێ بوو، کابرایەکی چڵکن و پێ خواس و بۆگەن بوو. وەکوو دوو پیاو کوژ سەیری کردین. دەستێکی لەپانتۆڵی کورتی داو تفێکی ڕوو کردە سەر زەوی. بەبێ جووڵە لە جێگای خۆی وەستاو بەسەرنج ستایشی تفەکەی کرد. ئینجا دەستی بردە ناو پانتۆڵی و خۆی خوراند، ئێمەی بە پاڵدان بردە بەردەم مێزێك ئاسکەلتێکی لەپشت دانیشتبوو بەرگێکی نیمچە کەوڵی لەبەر بوو. لەکاتێکا کە وەکوو ئاسکەلت بەبێ جووڵە دانیشتبوو، بەچاوێکی وا تەماشای کردین کەس نازانێ لەژێر کاریگەری چەند هەزار دووکەڵی تریاك، لێڵ و تۆزاوی ببوو. لەرزینی دەستەکانی تاکە نیشانەیەك بوو، بەو نیشانەیە زانیمان ئەمە مەوجودێکی زیندووە. دەستی بەبێ وەستان دەلەرزی، گرژببووەوە. جا بۆئەوەی لەرزی دەستی ڕابگرێ، دەستەکانی وەکوو نیشانەی لێکدان ( X ) لەسەر یەك دانابوو، بەڵام ئەمەش دادی نەدەدا، مێزەکەشی لەگەڵ دەلەرزی.

(مازۆر) کاغەزەکەی نیشان دا:

– ئەمریان پێ کردووم لەماوەی پێنج رۆژدا ڤێتنام جێ بێڵم، زۆرم پێ خۆشە ئەگەر ئەو ماوەیەم بۆ درێژ بکەنەوە.

ئاسکەلتەکە هەر بەبێ دەنگی مایەوە. لەرزینی دەستەکانی و مێزی بەردەمی هەر بەردەوام بوو.

– بەتایبەتیش کە فرۆکەخانە داخراوە و هیچ فرۆکەیەك ناتوانێ هەڵبستێ!

ئاسکەلتەکە هەر بەبێ دەنگی مایەوە و لەرزینی دەستەکانی و مێزی بەردەمی هەر بەردەوام بوو.

– ئایا تۆ لێپرسراوی ئەم بەرێوەبەرایەتییەی؟

– ئاسکەلەتەکە دەنگێکی ئاڵۆسکاوی لەزاری هاتە دەرەوە:

– بەڵێ!

– هیچ وەڵامی ترت بۆ من نییە!

– جەناب... ئەم کاغەزە جەنەراڵ (لۆن) مۆری کردووە، جەناب! جەنەراڵ (لۆن) فرۆکەیەکت بۆ پەیدا دەکا پێی دەربچی، جەناب!

من ئەو شەوە تا بەیانی لای (مازۆر) مامەوە و بێ گوێ دانە حکوومەتی سەربازی، بۆ شێو خواردن چووینە ئوتێلی کونتە نینتال و لەوێ بەسەر پێوە (کاترین)مان بینی.

من قەت لەو کچە ناگەم، کەتەماشای دەکەی هەست دەکەی دەیەوێ خۆی بشارێتەوە: زۆر وردو ناسك و بێ زاخە. پاشان کە باش تەماشای دەکەی، هەست دەکەی دەبێ لەدەستی رابکەی و خۆی لێ بشاریتەوە.

لەوانەیە ئەم هەستەمان سەبارەت بە چاوەکانی بێ: چاوەکانی سارد و بێ رەحمن، یان لەوانەیە لەسۆنگەی پەنجەکانی بێ: پەنجەکانی درێژو گرێ گرێن و وەکوو چرنووکی هەڵۆ هەمیشە روو لەپێشەوەن.

– ئایا ئەم کچە قەت لەشتێ ترساوە؟

(مازۆر) گوتی: بەڵێ!

کاتێ ڤێتنامییە باکوورییەکان گرتبوویان، هەر دەگریاو (مازۆر) پێی ژێر نەدەکرایەوە.





بەڵام ئەم شتانەی بە ئەدگارو رووکارەوە دیار نەبوو. بەجۆرێ لەگەڵ (مازۆر) دەدوا، وەکوو ئەوەی هاوکارێکی بچێتە ئیجازە.

– ئێ، کەواتە دەچیتە (هۆنگ کۆنگ)؟

– بەڵێ، وا بزانم لە (هۆنگ کۆنگ) دامدەبەزێنن!

– راستە، بەڵام فرۆکە نییە؟

– وا بزانم فرۆکەیەکم بۆ پەیدا دەکەن.

– باشە، ئەی دوای (هۆنگ کۆنگ)؟

– وا تێ بگەم بۆ (لەندەن)ە. من خۆم ماڵم لە (لەندەن)ە.

– باشە، هەرکاتێ بێمە (لەندەن)،هەڵبەت تەلەفۆنت بۆ دەکەم.

من بەپێچەوانەوە، ئەوەندە لەو کارەی لەگەڵیان کردبوو، سەخڵەت و ناڕەحەت بووم، نەمدەزانی چ بڵێم. (مازۆر) کوڕێکی زۆر باشە. کاتی خۆی کە سەربازێکی ڤێتنامی باکووری ئازادی کردبوون، (مازۆر) سەعاتی مەچەکی خۆی لەدەستی خۆی کردبووەوە و بەیادگار پێشکەشی کردبوو. سەربازەکەی ڤێتنامی باکووری ویستبووی وەری نەگرێ، بەڵام (مازۆر) پێی داگرتبوو کە هەر دەبێ وەری بگرێ و بەدەستی خۆی سەعاتەکەی لە مەچەکی سەربازەکە کردبوو، ئینجا پێی گوتبوو: (خێرو خۆشی لێ ببینی!)

(مازۆر) بەتەمابوو لەناو جەنگ دا بمێنێتەوە، تەنانەت پێی وابوو بەلانی کەمەوە یەك ساڵی تر لێرە دەمێنێتەوە.

ئێستاش بە زەردەخەنە جوانەکەی خۆی، هەمیشە دووپاتی دەکاتەوە:

– ڤێتنام ئیتر بۆ من تەواو! تەواو!.

(١٠)ی شوبات

دوای نیوەڕۆ

(چولون)یش رووخا. (لۆن) بڕیاری دابوو بەو پیلانە (چولون) بگرێ کە بۆ گرتنی (گیادین) بەکاری هێنابوو.

بێگومان ئەمریکییەکانیش نازانم بەچەند فرۆکەی(سکای رایدەرز) هاتنە یارمەتی. بەدرێژایی شەو، شار لەبەر بۆمبا دەهەژایەوە. بگرە لێرەش، لەناو شار،

کەرپووچ و دیوار شەقی بردبوو و شکابوون. بەیانی، داوام لە (جوسپائو) کرد، بەهیلیکۆپتەر بەسەر شاردا بسووڕێمەوە و ئەنجامی بۆمبا بارانی شەوی رابردوو ببینم. (چولون) نیوەی زیاتر لەگەڵ زەوی تەخت بووە. تەنانەت شەقامەکانیشی لێك جیا ناکرێنەوە. لەشوێنی شەقامەکان قۆپەنە خاك و خاشاکی سووتاوت دەکەوێتە بەرچاو. ئایا ئەمە ستالینگرادە؟ ئای ئەوە چم گوت! ئایا ئەمە بەرلینە؟ ئای ئەوە چم گوت؟ ئایا ئەمە هێرۆشیمایە؟ هەمووی تەفرو تونا بووە. ئەو شوێنانەی هێشتا شتێکیان تێدا مابوو گوڕی و هالآوی ئاگریان لێ هەڵدەستا. بڵێسەو گڕی ئاگر زنج و خانوو و کەشتییە لەنگەر گرتووەکانی دەم رووباری داگرتبوو. لە هەندێ شوێن، رووبار ئیتر شەپۆلی ئاوی تێدا نەبوو، بگرە هەمووی شەپۆلی ئاگر بوو.

هەوای ئاسمان ئەوەندە گەرم بوو، ئەوەندە تاقەتبەر بوو، برژانگت لە گەرمان دەسووتا. ئەوە ڤیت کۆنگ چۆن خۆیان پێ ڕادەگیرێ؟!

ئەو هیلیکۆپتەرەی سواری ببووم، بەدوای ڤیت کۆنگەکان دا دەگەڕا، بۆیە زۆر نزم دەفڕی. لەپڕ فڕۆکەوانەکە چاوی بە تاقمە زەلامێك کەوت رایان دەکرد. هیلیکۆپتەرەکەی لە زەوی نزیك کردەوە. شەستیرەکانی لەسەر پێ بوون بەلآم بۆی نەکرا تەقە بکا چونکە چڕە دووکەڵ لوولی داین و کوێری کردین.

فڕۆکەوانەکە بەدەم کۆکەو یەك ریزە جوێنەوە، هیلیکۆپتەرەکەی بەرزکردەوە. پاشان دڵی خۆی بەوە خۆش کرد گوتی: ئەمانە ناتوانن دوور بکەونەوە! دوێ شەو کارێکی باش کراوە، بەراستی کارێکی باش کراوە.

لە سەرانسەری دونیادا، دەنگی ناڕەزایی دژی بۆمبا بارانی ڤێتنامی باکووری و (هانۆی) و (هایفۆنگ) بەرزبۆتەوە.

لە سەرانسەری دونیادا، بۆمبای ئەتۆمی رەت دەکەنەوە. ئەی ئینسانی خۆپەرست! ئەی مەگەر پەنجا ناپاڵمی حەفت سەدو پەنجا کیلۆیی، یان سەد بۆمبای ئاسایی هەزار کیلۆیی، هەمان کاری بۆمبای ئەتۆمی ناکا؟

ئایا دەزانی لەم دە رۆژەی دوایی دا، چەند کەس لە (سایگۆن) کوژراوە؟ دە هەزار کەس!! ئێستا دەستیان بەناشتنیان کردووە و بە دەستووری





بەڕێوەبەرایەتی تەندروستی هەموویان لەیەك گۆڕی بەکۆمەڵ دەنێژن و ناویان دەنێن تەرمی نەناسراو، تەرمی بێ ناو!!

ئەمانە لەبەر ئەوەی ناویان نییە، ناوی بنەماڵەشیان نییە. ئەمانە مردوون و بڕایەوە. هاوڕێ و دایبابیان ئیتر هەرگیز ناونیشانیان نازانن.

ئەمانە دووجار مردوون، هەزار جار مردوون!! ئەمانە مەسیحی تازەی سەر رووی زەمینن.

گۆڕە بەکۆمەڵەکان زۆربەیان لە دەرەوەی شارن. لەو شەڕگانەن کە شەڕیان لێ قەوماوەو هێشتا شەڕیان تێدا بەردەوامە. تەنانەت شوێنی گۆڕەکانیشت پێ نادۆزرێتەوە چونکە پڕ تەرمن. هەر ئەوەندەیە خۆڵیان بەسەردا دەکەن و بە زرێ پۆش بەسەریاندا دەڕۆن بۆ ئەوەی عەرزەکەی راست و تەخت بێ. ژمارەیەك لەو گۆڕانە، لە گۆڕستانی شارو لە گەڕەکی (چی هوئا) لەناوچەی (لو وان دویت) دەکەونە بەر چاو.

دوای ئەو گەشتەی بە هیلیکۆپتەر کردم، چوومە ئەوێ. هەر دە تا بیست دەقیقە گەلابەیەکی پڕ تەرم دەگەیشتە ئەوێ. بگرە گۆڕ هەڵکەنەکانیش بە گۆڕ هەڵکەندن را نەدەگەیشتن. گەلابەکان، کە دەگەیشتنە جێ، ڕادەوەستان وپشتیان دەکردە قۆرتەکان و دەسکەکەیان ڕادەکێشاو پشتەوەی گەلابەکەیان بڵند دەکرد و تەرمی کوژراوو سووتاوو شێواوەکانیان، بەبێ هیچ تەرتیبێك، لەسەر یەك رۆدەکردە ناو قۆرتەکە. چ بۆنێك بوو!!... ئای چ بۆنێك!!

ئێستاش لووتم پڕە لەو بۆنە. خۆم شووشت و قژم شووشت و جلم گۆڕی، کەچی ئەو بۆنە هەر نەڕۆیشتووە، لەناو لووتم، لەناو مێشکم هەر ماوە!

بەم زووانە دەچمە سەردانی ئاوارەکان. ئەمانە لە (چولون) هەڵاتبوون. ئەمانە خۆیان بەیەکەوە نووساندبوو، دەستە دەستە لە مەیدانەکانی شار وەستابوون و لە ترسان چرك و هۆڕ دەلەرزین. کت و مت وەکوو مەڕ وابوون.

هەندێ کەس راسپاردرابوون ناویان بنووسن. راگەیاندنیان لەسەر دەرگای قوتابخانە و نەخۆشخانەکان دابوو، لەسەریان نووسی بوو: (ڤیت کۆنگ مایەی بەدبەختین!)

ڕەنگە قسەی (مارسیل) ڕاست بێ کە بە بڕوای مارکسی خۆی دەیگوت:

مەبەست لە شەڕی جەژنی (تەت) داگیر کردنی سەربازخانەکان نەبووە، بەڵکوو مەبەستی سەرەکی ئەوەبووە مێشکی خەڵکی بێ باك و کەمتەرخەم بجووڵێنێن و وریایان بکاتەوە. ئەو بڕوای وابوو: خەڵك ئەوەندە لەشەڕ بێزار بوونە، ئیتر لای هیچ کەس نین، تەنانەت ڕق و نەفرەتیش نایانبزوێنێ. ڤیت کۆنگ مەبەستیان ئەوەیە هێزی ڕق و نەفرەت لای خەڵك زیندوو بکەنەوە.

دوای بۆمبا بارانی ئاسمانی و دوای کۆمەڵ کوژی، ئەم هەستی ڕق و نەفرەتە وای کرد خەڵکە بێ بایەخ و کەمتەرخەمەکە، خۆیان بەلایەکدا ساغ بکەنەوە، بەڵام وێ ناچێ خۆیان بەلای ئەو کەسانەدا ساغ بکەنەوە کە ماڵیان کاول کردوون و منداڵیان کوشتوون! وێ ناچێ!

دوای سەردانی گۆڕستانی (چی هوئا)، بە بەردەمی دوکانی بەرگدرووییەکدا دەڕۆیشتم کە پێش سێ مانگ جلی سەربازیی بەقەدەر خۆم بۆ بچووك کردمەوە، منی ناسییەوە و تەماشایەکی ئەم لاو لای خۆی کرد بۆئەوەی دڵنیا بێ کەس گوێی لەقسەکانی نییە، ئینجا شتێکی گوت، بەهیچ جۆرێ چاوەڕێی بیستنی نەبووم:

– جەژنێکی زۆر خۆشی (تەت)مان کرد! جەژنێکی زۆر خۆشی (تەت)!

بۆئەوەی دڵنیابم قسەکەم بە دروستی بیستووە، لەوەڵامدا گوتم:

– جەژنی (تەت) لە (چولون) هێشتا هەر بەردەوامە.

چاوێکی تررووکاند و گوتی:

– بەڵێ، خانم! ئێستاش جەژنێکی زۆرخۆشی (تەت) لە (چولون) هەر بەردەوامە. جەژنێکی زۆر خۆشی (تەت)!

قاو داکەوتووە گوایە دوو سێ حاڵەتی نەخۆشیی درم لەشار کەوتۆتە بەر چاو. هەر بزانە ئەم نەخۆشییە هەموو لایەکی گرتەوە. بێ گومان هۆکەی بۆ تەرم و ئاوی پیسی شارو زبڵی کەڵەکەبووی سەریەك دەگەڕێتەوە.

– ئایا، ئەمە نرخێکی وای هەیە؟ نازانم، من هەستی هەڵسەنگاندنم لەدەست داوە.





## شەو

کاتێ کە پۆلیسەکانی (لۆن) چوونە (فرانس پرێس)، من لەوێ نەبووم، چووبوومە سەردانی ئاوارەکان. کە چووبوون (مازۆر)یان ترساندبوو و پاشان پێیان گوتبوو هەر ئێستا دەبێ شار جێ بێڵی. مازۆر پڕ کێشی کردبوو و گوتبووی ئێوە بەپێچەوانەی فەرمانی نووسراو دەجووڵێنەوە، بەڵام بێ هوودە بوو. هەر ئەوەندە دەرفەتی وەرگرتبوو کە تەلەفۆن بۆ (فرانسوا)بکاو بچێتە ئوتێل جانتاکەی هەڵگرێ. لەوێوەش لەگەڵ ( فرانسوا) چووبوونە فڕۆکەخانە.

لە دەوروبەری فڕۆکەخانەی (تان سون نوت) شەڕ هێشتا هەر بەردەوام بوو، گۆڕەپانی فڕۆکەخانەکە داخرابوو، بەڵام فڕۆکەیەکی ڤێتنامی چاوەڕێی (مازۆر)ی دەکرد. فڕۆکەکەیان بە تایبەتی بۆ (مازۆر) ئامادە کردبوو، چونکە بەوە تاوانبار کرابوو کەراستی گوتووە. (مازۆر) ڕەنگی پەڕی بوو و (فرانسوا) ئەوەندە تووڕە ببوو، نازانم لەسەر چی ئەمریکییەك ورووژاندبووی و ئەویش لێی دابوو.

ئەمشەو خەم و دڵتەنگی هەموومانی داگرتووە. (فرانسوا) نینۆکەکانی دەقرتێنێ و کاغەز بە ددان دەپچڕێ و قسە لەگەڵ هیچ کەس ناکا، بەڵام من دەزانم بیر لە چ دەکاتەوە. بیر لەوە دەکاتەوە ئەگەر بچووبایە لای (لۆن)، فەرمانی دەرکردنی (مازۆر) هەڵدەوەشایەوە. (لۆن) چاوەڕێی دەکرد (فرانسوا) بچێتە لای، هەر لەبەر ئەوەش فەرمانی دەرکردنی (مازۆر)ی مۆر کردبوو. بەڵام (فرانسوا) نەچووە لای. حەزی دەکرد (مازۆر)ی لەدەست بچێ نەك چاوی بە (لۆن) بکەوێ، یان دەستی بگوشێ.

لەپڕ (فرانسوا) بێدەنگییەکەی شکاند:

– دەزانی دوێ شەو چی کردووە؟

– پێویستی نەکرد بپرسم کێ؟

– نا، نازانم!

– نزیکەی نیو سەعات دوای دەست پێ کردنی حکوومەتی سەربازیی، شەش پەیامنێری دەستگیر کردووە.

– بەخۆی؟

– ئا، بەخۆی! بەسواری جێب بووە. بەلوولەی تفەنگ ناچاری کردوون بوەستن و پاشان هەمووی بردوون بۆ بەڕێوەبەرایەتی ناوەندیی پۆلیس و ئینجا لەسەر شۆستە بەڕیز رایگرتوون و بەدرێژایی شەو گلی داونەتەوە.

– مەست و سەرخۆش بووە؟

– نا، لەسەرخۆی بووە، (لۆن)

(۱۱)ی شوبات

ئەمرۆ یەك شەممەیە. بۆ یەكەم جار زەنگی كڵێساپان لێ داو خەڵك روویان كردە كەنیسەكان. چەند پایسكل سوارو ماتۆڕ سوارێك لەپشت ریزی سەربازەكان دەكەوتە بەرچاو.

بڵاوكراوەی (سایگۆن پۆست)، كە هەمیشە بەیەك پەڕە چاپ دەبێ، بڵاوی كردۆتەوە كە باوردۆخەكە خەریكە وەكوو جارانی لێ دێتەوە. هێلكە مریشك دووبارە یەكی سێ فرانك هەرزان بووە، خەڵك ئیتر بۆ برنج كڕین ریز ناگرن. باشە، ئەی بۆچی هێشتا گرمەی تۆپ دێ؟ بۆچی ژمارەی سەنگەرو فەردە قوم دوو چەندان بووە؟ بۆچی خەڵك لە دەرەوەی شار چاوەڕێی راگرتنی تەقە ناكەن و سەنگەر لە ماڵەكانیان دادەمەزرێنن؟ بۆچی لە سەعات دووی دوای نیوەڕۆوە دەرگاو پەنجەرەكان داخراون؟ ئێستا پێت دەڵێم بۆچی؟

شەڕی (سایگۆن) بەهیچ جۆرێ تەواو نەبووە، تەنیا بۆ ماوەیەك وەستاوە. دوێنێ شەو، ڤیت كۆنگ لە (گوواب) پەلاماری كۆگایەكی تەقەمەنیان دا. دوو حەفتەیە لە (فوتوئا) شەڕێكی گران و درندانەیە.

وا باوە دیسان چەك و تەقەمەنییەكی زۆریان لە ماڵ و گۆڕستانەكان شاردۆتەوە. دەگۆ وایە كە ژمارەیەكی زۆر ڤیت كۆنگ، بێ ئەوەی بناسرێن، دزەیان كردووە بۆ ناو شار و ئەم جارەیان شارەزای گۆشەو كەنارەكانی شارن و بگرە فێری ئەوەش بوونە چۆن بە پێڵاوی ژاپۆنی بڕۆن. هەمووكەس لەو بڕوایەدان ئەوانە خەریكن خۆیان بۆ شەڕێكی تر ئامادە دەكەن كە لەوانەیە ئەمرۆ، تا پێنج رۆژی تر، یان مانگێكی تر یا سێ مانگی تر دەست بە شەڕەكە بكەن. شتێكی حەتمییە ئاخیری ئەم شەڕە هەر دەكەن.





ئەمریكییەكان و ڤێتنامییە باشوورییەكان بەردەوام باسی ئەم مەسەلەیە دەكەن.

وای لێ هاتووە كە دەچینە (جوسپائو)، رووی خۆش نابینین، دەنگی شادو خەندان نابیستین. هەموو جددی و سەخت و قیچكە تەنگ بوونە.

با لە (زورتیان)ەوە دەست پێ بكەین كە ورگە زلەكەی نەماوە. هەموو ئامادەن باشتر كار بۆ شەڕی ئایندە بكەن. كێ چاوساغی ڤیت كۆنگەكان بووە؟ جەنەراڵ (جیاپ)، كە (دین بین فو)ی گرت، یان سیاسەتمەدارانی بەرەی ئازادی میللی؟ ئایا ئامانجیان چی بووە؟

ئامانجیان ئەوە بووە خەڵك تووشی شۆڕش و ئاژاوە بكەن، یان هێزو دەسەڵاتی خۆیان بنوێنن؟ ئەمانە لێكۆڵینەوە لەگەڵ زیندانیان دەكەن و پرسیاریان لێ دەكەن ودەیانەوێ وەڵامێكیان دەست بكەوێ.

دوو سەد ڤیت كۆنگ زیاتر لێكۆڵینەوەیان لەگەڵ كراوە. زۆر باش دەزانم بە چ جۆرێكیش!! نیوەیان زیاتر دانیان پێداناوە كە ئامانجیان ورووژاندنی زەینی خەڵك بووە. بەلاش نەبووە تەنیا خواردنی دوو رۆژیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، نەك زیاتر. ئەوانە چاوەڕوانی دەوڵەتێكی یەكگرتوو دەكەن: بڕیار بوو دوای سەركەوتن دەستەیەكی راوێژكاریی بچنە مەیدانی شار. هەندێ دەڵێن ڤیت كۆنگ دەستووریان وەرنەگرتبوو ئەگەر هێرشەكە شكستی هێنا چ بكەن.

ئەوانە تەنیا ئەوەندەیان دەزانی دەبێ لەشار بمێننەوە وپێویستییەكانی شەڕی دووەم ئامادە بكەن. هەموو دونیا چاوەڕێی دەكرد.

ئەم هەستی چاوەڕێ كردنە (لۆن)یشی گرتبووەوە. (لۆن) دەستووری داوە، ڤێتنامییەكان سەرژمێر بكەن و یەكەو كارتی ناسنامەیان بدەنێ.

هەر بۆیەشە ژمارەیەكی زۆری ڤێتنامی، لە تەمەنی ۱۵ ساڵی تا ٤٠ ساڵی، لەسپێدەی بەیانییەوە تا رۆژاوا سرەیەكی دوورو درێژ لەبەردەم بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس دەگرن و هەریەكە كاغەزێكی بۆر و ئیجازەی نیشتەجێ بوونی لە (سایگۆن) بەدەستەوەیە. مێزێكیان لەسەر پیادەڕۆ داناوە، ئەفسەرێكی پۆلیس لەپشت مێزەكە دانیشتووە. خەڵكەكە یەك یەك خۆیان دەناسێنن و كاغەزە بۆرەكەی خۆیانی پێشان دەدەن، هەركەسێ كاغەزی بۆری پێ نەبێ بەڤیت كۆنگ

دادەنرێ.

خەڵکێکی زۆر کاغەزی خۆیان بزر کردووە، یان هەرگیز بیریان لە وەرگرتنی کارتی ناسنامە نەکردۆتەوە. بەڵام پۆلیس گوێ بەم بیانووانەیان نادا، هەرچەندە ژن دەگرین و خۆیان بە کوڕیان، یان بە مێردیان دا شۆڕدەکەنەوە بۆئەوەی نەیانبەن، ئەوان هەر دەیانگرن و دەیانبەن.

سەرژمێرییەکە لەمڕۆوە تا سێ ڕۆژی تر دەبێ تەواو ببێ. ئێستا لە ڕۆژی دووەمداین. لەم ماوە کەمەدا هەزاران پیاوی بێ کاغەزی بۆر گیراون.

زیندانەکان ئەوەندە سیخناخ بوونە، (لۆن) نازانێ لە کوێ دایان بنێ. بەهەر حاڵ، ئەم جۆرە ئیشە بە چ کەڵك دێ؟! منداڵان راودەنێن چونکە دەزانن لە شەڕی (تەت) دەورێکی گەورەیان هەبوو. هەر دەستە ڤیت کۆنگێك بەلانی کەمەوە سێ منداڵیان بەگەڵ خۆیان دابوو، ئەوانە ئیشیان ئەوەبوو دەچوون لە قەراخ ئۆردووگای ئەمریکی و ڤێتنامی خواروو یارییان دەکرد و بەدەم یارییەوە تەماشای جووڵەی سەربازەکان و جۆری چەك و تەقەمەنییان دەکردو پاشان چییان دیبوو هەموویان لەسەر کاغەزێکی زەرد دەنووسی و کاغەزە زەردەکەیان بەسەر درەختان یان پەرژینانەوە هەڵدەواسی.

هەرکەسە منداڵێکی بگرتایە و تەسلیمی بکردایە، (لۆن) دە هەزار تا یەك ملیۆن روپیە پاداشتی دەدایە، بەڵام کەس شتی وای نەکرد.

(لۆن)! (لۆن)!. ئەم ناوەم لێ بووە بە مێردەزمە، (لۆن)!

شەو

زوو یان درەنگ دەبوایە ئەم بەسەرهاتە رووبدا، ئەوەبوو ئەم شەو رووداوەکە قەوما. ئێستا هەوڵ دەدەم بیرەوەرییەکانم ڕێك بخەم و بەسەرهاتەکەتان بۆ بگێڕمەوە. بەڵام ئایا لەکوێوە دەست پێ بکەم؟:

(فرانسوا) هەموو شەوێ، دەوری سەعات هەشت، دەچێتە ئوتێلی کاراول بۆئەوەی بەرنامەیەك بۆ رادیۆی پاریس تۆمار بکا. ئەو، بەپێچەوانەی دەستووری حکوومەتی سەربازیی، رەفتار دەکا.

حکوومەتی سەربازیی بۆ خەڵکی ئاسایی لە سەعات پێنجی دوای نیوەڕۆ و بۆ





ئێمەی پەیامنێر لە سەعات حەفتی ئێوارە دەستی پێ دەکرد. ئیتر هەموو جارێ ئێمە یەکێکمان بە ئارەزووی خۆی لەگەڵ (فرانسوا) دەچوو بۆئەوەی لە (باڕ)ی ئوتێلەکە بیرەیەکی فێنك بخواتەوە و پشوویەك بدا. ئەم جارەیان من خۆم داوام کرد لەگەڵ (فرانسوا) بچم. (فرانسوا) یەکەم جار ویستی رازی نەبێ، بەڵام دوای نەختێ بیرکردنەوە، بە ساردی گوتی:

– هم، باشە، بابڕۆین!

سواری ترومبێلەکەی ئەو بووین، پەنجا مەترمان لە شەقامی پاستۆر بڕی و بەلای دەستە راستدا پێچمان کردەوە بۆئەوەی بچینە مەیدانی کاتدرال. دونیا تاریك بوو، بەڵام ئەوەندە تاریك نەبوو کە نەبینم گەیشتووینەتە مەیدان. (لۆن)م بینی پاڵی بەجێبێك دابوو و پۆلیسەکانی دەوریان گرتبوو. بێگومان ئەویش ئێمەی بینی. هەموویان ترومبێلەکەی (فرانسوا) دەناسن. بیجۆیەکی (٤٠٣) ی رەشەو لەسەر دەرگاکەی نووسراوە:

(p·F hcoaBi esserp). (فرانسوا) بە ئەنقەست ترومبێلەکەی لێ نزیك خستنەوە ، بەڵام ئەو نە جووڵەیەکی کردو نە متەقی لێوەهات. تەنیا ئەوەندەبوو هەستمان کرد لەژێر لێوەوە، بە هێدی بە پیاوەکانی گوت هەقیان بەسەر ئێمەوە نەبێ.

ئاخیری گەیشتینە ئوتێل و لەوێ نیو سەعات لەگەڵ (فرانسوا)و هاوکارەکانی رادیۆی دانیشتین و دووبارە سواری ترومبێل بووینەوە.

وام زانی فرانسوا ئەم جارە ڕێگایەکی تر دەگرێ بۆئەوەی بەناچاری نەچێتەوە مەیدانی کاتدرال، بەڵام بەیەك جووڵە سوکانی وەرسووڕاند و رووی کردە مەیدانی کاتدرال و راستەوخۆ هاژوای.

بە هێواشی گوتم:

– جەنەراڵ (لۆن) لەوێ وەستاوە.

– دەزانم.

– دەم و چاوی گرژببوو!

–دەمانگرێ .

–دەزانم .

– ... بەلاّم...

– وس بە...

لەئوتێلەوە تا مەیدانی کاتدرال سەد مەتر زیاتر نییە، لە مەیدان بەلای دەستە چەپدا پێچ دەکەینەوە و دەچینە سەر شەقامێك دەگاتەوە کۆلاّنی پاستۆر و ئاژانسی فرانس پرێس. (لۆن)یش کت و مت لەو شوێنە چاوەڕێی دەکردین. گلّۆپەکانی جێبەکەی داگیرسابوون و ئەفسەرەکانی تفەنگیان ئامادەکردبوو تەقەبکەن. خۆی لەپشت ئەفسەرەکان وەستا بوو، بەشێنەیی جگەرەی دەکێشاو چاوەڕێی ئێمەی دەکرد.

– ئەوەتان...

(فرانسوا) وەلاّمی نەدامەوە. هەر وەکوو خۆی، بەبێ جوولّە، بە ساردی و بەوشکی لەسەر لێخوڕینی ترومبێلەکەی بەردەوام بوو. دوو مەتر مابوو بگاتە (لۆن)، ئیستاپی کرد. دەرگای کردەوە و دابەزی. بەرەو (لۆن) چوو. (لۆن)، بە ئارامی جگەرەکەی فڕێ داو بە ئارامیش دەستی بۆ وەڕوەڕەکەی بردو هەر بەو ئارامییەش هەنگاوێ هاتە پێش و راوەستا. (فرانسوا)ش راوەستا. ئێستا ماوەی نێوانیان لە پەنجا سانتیمەتر زیاتر نەبوو.

باش تەماشای دوڕچاوی یەکتریان کرد. ئەم تەماشاکردنە رەنگە دوو سێ چرکە زیاتری خایاند. ئینجا (فرانسوا) لێوی جوولاّند و بەشێنەیی گوتی:

– دەتەوێ دەستگیرم بکەی؟

(لۆن) زاری زلی بەش کردەوە بۆئەوەی بگرنژێ. سەری نەختێ لار کردەوە و بە ورتە ورت گوتی:

– جارێکی تر دەستگیرت ناکەم، یەك گوللەت لە سەری دەدەم.

(فرانسوا) گوتی:

– پێشتریش ئیشێکی وات کردووە!

(لۆن) بێ دەنگ بوو. (فرانسوا) دووبارە گوتی:

– بەداخەوە من دەستم وەکوو دەستی کابرا نەبەسراوە.





(لۆن) سوور هەلّگەڕا. شوێنەکە زۆرباش بە گلّۆپەکانی جێبەکە روناك ببووەوە و بە ئاسانی دیتم (لۆن) چۆن سوور هەلّگەڕا.

ئینجا هاتە پێشەوە و وەڕوەڕەکەی نەختێ لە کیفەکەی دەرهێناو دووبارە کشایەوە دواوە، وەڕوەڕەکەی خستەوە شوێنی خۆی و گوتی:

– بڕۆ!

– تۆ پێشتریش ئەم جۆرە ئیشەت کردووە، وانییە؟

– بڕۆ!

دیسان بۆ ماوەی چەند چرکەیەك تەماشای دوڕ چاوی یەکتریان کرد کە وام دەزانی یەك سەدەیە. ئینجا (فرانسوا) پشتی تێ کردو بە کاوەخۆ هاتەوە لای ترومبێلەکەی. بە هێمنی دەرگای پێوەداو ترومبێلەکەی گڕدا. بە هێواشی بە نزیك پێی (لۆن) دا تێپەڕی.

دوو ئەفسەری پۆلیس بە تفەنگ نیشانەیان لێ گرتین، بەلاّم (لۆن) دەستی هەلّبڕی و لێ نەگەڕا تەقە بکەن.

من ئێستاش شەلاّلّی ئارەقەم.

# بەشی پێنجەم

دوای ئەو دیدارە گرژو توندو تیژە لەگەڵ جەنەراڵ (لۆن)، برادەرەکانم منیان لە بینا بچووکەکەی شەقامی باستۆر بەند کرد. (فرانسوا)ی لێ دەرچێ کە سەرەڕای حکوومەتی سەربازیش، بۆ ململانەکردنی (لۆن) دەچووە دەرەوە، ئێمە ئەوانی تر هەموو ناچار بووین لە سەعات حەفت بەدواوە خۆمان بخزێنینە زیندانەکانمان و دەرنەچین– کە بۆ هەندێك ئوتێل بوو و بۆ ژمارەیەکیش ماڵ. ئوتێلی کۆنتە نینتال کە زۆربەی پەیامنێرەکان لەوێ دابەزی بوون، لە هەموو ئەم جۆرە زیندانانە زیاتر تەحەممول دەکرا. من خۆم بەخیلیم بەو کەسانە دەبرد کە لەو ئوتێلە جێیان دەست کەوتبوو، لەبەر کەش و هەوای ئوتێلەکە نا، کە وای نەدەکرد مرۆڤ هەست بە تەنیایی بکا، بەڵکو شێوەو دەوروبەری ئوتێلەکە دڵی لێ سەندبووم. هەوەسم بە رووکاری دێرین و کەونارای دەهات، بە شانشینە ئاسنەکانی، پلیکانە دارەکانی، هەڵکێشی (ئەسانسۆر)ی کۆنی کە دیواری بە مەخمەڵی سوور و شتی تر رازابووەوە.

هەوەسم بە رەوش و گیانی شاعیرانەی ئەوێ دەهات: باخی سەوزی، کە دارخورما و دەوەنی سەیرو تایبەتی ئەو ناوچەیەی تێدا بوو، (باڕ)ەکەی کە کورسی دار هیندی و پەردەی جوانی هەبوو نەیدەهێشت هەتاو بێتە ژوورەوە، ژوورەکانی کە گەورە بوون و پانکەی سایپیتەیان پێوەبوو.

من حەزم لەو کەشو هەوا سەیرو بارو دۆخە شاعیرانەیە بوو کە لە فەزای ئوتێلەکە شەپۆلی دەدا. کە بە دالآن و هۆڵەکاندا دەڕۆیشتین، وەکوو ئەوە وابوو لە سەردەمی داگیرکەراندا بین، یان کۆمیدییەکی پووچ پێشکەش بکەین.

بەڕێوەبەری ئوتێلەکە گەنجێکی خەڵکی (کورسیکا)بوو، ناوی (فلیپ فراکلین) بوو. کچێکی جوانی چینی هێنابوو. لە هەموو شتێ زیاتر مەراقی نیگاری





سێکسی بوو. یەکێ لە ئارەزووەکانی تەماشاکردنی نمایشگای سێکسی (کۆپنهاك) بوو. یاریدەدەری بەڕێوەبەری ئوتێلەکە بەڕێز (لوی) بوو، کابرایەکی ڤێتنامی مەیلەو پیر بوو. خەپڵەو شپرێو بوو. شەرابی وەکوو شەرابکەری (بۆرگینیۆن) دەناسی.

جەنگ، ئەوانەی خەفەتخان کردبوو، زەبری لە داهاتی ئوتێلی کۆنتە نینتال دا بوو،ببوو بە لەمپەر لە بەردەم هاتنی گەڕیدەو گەشتیاران، بەڵام بەهەر حاڵ، ئەوان پسپۆر بوون لە ئیش و کاری خۆیان، کت و مت وەکوو کەشتییەکی ناو گەرداو ئوتێلەکەیان دەپاراست.

ئوتێلەکەی من لەچاو ئوتێلی کۆنتە نینتال وەکوو بەلەمێ وابوو، یان وا باشە بڵێم وەکوو کەڵەکێ وابوو دوای نیشتنەوەی گەرداو پەنامان بۆ هاوردبێ. ئەو کەلەکە، جگە لە هەندێ ژووری داری شل و شۆق کە پەنجەرەکانی بەسەر ئۆردووگایەکدا دەیانڕوانی، هیچ شتی تری تێدا نەبوو. تەلەفۆنی نەبوو، خزمەتی نەبوو، چێشتخانەی نەبوو، کە برسی دەبووین، ناچاربووین بچینە (باڕ)ێکی بچووکی حەوشە. ئەو (باڕ)ە هی کابرایەکی (کۆرسیکی) بوو، ژنێکی ڤێتنامی هێنابوو. لەوێ، ئەگەر داوای خواردنی ژمارە (بیست و یەك)ت بکردایە، هێلکە مریشکێك و دوو ماسی سەردینییان بۆ دەهێنای کە لە زەمانی شاهنشا (هانگا نگای) راو کرابوون! مخەننەتیی خاوەنەکەی لە تام دەرچوو بوو،بەشداریی ژنەکەیشی لەم تاوانەدا ئەوەندە دزێو بوو، ئەگەر یەك جار بچووبای، جارێکی تر پێت پێ نەدەکەوت. ئەنجام، تەنیا ژووری ئوتێل و ماوەی نێوان ئوتێل و(فرانس پرێس)ت بۆ دەمایەوە و ئەو ماوەیە تەنیا سێ خولەك درێژەی دەکێشا. واتە: یەکەم جار دالآنی ئوتێلەکە، کە هەمیشە (مارسیل)ت لەوێ دەدی، بە دەنگی تیژی دەیگوت:

( چۆنی؟ منیش لەگەڵت دێم!)

ئینجا پلیکانەی رزیو و پاشان حەوشە و دواتر پلیکانەی نووسینگەو سەرکەوتن پیایاو ئاخیریش نووسینگەی کارکردنی (فرانسوا).

نووسینگەی کارکردن دوو ژوور بوو، بەسەر بانێژەیەك دا دەکرانەوە. من

شێوەی یەك بەیەكی كەرپووچەكانم لەبەر چاو بوو، چونكە هەر كاتێ بمویستایە هەوایەكی پاك هەڵمژم، یان بۆ خۆم بە تەنیابم، دەچوومە ئەوێ.

بانێژەكە پان و درێژ بوو، دەگەیشتە بەر دەرگای خانووی كرێچی تر، بەڵام ئێمە هەرگیز كرێچییەكانمان نەدەدی. دوا دەرگا دەرگای (فرانس پرێس) بوو. تابلۆیەكیان لەسەر دەرگاكە دابوو كە لە شووشەی ڵێڵ بوو، رستەیەكی زۆر كورت و پوختەی لەسەر نووسرابوو: (هاتنە ژوورەوە قەدەغەیە).

لەگەڵ ئەوەشدا، هەر كەسێ بیویستایە بێ ئەوەی لە دەرگا بدا یان روخسەت وەربگرێ دەچووە ژوورەوە،: ئەو فرەنسییانەی رێیان دەكەوتە (سایگۆن)، ئەو وێنەگرانەی بە ئیش دەهاتن، ئەو رەخنەگرانەی بۆ كۆكردنەوەی هەواڵ دەهاتن و ئەو قەشانەی وێڵ و عەوداڵی دونیای رۆح بوون. هەندێ جار هات و چۆ ئەوەندە زۆر دەبوو، (فرانسوا) حەوسەڵەی نەدەماو مستی لە مێز دەداو هاواری دەكرد: (بۆ دەرەوە!). جەنابی (لانگ) یش تەنیا یەك چركە سەری بڵند دەكرد و چاوێكی بە خەڵكەكەدا دەگێڕا، وەكوو ئەوەی بیەوێ بڵێ: (بەڵێ، بۆ دەرەوە!). ژوورەكە تەنگ بوو، بەو هەموو مێزانەی تێیدا بوو تەنگتر ببوو، مەیلەو پیسیش بوو. دیوارەكان نیگاری كاڵ بووەوەی ڤێتنام و وێنەی جەنگ و كارتی جەژنانە و ناونیشانی بەسەرەوە بوو. كاتێ قەفەزی باڵندەیەكم بە دیوارەكە هەڵواسی، فەزای ژوورەكە نەختێ كرایەوە. فلیكس باڵندەكەی خۆش دەویست، (كلۆد) رقی لێ دەبووەوە، كەچی بەلای (فرانسوا)وە بوون و نەبوونی وەكوو یەك وابوو. بەڵام بەهەر حاڵ نەدەكرا تەماشای ئەو باڵندەیە نەكەی، چونكە لەگەڵ بەئیش كەوتنی مەكینەی هەواڵ، ئەویش تێی دەچریكاند و دەستی بە خوێندن دەكرد.

مەكینەی هەواڵ لە بنەبانی ژوورەوە بوو. دەبوایە بە تەنیشتی دا بڕۆین ئەگەر بچووباینە ژووری (فرانسوا) و جەنابی (لانگ)، كە ژووری هەمووان بوو، چونكە هەموو لەوێ ئیشیان دەكرد، یان دەچوون بیرەیەكیان لە سارنجۆكی ئەوێ دەهێنا بۆ ئەوەی خۆیان فێنك بكەنەوە. ئاگردانێكیشی بۆ قاوەلێنان لێ بوو. بەهەر حاڵ، تێكەڵ و پێكەڵی و ئاڵۆزییەكی سەیری تێدا بوو. گۆڤاری كۆن، پاتری بەتاڵ، رادیۆ، كتێب، گومگومە، فیشەكی شەستیر، قەوانی بەتاڵ، جانتا، كیسەی خەوی





پاسەوانانی شەو. كاغەزێكی زۆریش لە تەنیشت سارنجۆكەكە هەڵدرابووەوە .(فرانسوا) لە ماوەی چەند ساڵ كۆی كردبوونەوە.

من، زۆربەی شەوان، لە تەنیشت لاتەختێكی نزیك كاغەزەكان دادەنیشتم، یان دەمخوێندەوە، یان دەمنووسی. هەڵبەت تا ئەو كاتەی كە مەكینەی هەواڵ ئیشی دەكرد. چونكە كە پەیوەندی لەگەڵ (مانیل) دەپچڕا، مەكینەی هەواڵ تەنیا ئەم رستانەی لەسەر كاغەزەكە دەنووسی: (شەو باش، بەڕێزان! پەیوەندیمان دەبڕین!). لە هەمان كاتدا باڵندە بچووكەكەش لە خوێندن دەوەستا.

بێ دەنگیی وەكوو پەردە باڵی بەسەر شوێنەكەدا دەكێشاو ئینجا بە دەستووری (فرانسوا) لەوێ دەڕۆیشتین: (با بڕۆین، با بڕۆین، تا سبەینێ)، یان وا باشە بڵێم ئەوان دەڕۆیشتن.من و (مارسیل) دەماینەوە و تەماشامان دەكردن كە دەڕۆیشتن. ئەوسا (مارسیل) دەچووە ئەو (باڕ)ەی یارۆی خەڵكی (كورسیكا) خەرجێكی زۆری پێ دادەپاچی. منیش دەچوومەوە زیندانی خۆم و دەرگام لەسەر خۆم كلیل دەدا و گوێم لە دەنگی نزمی بۆمبا بارانی بەردەوام و دەنگی تەنیایی خۆم دەگرت.

دەزانی هەندێ جار وای لێ دێ تەنانەت هۆگری زیندانەكەشت دەبی.

شووڕەییە! شووڕەیی!!

دوای چەند شەوێ هەستێكی سەیرم لا پەیدابوو. دەمەوێ بڵێم دوای چەند شەوێ، وام لێ هات ئیدی بەخیلیم بە هاوكارەكانم نەدەبرد كە لە ئوتێلی كۆنتە نینتاڵ ژووریان دەست كەوتبوو، تەنانەت بەخیلیم بە كەش و فەزای دەورانی ئیستیعماریش نەدەهات كە لەوێ لەئارادا بوو، چونكە شتێكم لەسەر كەلەكەكەم دۆزییەوە، شایانی خوێندنەوە بوو، مرۆڤانەو شاعیرانە بوو.شتەكە لەناو جەنگ دا هەڵتۆقی بوو دەق وەكوو گوڵێ وا بوو لە ناو زبڵ پشكووتبێ .

دەزانی ئەو شتەم لەكوێ پەیدا كرد؟

ئەو شەوەم زۆر باش لەبیرە، برادەرەكانم سەرقاڵی ئیش بوون، من بەبێ كاری دانیشتبووم، چونكە پەیامی رۆژانەی خۆم رەوانە كردبوو.

لەسەر بانێژەكە دانیشتبووم،بایەكی گەرمی دەهات، هیلیكۆپتەرێك بەسەر

سەرمانەوە دەسووڕایەوە و ساروخی نوور بەخشی بەرەو جەنگەڵ دەهاویشت بۆئەوەی جێگای ڤیت کۆنگەکان بدۆزێتەوە کە وەکوو تارمایی وابوون لە تاریکی دا.

هەستم کرد بەلای منیشەوە ڤیت کۆنگەکان وەکوو تارمایی ناو تاریکی وان، بە ڕاست! ئایا من هیچیان لە بارەوە دەزانم؟! بەر لە چەند مانگێ، هەوڵم دا بچمە ناو ڕۆحی یەکێکیانەوە کە بڕیار بوو لە سەری بدرێ، بەڵام نەمتوانی.

دوای ئەوە ئەگەر ڤیت کۆنگێکی مردووم بدیبایە، هەوڵم دەدا بە زیندوویی بیهێنمە بەر چاوم، بەڵام نەمدەتوانی!

بانێژەکەم جێ هێشت و چووم لە تەنیشت کاغەزەکان لەسەر کورسییەك دانیشتم. دەفتەرێکی بچووك لەناو کاغەزەکان سەرنجی راکێشام، بەپیتی ئینگلیزی تایپ کرابوو. هێدی هەڵم گرت و دەستم بە خوێندنەوەی کرد.

لەپڕ لە شوێنی خۆم راچڵەکیم و قیژاندم:

– ئۆی، ئەمە چییە؟

(فرانسوا) خەریکی داڕشتنەوەی هەواڵێك بوو، سەری هەڵبڕی و گوتی:

– بیرەوەری ڤیت کۆنگێکە!

– بیرەوەری راستەقینەیە؟

بێ ئەوەی وەڵامم بداتەوە لەسەر خوێندنەوەی هەواڵەکە بەردەوام بوو. کاتێ لە خوێندنەوەی هەموو نووسینەکانی دەفتەرە بچووکەکە بوومەوە، ئەو هەستایەوە، چەکمەزەی مێزەکەی کردەوە و دەفتەرۆکەیەکی بچووکی سپی پاتی لێ دەرهێنا بەخەتی ڤێتنامی نووسرابوو.

دەفتەرە بچووکەکە پەڵەخوێنی پیس و وشکەوەبووی بە سەرەوە بوو.

– بەڵێ راستەقینەیە! ئەمەش ئەسڵی بیرەوەرییەکەیە! زۆربەی ڤیت کۆنگەکان دەفتەری بیرەوەرییان هەیە. هەریەکە دەفتەرێکی بچووکیشی پێیە چی شیعری پێی خۆش بێ لێی دەنووسێتەوە.

– ئەم دەفتەرەت لە کوێ دەست کەوت؟

– ئاشکرایە. لەسەر تەرمێك! سەدان دەفتەری بچووکی وەکوو ئەمەی لێ بوو.





جاران زۆر بە ئاسانی ئەم دەفتەرە بچووکانە دەست دەکەوتن بەڵام ئێستا نا، چونکە ئەمریکی پێش ئەوانی تر دەفتەرەکان دەدۆزنەوە و کۆیان دەکەنەوە بۆئەوەی وەریان بگێڕن، بۆی هەیە رۆژێ بێ و سوودیان لێ وەربگرن.

– سوودی چیان لێ وەردەگرن؟

– بۆ وەرگرتنی هەندێ زانیاری، کە وەکوو دژە بانگەشە بەکاری دێنن.

ئەمەش یەکێکە لەو دەفتەرە بچووکانەی دۆزیومانننەتەوە.

دەیبەم دەیخوێنمەوە و دەتدەمەوە!

ئەو شەوە ئیتر چاوەڕێی کپ بوونی مەکینەی هەواڵم نەکرد، هەر زوو گەڕامەوە ئوتێل.

زیندانەکەم ئیتر زیندان نەبوو. ئەوانیش چیتر بەلامەوە تارمایی گومبووی ناو تاریکی نەبوون .

لە خوێندنەوەی کتێبەکە شتێکی وام دەست کەوت ، جەنگیش پێی لە ناو نەدەچوو :

شکۆمەندیی دەردی ئینسان بوون .

<u>( ١٦ ) ی شوبات</u>

وەکوو تینوویەك کە پەرداخە ئاوێکی بدەنێ ، ئاوهابە پەرۆشەوە خوێندمەوە .کاتی خەو رابرد و بەیان ئەنگووت و من  هەر خەریکی خوێندنەوەی بووم .خۆزگە ئەم نووسینانە هی من بان! باشە ئەوە کێیە ؟ بە کێ چووە ؟ ناوەکەیم لە هیچ کوێی دوفتەرۆکەکە نەدۆزییەوە .

زەحمەت بوو بتوانی ئەدگاری بێنیتە بەر چاوت. تەنیا یەك جار باسی دەم و چاوی خۆی کردبوو. ئەویش ئەو کاتەی دوای ماوەیەکی زۆر بۆ یەکەم جار لە ئاوێنەدا دەم وچاوی خۆی دی بوو چەند لەڕو دەردەدارە .

یەك شتمان لە نووسینەکانی بۆ دەردەکەوت ، ئەویش ئەوەیە خۆی خەڵکی ڤیتنامی باکوور بووەو لە لاوسەوە هاتۆتە باشوور و چۆتە ناو دەستەیەکی سەربازی .دیارە کاتۆلیکیش بووە، چونکە وەکوو جەژنێکی ئایینی یادی  جەژنی نۆییلی کردۆتەوە. گەنجیش بووە ، چونکە تازە چۆتە عەسکەری. بەڵام لادێی

نەبووە ، کیمیاوی یان تەکنیکار یان قوتابی بووە .چونکە لە نووسینەکانی دا، هەندێ جار باسی تاقیگا دەکا کە پێش چوونە عەسکەری ئیشی تێدا کردووە .باسی کتێبخانەکەی و کتێبەکانی خۆیشی کردووە .وێ ناچێ بە کەلەش گەورەو بەهێز بووبێ .لە رۆیشتن زۆر شەکەت بووەوەو هەمیشە ژانە سکی لێ بووە .باسی هەموو شتێکی کردووە :گەرما ، سەرما ، جۆری خواردن و زەروو. بە شان و شەپیلکێکی ئێسکن و دەستێکی باریک و چاوێکی مامزیی دێتە بەرچاوم .ئەو چاوانەی لە کاتی مالآوایی زۆر بە وردی لە ژنەکەی راماون . ئەو ژنەی کە ئاشقی بوو . چاوەکانی هەر ئەو چاوانە بوون کە لە کاتی مردنیش هەر لەگەڵی دا بوون.

وا بزانم ئەمە لە کاتی شۆڕش و ئاژاوەی (سایگۆن) کوژراوە. کێ دەزانێ داخۆ تەرمەکەیان لەکوێ ناشتووە. ناتوانم بیهێنمە بەرچاوم کە ئەو کابرایە مردووە و نەماوە. ئێستا نووسینەکانی وەردەگێڕم.

شەوەو چوارچێوەی پەنجەرەکانم لەبەر تەقینەوەی بەردەوام دەهەژێنەوە. پاسەوانەکەی بن پەنجەرەم، بەردەوام تەقە دەکا، لەگەڵ هەر تەقەیەکیش قیژەیەکی تیژو وشکی لە گەروو هەڵدەستێ.

## بیرەوەرییەکانی
## ڤیت کۆنگێکی نەناسراو

### ئەمڕۆ یەکی مایسە

لەبەر جەژنی کرێکاران نییە کە ئەمڕۆ دەستم داوەتە قەڵەم، بەڵکو سەبارەت بە رووداوێکە کە سەراپای ژیانی گۆڕیم. ئەمڕۆ بەیانی، سەعات حەوت و نیو، کاتێ کە خۆم ناساند، هاورێ (لان) گوتی: (خۆت ئامادە بکە بۆئەوەی بچیتە عەسکەری!)

وا بزانم ئەگەر هەست و سۆزی خۆم بخەمە سەر کاغەز، باشتر دەتوانم روونی بکەمەوە. شادی و شڵەژانێکی لە رادەبەدەر دایگرتم، پاشان هەر لەو شادی و شڵەژانەدابووم لەپڕ غەمێك هەمووگیانی داگرتم. دەبێ ژنەکەم جێ بێڵم!! دەبێ ئەم عەشقە پیرۆز و بەنرخە جێ بێڵم. تەنیا چوار مانگە زەماوەندمان کردووە، ماوەیەکی زۆر نییە بەیەکەوە دەژین. دەزانم بەچوونە عەسکەری دەبێ چ





قوربانییەك بدەم. من باکم بە مردن نییە. ئەگەر مردن ببێ بە مایەی ئازادیی هاولآتییەکانم، بەوپەڕی ئارەزوو باوەشی پێدا دەکەم. بەلآم جێ هێشتنی (کان)ی ژنم، بۆ من کوشندەیە، کوشندە!! ئاخ!!

### ئەمڕۆ دووی مایسە

بڕیارم داوە دەفتەرێکی بیرەوەریم هەبێ. ئێستا وا لە تاقیگەم. کاتی رۆیشتن نزیك بۆتەوە و پەستی و نیگەرانی من ژنەکەیشی گرتوومەتەوە. ئەویش ئێستا دەزانێ چل سەعاتی دی زیاتر بەیەکەوە نابین. تەنیا چل سەعاتی دی! ئەو چل سەعاتە بەنرخترین سەعاتی ژیانمانە! لەوانەیە هەرگیز یەکتر نەبینینەوە. کارەساتێکی گەورەیە!!

من دەزانم ژیانی سەربازیی شتێکی پڕ سەربەرزیی و شکۆمەندییە، بەلآم جێ هێشتنی ژنی ئازیزو خۆشەویستمان، کارێکی سەخت و دژوارە. رۆژگار لە بەینی پەنجەکانم دەخزێ. چاو تروکانێکی ترەو ئیتر نایبینمەوە.

بە پەستی و نیگەرانی، خولەك بە خولەك دەژمێرم و هەزاران پرسیار لە خۆم دەکەم.

ئێمە بۆچی دەبێ بێینە دنیا؟ بۆچی دەبێ ئازار و ئەشکەنجە بکێشین؟!

### ئەمڕۆ سێی مایسە

دوا ساتەکانمان بە یەکەوە رابوارد. من و (کان) گاوێ قسەمان دەکرد و تاوێ کپ و بێ دەنگ دەبووین. بە کپ و بێ دەنگیی پرسیارم لە خۆم دەکرد: ئەگەر بشێ دووبارە یەکتر ببینینەوە، ئاخۆ دەبێ ئەو کاتە کەی بێ؟!

دەزانم، کە جەنگ تەواو بوو ئەوسا بە دیداری یەك شاد دەبینەوە، بێ گومان ئەگەر تا کۆتایی جەنگ بمێنین. خەفەتی ئەوەمە نەوەك جارێکی دی بە دیداری باوك و دایك و خوشك و براکانم شاد نەبمەوە، بەلآم ئێستا ئەو کاتەم لەپێش نەماوە دەرفەت وەربگرم و بچمە سەردانیان. ئایا ئەوان دەزانن من لە چ حاڵێکدام؟ ئاخ جەنگ!!... مەرگ!!... جەنگ شتێکی چەند بێزەوەرە، مەرگ چەند قێزەوەنە!

دەبێ ئێرە جێ بێڵم. دەگریم. من پیاوێکی بێ غیرەت نیم، خۆم بە خاوەن ویست و بە پیاوێکی بەهێز دەزانم، بەلآم هەر چۆنێ بێ منیش بەشەرم، ناتوانم

رێ لە دەرکەوتنی هەست و نەستی خۆم بگرم. بە دەوام فرمێسکم لە چاو دێتە خوارێ.

خوا حافیز خۆشەویستەکەم! دەبێ بگەمە سەر ئیشەکەم. هەوڵ دەدەم کە هاتمەوە پاسکلێك و چەند کتێبێکت بۆ بێنم. هیوادارم (چن) بە ترومبێل بمهێنێتەوە بۆئەوەی بتوانم پاسکلەکە لە ترومبێلەکەی بار بکەم و زووتر بتبینمەوە. ئۆی (کان)!! ...وێنەی دڵەکەت لەناو چاوەکانتەوە دەبینم، دڵێکی شکاوە. با وابێ، بەڵام رۆژێ هەر دێ ئەو شەیتانە ئەمریکییانە ئیتر لەم وڵاتەدا نامێنن. ئەگەر لەبەر ئەم ئەمریکییانە نەبوایە، ئێمە ناچار نەدەبووین ماچی ماڵاوایی لەیەك بکەین!

ئەمڕۆ چواری مایسە

ماڵاواییم لە برادەرەکانم کرد. ئای چەند شەو بەیەکەوە چامان خواردۆتەوە و هاوبەشیی غەم و دەردی یەکتر بووین. بەجێ هێشتنی برادەرانیش دەردێکی گرانە!

ئەو رۆژە خۆشانە بەسەر چوون. ئێستا نۆرەی ژیانی سەربازییە.

ئەمڕۆ پێنجی مایسە

ئەمڕۆ یەکەم جەمە خواردنی سەربازیم خوارد! ئەمڕۆ وام هەست کرد بە قەدەر یەك ساڵ پیر بوویم. هێشتا جلی سەربازیم نییە! بەڵام من لەخۆم رازیم.

ئێستا خەریکن رێکمان دەخەن و بەسەر دەستەی سەربازیی تایبەتی و دەستەی گشتی دا دابەشمان دەکەن، ئەوسا پێویستی حەوانەوە و خواردن و ئاومان بۆ دابین دەکەن.

ئەمشەو دەچینە (نگیادان) . دەبێ حەفت هەشت رۆژ لەوێ بمێنینەوە. بۆ ئاخیر جار تەماشای (فوکی) دەکەم: لێڕ و جەنگەڵە سەوزەکانی، دەشتە بێ پەی و سنوورەکانی و ئەم خاکە دڵگر و خۆشەویستەش. چەند ساڵ لێرە ژیاوم؟ وا جێی دێڵم و بە کۆڵە بارێکی لە شان قورس، بە شاڕێی ژمارە پازدەدا دەکەومە رێ.

ئێستا شەوە و مانگ بە دەرەوەیە. رێگابە تریفەی خۆی بۆ نەفەرەکان روناك





دەکاتەوە.

ئەمڕۆ شەشی مایسە

بە مەزەندەی تۆ کێم لە رێگا دیبێ باشە!؟ (تران تی هان) ی کۆنە دۆستم بینی. ئەو کچەی بە منداڵی خۆشم دەویست. رێکەوتێکی سەیر بوو!! بە روو خۆشی دەستی یەکترمان گوشی. چەند قسەیەکمان لەگەڵ یەك کرد و خواحافیزیمان کرد. پێکەنی و گوتی: (ئێمە ئەم دووە هەر خواحافیزی لەیەك دەکەین!)

ئای (هان)، کاتێ کە تۆم لەبەر دەرگای ماڵەوەتان بینی، تووشی چ حەپەسان و پەشۆکانێك هاتم! (تران تی هان) خانی هاوکاریی (دای تان)ی خەڵکی گوندی (نگیا بین)! ئایا قەت دەزانی بەم پێك گەیشتنە چەند شاد و خۆشحاڵ بووم؟ هەر چەندە من ئێستا یەکێکی ترم خۆش دەوێ، بەڵام ئەم دە خولەکە وەختەی تۆ پێت بەخشیم ئەوەندە بەرز و بەنرخ بوو قەت لەبیرم ناچێتەوە.

دووبارە ملی رێمان گرت: لە (نگیا بین) و (نگیا دونگ) تێپەڕین و ئێستا لە (نگیا دوپ) ین. سەعات سێی رەبەقی بەیانییە. زۆر کەشەنگ و شەکەتین. کەس قسە ناکا، کەس گۆرانی ناڵێ!

ئەمڕۆ حەفتی مایسە

زۆر کەم نووستم. زۆر ماندوو بووم. زۆرم پێ خۆشە کە لە (نگیا تای) لا دەدەین. (بی لوان) ی برام ماڵی لێرەیە، روخسەتم وەرگرتووە سەردانێکی بکەم. بەم جۆرە دەتوانم پەیامێکی دوو وشەیی بۆ باوکم بنێرم ... دەست بە بیرەوەرییەکانم دەکەم. (بی لوان) م بینی. تەنانەت خواردنیشم لەگەڵ خوارد. وای چەند بە دیدارم شاد بوو! هەرچەندە بۆ چوونە سەردانی، لە رووبارم دا، بەڵام بەوەی باش بوو دیتم و بە دیداری شادو کەیفخۆش بووم. خۆشبەختانە ئاوی رووبارەکە زۆر نەهاتبوو. تا سەعات دووی پاش نیوڕۆ لای (بی لوان) مامەوە، ئەوسا گەڕامەوە لای دەستەکەی خۆم. تا سەعات شەش ئێورین و ئینجا دووبارە کەوتینەوە رێ.

ئەمە دووەمین شەوە، لە دووری ماڵەوە و لە دووری (کان) بەسەردەبەم. مانگ

کەوتۆتە بن هەور. باران دەباریّ، بەلاّم ئیّستا هەوای خۆشە. ئەو خەلّکە بە دەنگە دەنگ و هەراو هۆریا قسە دەکەن و پیّدەکەنن.

ئیّستا گەیشتووینەتە ناوچەیەك، بۆ من زۆر نائاشنایە! بانی خانووەکان بە کەرپووچی سوور کراوە و زنجەکان لە بەلّمە برنج دروست کراون. کچ لە مالّ و زنجەکانەوە دیّنە دەریّ و تەماشامان دەکەن، بەلاّم بە شەرمەوە خۆیان لەپەنا داران دەشارنەوە. جا ئیّمەش هاوار دەکەین و دەلّیّین:

( چکۆلّە نازدارەکان، ئازا بن، ئیّوەش لەگەلّمان وەرن! )

ئەوانیش لە تریقەی پیّکەنینی مندالاّنەی خۆیان دەدەن و را دەکەن.

### ئەمڕۆ هەشتی مایسە

ئەمڕۆ نۆرەی چیّشت لیّنانی منە. دەبیّ ئاو پەیدا بکەم، بەلاّم لەبەر ئەوەی دوو شەو لەسەر یەك رۆیشتووین، ئیّستا خۆم پیّ لە سەر پیّ راناگیریّ. هەر بە حەستەم بجوولّیّمەوە هەموو گیانم دیّشیّ . من هەرگیز وەرزشوان نەبوویم. ئەو خواردنەی دەبیّ ئەمڕۆ لیّی بنیّم، وەکوو هەموو جاریّ مەرەگەی سەوزەیە. باش هەرس دەبیّ.

شەو دەبیّ زیاتر برنج لیّ بنیّین بۆ ئەوەی کفتە دروست بکەین و بۆ ریّگای سبەینیّ هەلّیبگرین تا برسی نەبین. ئەم شەو لە بەرنامەدا نییە ریّ تەی بکەین.

زۆرمان نائومیّد بووینە: بەبیّ ئۆقرەیی چاوەڕیّی دەستەکەمان و بیستنی هەوالّی تازە دەکەین، بەلاّم فرۆکەی ئەمریکی هەمیشە بەسەر سەرمانەوەن و سارووخی نووربەخشمان تیّ دەگرن. ئیتر لەو بارودۆخەدا بزووتنەوە کاریّکی ئەستەمە.

هەرچۆنیّ بیّ، وا چاکە لیّرە بمیّنینەوە. من زۆر شەکەت و ماندووم. ئەوە شەش رۆژە بەڕیّوەین. بە دریّژایی ئەو ماوەیە عەشقی شتە لەدەست چووەکانی خۆمم هەر لەگەلّدا بووە. ئەم عیشقە قورسە قورس! ... وای دلّم بۆ (کان) زۆر تەنگ بووە، ئای چەند غەریبی دەکەم!!

ئیش و کارم بۆتە ئەوە، بیر لە کان دەکەمەوە و دەژمیّرم داخۆ چەند رۆژە لیّی جیابوومەتەوە. لەوە زیاتر هیچ ناکەم.





### ئەمڕۆ نۆی مایسە

پاش ئەوەی یەکەم دەستەی سەربازیی رۆیشتن، سیّ فرۆکەی ئەمریکی بەدەر کەوتن و پاشان لە نزیك ئۆردووگای دەستەی سەربازیمان، گویّمان لە گرمەی بەربوونەوەی بۆمبا بوو. دوای سەعاتیّك گەیشتینە ئەویّ، هیچ کوژراومان نەبینی، تەنیا یەك رەشەولاّغمان بینی لە چەقی ریّگای ژمارە (١٥) کەوتبوو.

تووشی حالّەتیّکی سەیر هاتم. دەبیّ ئەوەش بلّیّم ئەمە یەکەمین گیانلەبەر بوو کە دیتم لە شەڕ کوژرابیّ.

نیو سەعات لەویّ ماینەوە بۆ نان خواردن، بەلاّم من لەباتی نان خواردن، دەستم بە نووسین کرد.

نووسینم زۆر لە خواردن پیّ باشترە! بەم زووانە لە گوندەکانی (دو لونگ) تیّدەپەڕین.

ئەم لاو ئەو لای ریّگا گیای سەوز و بلّندی لیّ رواوە.

### ئەمڕۆ دەی مایسە

برنجمان نەماوە. ئیّرە برنجی لیّ نییە تا بیکڕین. ئەمشەو دەبیّ بە سکی برسی بخەوین. ئەگەر بارودۆخەکە باش بیّ، سبەی برنجمان دەبیّ. وای برسیّتی چەند ناخۆشە!! ئیتر ئارەزووی نووسینم نییە.

### ئەمڕۆ بیست و شەشی مایسە

شازدە رۆژە ناڕەحەتم و ئارەزووی نووسینم نییە. بە تاریکی ئەنگوستەچاو دەڕۆین، بە چەند گوندی نا ئاشنادا تیّپەڕ بووین. فرۆکەی ئەمریکی یەك چرکە دەستبەرداری تاقیب کردنمان نابن. ئەو کاتانەی هیچ چاوەڕیّیان ناکەین، لەپڕ دەردەکەون و سارووخی نووربەخشمان بەسەردا بەردەدەنەوە. ئەمڕۆ بارو بنەمان خست و دابەشی دەستەی شەش نەفەرییان کردین بۆئەوەی داری جەنگەلّ ببڕین. من خۆم دەوری شەش سەعات خەریکی دار بڕین بووم، بەلاّم ئەم ناڕەحەتییە لەچاو ناڕەحەتیی زەروو، هەر هیچ نییە.

هەرکاتیّ پیّ دەخەینە ناو جەنگەل، یان شویّنیّکی تەڕ، یەکسەر هەست بە خواپترین دوژمن دەکەین کە زەرووە. زەروو زیندەوەریّکی بچووکی لەعنەتییە! ئەم

زەروانە لە هەموو شوێنێ هەن، یەکەم کەس پێی نایە ئەو شوێنە، دەکەوتە سەری. هەرچەندە لە ترسی ئەم زەروانە سەراپای لەشی خۆمان پێچاوە، لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانن خۆمان پێوە بنووسێنن. هەر کاتێ هەست دەکەم پێم دەزووڕێتەوە، یەکسەر دەزانم هۆی چییە.! ئێستا پێڵاوم لەپێ کردۆتەوە، پێیەکانم پڕ خوێنن، ناخۆش و بێزەوەرە!

ئەمڕۆ بیست و حەفتی مایسە

لە (لام) مەلەمان کرد و دووبارە کەوتینەوە ڕێ. هەریەکەمان دەبێ دوو سەبەتە هەڵگرێ. بۆ خواردنی ئەمڕۆمان، لە کاسە برنجێك زیاتر هیچیان پێ نەداوین. بۆ نووستن گەڕاینەوە ناوچەی (دی لونگ)، واتە دووبارە ئەو ڕێگایەمان بڕی کە پێیدا هاتبووین. ئینجا بەرەو (نگون سون) و (لم سون) و (بوی سون) چووین. مەتاڵەکەم بەتاڵ بووە. شانەکانم ئاوساون و ژان دەکەن. هەرجارەی جێی سەبەتەکان دەگۆڕم هەست بە ژان و ئازارێکی زۆر دەکەم. پێم هەمووی بۆتە برین، ئیدی تاقەتی ڕۆیشتنم نەماوە.

دەستەکەی من چەکیان تەنیا تفەنگە! مەبەست لەم ڕۆیشتنە مەشقی پیادەی سەربازییە. ئەو سەبەتانەی بەشان هەڵمان گرتوون پڕن لە تەقەمەنی: بۆ تەقاندنەوەی لۆری و تانکی ئەمریکی. ئێستا لە گوندی (تان فونگ) ی ناوچەی (تان چونگ) ی پارێزگای (نگە ئان) لامان داوە. لەسەر ورگی خەڵکی گوندەکە دەلەوەڕێین،

ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر خۆمانیان لە لا خۆشەویستتر دەکەین، بەڵام هیچ خەبەری (کان)م نییە!! کان!!

ئەمڕۆ یەکی حوزێرانە

نزیکەی مانگێکە سەربازم و لەرێگا بڕین بەولاوە هیچمان نەکردووە. بە هەر چوار پەلان دەڕۆین. خۆمان لەناو قوڕتان دەشارینەوە، بەسەر داران دەکەوین و خۆمان لەناو چڵ و گەڵا حەشار دەدەین. ڕێ بڕین ئەوەندە تاقەتبەر نییە.

دونیا زۆر گەرمە، ئەو (با) یەی لە لای (لاوس)ەوە دێ دونیای گەرمتر کردووە. بەڵام ئەم ژیانە سەختە قاڵمان دەکا. ئەوەی لەم ژیانە سەختەدا بەدەستم هێناوە





پەرۆشییە. سێ ڕۆژی ڕابردوو دەرزی سیاسییان پێ گوتین. چەند کەسێکمان ئامادەییان پێشان دا لەسەر داوای خۆیان، لە ڕێگای (لاوس) ەوە بچنە ڤێتنامی باشوور و لەوێ لەگەڵ پەلاماردەرانی ئەمریکی بجەنگن. یەکێ لەوانە منم. بەڵام زۆر غەریبی (کان) و دایکم دەکەم!

سبەی ڕۆژی پشووە. ڕوخسەتم لە سەرۆکەکەم وەرگرتووە بۆئەوەی بچمە سەردانی دایبابم کە ماڵیان لەم نزیکانەیە. سەرۆکەکەم ئەو ڕوخسەتەی پێدام چونکە خۆم داوام کردووە بچمە ڤێتنامی باشوور.

ئەمڕۆ سەعات چواری دوای نیوەڕۆ، لەگەڵ (وی) دەچمە سەردانی دایبابم. دەبێ بە ڕێگای (ترانگ کە) دا بڕۆین و بەسەر چەند چیایەکدا تێپەڕین.

بێگومان ڕێگایەکی دوورمان لە پێشە، بەڵام گرنگ نییە. لە خۆشییان وەختە شێت بم. بەم زووانە بە دیداری دایکم و ئەندامەکانی تری ماڵەوەمان شاد دەبم.

ئەمڕۆ دووی حوزێرانە

هەموویانم بینی تەنیا دایکم نەبێ. وای چەند بەدبەختییەکی گەورەیە، دایە! کە گەیشتمە ئەوێ سەعات یازدەو نیوی شەو بوو، لە شپرزەییان دڵم زۆر بە توندی لێیدەدا. (وان)م ماچ کرد. دایە گەورە و خاڵۆکان و پوور و پوورزاکانم ماچ کرد. ئینجا پرسیم: دایە، ئەی دایە کوا؟

دایە لە ماڵەوە نەبوو. هەر ئەو ڕۆژە بەیانییەکەی چوو بووە (دونگ هوی). ئاخ دایە! کە بێیتەوە و بزانی کوڕەکەت هاتۆتەوە و تۆ لە ماڵەوە نەبووی، چەند ناڕەحەت دەبی؟! منیش زۆر ناڕەحەت بووم. ماڵەوەمان چێشتێکی باشیان بۆ لێنام. لەو ڕۆژەی چوو بوومە عەسکەری تا ئەو ڕۆژە شێوی وا باشم نەخواردبوو. بەڵام دایە، هەستم بە برسێتی نەدەکرد، تەنیا بیرم لە تۆ دەکردەوە. لەوانەیە جارێکی تر دەرفەتێکی وا هەڵنەکەوێ بتبینمەوە....

وای چەند نائومێدم! تا نیوەڕۆ چاوەڕێم کرد و تۆ هەر نەهاتیتەوە، بە ناچاری ڕۆیشتم. ئەوانیش برنج و خواردنی تریان بۆ توێشووی ڕێگام ئامادەکرد، بەڵام من هیچ ئارەزووی خواردنم نەبوو. کە ڕۆیشتم، ئەوەندە دڵتەنگ و ناڕەحەت بووم نەمتوانی بەری فرمێسکم بگرم...

بە ناو درەختەکانی بێشەدا ڕۆیشتم و دیم گوند  وردە وردە لەبەر چاوم بزر دەبوو، منیش هۆڕ هۆڕ دەگریام، ئێستاش وا هەر دەگریم و فرمێسکم بەسەر دەفتەرە بچووکەکەمدا دەڕژێ. چ خەم و کەسەرێکە، دایە! ئێمە ئەو دووەمان هەرگیزا و هەرگیز بەختمان نەبووە.

ئێستا گەیشتوومەتە گوندی (وی). چاوەڕێم تا (وی) ماڵاوایی لە دایك و باوکی دەکاو بە یەکەوە بەرێ دەکەوین.

ئەمڕۆ سێی حوزێرانە

سەفەرێکی سەخت و دژوار بوو. دەوری سەعات سێ، ناچار بووین بەپێ لە رووبار بپەڕینەوە. لەو ساتەدا فڕۆکەیەکی دوژمن لە ئاسمان دەرکەوت و دایگرتینە بەر گوللە باران. ناچار بووین خۆمان لە قۆرتێك شاردەوە و دوعامان کرد خوا لێمان خۆش بێ. بە ترسەوە تەماشامان دەکرد گوللە لە دەوروبەرمان بە زەوی دەکەوت بەڵام نە (من) و نە (وی) هیچ گوللەمان پێ نەکەوت.

دوای چوار سەعات توانیمان دووبارە بێینەوە سەر ڕێگاو لە ڕۆیشتنی خۆمان بەردەوام بین.

ڕۆژاوا گەیشتینە (ترانگ)و ئاشنایەتیمان لەگەڵ کچێکی جوان پەیدا کرد، دەنگێکی خۆشی هەبوو. دەچووە پەرستگا. سی (٣٠) مەتر بەیەکەوە ڕۆیشتین. پێی گوتم ناوی (تران تی هونگ)ە. کە بەبیرم دێتەوە دڵم دادەخورپێ. دەنگی وەکوو دەنگی (کان) وابوو. دەم و چاویشی نەختێ لە هی (کان) دەچوو. نامەیەکی ترم بۆ (کان) نووسی.

لە ماوەی ئەم مانگەدا، تا ئێستا (دە) نامەم بۆ (کان) نووسیوە. بێ ئەوەی هەرگیز وەڵامێکی ئەوم پێ بگا، هەرگیز.

ئەمڕۆ حەفتی حوزێرانە

ئەمڕۆ هەمموو ئەمڕۆ سەرو دڵم زۆر دەئێشا، خۆم پێ ڕانەدەگیرا. چوومە ماڵێك بۆ ئەوەی لەوێ بحەسێمەوە و لە ئاوێنەدا سەیری خۆمم کرد، خۆمم نەناسییەوە. پێش مانگێك ئەوەندە ناشیرین نەبووم. گۆناکانم بە جۆرێ داقۆپاوەو پێستەم بە جۆرێ داچۆڕاوە، زیاتر لە مردوو دەچم. دەبێ ئەوەش بڵێم خواردنم پێ ناخورێ،





بۆ نموونە ئەمشەو تەنیا نەختێ برنجی کوڵاوم خوارد و بەس، چیترم پێ نەخورا. شەکەت و ماندووم. لەپێ کەوتووم. بەڵام خورتی لەخۆم دەکەم بنووسم، چونکە پێویستم بەوەیە دەردە دڵی خۆم بۆ یەکێ بکەم، تەنانەت ئەگەر ئەو یەکە پارچە کاغەزێکیش بێ.

دەزانی ئەی کاغەز !!! لە جەنگ دا، هەموو شتێ هەر دزێو و ناشیرین نییە. بۆ نموونە جاری وا هەیە ناسیاوی لەگەڵ ئینسانی باش پەیدا دەکەی وەکوو ئەوانەی یارمەتی ئێمەیان داوە وەك: (تانگ سونگ) خەڵکی گوندی (تان فونگ)، مامە (کوی)، مامە (دونگ)، جەنابی (لام).

ئینسانی باشن وەکوو دایبابت خزمەتت دەکەن و داڵدەت دەدەن.

سوشیالیستی ڕاستەقینە! ئەوانە هەموو شتەکانی خۆیان لەگەڵ ئێمەدا بەش کرد، لە (چا)وە بگرە تا کرتۆپە. کە لەناو ئەوان بووم، هەستم دەکرد وەکوو ماسیم لەناو ئاو. تا ماوم بە خۆشی یادیان دەکەمەوە. بەڵام جەنگ شتی زۆر کرێت و دزێویشی تێدایە: گوللە باران و شەکەتی و سەردڵ ئێشان. ئوە! سەر دڵم چەند دێشێ! نابێ چیتر بنووسم. بەراست! ئەوە پێشتر چۆن دەمتوانی هەموو ڕۆژێ بنووسم؟!

ئەمڕۆ شازدەی حوزێرانە

تا ئەو ڕۆژەی دەستمان بە ڕۆیشتنەوە کرد، هەر نەساخ بووم. ئێستا لە (لونگ مین)، لە گوندی (مین لون) ین. شوێنێکی سەیرە! دەریاچەیەکی بچووکی لێیە پڕە لە گوڵی لۆتس. هەوای پڕ بۆنێکی خۆش کردووە. هیچ شتێ لە گوڵی لۆتس جوانتر نییە!

ئەمڕۆ چواری تەممووزە

دوو مااانگ !! دوو مانگ تێپەڕیووە و کە بیر لەتێپەڕینی ئەم دوو مانگە دەکەمەوە، دڵم ژان دەکا ... زۆر ئەزیەت دەخۆم.

دوو مانگە جێم هێشتووە و یەك وشە چییە هەواڵم نەبیستووە. بەرگە گرتنی دژوارو گرانە!

ئایا دەبێ شتێکی بەسەر نەهاتبێ؟ خۆ قاتی نەکەوتۆتە بەر بۆمباباران؟ ئاخر لە

جەنگدا هەموو شتێ لە گوینە رووبدا.

<u>ئەمڕۆ پازدەی تەمموزە</u>

ئەمڕۆ ڕۆژێکی گەورەیە! نامەی (کان) م بۆ هاتووە. ئەمە یەکەم نامەیەتی. (کان) ەکەم چاوەڕێی لەدایکبوونی منداڵێك دەکا.

<u>ئەمڕۆ حەڤدەی تەمموزە</u>

ئەمڕۆ ڕۆژی لەدایکبوونی منە. تا ئێستا هەموو جەژنێکی لەدایکبوونم لە ماڵەوە کردبوو. ئەم جارە ڕۆژی لەدایکبوونم کەوتۆتە ڕۆژی شەممە. شەممە لە ماڵەوە ڕۆژێکی زۆر گرنگ و تایبەتییە، بەڵام لە جەنگدا، شەممە و یەك شەممە جیاوازییان نییە. من ناتوانم تەنانەت بە ئیسراحەت ئاهەنگی لە دایکبوونی خۆم بگێڕم. فەرماندە بڕیاری داوە بەرنامەیەکی نواندن –استعراض– ڕێك بخا بۆئەوەی وەرەی رووخاومان بەرز بێتەوە.

ناچارم، ئەمڕۆ بە درێژایی ڕۆژ ئیش بکەم. ئەمڕۆ یەکێکە لە ڕۆژەکانی قەهر و دڵتەنگیی من. من هیچ گوێ بە نواندنی فەرماندە نادەم.

<u>ئەمڕۆ هەژدەی تەمموزە</u>

ئەی دەفتەرەکەم ... ! ئایا پێم گوتیت داوای مادۆنم کردووە بۆئەوەی بچمە سەردانی (کان)؟

بە بیرم نایە پێم گوتبیت. ئەوەندە بە وەرگرتنی ئەم مادۆنە سەرقاڵ بووم، ماوەم نەبوو قسەت لەگەڵ بکەم. باشە، با پێت بڵێم: ئاخیری مادۆنم وەرگرت!! ... بەرزە! دوێ شەو ئەم خەبەرە خۆشەیان پێدام. فەرماندە بانگی کردم و گوتی: (دیارییەکم بۆ ڕۆژی لە دایکبوونت داناوە.) وام زانی دەیەوێ دیارییەکم بداتێ و شەرمم لەخۆم کردەوە، بەڵام کە بە دەنگی بەرز گوتی: (مادۆنەکەت ڕەزامەندی لەسەر دراوە)، زۆر پەشۆکام. نەمدەزانی چ بڵێم، نەمدەزانی چ بکەم. هەست دەکەم وشەم بۆ نایە هەستی خۆمی پێ دەربڕم! لەوانەیە خڵەفابم، لەوانەیە لەبەر پەشۆکانی زۆر بێ. هەستم زۆر ناسك بووە. شارەکەم (دە) ڕۆژە ڕێ دوورە و لە ماوەی ئەم (دە) ڕۆژەدا بۆخۆم بە شادی دەژیم.

<u>ئەمڕۆ بیست و شەشی تەمموزە</u>





دەوری هەشت ڕۆژە بە ڕێگاوەم. لە ڕێگای ژمارە حەفت، بە سەعاتێك شەش کیلۆ مەتر دەبڕم. ئەمڕۆ بەیانی، جگە لە کاسە برنجێك هیچی ترم نەخواردووە. بەڵام گوێم لێ نییە. لە خۆشییان برسێتیم لەبیر چۆتەوە! تەنانەت لە خۆشییان وام لێ هاتووە ئیتر ناترسم؟. فڕۆکەیەکی ئەمریکی گوللە بارانی کردم، بەڵام لەم هێرشەدا، وەکوو هێرشی ئەو ڕۆژە کە لەگەڵ (وی) دا بووم، هیچ بریندار نەبووم. خۆم فڕێ دایە ناو قۆرتێك، پاشان کە فڕۆکەکە ڕۆیشت، دەستم کرد بە راکردن.

ئێستا وا بەخێرایی لە (دیو چو)ی زێدو زاگەی خۆم نزیك دەکەومەوە. سەعات چوار دەگەمە ئەوێ و پێم دەڵێن: دایك و باوکم لەسەر مەزران. وای چەند شاد و خۆشحاڵم!

باشە، با لە ڕۆیشتن بەردەوام بین.

<u>ئەمڕۆ بیست و حەفتی تەمموزە</u>

دایە و بابە و ئەندامانی تری خێزانەکەمانم ماچ کرد.باشە ئێستا تەنانەت هەست بە ماندوو بوونیش ناکەم. هەموومان پێدەکەنین. پێم دەڵێن لاواز بوویم. ئای چەند پێکەنین!...

بەڵام من جگە لە بیر و غایەڵەی دیداری (کان) هیچم لە مێشکدا نەبوو. لە دڵی خۆمدا گوتم: (ئێستا خۆم دەزانم چ دەکەم: ماوەیەکی زۆر بە تەنیشت هێڵی ئاسندا دەڕۆم، ئینجا پێچ دەکەمەوە بۆ دەستە چەپ و بەدەم رووباری (تین) دا دەڕۆم تا دەگەمە (هانگ داو)و لەوێ بە ئوتومبێل دەچمە (فوکی). ئوتومبێل سەعات (٩) ی شەو بەرێ دەکەوێ. تا نیوە شەو بە ئوتومبێل دەڕۆم و ...)

سەعات (٩) سواری ئوتومبێل نەبووم. بە وەختەوە گەیشتمە ئەوێ، بەڵام ئوتومبێل نەهات. سەعات (دە) تێپەڕی، سەعات یازدەش تێپەڕی، بوو بە نیوە شەو ... نەختێ دوای نیوە شەو ئینجا ئوتومبێل هات، وای لەو بەدبەختییە گەورەیە!! ئەم ئوتومبێلە ناچێتە (فوکی)، دەچێتە (وین). ئاخیری سەعات یەکی بەیانی سواری ئوتومبێلی (فوکی) بووم، بەڵام تا سەعات سێ بەڕێ نەکەوت. بەم جۆرە ئەم شەوەم بە فیڕۆ چوو کە دەمتوانی بۆ خۆم لەگەڵ (کان) بەسەر بەرم. ئێستا سەعات پێنجی بەیانییە. ئوتومبێل تاریکی شەو شەق دەکاو دەڕوا. لە

خەونێکی خۆش بە خەبەر هاتووم. لە خەودا دیم لە باوەشی (کان) خەوتووم.

هیوادارم پێش ڕۆژهەڵات بگەینە جێ، چونکە سەفەری ئەم ڕێگایە بە ڕۆژ ترسی تێدایە. نەفەرەکان بە پێکەنین بە لێخوڕەکە دەڵێن: " خێرا باژۆ، ئەگەر جۆنسن لەو بەرزاییە بمانبینێ، گوللە بارانمان دەکا."

<u>ئەمڕۆ بیست و هەشتی تەممووزە</u>

لەوانەیە بەگێلم تێ بگەن کە لە ڕۆژی ئاوها، کاتی خۆم بە نووسینی بیرەوەری بە فیڕۆ دەدەم. بەڵام ئێستا لەو لەحزەیەدا، (کان) نووستووە و من خەوم لێ ناکەوێ. دانیشتووم و لەبەر خۆمەوە هەر دەڵێم: (ئەوە منم لە تەنیشت (کان) دانیشتووم!)

ئەی دەفتەرەکەم! ... ئێستا باسی هەموو شتێکت بۆ دەکەم:

سەعات پێنج و نیوی بەیانی گەیشتمە شارەکەمان. ڕام کرد بۆ لای پردەکە بۆئەوەی بپەڕمەوە و بچمەوە ماڵێ، بەڵام پردەکە داخرابوو چونکە لە بۆمبا بارانێکی ئەمریکی تێك چووبوو. سەد پێ لەولاوە، دوو بەلەمیان لە نزیك یەك دانابوو، لە باتی پردەکە خەڵك بەو بەلەمانە دەپەڕینەوە. بەم جۆرە چوومە ئەو بەری ڕووبارەکە.

شار لەژێر بۆمبا بارانی ئەمریکی بە تەواوی کاول و نابوود ببوو. خەرابەیەکی تەواو بوو! لە باخچەی شار، بڵێسەی ئاگر وەکوو گڕکان هالاوی بەرز دەبووەوە. لە لایەکی تریشەوە گڕکانێکی زلتر گڕەو هالاوی لێ هەڵدەستا، ئەمە دەق ئەو شوێنەبوو کە دوکانی کتێبفرۆشیی منی لێ بوو.

جادەش هەر نەمابوون. چێشتخانەی (تی هیو)، قوتابخانەی بازرگانی، تاقیگەکانی من ... جگە لە ئەسکالتی بیناکە هیچیان تێدا نەمابوو. بەسەرهاتێکی هەزار جار جەرگبڕتر بوو لەوەی بە خەیاڵی مندا دەهات. (نگیادام)، (نگیادام) ی من کە شوێنێکی ئەوەندە خۆش بوو، ئێستا بووە بە شارێکی ئەفسانەیی.

بە نائومێدی بەناو کەلاوەکاندا دە ڕۆیشتم و لە دڵی خۆمدا بیرم دەکردەوە من ڕۆژێ لە ڕۆژان لێرە ژیاوم، لێرە ئیشم کردووە. کەچی ئێستا لە کاوڵگەو گیاو گۆڵ زیاتر هیچی لێ نەماوە!





ئاخ، دەفتەرەکەم! چەندم ئازار خوارد. هەمیشە لەبەر خۆمەوە دووبارەم دەکردەوە: (نەکا (کان) ی منیش مردبێ!)

بە درێژایی ئەو ماوەیەی بەرەو بەڕێوەبەرێتی ناوەندیی کشت و کاڵ دەچووم، زۆر بە ناڕەحەتی بیرم لەم بابەتە دەکردەوە. ئینجا لە ڕێگادا، (نونگ)ی هاوڕێمم بینی و داوام لێ کرد جانتاکەم بۆ هەڵگرێ چونکە ئیتر تاقەتی جانتا هەڵگرتنم نەمابوو. لەگەڵ ئەوا، بەرەو ماڵەوە ڕام کرد. ئەگەر بە تەنیا بچووبامەوە، ناڕەحەت دەبووم.

بەرەو ماڵەوە ڕام کرد و هاوارم کرد: (کان!)، بەڵام (کان) لە ماڵەوە نەبوو. سۆراغم لە دراوسێکان کرد، گوتیان (کان) چۆتە مەزرا. گوتم: پایسکلێکم بدەنێ، یەکسەر پایسکلێکیان دامێ. (کان) بە ڕاکردن بە پیرمەوە هات. لە پایسکیل دابەزیم و تەنیا ئەوەندەم پێ کرا بڵێم:

(کان)!

ویستمان یەکتر بگرینە باوەش، بەڵام دانمان بە خۆماندا گرت: چونکە شتی وا جوان نەبوو. زۆر کەس تەماشایان دەکردین. تەنیا دەستی یەکترمان گرت و چاومان بڕییە چاوی یەکتر. چاومان لەیەك بەسرابوو.

(کان) پرسی: چەند دەمێنیتەوە؟ گوتم: دوو ڕۆژ. لە سەرەخۆگوتی: تەنیا دوو ڕۆژ؟!

هەقتە (کان)! دە ڕۆژە ڕێگای چیام بڕیوە، بۆئەوەی تەنیا دوو ڕۆژ لای تۆ بمێنمەوە.

<u>ئەمڕۆ سی (٣٠) تەممووزە</u>

دەبێ ئەمڕۆ بەیانی بەرێ بکەوم بۆ ئەوەی بتوانم سبەی شەو بگەمەوە دەستەکەی خۆم. (کان) خەریکە بە بێدەنگی فراوینم بۆ ئامادە دەکا. مەنجەڵە برنجێکیشی بۆ لێناوم بۆ ئەوەی لەڕێگا بیخۆم. سپێدەبوو بە بێ دەنگی چاومان بڕیبووە یەکتر و تێشتمان دەخوارد. دڵم هەلاهەلا ببوو دڵنیام ئەویش دڵی هەر وا بوو.. ئێستا دوا ماچی لێ دەکەم، بۆ دواجار تەماشای دەکەم و دەڕۆم. بەردەوام ئەو ساتانە دێنمەوە بەر چاوم کە خەریك بوو خۆی ئامادە دەکرد بۆ ئەوەی بەڕێم

بکا.

من بۆیە دەنووسم تا خۆم خەریك بکەم، تا ئارامییەك بەخۆم ببەخشم، تا لەم چاوەڕوانییەدا شێت و هار نەبم.

بە ئۆتومبێلێ تا (تی هو) دەچم و لەوێوە سواری ئۆتومبێلێکی تر دەبم.

خواحافیز (کان)! هەست دەکەم ئەمە دواجارە بەیەکەوەین، هەست دەکەم هەرگیز یەکتر نابینینەوە! بەڵام بچمە هەر کوێ و هەرچەندە لە تۆ دووربکەومەوە، تەنانەت ئەگەر بشمرم، عیشقی تۆم هەر دەمێنێ. خواحافیز (کان) ەکەم!

ئاخ! ئیمپریالیستی ئەمریکی، چەند رقم لە ئێوەیە! چەندم رق لەئێوەیە کە ئەوەندە ئازارمان دەدەن.

ئەمڕۆ سی و یەکی ئابە

خواحافیزییەکی دی! من سەراپای تەمەنی خۆم بە خواحافیزی بردۆتە سەر. لە خۆشبەختی، توانیم چاوم بە دایکم بکەوێ. بۆ پەیداکردنی هەندێ ئازووقە رەوانەی لای گوندی خۆمانیان کردین. بەم جۆرە، بۆم رێکەوت شەو لە ماڵەوە بخەوم و تێشت لەگەڵ دایکم بخۆم. بەڵام سەعات هەشتی بەیانی بەجێم هێشت و رۆیشتم. تا ئاخیری رێگاکە بەڕێی کردم، ویستی جانتاکەم بۆ هەڵبگرێ. جانتاکەم قورس بوو، لەگەڵ ئەوەشدا رێگام دا بۆم بێنێ، چونکە دەمزانی بەمە خۆشحاڵ دەبێ. پاشان جانتاکەی بە شانم داداو لاواندمییەوەو لێك دابڕاین بێ ئەوەی یەك وشە ئاڵوگۆڕ بکەین.

وەکوو ئەوە وابوو جگە لە خەم و خەفەت قسەی ترمان نەبێ بیکەین.

ئەمڕۆ چواردەی تشرینە یەکەمە

ئەمڕۆ نامەیەکم بۆ (کان ) نووسی و لەوانەیە ئەمە دوا نامەبێ بۆی دەنووسم ، چونکە بڕیارە لەم رۆژانە بچینە شەڕو لەوانەیە بکوژرێم. ماوەیەکی زۆرە خەبەری (کان ) م نییە ، بەڵام نامەی ( وین ) و باوم بۆ هاتووە .

ئەمڕۆ هەژدەی تشرینی یەکەمە

ئەی دەفتەرەکەم! ئەم رۆژانە، من زیاتر قسەم لەگەڵ تۆ هەیە. هەست دەکەم پیاوەکەی جاران نیم. ئێستا خەریکین خۆمان بۆ شەڕێك ئامادە دەکەین و من ئیتر





پیاوەکەی جاران نیم. پێش هەموو شەڕێك، وا هەست دەکەم لەم شەڕەدا دەکوژرێم و بە سەلامەتی گیان دەرنابەم و دوای شەڕەکەش، کە دەبینم ماوم و نەمردووم، تووشی سەرسامی دەبم و بڕوا بەخۆم ناکەم! ئێستا ئەوە پێنج مانگە عەسکەرم. هەست دەکەم هەموو شتێکی خۆم کردۆتە قوربانی نیشتمانەکەم: بنەماڵەکەم، ئیشەکەم، بەختەوەریم!

ئەمڕۆ بیست و دووی تشرینی یەکەمە

ئەوە چل رۆژە، بێ هیچ کارو چالاکییەك، لێرە، لە (هونگ دائو) گیرساوینەتەوە.

هیچ جۆرە کردەوەیەکمان نەنواندووە بۆ ئەوەی شەڕ لەگەڵ دوژمن بکەین، ئیتر خوومان بەم گوندەوبە خەڵکەکەیەوە گرتووە.

ئێستا دەبێ خۆمان ئامادە بکەین بۆ ئەوەی لێرە بڕۆین. ئەو کارانەمان لە پێشە کە دەبێ لە لاوس جێ بەجێیان بکەین. لەوانەیە یەك ساڵ لە لاوس بمێنینەوەو لەوانەیشە دووساڵ. هەر چۆنێ بێت، تا ئەو کاتەی ئەرکی سەر شانی خۆمان بەرامبەر بەم وڵاتە جێ بە جێ دەکەین، لەوێ دەمێنینەوە. هەموو شتێ ئامادەیەو دەبێ بەڕێ بکەوین. تەواوکردنی نووسینی بیرەوەرییەکانم دەنێمە لاوە بۆ ئەو کاتەی لەرێگا دەوەستین ...

باشە! سەعات چواری دوای نیوەڕۆ بەڕێ کەوتین. تۆپێکی بچووك و جانتاکەمم بەشانم دا دابوو، زۆر قورس بوون. بە تایبەتی ئەم تۆپە بچووکە هەر زۆر قورسە. تا ئێستا دوو سێ جار بەربوومەتەوە، کەس هەر ئاوڕیشی لێ نەدامەوە، هەرکەسە رێی خۆی گرتبوو دەرۆیشت.

بە (هونگ دائو) و (رونك تونگ) و (کسوم کت) دا تێپەڕین، پاشان دەوری چوار کیلۆمەتر بەسەر لمی کەناری رووباری (لام)دا رۆیشتین.

ئاوی رووبارەکە روون بوو. نزیکەی دەرزەنێك بەلەم چاوەڕێیان دەکرد بۆ ئەوەی بمانپەڕێننەوە کەناری ئەوبەر. نەك تەنیا ئێمە بەڵکو دەستەکانی تریشیان دەپەڕاندەوە.

سەعات نۆی شەوبوو لە رووبارەکە پەڕینەوە. برسی بووم، هەموو کفتە برنجەکانی خۆمم خوارد.

ئێستا سەعات یازدە (١١)یە. وا خەریکین دەکەوینەوە ڕێ. وای چەند ماندووم!!

ئەمڕۆ بیست و سێی تشرینی یەکەمە

کاتێ کە ناچار دەبین، وەکوو ئەمڕۆ، بەسەر زوورگی بەردەڵان بکەوین، داردەست زۆر بە کەڵکمان دێ. ئێستا باشتر دەتوانین کیلۆمەترەکان بژمێرین: پێنجی کیلۆمەترمان ماوە ... چوار ماوە ... سێ ماوە ... دوو ماوە ... یەك ماوە ... ئەوە بارمان خست. کە بارمان لە جێگایەك دەخەین و دەئێوەرین، من ئارەزووی نووسینم نابزوێ. یەکسەر خەوم لێ دەکەوێ و زۆر بە زەحمەت لەو خەوە گرانە بەئاگا دێم. خۆشبەختانە کاتێ کە بە گوندەکاندا تێدەپەڕین، خەڵك یارمەتیمانم دەدەن و بارەکانمان لەگەڵ هەڵدەگرن، بەتایبەتی کچی عازەب. لێرە، لە (سان هوئا)، ناسیاویم لەگەڵ چوار ژنی میهرەبان پەیدا کرد: خاتوو (کە)، خاتوو (دائو)، (کونگ) و (دونگ)ی بچکۆلانە. ئەمانە بارەکەی منیان لە بەینی خۆیان دابەش کردو پازدە (١٥) کیلۆمەتر بۆیان هەڵگرتم، ئەویش بە چ میهرەبانی و بە چ حەوسەڵەیەك!!!

ئێستا خەریکی پشوودانین بۆ ئەوەی پاشان دەست بە ڕێگا بڕینی هەمیشەیی بکەینەوە. بێ گومان وا باشترە کە بەشەو بەڕێوە بین چونکە بە شەو فڕۆکەی ئەمریکی نامانبینن. هەندێ جار ئەم پرسیارە لەخۆم دەکەم: باشە، ئەم سارووخە نوور بەخشانە بە چ کەڵك دێن؟

ئەمڕۆ بیست و شەشی تشرینی یەکەمە

ئەمڕۆ ڕۆژێکی  ناخۆش بوو. ڕەوانەی (نگائان) یان کردین، ئەویش بە ڕێگای کۆن نا، بەڵکو بە ڕێگای (ترونگ تان)، کاتی خۆی بەرەبابی (لە) لەم ناوچەیە ژیاون.

کێوێکی بڵندمان لە پێش بوو. ڕێگا لووس و ماهی بوو. یەك چرکە غافڵ بوون و ئاگا لەخۆ بڕان، هەڵدێرانی بەدواوە بوو. پاشان هەموومان بەرەو (هونگ لائو) بەڕێ کەوتین. نانمان لە (فام تی) خوارد و دوای ئەوە گەیشتینە (نام لین). ئێرە زێدی مامە (هو)یە، (هوشی منە)ی ڕابەرمان.

چوومە ڕێکخراوەکەمان لە (لین تونگ) بۆ ئەوەی (ترونگ)ی هاوڕێم ببینم، بە





بەردەمی ماڵی مامە (هو) دا تێپەڕیم. خانووەکەی دوو زنجە سەریان بە بەڵمە برنج گیراوەو بە حەیزەران تانۆکیان بۆ کراوە.

هەمیشە حەزم دەکرد ماڵی مامە (هو) ببینم، کە بینیم هەستێکی سەیرم لا پەیدا بوو.

پەنجەرەکان لە پشت پەردەی جوانی حەیزەران بزربووون. پیرە دار مۆزێك لەلای دەستە ڕاست بوو. دارترنجێك و دار پرتەقاڵێکیشی لێ بوو. مۆزێك و ترنجێك و پرتەقاڵێکم لێ کردەوە. هەرچەندە جێگایەکی بچووك بوو، بەڵام لەبەر چاوی من شوێنێکی گەورەو فراوان بوو.

ئەمڕۆ پێنجی تشرینی دووەمە

ئەمڕۆ سێ نامەی (کان)م بۆهات. هەموو بە یەکەوە گەیشتن. هەر نەختێ دوای ئەوەی گەیشتمە (سونین)، چوومە دوکانێکی وێنەگری و وێنەی خۆمم گرت و دانەیەکم بۆ (کان) نارد. نامەیەکیشم بۆ نووسی. ئینجا نامەم بۆ باوکم و بۆ (لانگ)ی خوشکم و بۆ (توك)ی هاوڕێی کتێبفرۆشیشم نووسی. بەڵام وام لێ هاتووە دڵم بە نووسین  داناکەوێ. زۆر ناڕەحەت و زۆر نائومێدم. لەوانەیە ئیدی واز لە نووسینی بیرەوەری بێنم و هیچی تر نەنووسم.

ئەمڕۆ بیست و سێی کانوونی یەکەمە

هەشت ڕۆژی خشتە لەم جێگا ناخۆشەین کە پێی دەڵێن (سون هام)! بەدرێژایی ئەو ماوەیە هەر خەریکین مەشق لەسەر ئەو کارانە دەکەین کە دەبێ لە کاتی جێ بە جێ کردنی ئەرکەکەمان، بیانکەین. ئەمڕۆ دەست بە پێڕۆیەکی دوورو درێژ دەکەین. ئێستاش ئەم پرسیارە لە خۆم دەکەم: باشە ئێمە دەچینە کوێ؟ چ دەکەین؟ ئەو ئەرکەی هەموو لایەك باسی دەکەن، سوودی چییە؟ لەوە دەکا ئەرکێکی گرنگ بێ بەڵام کەس ناتوانێ بێنێتە بەرچاوی داخۆ، چ ڕوودەدا: دەبێ بە جانتاو تفەنگ و ئازووقەو تەقەمەنییەوە، ماوەی دوو سەد کیلۆمەتر بەدەم ڕووبار و بەناو چیادا بڕۆین. تەنانەت کە بیری لێ دەکەمەوە پێ سەخڵەت دەبم!

جا بۆ ئەوەی سوکنایییەك بەخۆم بدەم،  دەستم بە نووسینی بیرەوەرییەکانم کردووە.

ئەمڕۆ بیست چواری کانوونی یەکەمە

لە سەعات پێنجی بەیانی بەڕێ کەوتین. دونیا هێشتا تاریك بوو. زۆر شەکەتم! پێم دێشێ. زەوییەکە هەمووی بەردەلانە و ڕێگا پڕی هەڵەت و هەڵدێرە. بەوەی باشە کە دەگەینە کەوێلێکی کوێستانی یان گوندێك، لێ دەگەڕێن لا بدەین و پشوویەك بدەین.

بەلام ئەمە چ ژیانێکە ئێمە هەمانە؟! ئای عیشقی نیشتمان چەند گران دەوەستێ!

ئەمڕۆ بیست و پێنجی کانوونی یەکەمە

ئەمڕۆ نۆییلە. یا حەزرەتی عیسا! نۆییلەو من تۆپەکەمم بە شانەوەیە! نۆییلێکی چەند خۆشە !! وای لەو نۆییلە جوانە!

سێ ڕۆژ بەناو لێڕو جەنگەڵدا ڕۆیشتین، مێشوولە ڕۆحیان دەرهێناین. بەربوومەوەو ئەژنۆم بریندار بوو. ئێستایش هەر ئاوساوە. قاچم لەبەر چزووی مێشوولە هەمووی کون کون بووە.

گەڕاینەوە سەر ڕێگای سەرەکی. دەرفەتمان لە تاریکی وەرگرت و بە ڕێگای تەنیشت هێڵی ئاسندا ڕۆیشتین.

باران بە خوڕتر دەبارێ، کە دڵۆپە باران بەدەم و چاومان دەکەوێ، هەست بە ئازار دەکەین.

سەعات سێی بەیانی، ناچار بووین بەپێ خاوسی بەناو ڕووبارێکی بەستەڵەکدا پەڕینەوەو پاش ڕۆژهەلات لە (چولە) گەیشتینە گوندێکی کاتۆلیك. ئێستا لەو گوندەین، خەریکین برنج لێ دەنێین و نەختێ پشوو دەدەین. سەعات یەکی بەیانی دووبارە دەکەوینەوە ڕێ. بەلام من پێم وا ئاوساوە، بیردەکەمەوە: ئایا تاقەتم هەیە ئەم هەموو ڕێگایە ببڕم و بگەمەوە دەستەکەی خۆم؟

باران بەردەوامە. بەشی زۆری ڕێگاکە لەبەر بۆمبا باران تێك چووە. پردەکانیش ڕووخاون. دوای ئەوەی لەو ئاوە ساردەمان داو پەڕینەوە، ئێستا زیاتر ناڕەحەت بوویم. ناچارم ناو بەناو ڕابوەستم و هەناسەیەکی تازە هەڵبکێشم، بەلام پاشان ناچارم ڕادەکەم بۆ ئەوەی بەوانەی دی بگەمەوە.





ئۆف، ئەژنۆم چەند دێشێ ... ! لەفافی نایلۆنیان داوینەتێ بۆ ئەوەی لەترسی زەروو لەپێمان ببەستین تا لە دەست زەروو بحەسێینەوە.

ئیتر تاقەتم نەماوە! ئاخ، چ نۆییلێکی ناخۆشە! ئەی (کان)؟ داخۆ (کان) ئێستا چ دەکا؟ سەیرە، من هەمیشە بیر لە (کان) دەکەمەوە، بەلام بە جۆرێکی تر ...

ئەمڕۆ بیست و نۆی کانوونی یەکەمە

ئەمڕۆ حەفتەمین ڕۆژە بەرێوەین.. زۆربەی کات پێش ڕۆژهەلات را دەبین بۆ ئەوەی بەتاریکی بڕۆین. بە شێنەیی و بێ خۆتەنگاو کردن دەڕۆین. هەندێ جار هاوڕێکانم تۆپەکەم لە باتی هەڵدەگرن، بەلام تەنانەت ئەم کارەی ئەوانیش دەردی من دەرمان ناکا.

کە نەتوانین بەناو جەنگەڵی پڕ زەروودا بڕۆین، دەدەینەوە ڕێگای چیاو لە ڕۆیشتنی خۆمان بەردەوام دەبین. خۆشبەختانە، ئەم ڕێگایە نۆینی زۆرە: مەبەست ئەو ڕێگا دوورو درێژانەیە کە لەناو چیا هەڵکۆڵراون. من زۆر جار باسی ئەم نۆینانەم بیستبوو، بەلام تا ئێستا نەمدیبوون. ڕۆیشتنی ناو ئەم نۆینانە زۆر خۆشە، بەلام تاریکاییەکی ئەنگوستەچاوە و بۆئەوەی ئاگامان لەیەك نەبڕێ، دەبێ بەردەوام قسە لەگەڵ یەك بکەین. لە هەندێ جێگادا هەوا قورس دەبێ و پیاو هەناسەی تەنگ دەبێ. وەکوو ئەو نۆینە دوو سەد مەترییەی بۆمبا باران بەردی چیای ڕووخاندبوو و بەردەکان زارکیان گرتبوو. ئاخیری ناچار بووین بەسەر چیادا بڕۆین. باران دەباری. هێشتا هەر بەردەوامە. هەر کاتێ ژانی ئەژنۆم زیاد دەکا، دەکەوم و پێنج دەقیقەی پێ دەچێ تا دەتوانم دووبارە ڕاست ببمەوەو بڕۆم. دڵم بەوە دەدەمەوە کە مرۆڤ بە خواست و ئیرادەی خۆی دەتوانێ هەموو گیرو گرفتێك لەسەر ڕێ لابەرێ. منیش ئەم ماوەیە هەر دەبڕم و گوێ بە زەروو ژان و ئازار نادەم.

ئەمڕۆ سی (٣٠) کانوونی یەکەمە

هێشتا سی (٣٠) کیلۆمەتر ماوە بگەینە (کین چو). جاکاتێ کە من و (لی) تووشی ماڵێك هاتین، کۆڵە بارمان داناو چووینە بەر دەرگای ماڵەکەو داوای خواردنمان لە خاوەن ماڵەکە کرد. خاوەن ماڵەکە یەك مەنجەڵی پڕ کرتۆپەی تازە

کولاّوو هەندێ مۆزی داینیّ. ئەوەندەمان خوارد هەر وەخت بوو بتەقین. ئینجا بانگی (نوی) و (مای) مان کرد بۆ ئەوەی بەرماوەکە بخۆن. ویستمان پارە بدەینە ئەو پیاوە میهرەبانە، بەلاّم وەری نەگرت. بگرە پەرداخە ئاوێکی گەرمیشی داینیّ تا ئەوەی خواردوومانە زوو هەرس ببیّ.

بەم جۆرە حالّمان هاتەوە سەر خۆو کە گەیشتینە (کین چو) زەوقی گاڵتەو رابواردنمان هەستابوو.

لە تاریکی شەوا، (لین) وشەی شەوی (نهێنی) بە دەنگێکی بەرز گوت: (سون!)، یەکێکی تر وشەیەکی تری شەوی گوت: (سام). ئینجا من هاوارم کرد: (بژی مامە —هو—). (لی) گوتی: (هەی گێلە، دەتەویّ گوێی لە دەنگت بیّ؟)

بەهەر حالّ، ئەژنۆم ژانی کەم بووە، خۆشحالّم کە سبەی رۆیشتنەکەمان کۆتایی دیّ.

وای چەند پیس و دژوونم! بۆنێکم لیّ دیّ کەس خۆی پیّ لەبەر راناگیریّ. بەبیّ ئۆقرە چاوەڕێی دەرفەتێك دەکەم خۆم بشۆم. وای بۆ خۆ شووشتنیّ لەناو بانیۆیەکی پڕ ئاوی گەرم ...!

دەریا چەند کیلۆمەترێك لێرە دوورە.

<u>ئەمڕۆ نۆی کانوونی دووەمە</u>

ئەمڕۆ بۆ من رۆژێکی زۆر گرنگ و پڕ بایەخە، چونکە یادی رۆژی زەماوەندی منە. یەك سالّ! ناتوانم بلّێم من و (کان) ژیانێکی خۆش ژیاوین. دوای زەماوەند تەنیا چوار مانگ بەیەکەوە ژیاین، لەو چوار مانگەشدا هەمیشە چل کیلۆمەتر لەیەك دوور بووین. چونکە من لە تاقیگەیەك ئیشم دەکرد زۆر لە مالّەوەمان دوور بوو. نزیکەی تەنیا رۆژانی کۆتایی حەفتەو رۆژانی جەژن یەکترمان دەبینی. ئەوەبوو پاشانیش بوومە عەسکەر. سیّ مانگ دوای چوونە عەسکەری، بۆ ماوەی تەنیا دوو رۆژ بینیمەوە و هیچی تر.

چارەنووسێکی چەند بیّ رەحمە بەرامبەر بەم عیشقە راستەقینەیە! لەدڵی خۆمدا دەلّێم: داخۆ ئێستا (کان)ی من چ دەکا. هیوادارم هیچ رووداوی خراپی بەسەر نەهاتبیّ. چەند هەفتەیەك بوو زۆر بیرم لیّ نەدەکردەوە و زۆر ناڕەحەت





بووم. بەلاّم ئێستا وا دووبارە بیری لیّ دەکەمەوە و لەبەر ئەوەی جەژنی (تەت) نزیك بۆتەوە، کە بیر دەکەمەوە لای ئەو نیم، ئەمە وەکوو چقلّ لەدلّم دەچەقیّ. ئەمە یەکەم جەژنی (تەت)ە لە مالّەوە دوورم. بریا جەژنی (تەت) هەر نەبوایە! چونکە بوونەکەی لە ناخۆشی زیاتر هیچی بۆ من تێدا نییە. وەرە بە تەنیا بەرگەی ئەم هەموو خەم و خەفەتە بگرە! تەنیا ئەوەندەم پیّ ماوە لەگەلّ دەفتەرەکەم دەردەدلّ بکەم.

تەنیاییەکی گەورەم لەپێشە، لەوانەیە مەرگی بەدواوە بیّ!

<u>ئەمڕۆ چواردەی کانوونی دووەمە</u>

ئێستاش هەر باس دەکەن کە خۆیان بۆ رووداوێکی گەورە ئامادە دەکەن، هەڵبەت بەو مەرجەی خواردن و چەکی پێویست هەبیّ.

بە گوندان دا دەڕۆین و خەڵکەکە هێشتا لەخەودان. هەریەکەمان بەلانی کەمەوە پەنجا کیلۆ تەقەمەنی و برنج و شتی تری پێیە. بەیانییەو ئیتر لە پەل و پۆ کەوتووین.

خۆمان لە شوێنێك شاردوەوە. تا سەعات پێنجی دوای نیوەڕۆ پشوومان داو ئەوسا دووبارە دەستمان بەرۆیشتن کردەوە. بەلاّم نازانم ئەوە ئێمە دەچینە کویّ؟

<u>ئەمڕۆ هەژدەی کانوونی دووەمە</u>

چەند رۆژێکمان ماوە بۆ جەژنی (تەت). فەرمانیان پیّ داوین نەچینە بەر دەرگای مالاّن و سەر بەهیچ مالّێکیشدا نەکەین. وەکوو ئەوەی خەبەری شتێك هەبیّ. دەبیّ بە کپ و بیّ دەنگی خۆمان لەناو دارو دەوەن بشارینەوە.

خەڵك جەژن دەکاو ئێمەیش ناچارین خۆمان لە پەناو پەسیوان حەشار بدەین و کڕ و بێدەنگ بین.

دوا جەژنی (تەت)م لەبیرە. من و (کان) بە یەکەوە جەژنمان کرد. ئای شادو کەیفخۆش بووین!!

<u>ئەمڕۆ نۆزدەی کانوونی دووەمە</u>

هەریەکەو یەك کیلۆ برنجیان داوینەتیّ. وابزانم ئەم برنجەیان بۆ دروست کردنی شیرینی پێداوین! سوکناییەکی چەند خۆشە!

دیسان دایکردەوە باران، ئافاتە! دووبارە روخسەتیان داین بچینە ناو ماڵآن، بەم روخسەتە من چوومە ماڵی جەنابی (ویت) کە پیاوێکی ئازاو میهرەبانە.

ئەمرۆ بیستی کانوونی دووەمە

زۆر غەریبی ماڵەوە دەکەم. بە شیرناتی برنجیش دڵتەنگیم نەرەوییەوە. هەوڵ دەدەم هەست و سۆزی خۆم بشارمەوە و وانەکەم دەربکەوێ، چونکە لەوانەیە ببم بە مایەی نارەحەتی بۆ جەنابی (ویت) ی میهرەبان، بەڵام بیرم هەر لای (کان)ە. بیر لە خانەوادەکەشمان دەکەمەوە: لە دایکم، لە دواجار کە بینیم و لەو کاتەی ویستی جانتاکەمم بۆ هەڵگرێ لەو کاتەی کە تەماشای منی دەکرد دوور دەکەوتمەوە.

بەشە گۆشتێکیشیان داوینەتێ، بێ گومان هەق وابوو شادو کەیفخۆش بم، بەڵام کە لەخەو بەئاگا هاتم، هەستم کرد لە خەودا گریاوم.

ئەمرۆ بیست و یەکی کانوونی دووەمە

بەشە گۆشتەکەیان سێ چەندان کردووین. وای ئەو رۆژانە چەند دەخۆین!

بەڵام سەیرە، هەموو بە بێ دەنگی خواردنی خۆیان دەخۆن، وەکوو ئەوەی بیر لەشتێکی دوورتر لە خواردنەکە بکەنەوە.

نیوەرۆ دووبارە کەوتینەوە رێ. من تۆپێکی بچووکم هەڵگرتبوو. فەرمانیان پێ کردین تا پێمان دەکرێ لە چاوی بێگانە بەدوور بین. بەردەوام بە تاریکی دەڕۆین. رێگا لەبەر باران خلیسکەو لەبەر ئەوەی بارمان گرانە دوو کیلۆمەتر بە سەعاتێک دەبڕین. بێ گومان تۆپێکی بچووکت بە کۆڵەوە بێ و بە پشت دا بخلیسکێی بەهیچ جۆرێ کارێکی خۆش نییە.

ئەمرۆ بیست ودووی کانوونی دووەمە

دەتوانم بڵێم ئەمرۆ یەکەمین رۆژە خەباتێکی چالاکانە بۆ رزگاری ڤێتنامی باشوور دەکەین. باران بەردەوامە بەڵام ئێمە هەموومان بڕیاری خۆمان داوە کە تا کۆتایی لە کاری خۆمان بەردەوام بین و ئەرکی خۆمان جێ بەجێ بکەین.

من لەمڕۆوە ناونیشانێکی نوێم هەیە: (SH ٨٧٥٧). بۆ (کان)یشم نووسیوە.

لەناو جەنگەڵ هەنجیری بەتام و زەریفم لێ کردەوەو خواردم.





ئەمرۆ بیست و سێی کانوونی دووەمە

لەناکاو گوێمان لە دەنگی فڕۆکە بوو و یەکێ هاواری کرد: "کوڕە بۆردومانمان دەکەن". دوای خولەکێك، فڕۆکەیەك دابەزییە خوارێ و بۆمبا بارانی کردین. تەقینەوەیەکی گەورەبوو! ساچمەی بۆمبا بە هەموو لایەکدا بڵاوبووەوە. یەکێکیان چوار سانتیمەتر لەسەرم دوور، گیزەی هات تێپەڕی. گوێم لە دەنگی بوو.

بەڵام ئاخۆ کام یاسای نهێنی، ژیان و بەزیندوویی مانەوەی مرۆڤ دیاری دەکات؟! ئەگەر سەرم چوار سانتیمەتر بەو لاوە بوایە ، ئێستا مردبووم .ئایا دەشێ ئەم هەموو رووداوانە بدەینە پاڵ رێکەوت؟ کە گوێم لە دەنگی گوللەکە بوو، خێرا غارم داو خۆم فڕێ دایە ناو قۆرتێك دەوری چل سانتیمەتر قووڵ دەبوو. شێلکەی شەستێرو بۆمبا بەردەوام بوو. رام کردە لای قۆرتێکی دی، لەوێ برادەرێکی خۆمم بینی خەڵتانی خوێن بوو. هاوارم کرد:

(ئەوە بریندار بووی!؟)

وەڵامی دامەوە:

(ئا!).

نزیکتر کەوتمەوە دیتم قاچێکی بە تەواوی لێ بۆتەوەو تەنیا بە پارچە پێستێك بە لەشییەوە لکاوە.

کراسەکەمم داکەند و لە قاچم بەستا بۆ ئەوەی خوێنەکەی رابگرم. ئینجا بانگی برین پێچێکم کردو بەدوو قۆڵی رامانکێشایە ژێر درەختێك. قاچی وەکوو باندۆڵی سەعات لە هەوادا تەکەتەکی بوو. برین پێچەکە پارچە پێستەکەی بڕی و قاچەکەی توور هەڵدا. سەیر ئەوەیە زۆر بەمە نارەحەت نەبووم. ئەو رەشە وڵاغە مردارەی شەوی یەکەم لەسەر رێگا دیم، لەمە زیاتر نارەحەتی کردم. رەنگە هۆی ئەوە بێ ئەویان یەکەم گیانداری مردوو بوو، دیم. کە بۆمبا باران تەواو بوو، دەورو بەرمان بوو بە چڕە دووکەڵ.

چل هەنگاوێ چوومە پێش، دیتم ئەو قۆرتەی خۆم لێ شاردبووەوە پڕی پارچە بۆمبا بوو. باوەڕم نەدەهات، بەڵام باش لە مەترسی رزگار بووم. چارەنووسم ئەوە نەبوو لێرە بکوژرێم.

بەڵام ئایا نووسراوە لەکوێ بمرم؟!

<u>ئەمڕۆ بیست و چواری کانوونی دووەمە</u>

ئەو ساتە بەرزو شکۆمەندە هات کە هەمیشە چاوەڕێم دەکرد. خەونەکەم بوو بەراستی. چوومە ریزی حیزب.

ئالای حیزبم بە دەستی چەپەوە گرت و دەستی راستم بڵند کردو سوێندم خوارد کە خزمەتی حیزب بکەم، با ناچاریش بم قوربانی زۆر بدەم و ناڕەحەتی و دەردەسەری زۆر بکێشم. سوێندیشم خوارد هەر ئەرکێکی حیزب پێم بسپێرێ بەوپەڕی وردی و دروستی جێ بەجێی بکەم جا بەهەر نرخێ بێ، تەنانەت ئەگەر ژیانی خۆیشم لەسەر دانابێ.

دابێکی کورت و سادە بوو، بەڵام بەرز و سەرنجکێش بوو.

ئێستا من دروشمم ئەمەیە: وەفاداری بۆ حیزب و راستگۆیی لەگەڵ خەڵک.

هاوڕێ (هو داک ڤین) بوو بە باوکی گفتەنیم و ئێستا هەست دەکەم هێزێکی گەورەم تێدا پەیدابووە.

ئایا ئەم هەست و ئەم هێزە بەردەوام دەبێ؟

<u>ئەمڕۆ بیست و شەشی کانوونی دووەمە</u>

زۆر زوو بە ئاگا هاتین و پێش بەیانی تێشتمان خوارد. ئێستا هەموو شت ئامادەیە.

نامەیەکم بۆ (کان) نووسی، دامە هاوڕێیەکم کە تازە لە تایلاندەوە هاتۆتەوە بۆ ئەوەی بیداتێ. هیوادارم ئەم هاوڕێیە بتوانێ نامەکەم بە (کان) بگەیەنێ. لەم نامەیەدا هەوڵم دا ئەو شتانەی بۆ نووسم کە تا ئێستا پێم نەگوتبوو.

(کان)!، هۆ (کان)ەکەم!

لەوانەیە مردن چاوەڕێم بکا، بەڵام عیشقی من و تۆ هەرگیز نامرێ! هەرگیز نامرێ. تەنانەت ئەگەر منیش بمرم، تەنانەت ئەگەر تۆش بمری!

(کان)! هۆ (کان)ەکەم!

ئێستا دەبێ بڕۆین. فەرمانده بانگمان دەکا، ئەمرمان پێ دەکا! ...

– – –





<u>(١٩)ی شوبات</u>

بیرەوەرییەکە لێرە دەپچڕێ. لەوانەیە دوای پێنج شەش رۆژ لەبەر دەروازەی (سایگۆن) کوژرابێ، یان رەنگە لە (تان سون نوت) کوژرابێ کە تاقمێکی ڤێتنامی باکووری دەستیان بەسەردا گرتبوو. بۆیشی هەیە لە بیست و شەشی کانوونی دووەم، لە بۆمبا بارانێکی وەکوو ئەو بۆمبا بارانە کوژرابێ کە (من) و کاپتن (ئاندی) بە فڕۆکەی (A–٣٧) ئەنجاممان دا.

من لەمە زیاتر هیچم بە خەیاڵدا نایە، لەدڵی خۆمدا دەڵێم: ئایا (کان) بە کوژرانی ئەم کوڕە دەزانێ؟ لەوانەیە نەزانێ. تەنیا ماوەیەکی کەمە دوا نامەی ئەوی بۆ هاتووە. بێ گومان (کان)یش بە ناونیشانە نوێکەی وەڵامی بۆ نووسیوەتەوە (٨٧٥٧ SH). تەنانەت پرسیارم لە کارمەندانی بەڕێوبەرایەتی پاڵپشتی ڤێتنام و بارەگای لێکۆڵینەوەش کرد، ئەوانەی دەفتەرە بچووکەکان کۆدەکەنەوە و وەریان دەگێڕن. ئەوان پێم پێ کەنین و پێیان گوتم گوایە من ژنێکی رۆمانتیکیم، پێیان گوتم وەکوو ڤیت کۆنگەکان وام و گوتیشیان دەفتەری بیرەوەری ڤیت کۆنگەکان زۆر لە شیعری ناپولی دەکا: لە بیرەوەرییەکانیان، هەمیشە هەر باسی عیشق دەکەن. پاشان پرسیاریان کرد داخۆ بیرەوەری عاشقانەی ڤیت کۆنگەکانم لا زۆر مەبەستە! منیش گوتم: بێ گومان.

– ها، ئەمە یەکێکە لەو بیرەوەرییانە. دەورییەیەکی تیپی سێیەمی هێزی دەریایی ئەم دەفتەرەی لە (کانگ تری) دۆزیوەتەوە.

ئەم جارە دەفتەرە بچووکەکە هی سەربازێکی بێ ناو نییە. ئەم دەفتەرە بچووکە ناوی خاوەنەکەی و ناوی خانەوادەکەی تێدایە (لە وان مین). ساڵی ١٩٤٢ لە (کانگ بین) لەدایک بووە. دەوری دوو حەفتەیە کوژراوە. ئەم ئەمریکییانە چەند زوو دەکەونە خۆ بۆ کارو چەند چوست و چالاکن!

ئەم دەفتەرە بچووکە چەند پەڕەیەکی لێ بۆتەوە، تا ئێستا سەرم لێ دەرنەکردووە ئەم پەڕانەیان بۆ لێ کردۆتەوە: ئایا بۆ ئەوەیە چاکی بکەنەوە؟ یان هەروا بە ساکاری لێیان کردۆتەوە؟ یان لەوانەیە بەهۆی لێکدانەوەیەکی دوورەوە لێیان کربێتەوە؟ بەڵام کام لێکدانەوەی دوور!!

بە گەرووی پڕ قین و نەفرەت، بیرەوەرییەکەی (لە وان مین)م وەرگێڕا.

لە دەرەوە بەردەوام دەنگی تۆپ دێ، قسەکانی ئەمڕۆ بەیانی (فرانسوا)م دێتەوە بیر: (کە شارەزای جەنگ ببین، گریان کارێکی ئاسان نییە).

بەڵام من روخسەتی گریان بەخۆم دەدەم: (ئەم گۆی زەوییە سێ ملیارد مرۆڤی لێ دەژی، من بۆ هەموویان دەگریم.)

بۆ هەموویان؟ من لەگەڵتا نیم. دەبێ ئەو کەسانە دیاری بکەین کە بۆیان دەگرین. سێ ملیارد گەلێ زۆرە. لەوەتی ئەم کاغەزانەم دەست کەوتووە، کەمتر بۆ (لاری) دەگریم، هەروەها بۆ (جان)یش کە بە ڤیتامین و تفاقی تەواو و رێنمایی بەرز هاتۆتە ئێرە.

زیاتر هەوەسم بە (لە وان مین) دێ

بیرەوەرییەکانی (لە وان مین

(تویت لان)! ئەی بتەکەم! دەزانم هەق نەبوو نامەیەکی ئاوها پڕ خەم و کەسەرت بۆ بنێرم، دەبوایە بزانم ئەمە غەمبارو خەفەتخانترت دەکا. داوای بوردنت لێ دەکەم. جارێکی تر دووبارەی ناکەمەوە، عیشقی من! ئاخر ناتوانم بۆت نەنووسم.

خۆت دەزانی ئەگەر بۆت نەنووسم، ئەدی چ بکەم!؟ بۆت دەنووسم بەڵام نامەکانت بۆ رەوانە ناکەم، لەناو دەفتەری بیرەوەریما هەڵیاندەگرم: بۆ ئەوەی کە یەکترمان دیتەوە ئەوسا پێشکەشت بکەم. ئەمڕۆ لە هەموو رۆژێ زیاتر هەست دەکەم پێویستم بە نووسینە. ئەمڕۆ کابرایەك هاتە بنکەی سیاسی، بازووی راگوشیم و گوتی: (وان لە مین، ئازاو بە جەرگ و خۆڕاگربە، دایك و باوکت کوژچیان کردووە.)

من موچڕکم پێداهات، ئینجا وەکوو منداڵ لە پرمەی گریانم دا: خۆت دەزانی تا چ رادەیەك خۆشم دەویستن. تەنانەت لە ئۆردووگاش شیعرم بۆ دایکم دەنارد. ئەو شیعرانەم دووبارە خوێندەوە. وەختە لە خەمان بخنکێم! لەناو ئەو خەمەدا، ئەو بەیانییەم بیرکەوتەوە کە دەستم بە سەفەر کرد و تۆ تا رووباری (هین لونگ) بەرێت کردم کە گوندەکەمان دەکاتە دوولەت. لێوەکانی خۆم لێك قیرساندبوو، لەبیرتە؟ بیرم لە ساتی ماڵاوایی دەکردەوە! کێ دەزانێ داخۆ تا ماوەی چەند لەیەك





دوور دەبین. لەوانەیە تا ئەو کاتەی وڵاتەکەمان رزگار دەبێ و بەهار بە گوڵی لۆتس و بەبێ گرمەی بۆمبا دەست پێ دەکا. لێرە، لە باشوور، هەمیشە هەر زستانە. گەلەکەمان لەژێر پێی دوژمن دەژی. زۆرمان لێ مردووە یان بزر بووە بەڵام ئایا دەزانی شەڕێکی مەردانەیان کرد.

ماڵاوا (تویت لان)! هەمیشە وێنەت لەسەر دڵم هەڵدەگرم. هیوادارم بە وەفاداری بۆم بمێنیتەوە.

(تویت لان)! ئازیزەکەم! راستە رووبارو کێو ئێمەیان لێك جیاکردۆتەوە، بەڵام من لە هەر چوار ریانی کۆڵانێك و لەپشت هەر دەوەنێك و لەپەنا هەر درەختێك تۆ دەبینم. پەرەسێلکەیەك وا بەرەو گوندەکەمان دەچێ. داوام لێ کردووە عیشقی منت بۆ بێنێ، داوام لێ کردووە تکات لێ بکا زۆر بە خۆڕاگری چاوەڕێم بکەی!

ئەگەر تۆ ئەزیەت بخۆی، سەراپای ڤێتنامی باشوور ئەزیەت دەخواو دەنگی گریانی لە هەموو مەزرایەك و لای هەموو دار نارگیلێك و لەسەر هەموو جۆگایەك دەکەوێتە بەر گوێ .

(هین لونگ) تەنیا عیشقی من و تۆی لێك نەکردووە، زۆر عیشقی تریشی لێك کردووە. ئەگەر تۆ بە راستی منت خۆش دەوێ دەبێ تۆش بەشداری ئەم جەنگە بکەی بۆئەوەی شانازی بەو وێنەیە بکەم کە پێت داوم. ئاخیری، رۆژی بەختەوەری بۆ ئێمە ئەم دووەمان و بۆ هەر یەکێکی تر دێت کە وەکوو ئەم دووەمان دەگری.

(تویت لان)! گەنجینەکەم! حەزم دەکرد مانگی ئاب شیعرێك بۆ بیستەمین ساڵیادی لە دایکبوونت بنووسم! حەزم دەکرد شیعرەکە هەر دیرێکی عیشقی منی بۆ تۆو رقی منی بەرامبەر بە دوژمن تێدا بێ.

ئەم نامەیەم وەکوو شیعرێك لێ قبووڵ بکە. ئەمڕۆ رۆژی لە دایکبوونی تۆیە، وانییە؟ تۆ ئەوەتا لە بەهاری ژیانداى و بە عیشقی شۆڕش دەژی. تۆ بەو عیشقەوە گەورە بووی و بە گەورەبوونی ئەو عیشقە، عیشقی منیش بۆ تۆ زیاد دەکا. وا دەزانم یەك لەحزەیە تۆم جێ هێشتووە: چاوی برسیم ئێستاش کراسی سپی تۆی لێ دیارە کە لێم دوور دەکەوتییەوە! زوڵفی پڕ پێچ و خەمی تۆ لە

کۆڵانەکانی گوندەکەمان دەکا!

عیشقی من ئاوا گەورەیە! عیشقی من وەکوو بۆنی گوڵی لۆتس شیرین و وەکوو ئاوی کانی تازە و وەکوو خۆر بە نرخە کە زێڕ بە زەوی دەبەخشێ.

ئەم عیشقە ئەو کاتە فریام دەکەوێ کە دەبینم بۆمبا بەسەر وڵاتەکەم دا دەرژێ و دەبینم ئافرەتێ دڵۆپە فرمێسکی لە چاوان دەرژێ. ئەم عیشقە هێزی یەك کێوم پێ دەبەخشێ بەرامبەر بە زریان و شڵێوەو بەرامبەر بە ئەمریکییەکان، بەقەد رووبارێك هێزو تەوژمم پێ دەبەخشێ کە زبڵ و زاڵ رادەماڵێ و لە دەریای دەکا.

ئای، ئەمریکینە!!

کێوی (چی لین)و رووباری (باك دانگ) ئێستاش هەست دەکەن شوون پێی تری دوژمنی سەرکەوتوویان بەسەرەوەیە.

تا ئێستا چەندین دوژمن وڵاتی ئێمەیان داگیر کردووە!

ئەوە چەند سەدەیەکە ئێمە خەریکین دەجەنگین. ئایا وڵات هەیە لە ئێمە ئازاتر؟!

(تویت لان)، ئەم دوژمنە نوێیەش دەبەزێنین و لەناوی دەبەین!

(تویت لان). ئێستا لە ژێر سێبەری دار نارگیلێك دانیشتووم و بیر لەتۆ دەکەمەوە. ئێمە لە (تری تین)ین، لە پارێزگای (کانگ تری) و رووباری (بن هی) لە بەرامبەرمەوە دەرژێتە کەنارێکی لم سپی.

دوای نیوەڕۆیەکی پایزە. غەریبی ماڵەوە دەکەم. هەمیشە، لە کاتی نان خواردن و لە کاتی رۆیشتن هەست بەم حاڵەتە دەکەم، بەڵام کە چاوم بە گوڵێکی سوور دەکەوێ، ئەو هەستەم دەگاتە چڵە پۆپە: تۆ گوڵی سوورت چەند خۆش دەویست. هەر کاتێ چاوت بە گوڵێکی سوور بکەوتایە، هاوارێکی نزمت دەکرد. ئای چەند خۆش بوو تۆیش لێرە بای!

دەزانی ئێرە جێگایەکی چەند خۆشە! زنجیرە چیا و سەوزایی بێشەو جەنگەڵ و ئەو باڵندانەی بەسەر سەرماندا دەفڕن و هەژانەوەی گەڵای داران، هەموویان زۆر جوانن!

حەزم دەکرد وێنەی دار زەردەلوو و حەیزەران و پەڕەگوڵی ئارکیدەت بۆ بکێشم، بەڵام شەو بە کپی و بێ دەنگی خۆیەوە، بەسەر ئەم هەموو شتانەدا دەکشێ.





هەرچی جێگای شادی بوو، ئێستا بۆتە گرفت و مەترسی.

(تویت لان)، ئای چەند غەریبیت دەکەم!

(تویت لان)، من هێشتا لەسەر نەناردنی ئەم نامانە بەردەوامم، بەڵام ئەمە چ قوربانییەکی گەورەیە! ئەگەر تۆئەوەندە بەهێزی، ئەی بۆچی ناتوانی جارو بار ئەم نامانە بخوێنیتەوە، (تویت لان)؟ بۆچی ناچارم دەکەی بیانخەمە لاوە. چ کەڵکی هەیە بۆت بنووسم، کە تۆ نەزانی من بۆم نووسیوی؟ (تویت لان) لەوانەیە من بکوژرێم، ئەو حەلە دەفتەری بیرەوەریم بزر دەبێ و تۆ هەرگیز نایخوێنیتەوە. ئایا سەلامەتی (تویت لان)؟

ئایا وەفات بۆ من هەر ماوە؟ (تویت لان)، تۆ دەبێ هەر وەفاداربی بۆ من، ها!!

بۆت دەردەکەوێ کە چاوەڕوانیت زۆر درێژە ناکێشێ. چاوەڕێم بکە (تویت لان).

رۆژێ دێ و دەگەڕێمەوە وڵات، بەڵێن دەدەم، شیرینەکەم!

(تویت لان)، شیعرێکم بۆ دایە نووسیوە، بەڵام دایە تازە هەرگیز نایخوێنێتەوە.

(تویت لان) نامەکەم بۆ تۆ خستۆتە لاوە.

شیعرەکە

( دایە گیان، بانگت دەکەم و تۆ چەند دووری!
بانگت دەکەم و شوورێك وەڵامم دەداتەوە.
بەرەو لامەوە ڕا دەکات و لەناو جەنگەڵ بزر دەبێ.
هێنکە هێنکیەتی وەکوو تۆ کە لەژێر بۆمبا باران هێنکە هێنکت بوو.
وەکووکاتێ هاواری یەکێکت دەکردو کەس گوێی پێ نەدەدای
ئێستاش دایە، هەستی خۆم بۆ کێ دەربڕم؟
تەنیا یەك دایك هەیەو کەس ناتوانێ جێگای بگرێتەوە.
دایە، هەندێ جار خەون دەبینم گەڕاومەتەوە ماڵێ و
بێجگە لە کاولکاری چیتر نابینم.
قۆرتی جێ بۆمبا دەبینم و هێزی تۆڵەم لەلا زیاد دەبێ.
ماڵمان بە تەواوی خاپوور بووە.
دایە، خانووەکەمان زۆر خۆش بوو، لە بیرتە!؟

به یەکەوە چیرۆکی (کیم وان کو) مان دەخوێندەوە
وامان دەزانی غەمبارترین چیرۆکە دەیخوێنینەوە
دایە، ئێمە نەماندەزانی غەم چییە؟
غەم داگیرساندنی مۆمە.
مۆمێك بۆ تۆو مۆمێك بۆ بابە.
من سێ مۆمم کڕیوە. سێیەمیان بۆ خۆمە.
ئەمەیان بۆ سەر گۆڕی خۆم هەڵدەگرم.
وا دەڕۆم. لەگەڵ ئەو سەربازانە دەڕۆم کە دەچنە شەڕ.
بەلاّم دایکە، ئای چەند هەست بە تەنیایی دەکەم!
من هەست دەکەم وەکوو (لوك وان تین) ی خانەدان وام.
ئەو، کە گەڕایەوە ماڵێ، هەر بە خانەدانی مایەوە.
دایکی مردبوو. تەنیا (نگویت نگا)ی دەزگیرانی مابوو.
دە ساڵ چاوەڕێی کردبوو.
ئەوەندە گریا تا کوێر بوو.
هەر بۆیەشە من بە غەمباری باسی رقی خۆمت بۆ دەکەم
بەرامبەر بەو کەسانەی تۆیان کوشت، دایە!
دەشێ رووبار وشك ببێ و کێو لەبەر یەك هەڵبێتەکێ
بەلاّم دایە، ئاخیری تۆڵەم هەر دەکرێتەوە.
بەلامەوە گرنگ نییە بمکوژن
بێ ئەوەی مۆمێکم بۆ دابگیرسێنن.)

(تویت لان)، دڵەکەم، دەزانم تۆ حەزناکەی گوێت لە وشەی پڕ رق و نەفرەتی من بێ، بەلاّم چۆن دەکرێ رق و نەفرەتمان نەبێ؟

دەزانم تۆ بڕوات بە بوردەیی و بەخشندەیی هەیە، بەلاّم ئەم جۆرە تاوانە بەخشینی بۆ نییە! من تەنیا بیر لە یەك شت دەکەمەوە: لەناوبردنی ئەمریکییەکان. بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجە یارمەتی لە هەموو شتێ وەردەگرم: تەنانەت بەردێك، تەنانەت منداڵێك! هەر بۆیەش داوات لێ دەکەم کە تۆش





بەشداری ئەم بەرگرییە بکەی. دەزانم، پێم دەڵێی کە تۆ بۆ ئەم ئیشانە دروست نەکراوی، وانییە؟ رواڵەتیش ئەمەت بۆ دەسەلمێنێ: زوڵفت وەکوو ئاوی کانی ناسکە، دەستت وەکوو پەلکی ئەم گوڵە نەرمە، شانت وەکوو ئەم داوە جاڵجاڵۆکەیە باریکە، ئۆی (تویت لان)!

بەلاّم بەهەر حاڵ، دەبێ تۆش ئەم بەشدارییە بکەی و بەم جۆرە یادی ئایندەی ساڵی لەدایکبوون و ساڵیادەکانی تری دوای ئەوەشت، شاد و خۆشتر دەبن. لەبیر دەکەی کە لەناو خوێن و تەقینەوە گەورەبووی. ورەت نەرووخێ، عیشقەکەم! ئەمە بۆمن لێ گەڕێ!

ئەم گیرو گرفتانە فێری ژیانمان دەکەن و یارمەتی گەورەبوون و پێگەیشتنمان دەدەن؟ دەزانی ئێستا لە ئۆردووگایەکین لەناو جەنگەڵ. دونیا ساردە. باران دەبارێ. من هەموو گیانم تەڕ بووەو دەلەرزم. بەلاّم ئەگەر نەجەنگابام، ئایا شایەنی ئەوە بووم پێم بڵێن: پیاو؟! ئەگەر نەجەنگابام، پیاو نەبووم. دەمامەوە یەك لەشی لەرزۆك و هیچی تر. داوات لێ دەکەم لە هەست و سۆزی من بگەی. بەلاّم مادام تۆ ئەم نامەیە ناخوێنیتەوە، هەموو شتێ بێ هوودەیە.

(تویت لان)، ژیانی جەنگاوەر سەخت و دژوارە، بە تایبەتی ژیانی جەنگاوەرێکی وەفادار بە ژن.

دەزانی، شەوەهای شەو بووە دەمتوانی وەلاّمی خەندەیەك یان داوەتێك بدەمەوە و بە دوویدا بچم بەلاّم پاشان یەکسەر بیرم کردۆتەوە:( ئایا ئەمە نابێ بە خیانەت؟ ) ئینجا وەلاّمی خۆمم داوەتەوە: ( با، دەبێ بە خیانەت.)

ئای تویت لان، من قەت شتی وام پێ ناکرێ.

هەندێ جار بەخیلی بەو کەسانە دەبەم کە دەتوانن ئیشی وا بکەن، پاشان لە خۆم تەریق دەبمەوە کە حەزم کردووە وەکوو ئەوان بم.

(تویت لان)، تۆم زۆر خۆش دەوێ!

لە کاتەوە کە یەکەم باڵندەی سپێدە دەم دەست بە چریکەی گۆرانی دەکا تا ئەو کاتەی رۆژ دەچێتە سەر ئاوابوون وسوور هەڵدەگەڕێ ، تۆم خۆش دەوێ .

کاتێ کە هەست دەکەم چوست و چالاك و ئازام، خۆشم دەوێی!

کاتێ کە هەست دەکەم شەکەت و تەپ و تەوەزەلم، خۆشم دەوێی!

کاتێ کە بای دێ و شەونم هەیە، خۆشم دەوێی!

کاتێ کە هەست بە تەنیایی دەکەم، یان لەگەڵ دۆستێکام، خۆشم دەوێی!

یەك ئاوازی شمشاڵ بەسە بۆ ئەوەی بەرەو کەناری رووبارێ کە بەلەمی تیا لەبەر بادا دەهەژێتەوە و بایەوانەکانی دەشەکێنەوە، بەرەو لای تۆو بەرەو قۆرتی گۆناکانت رامبکێشێ!

(تویت لان) دە تۆش بەشداری جەنگ بکە، بەڵام ئەگەر ناتەوێ، بەشداری جەنگ مەکە! بەلای منەوە ئەوەندە گرنگ نییە. من تەنیا ئەوەندەم بەلاوە گرنگە کە تۆ سەلامەت بی و چاوەڕێم بکەی و وەفات بۆ من هەبێ ، چونکە ئەگەر تۆ شتێکت بەسەر بێ، ئەوا من خۆم فڕێ دەدەمە ژێر ئاگری یەکەمین شەستیر.

عیشقەکەم، (تویت لان)، من گەوجم، شیعرێکیشم بۆ تۆ گوتووە. سەربازەکان، کە دەمبینن خەریکی نووسینم، هەقیان بەسەر منەوە نییە. تەنیا ئەوەندە دەڵێن: (ئەوە شیعر دەنووسێ، شیعرێکی تر دەنووسێ!). بەڵام من هیچ گوێ بە قسەیان نادەم و لەسەر ئیشی خۆم بەردەوام دەبم. زۆر جار خەت بەسەر شیعرەکانم دا دێنم بۆ ئەوەی کە دووبارەم کردەوە، رام لێ بێ.

لەم شیعرە رازیم. هەر چۆنێ بێ، بەبێ دەستکاری پاکنووسی دەکەم.

ئەوەتا شیعرەکەم، (تویت لان)! ئەم شیعرە باسی تۆو باسی گوندەکەمان دەکات، چونکە لە راستیدا ئێوە هەردووکتان یەك شتن:

(–کانگ بین–ی گوندیی خۆشەویستم

رووبارەکانی بە خوڕترن

دار نارگیلەکانی سێبەریان درێژترە

سەروەکانی کەناری گەورەترین بەریان گرتووە.

– کانگ بین–

سەوزەکانی لە هەموو سەوزییەك سەوزترن

(با) بۆنی برنجی گەییوی لێ دێ.

قازو قورینگ باڵی سپییان بەسەر مەزراکاندا دەکێشن





لم وەکوو لاوانەوە لەسەر رووت دەخزێ

ئاخۆ تۆ لە (کانگ بین) ایت!!

لە خەوما دەچمەوە (کانگ بین)

کچێکی باکوورم دێتەوە یاد،

ئەو رۆژانەم دێتەوە بیر کە لەگەڵ ئەو کچەدا بووم.

هاوبەشی خۆشی و ناخۆشی یەکتر بووین

رێگای شۆڕش رێگایەکی درێژو تاقەتبەرە

بەڵام ئەی کچی باکوور، ئاخیری هەر سەردەکەوین!

وڵاتەکەمان رزگار دەکەین.

وا رزگاری دەکەین کە هەرگیز لە دەستی نەدەین.

دەگەڕێمەوە (کانگ بین)، خەم و خەفەتم نامێنێ.

ئیتر بیر لەوە ناکەینەوە بۆمبا لە ناخمان تەقیوەتەوە، (تویت لان)

ئیتر بیر لە دووکەڵ و ئاگرو تەقینەوە ناکەینەوە.

سوێند دەخۆم هەموو شتێ دەبڕێتەوە، (تویت لان)!

بەلەم دووبارە لەسەر ئاو دەکەونە جووڵە جووڵ،

مەزراکان دووبارە لەبەر (با)دا کەروێشکە دەکەن،

دەنگی غەمباری شمشاڵ دووبارە هەوا پڕ دەکا.

سەربازەکان، تفەنگ لە شان بۆ ئەم جۆرە  شتانە دەجەنگن.

واتە بۆ تۆ، (تویت لان)!)

(تویت لان)، قەت باوەڕ ناکەم!! راست نییە (تویت لان)! خەبەریان دامێ کە تۆ مردووی، (تویت لان). گوتیان تۆیش وەکوو دایکم مردووی! لە بۆمبا بارانێك!! باوەڕناکەم (تویت لان). زۆر زەحمەتە (تویت لان)! ناتوانم بەرگەی بگرم (تویت لان)! بێ شك ئەوانە بە هەڵەدا چوونە (تویت لان)، ئەگەر نا من شێت دەبم. تۆ زیندووی (تویت لان)! ساخ و سەلیمی و چاوەڕێی من دەکەی. یەکتر دەبینینەوە (تویت لان). بە یەکەوە لە کەناری دەریاچەی قوو پیاسە دەکەین، لە کەنداوی زەرد پیاسە دەکەین، ئەو شوێنەی هەمیشە شنە بایەکی هێمنی لێ دێ. ئەو شنە بایەی

تۆ حەزی لێ دەکەی، ئەو شنەبایەی زوڵفەکانت دەئالۆسکێنێ (تویت لان)! ئەوسا تەماشای ناو چاوی یەکتر دەکەین (تویت لان)! دەست لەناو دەست (تویت لان)! هەرگیزاو هەرگیز یەکتر جێ ناهێڵین (تویت لان)!

(تویت لان)! (تویت لان)! (تویت لان)!. من لە خەوندام (تویت لان)! تۆ مردووی (تویت لان)! کە منیش مردم، ئەوسا لەو دونیا، ئەگەر هەبێ، دەتبینمەوە. چونکە لەمەو دوا تەنیاو تەنیام (تویت لان)! ئیتر هەموو شتێکم لەلا بێ نرخ وبێ بایەخە (تویت لان)!

داوایان لێ کردووم بۆ زێرەوانی دەربچم،منیش وا دەچم بۆ ئەوەی بمرم!!

— — —

<u>(٢١)ی شوبات</u>

باری زورتیان نەدەبوایە بانگێشتم بکا بۆ فراوین، بە تایبەتی لە رۆژێکی وەکوو ئەمرۆ. بەڵام بۆیە بانگێشتی کردم چونکە ئەو راپۆرتەی لە بارەی ڤێتنام نووسیبووم بە دەستی گەیشتبوو، ویستی بۆم بخوێنێتەوەو پاشان بە شێوەی تایبەتی خۆی، بە نەرمی پێم بڵێ نابێ لەم بارو دۆخەدا بەم جۆرە شت بنووسم. فراوینمان لە ماڵی خۆیان خوارد و بۆ ئەوەی یەکماڵیی خۆیانم پێشان بدا، نانمان لە ژووری نانخواردن نەخوارد، فراوینمان لەسەر بانێژەکە خوارد کە لە پەنجەرەکەوە ناو ژووری نووستنی لێ دیار بوو. لەوێ من وئەو بە تەنیا بووین، وەکوو دوو دەزگیران. لەحزەیەك هەستم کرد راپۆرتەکە تەنیا بیانوویەك بووەو هیچی تر، زورتیان لە پرێکا دڵی کەوتۆتە سەر من.

کە یەکەم پرسیاری کرد و پرسیارەکە وەکوو دەنگی گوللە لەژێر مێزی شەراب ومێزی دانتیل وپەرداخی کریستاڵ و پڕ شتی زیوین دەنگی دایەوە، گومانم لە بۆچوونەکەم نەما.

— ئازیز، تۆ کۆمۆنیستی؟

— نەخێر، باری.

— زۆر کەس دەڵێن هەو نین، کەچی لەبنەوە هەون.

رۆژێکی زۆر خۆش بوو. هەتاوێکی ساف و بێگەرد بوو. درەختێکی گوڵ سوور





لە پشت درەختەکانی باخ و لەسەر رووی ئاوی دەریای پڕ شەوق، دیار بوو.

من (تویت لان)م بیر کەوتەوە کە حەزی لە گوڵی سوور دەکرد. ئینجا بە دەنگێکی هێمن و لەسەرەخۆ وەڵامی (زورتیان)م دایەوە:

— ئەگەر کۆمۆنیست بام هەرگیز نکووڵیم لێ نەدەکرد، بە تایبەتی کە من خۆم خەڵکی ولاتێکم ئەگەر کۆمۆنیست بی سەرت رەحەتترە، لەوەی کۆمۆنیست نەبی.

ئەمانە قسەی هەمیشەیین، وانییە باری؟ ئەوەی لە گەڵتان نەبێ، دوژمنتانە و ناویشی لە پارت تۆمار کردووە.

— تۆ لەگەڵ ئێمەیت، یان، نا!؟

— نا باری، من لەگەڵ ئێوە نیم. ئەو کاتەی من برادەرتان بووم و خۆشم دەویستن، سەردەمێ بوو لە مێژە بەسەر چووە. ئێستا ئیتر ئێوەم خۆش ناوێ.

— ئازیز گیان، کوێت/ باش/ نییە

ئەو رستەیەی وشە بەوشە بەو جۆرە گوت کە نووسیومە. وەکوو ئەوەی نەساخ بم، یان نیشانەی نەخۆشی دەروونیم لێ دەرکەوتبێ، چوزانم.

— هیچم نییە، باری! لانی کەم هیوادارم هیچم نەبێ.

— دەزانم تۆ کچێکی ئازای.

— زۆر کەس بەمە نازانن. منیش هەندێ جار نازانم.

— وا رووقایم مەبە.

— من هیچ رووقایمی لەوەدا نابینم کە بڵێم کچێکی ئازا نیم.

یەکەم جار بە میهرەبانی چاوی تێ بڕیم و نێوچەوانی وێك هێنایەوە و وەکوو ئەوەی نهێنییەکی منی ئاشکرا کردبێ، گوتی:

— تۆ هەندێ جار نابی بە ئاشتیخواز ؟

وشەی (ئاشتیخواز)ی بە هەمان ئاوازی وشەی (کۆمۆنیست) دەربڕی، دەق وەکوو ئەوەی جوێن بێ.

— ئەگەر دەتەوێ بزانی، با پێت بڵێم من حەز لە جەنگ ناکەم.

— چ جەنگێك؟

— جەنگ، هەر جەنگێك!

– ئا!، وامزانی ئەم جەنگە دەڵێی!

– بەڵێ ئەم جەنگەش. ئەم جەنگە چی لە جەنگەکانی دی کەمتر نییە، باری!

– باشە، ئەی بۆچی هاتیتە ئێرە؟

– بۆ ئەوەی کە ... گوێ بگرە باری، دەتوانم بڵێم لەبەر ئیشی خۆم هاتووم. لەبەر لایەنی دەروونی کارەکەم هاتووم.

دەشێ ئەم وەڵامە وەڵامی پرسیارەکەت بێ، یان لانی کەم، یەکێ بێ لە وەڵامەکان.

دەتوانم تەنانەت ئەوەشت پێ بڵێم کە من هاتووم بۆ ئەوەی جەنگ بەو کەسانە بناسێنم کە ئاشنایەتییان لەگەڵ جەنگ دا نییە. دەشێ ئەمەش وەڵامێك بێ. بەهەر حاڵ دەتوانم وەڵامی تریشت بدەمەوە، بەلاّم وەڵامی راستەقینەی پرسیارەکەت وەڵامێکی خۆپەرستانەیە. من بۆ ئەوە هاتمە ناو جەنگ چونکە ویستم جەنگ بناسم. ئاخر مرۆڤ هەمیشە بەرەو ئەو کەس و ئەو شتانە دەکشێ کە نایانناسێ و نازانێ چین.

– تۆ چ شتێکت نەدەناسی و نەتدەزانی چییە؟

– بۆ نموونە ترس، ئەو ترسەی خۆراکی جەنگە.

– ترسی چی؟

قسەو گفتوگۆ گەیشتبووە رادەیەکی پووچ و گێلانە. لە لایەکەوە ئەو بنەگوڵە سوورە بوو کە (تویت لان)ی بیر دەخستمەوە، لە لایەکی تریشەوە باری بوو بە لووتی زل و رێزی ئەزیەتبارو پێشاندانی نەرمی، لەو ناوەش من بووم و پێش خزمەتێکی ڤێتنامی کە بە خاکی و بەبێ دەنگی خزمەتی دەکردو دەنگی دەرنەدەهات. بەلاّم جارجار سەرنجێکی وا تیژی لێ دەداین دەتگوت هاوار دەکا.

– باری رەنگە بەلای تۆوە کوشتن ترس نەبێ. نە کوشتن و نە کوژران.

– ئەگەر هۆیەکی لەباری هەبێ، نا.

– تەنانەت ئەگەر هۆیەکی لەباریش هەبێ. هەر چۆنێ بێ، با بزانین هۆکەی لەبارە یان نا. جەنگەکەی ئێوە هیچ هۆی لەباری نییە.

باری دەزانی من هات و چۆی کلێسە ناکەم، نوێژیش ناکەم بەلاّم خاوەنی ئەم





رستەیەم قبووڵە کە دەڵێ: (تۆ هەرگیز ناکوژی!)

– ئازیز گیان، تۆ گاور نی؟

– نازانم، بەلاّم پێم خۆشە گاور بم.

لە شوێنی خۆی هەستایەوەو گەرووی پاك کردەوەو زۆر بە نەرمی و میهرەبانی دەستی بە قسە کرد وەك ئەوە وا بوو بیەوێ زەینی منداڵێك بۆ شتێ ئامادە بکا، زۆر بە پەرۆشەوەش هەوڵی دەدا زەینی رۆشن بکاتەوە. چونکە بڕوای بە دیموکراسی و هەروەها بە ئازادیش هەبوو، چونکە رێزی باوەڕی خەڵکی تری دەگرت، سەرەڕای ئەمەش ئامادەبوو هەموو بیرو باوەڕێکی چەوت راست بکاتەوە. هەمیشە تێ دەکۆشا بۆم بسەلمێنێ کە ئەمریکییەکان مرۆڤی لێبوردەو میهرەبان و چاکن. هەر لەبەر ئەم سیفەتانەشە کە لە ڤێتنام یان کوریا یان ئەوروپا دەجەنگن. ئەوروپا! لەبیرم نەکرد بڵێم ئەی جگە لە ئەمریکییەکان کێ بوو ئێمەی ئەوروپی لە دەسەلاّت و چنگی نازییەکان رزگار کرد؟ (باری زورتیان)یش لەگەڵ ئەو ئەمریکییانەدابوو چونکە ئەو کاتە لە ئۆقیانوسی ئارام گیانی خۆی لە پێناوی ئازادی و دیموکراسی خستبووە مەترسی.

قسەکانی وەکوو دەستپێکی بابەتێ نەختێ درێژەی کێشا، پاشان هەوڵی دا بۆم رون بکاتەوە کە بەراوردکردنی مەسیحیەت و ئاشتیخوازی لەگەڵ جەنگی ڤێتنام جۆرە خیانەتێکە بەرامبەر بە ئەمریکا.

ئینجا گوتی ئەوە دەوڵەتی ئەمریکایە روخسەتی بە من داوە لەوێ بمێنمەوەو گوتیشی بەزەیی بەرامبەر کوژراوێکی ئەمریکی بەهیچ جۆرێ لەگەڵ بەزەیی بەرامبەر بە کوژراوێکی ڤیت کۆنگ بەراورد ناکرێ، چونکە ڤیت کۆنگ دوژمنە.

بۆم روون کردەوە کە دوژمنی ئەو دوژمنی من نییە. بەلای منەوە ئەمریکییەك و ڤیت کۆنگێك هیچ جیاوازییان نییە. هەردووکیان مرۆڤن. دوو دەست و دوو قاچ و یەك مێشك و یەك دڵیان هەیە. جیاوازی ئەم دوانە تەنیا ئەوەیە کە ڤیت کۆنگەکە لە ولاّتی خۆیەتی، بەلاّم ئەمریکییەکە نا، ڤیت کۆنگەکە بەرگری لە ولاّتی خۆی دەکات، بەلاّم ئەمریکییەکە نا.

روون کردنەوەکەم تا ئاشکراتر و سادەتر دەبوو، ئەو کەمتری لێ تێدەگەیشت و

دوای هەموو قسەکانی گەیشتە ئەنجامێکی وا من ناچار بووم لێی بپرسم ئاخۆ چۆن (مازۆر)ی دەرکرد، هەر بەو جۆرەش خەیاڵی دەرکردنی منی هەیە؟

ئەویش گوتی: فەرمانی دەرکردن پەیوەندی بە دەوڵەتی ڤێتنامەوە هەیە نەك بە ئەمریکییەکان.دەبینی دەشێ هەموو شتێ لێرە رووبدا.

ئەمڕۆ خەبەرمان پێگەیشت کە جەنەرل (لۆن) قەشە (تری کانگ)ی دەستگیرکردووە. بەبێ هیچ تاوانێك دەستگیری کردووە و تەواو!

من ئامادەم هەرچی هەمە هەمووی بدەم هەر بۆ ئەوەی بزانم (فرانسوا) بڕوای دەرهەق ئەم هەڵس و کەوتەی (لۆن) چییە، بەڵام کاتێ کە پرسیارم لێکرد وەڵامی نەدامەوە.





## بەشی شەشەم

ئیتر کەس باسی (لۆن)ی نەدەکرد، مەگەر بەرێکەوت ناوی بهاتایە.

(فرانسوا) باسی نەدەکرد و ئەوانی تریش ئەگەر باسیشیان بکردایە، زۆر بە هێمنی و لە سەرەخۆ، هەر لە بەینی خۆیانەوە باسیان دەکرد.

هەندێ جار خۆیان بە سووك دادەنا کە رۆژێ لە رۆژان رێزی ئەو کابرایەیان گرتووە، هەندێ جاریش بە بێ بایەخی ناویان دەهێنا. ئەو شتانەی لە دەورو بەرمان دەقەومان لەو گوللەیە زۆر گرنگتر بوون کە بەهۆی (نگوین نگوك لون) لە ناو سرویت کنگی دابوو. مەرگ وەك باران تەڕی کردبووین و وەکوو سایە لە دوومان دەخشا: لە هەموو شوێنێ، دەچووینە هەر شوێنێ، و هەر کارێکمان دەکرد، بە جۆرێ بە بیرو هەستمانەوە چەسپابوو، ئیتر بە کوژران حیساب نەدەکراو کەس بایەخی بەم بابەتە نەدا.

شەڕ لە (هوئە) ببوو بە کارەسات و دارو بەردی ئەو شارەی لەسەر یەك نەهێشتبوو.

(خەسان) لە بەربەستێك گیری خواردبوو، رۆژ بە رۆژ دیل و گرفتارتر دەبوو، بست بە بستی کاول و وێران ببوو. (لون) لەناو ئەم جۆرە زریان و گەرداوەدا وەکوو زلە قەسەرێکی سووکی لێ هاتبوو، ئیتر چاوت پێ نەدەکەوت. من لەم جۆرە گەرداوەدا لە رووداوی جیاجیا نقووم ببووم و هەردەم بەرەو رووی پرسیاری زیاتر دەبوومەوە کە هەمیشە بەدەوری سەرمدا دەخولانەوە، کەسیش نەبوو وەڵامیان بداتەوە. دەمزانی ئەم پرسیارانە هاتوونەتە پێش (فرانسوا)ش، بەڵام پیلەکەو گفتوگۆم لەگەڵ نەدەکرد چونکە من زۆر لە (سایگۆن) نەبووم و ئەو هەست و بیرانەی نارەحەتیان کردبووم و تێیان نەدەگەیشتم و هەوڵم دەدا دەرکیان بکەم، هەموو گیانیان داگیر کردبووم: حەزم دەکرد بزانم ژیان یانی چی؟

مردن یانی چی؟ بەشەرایەتی چ مانایەکی هەیە؟!

دەزانی، کاتیٚ کە دەفتەری بیرەوەرییەکانم دەخویٚنمەوە لەناو خاوبوونەوەیەکی خەونانەدا نقووم دەبم. ئەمانە دەفتەری ڕەشن کاغەزەکەیان هیٚڵدار یان دامەیین و نووسینەکانی سەریان وەکوو نووسینی هەمیشەیی من نییە: بەناو یەکداچوو، وردو حیساب بۆ کراو.

تەنانەت کاتیٚ کە شتی تۆقیٚنەرو باوەڕ نەکردەنیشم نووسیوە، دیسان بەو جۆرە خەتە نووسیومە. بەڵام ئایا من هیٚزی بەرگەی ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەم بارە قورسەی غەم و ترس و خراپەم لەکویٚ پەیدا کردووە؟

ڕۆژ بە ڕۆژ، حەفتە بە حەفتە، بەبیٚ حەسانەوە، بەبیٚ هەناسەدان! هەندیٚ جار بیردەکەمەوە: شیٚتیش نەبووبم؟ بەهەر حاڵ منیش ئەو حاڵەتەم هەبوو کە ئەوانی تر تووشی هاتبوون. ئایا تۆ قەت بیرت لەوە کردۆتەوە کە جەنگیش جۆرە شیٚتخانەیەکە؟ ئایا دەزانی لە جەنگ دا هەموو لە هەموو شیٚتن؟ ئاخر چۆن دەبیٚ ژن و میٚردیٚك بەیانی لەخەو رابن و بزانن کە لەوانەیە دەقیقەیەکی تر یان سەعاتیٚکی تر بە زیندوویی نامیٚنن. پیٚم بڵیٚ! ئەوانە چۆن دەتوانن لەناو ئەم هەموو جەنازەیە بژین؟ ئینجا لەسەر خوانی خواردن دابنیشن و بە ئاسوودەیی خواردنی خۆیان بخۆن؟ چۆن دەتوانن لەدەست ئەم خەونە تۆقیٚنەرانە رابکەن و دوای یەك لەحزە ترس، شەرم لەخۆیان بکەنەوە؟ وەکوو ئەو سپیٚدەیەی من لە فرۆکەخانە هەلاٚتم. ئەو ڕۆژەی چاوەڕوانی شتیٚکم دەکرد پیٚی بچمە (خەسان).

ئەمرۆ پیرۆزبایی لەخۆم دەکەم کە ئەو ڕۆژە کاریٚکی عاقلاٚنەم کرد. بەلاٚم ئەو کاتە، ئەوەم بە کاریٚکی عاقلاٚنە نەدەزانی، بەڵکو بەترسنۆکیم دەزانی و سووکایەتیم بەخۆم دەکرد. شیٚت بووم!

<u>(٢٢)ی شوبات</u>

(فرانسوا) داهاتبووەوە سەر ئامیٚری چاپەکەی و وەکوو لیٚخوڕیٚك چۆن بە خیٚرایی داژوا، ئەویش ئاوها بەوپەڕی خیٚرایی وتاری ئەمڕۆی چاپ دەکرد. هەر پەڕیٚکی نووسراوی فڕیٚ دەدایە سەر پەڕە نووسراوەکانی تری لای ڤیٚتنامییەکەی لیٚپرسراوی ئامیٚری هەواڵ و ئەویش بە هەمان خیٚرایی چاپی دەکرد. ئامیٚری





هەواڵیش هەواڵەکەی چاپ دەکردو خیٚرا خیٚرا شریتی کاغەز دەهاتە دەرەوەو لەسەر یەك کەڵەکە دەبوو. (P·F·A) لە سایگۆنەوە بۆ پاریس .یەکسەرە.

ڤاو داکەوتووە کە ئەمشەو بۆ جاری سیٚیەم هیٚرش دەکریٚتە سەر سایگۆن. ترس شاری سایگۆنی داگرتووە. ترسی ڤیت کۆنگ و ئەم ترس و تۆقانە بە هیچ شتیٚ ناڕەویٚتەوە.

خەڵکەکە لە ترسی ئاژاوەی گشتی تۆقاوە. لە ڕۆژی سیٚ شەممەوە هەموو دەستەو تاقمەکانی سوپا لە باری (تەیار)دان بۆئەوەی بتوانن بە باشی بەرگری لە پایتەخت بکەن. سەنگەرو پەناگەکانی سایگۆن زیاترو پتەوتر بوونە. لەناو شار، لەبەر لۆری سەربازی، جگە لە چەند شەقامیٚکی وەکوو (تودو)، هاتو چۆ لە هیچ شویٚنی تر نەماوە.

جیب، بۆئەوەی بە سەنگەری تازە نەکەون، هەر لەحزەو بە توندی ئیستاپ دەگرن. دەورییەکان بە بەردەوامی فیك فیکە لیٚدەدەن و تەقە بە هەواوە دەنیٚن. سایگۆن دووبارە بووە بە پایتەختی ترس.

پیٚش سیٚ ڕۆژ، دەستەیەکی ڤیٚتنامی باکوور، لەژیٚر پەردەی تاریکی هیٚرشیان کردە سەر پردی (بین هوی). ئەو پردەی، تا پیٚش مانگیٚك، خەڵکی سایگۆن بۆ رابواردن و خواردنی قرژاڵ دەچوونە سەری. ئەمە یەکەمین جارە، سەربازانی (هانوی) بەم شیٚوە یەکگرتوو و یەك بڕواییە هیٚرش دەکەنە سەر دەروازەکانی سایگۆن. لەو بارو دۆخەشدا، کەشتییەکی چینی، کە ساروخ و تەقەمەنی بار کردووە، لەلای ڕۆژهەلاٚتەوە لە سنووری کەمبۆدیا نزیك دەکەویٚتەوەو خەریکە بەرەو پایتەختی ترس دیٚ. سایگۆن خەریکە بە ترسناکترین ڕۆژانی ئەم جەنگەی بیست ساڵی دواییدا تیٚدەپەڕیٚ. شەوی (٣١)ی کانوونی دووەم، ژمارەیەکی زۆری ڤیت کۆنگی خەڵکی (کین هوئا)، کە حەفتا کیلۆمەتر لە سایگۆن دوورە، توانیان دزە بکەنە ناو شار. ئەوانە خۆیان لە شویٚنی جیاجیا شاردۆتەوە و چاوەڕوانی فەرمان دەکەن. خەڵك زۆر شت لەسەر زاری ئەوانە دەگیٚڕنەوە. بۆ نموونە: ((ناوچەی بازاڕی ناوەندی چۆڵ کەن، لەگەڵ خاك تەختی دەکەین.))

یان ((ئەگەر خاوو خیٚزان یان برادەریٚکتان لە سایگۆن هەیە، پیٚیان بڵیٚن بە

زووترین کات شار جیٚ بیٚلّن، ئەگەر نا بەبەر بۆمبا باران دەکەون و دەکوژریٚن.))

هەندیٚکیان تەنانەت کاتی راپەڕینەکەشیان مەزەندە دەکرد:

لەمڕۆوە تا کۆتایی مانگ.

هەنـدیٚکی تـر لەسـەر زاری ئەوانـەوە دەلّـیٚن گوایـە ئەوانـە تەقـە تـەنیا لـە ئەمریکییـەکان دەکـەن و کاریـان بـە دەزگـا کارتۆنییـەکانی دەولّەتـەوە نییـە. لـەم بارودۆخـەدا، دانیـشتوانی سـایگۆن لـە سـەعات شەشـی دوای نیـوەڕۆ دەرگـای مالّەکانیان دا دەخەن و ئیتر لە مالّەوە دەرناچن و چاوەڕوانی راپەڕین یان بۆمبا باران دەکەن. تەقینەوە کش و ماتی شەو دەشلەقیٚنیٚ ودەنگی تۆپ لە ژیٚر هەوری ئاسمانەوە دیٚ و شووشەی پەنجەرەکان دەهەژیٚنیٚتەوە.

مرۆڤ نازانیٚ ئاخۆ ئەمە دەنگی هاوەنە دەیبیسیٚ یان تۆپی سەدو بیست پیٚنج ملیمە دەیهاویٚژن.

فڕۆکـەو هیلیکۆپتـەر بـەردەوام بەسـەر شـاردا دەسـووڕیٚنەوە. کـەس زات ناکـا بـچیٚتە بـەر پەنجـەرەو ئەگـەر بەریٚکـەوت پەنجەرەیـەك شـکابیٚ، لـە کونەکـەوە، روناکییـەکی سـوور لـە ئاسـۆ دەکەویٚتـە بەرچـاو. هـەموو هەناسـەیان لـە سـینە بەندبووە. دوای سیٚ حەفتە هیٚرش و راپەڕین، شەکەتی و نائومیٚدی پرزەی لە شاری سایگۆن بڕیوە. ئیتر بووە بە شاریٚکی بیٚ بایەخ. ئەم میٚردەزمەیە دەبیٚ هەر بەکۆتا بیٚ. بەلاّم کەی؟ باوو بارانی وەرزانە لەمڕۆوە تا دوو مانگی تر دەست پیٚ دەکاو لەوانەیە ببیٚ بەهۆی کەم کردنەوەی هیٚزی ئەم راپەڕینە کە کاریٚکی خراپی لـە وەرەی سـوپا کـردووە. بگـرە سـەربازی ئـەمریکیش وەرەیـان رووخـاوە. ئـەم ناڕەحەتییە بە ئاشکرا بەدەم و چاویانەوە دیارە. دەم و چاویان هەمووی خۆلّی مەرەزەیەو لەگەلّ ئارەقەی لەشیان تیٚکەلّ بووەو هەویریٚکی خۆلّەمیٚشی دەم و چـاوو جـل و پـانتۆلّ و پـیٚلاّوی داپۆشـیون و بـەم سـەرو سـەکوتەوە لـە شـار دەردەکەون، لەناو لۆری لە پشت رەشاشەکانیان دانیشتوون، چاوەڕیٚ دەکەن، بیٚ ئەوەی سەیری هیچ کەس بکەن یان هیچ جوولّەیەك بکەن ...

نازانم چیتر زیاد بکەم. هیچ شتی تر نییە کە زیادی بکەم. هەموو شەو هەر ئەو دیمەنەیە. دوای دانیشتنی رۆژنامەوانی (جوسپائو)، (کلود) و (فلیکس) هاتن،





ئینجـا (فرانـسوا) و (مارسـیل)یـش. یـەك لـە دوای یـەك دەیـانگوت: ((راوەسـتە دەبینی، بیٚ شك ئەم شەوەیە!)) شەو بە چاوەڕوانییەکی گرژ تیٚپەڕی. بەیانی، بە شەکەتی لەخەو هەستاین، دەستمان هیچ ئیشی نەدەگرت. ئیتر دەتوانین چ بکەین جگە لەوەی خۆمان بە وردە شەڕی ناو شارەوە خەریك بکەین.

تەنیا ئەوەمان لە دەست مابوو بچینە باکوور، یان وردتر بلّیٚم بچینە (هوئە)و ئەگەر هیٚرش دەستی پیٚ بکردایە، یەکەم شویٚن فڕۆکەخانەی (تان سون نوت) بوو داگیریـان دەکـرد. ئـەو حەلـە لـە سـایگۆن دادەبڕاین. بۆیـە کـەس هـیچ جوولّـەی نـەدەکرد، هـەر بۆیـەش هـەموومان تـووڕەو بـەدمیزاج ببووین. هـەر دەتگـوت لـەپڕ جـۆرە دوژمنیٚکـی رووبـەروومان لـەناو پەیـدابووە. تـەنیا (دەرك ویلـسون) ی ئینگلیزی، کە هاتبووە جیٚگای (مازۆر)، ئارام و لەسەرەخۆ بوو: کوڕیٚکی سی و حـەفت سـالّەی کەلّەگـەتی شـل و مـل بـوو، هـەلّس و کـەوتی نـەرم و هـیٚمن بـوو. جگەرەی بۆ دادەگیرساندی، کورسی بۆ دەهیٚنای. چ جۆرە کەسیٚ بوو! چەندی وەخت دەویست تا لە رەوشتی توندوتیژی ئیٚمە مانان رادیٚ؟ جا لەکاتی خواردنی بەشە خواردنەکەی خۆی بتدیبایە!! خواردنەکەی لەناو قوتووەکە نەدەخوارد. زۆر بـە وریـایی لـەناو قـاپیٚکی دەکـرد. سـفرەو چـەنگالّ و چـەقۆو دەسمـالّی سـفرەی دادەنا. لۆبیا سەوزەکەی بە جۆریٚ دەخوارد هەر دەتگوت چەقچەقۆکەیەکی تازە، یـان خاویـار دەخـوا. وردە وردە خەریکـە دەبم بە هاوڕیٚی، بە تایبـەتی کـە زمانی ئیٚمە دەزانیٚ. پیٚش ئەوەی ببیٚ بە پەیامنیٚر، لە زانکۆی ئۆکسفۆرد ئـەدەبی ئیتالّی دەگوتەوە. شارەزاییەکی باشی لە نووسەرانی سەدەی حەڤدەم هەیە. خۆم باش بەگویٚ دانە قسەکانی خەریك کردوە. بە وشەی کۆن قسە بە زمانی ئیتالّی دەکا. ئەویش لە ئوتیٚلە بچووکەکەی من دەژی.

(٢٣) ی شوبات

جـەنابی (لانـگ) بـە جـۆریٚ چـوو بـووە ژیٚـری و چـاوی بڕیبـووە دەرگـای هاتنـە ژوورەوە، دەتگوت چاوەڕیٚ دەکا لە هەر لەحزەیەکا پۆلیس بیٚت و دەسگیری بکا.

بـیٚ گومـان ئەمـشەو هـەقی بـوو وا بیربکاتـەوە، چـونکە ئەمـشەو پـۆلیس هاتنـە ئوتیٚلەکەی من و هەموو جیٚگایەکیان پشکنی. کاغەزی بچووکیان لە کونی قوفلّی

ژووره چۆڵەکان دا. کاغەزەکان مۆری (لون)یان پێوەبوو. ئەگەر یەکێکی فرار بیەوێ بێتە ئەم ژوورانە، یەکسەر دەسگیر دەکرێ.

لەگەڵ هاتنی پۆلیسەکان، خەومان لێ زڕا. من و دەرك لەباتی ئەوەی بچینەوە ناو نوێنەکانمان ، ئەو شەوەمان تا سبەینێ لەسەر شۆسەی شەقامی پاستۆر بردە سەر. کە رۆژهەلات، ئێمە هێشتا هەر لەوێ بووین. پشتمان بە دیوارەوە دابوو و قسەمان دەکرد.

— دەرك، تۆ بۆچی هاتیتە ڤێتنام؟

— بەبێ هیچ هۆیەکی ماقووڵ هاتم، پێم بڕوابکە. دوای جەنگی ئیسرائیل گەڕامەوە پاریس. لە پاریس تاقەتم چووبوو و تەواو!

— کەواتە پێت خۆشە ژیانت بخەیتە مەترسی؟

— بەڵێ، من حەز لە مەترسی دەکەم. تا ترسم زیاتر بێ، زیاترم پێ خۆشە.

ئایا ئەم هەستە لە ناوەوەی هەموومان‌دا نییە؟

— راستییەکەی، با. بەلام گەلۆرانەیە.

— گەلۆرانە؟

— ناسك پەروەرییە. من زۆر بیرم لەم بابەتە کردۆتەوەو بەو ئەنجامە گەیشتووم کە ئەمە ناسك پەروەرییە. دەمەوێ بڵێم یەکێ کە ژیانی خۆی لە پێناوی ئامانجێك دەخاتە مەترسی وەکوو ڤیت کۆنگێ، یان سەربازێکی هێزی دەریایی، ئەمە شایەنی ستایش و پیا هەڵدانە. بەلام پیاوێ، یان ژنێ کە ژیانی خۆی دەخاتە مەترسی هەر تەنیا لەبەر ئەوەی تاقەتی چووە ...! ... ئێ ... ئەمە شایەنی هیچ خۆشەویستییەك نییە.

— بۆچی؟

— چونکە ئەم پیاوە یان ئەم ژنە هیچ شتی سەرنجکێشی لە ناوەوەدا نییەو لەوە بەتاڵترە کە خۆی بیری لێ دەکاتەوە.

— لەوانەیە گیانەکەم، ئەمە لەبەر ئەوەبێ کە ئەم ژنە، یان ئەم پیاوە ئینسانێکی تەنیا یە.

— لەوانەیە.





— تەنیاو بەدبەخت.

— دەبێ رێگایەکی تر بۆ چارەسەری ئەم تەنیاییە بدۆزینەوە. دەرك، دەبێ لەگەڵ بەدبەختی بجەنگین.

— ئەمە پەیوەندی بە تەرازووی بەدبەختییەوە هەیە. ئەگەر بەدبەختییەکە زۆر گەورە بێ، ئیتر ئارەزوو ناکەی لەگەڵیا بجەنگی. تەنیا دەتەوێ ئەگەر بۆ لەحزەیەکیش بێ، لە بیر خۆتی بەریتەوە. بەراست، ئەم قسە ترسناکە هی کێیە کە دەڵێ: ((ئەوەی هەموو شتێکی لە دەست دابێ، جاری وا هەیە، وا رێك دەکەوێ کە خۆیشی لەدەست دەدا.))

— بەبیرم نایە. وابزانم لە شوێنێك خوێندوومەتەوە. بۆ نموونە سەیرکە، شێتەکان ...

پێکەنینێکی سەیرو تەنانەت غەمباری کردو گوتی:

— گیانەکەم، ئایا ئێمەش نەختێ شێت نین کە لەسەر شۆسەی سایگۆن دانیشتووین و چاوەڕوانی هەڵاتنی رۆژ دەکەین؟

ئینجا گوتی: دەمەوێ بچمە (هوئە) و بە لامەوەش گرنگ نییە کە لە هەموو شوێنێ دابڕێم و بێ خەبەر بم. من نەمتوانی ئەم کارەی بە شتێکی چەوت بزانم. بە زاری بەش و زمانی درێژ، لێرە هیچ ناکرێ.

ئەوەی وا لە باکوور روودەدا، ئەو گرنگترە. بیست و چوار رۆژە ئالای زەردو سوور و شین لە هوئە هەڵکراوەو ئەمریکی و ڤێتنامی باشووری شاریان ئابڵووقە داوە. ئەوەی ئەوێ هەر شەڕ نییەو بەس، بگرە داستانێکە بۆ خۆی. وەکوو ئەو داستانانەی لە کتێبی قوتابخانە دەیانخوێنین. ئەمریکی و ڤێتنامی باشووری فەرمانیان پێ کراوە بەهەر جۆرێ بێ شار داگیر بکەن.

(ویست مورلند) ئەم ئەرکەی بە جەنەراڵ (ئابرامز) سپاردووە.

هەزاران تەن ناپاڵم و هەزاران ساروخ بەسەر شاردا دەرژێ و تۆپخانە بەبێ ئەوەی چرکەیەك بوەستێ تۆپ بە زەوی و دەریاوە دەنێن. بەلام ئایا ئەو سێ سەد مرۆڤەی لە شارو لە پشت سەنگەرەکانەوە بەرگری دەکەن، خۆیان بە دەستەوە دەدەن؟ ئەمانە بەرگرییەکی باشیان کردووە. ئەوە دوو حەفتەیە پێنج سەد

سەربازی هێزی دەریاییان کوشتووە. ئەمانە ئەم ئیشەیان چۆن پێ دەکرێ؟ کەس نازانێ! هەندێ دەڵێن ئەمانە تاقمێکی فیداکارن و خەریکن دوا تەقەلا دەدەن و هەندێکی تر دەڵێن ئەمانە ڤێتنامی باکوورین تەکتیکیان بەرگری کردنی زۆرە.لە نۆینەکانی ژێر کۆشکی دەسەڵاتداریێتی، لەناو جەنگەڵ یان لەوانەیە لە دەشتێك سەر دەردێنن و ئەوانیش زۆر بە ئاسانی دەتوانن لەم نۆینانەوە چەك و سەرباز رەوانەی ناو شار بکەن.

بەڵام هیچ گومانی تێدانییە کە (هوئە) تەفرو توونا دەبێ. دەبێ بە خۆڵەمێش.

(هوئە)ی جوان، ئەو شارەی لە هەموو شارەکانی ڤێتنام جوانترەو ناویان ناوە فلۆرەنسای ئاسیا، کەوتۆتە سەر دەریاو چەندین رووباری بەناودا دەڕوا، جاران پڕ زاناو گەڕیدەبوو.

(هوئە) لە سەردەمی دەسەڵاتداریێتی ئیمپراتۆرەکان پایتەخت بووە و هەر بۆیەش بە ماوەی چەند سەدەیەك، پەرستگاو بینای مێژوویی و پردو باخی زۆری تێدا دروست کراوە. ئێستاش وا هالاوی گڕی جەنەراڵ (ئابرامز) لەسەر ئەم پەرستگاو بینای مێژوویی و پردو باخانە بەرزدەبێتەوە.

دوێنێ لە (زورتیان) م پرسی:

– ئەمریکی چ دەکەن بۆ رزگارکردنی بینای مێژوویی و هونەری هوئە؟

زورتیان وەڵامی دامەوە:

– ئەفسەری ئەمریکی و ڤێتنامی باشووری یەکەم جار چەکی قورسیان بەکار نەهێنا بۆ ئەوەی ئەو بینایانە خراپ نەبن، بەڵام کاتێ کە دیتیان دوژمن بۆ ئیشی خراپە سوود لە بینا مێژووییەکان وەردەگرێ، ئەوانیش ناچاربوون ئەو شوێنانە بۆمبا باران بکەن.

بێگومان زورتیان!! راستە جەنابی زوریتان رووداوی وا لە فلۆرانس و لە کاسینۆو لە کاونتری و لە ستالینگرادو لە وارشۆو لەو کاتەش کە بە گورز لەناو ئەشکەوت هاتینە دەرەوە، رووی داوە.

لە جەنگا، مەسیحی بی، جوانیت خۆش بوێ و بە کولتوور هەڵبلێی، ئەمە هەمووی خیانەتە. ئێمە سوپەر مارکێتی گەورەو هەور بڕی سەر لە ئاسمان بۆ





ئوتێلەکانی جەنابی (هیلتون) و گۆڕەپانی گەورە بۆ راگرتنی ئوتومبێلەکانی جەنابی (فورد) دروست دەکەین، ئیتر چیتان دەوێ؟ بەڵێ، بێگومان راستە قوتابخانەو مووزەخانەی وەکوو مووەزەخانەی هێرۆشیمایش ...

(٢٤) ی شوبات

بەیانی دەچمە (هوئە). وا دیارە چوونە (هوئە) هەر بە راستی شتێکی زەحمەتە. چونکە کاتی بەڕێ کەوتنی فڕۆکەکان دیار نییە. هەندێ جار دەچن و هەندێ جار ناچن. بەهەر حاڵ سەفەرێکی درێژ خایەنە. دەبێ لە (سایگۆن) بچمە (دانانگ) و لەوێ بچمە (فوبی) و لە (فوبی) دەبێ بە لۆری یان هیلیکۆپتەر بەرەو لای باشوور بڕۆین و لەوێ دەبێ لە رووبار بپەڕینەوەو هێشتا لە سەرەتای رێگاین.

سەبر! خۆشبەختانە، شەوی دووشەممە گەیشتینە (دانانگ). بەم جۆرە لەوانەیە بتوانم راپۆرتەکانم لەکاتی خۆیا، واتە رۆژی سێ شەممە، بۆ رۆژنامەکەم رەوانە بکەم. بۆی هەیە بە کۆتایی ئەم داستانەش رابگەم و ببینم: نزیك بۆتەوە شار داگیر بکەن. هێزی دەریایی دزەیان کردۆتە ناو شارو ئێستا لەبن کۆشکی باشوور خەریکی شەڕن.

– ئاه، (فرانسوا)، ئەم جەنگاوەرانە لە سپێدەی بەیانا جەنگیان هەر بە خەیاڵیشدا نایە، شادو کەیفخۆشن.

– بۆچی؟ مەگەر تۆ حەزت لە ژیان نییە؟

– بێ گومان حەزم لە ژیانە، بە هیچ جۆرێکیش حەز لە مردن ناکەم. تەمەنم تەنیا چل و سێ ساڵە. تەندروستیم باشەو هێشتا زۆر کار ماوە ئەنجامیان بدەم. ژیانیشم زۆر پێ خۆشە. بەڵام دەبێ بەیانی، یان پاش دەقیقەیەکی تر بمرم و بەمەش پەست نابم، تەنیا بیر لەو ساتە دەکەمەوەو دەڵێم: (سەرمایەم لەم قومارەدا سووتا، تەواوبوو!)

(فرانسوا)، ئێمە هەمووومان وەکوو یەك واین.

– نەء، تۆ لە ڕادەبەدەر بیر لە مردن دەکەیتەوە. تۆ بەو بیرەوە هاتیتە ئێرەو هێشتا نەتتوانیوە لە سەری خۆتی دەربکەی. چونکە تۆ جەنگان و مردن بەیەك شت دەزانی.

– ئاخر (فرانسوا)، جەنگ یانی مردن.

– نا، جەنگ جۆرە خەباتێکە دژی مردن. یان ئەگەر بتەوێ باشتر تێ بگەی، مردنی کاتی جەنگ لەگەڵ مردنی کاتی ئاشتی بەراورد ناکرێ و نابێ بەیەك چاو تەماشایان بکەین. لە کاتی ئاشتی دا تۆ فرمێسك دەڕێژی، کاتێکی زۆریشت هەیە بۆ ئەوەی فرمێسك بڕێژی. لە کاتی ئاشتی دا، فرمێسك بۆ هەموو بەسەرهاتێکی گەلۆرانە دەڕێژن: بۆ زەماوەند، بۆ ناشتنی مردوو. لەکاتی ئاشتی دا، مردن مردنە، بەلاَم لە کاتی جەنگ دا، مردن شتێکەو بەرامبەر بەمەوە، زۆر شتی سەرنجکێشتر هەن، سەرنجت رادەکێشن و مردنت لە بیر دەبەنەوە.

– وەکوو؟

– وەکوو؟ کلاَوخوردەیەك. ئایا بۆم باس کردی کاتێ لە جەنگی فەرنساو کوریا بووم چ رووداوێکم بینی؟ لە شەڕێکا، کە لە (٦)ی بەیانی تا (٦)ی شەو بەردەوام بوو، گوللە هاوەنێك بە ناوەندی لێپرسراوانی هاویشتنی هاوەنی دەستەکەمان کەوت. من تەنیا چەند لەحزەیەك بوو لەوێ رۆیشتبووم. سەربازانی کووریای باکوور هاوەنێکیان لە دەستەی هاوەنی فەرەنسی دا. سەربازەکان هەموو لەشیان پارچە پارچە بوو. سەرێك لێرەو پێیەك لەوێ. من بێ ئەوەی فرمێسك بڕێژم، لە دڵی خۆمدا دەمگوت: (ئەمە سەرە، ئەمە پێیە!) لەو کاتەدا کلاَوخوودەیەك سەرنجی راکێشام، زۆر لە سەرو پێیەکان دوورتر رۆیشتبوو. دیم هەر بەرزبووەوە، بەرز بووەوە، تا وام کەوتە بەرچاو کە لە جووڵە کەوت، ئینجا بەرەو رووی زەوی هات و بە عەردی کەوت و هەر گلۆربووەوە و گلۆربووەوە تا دەنگێکی لێوەهات: (گرم!). تێگەیشتی؟ تەنانەت ئێستا، کە سەربازە کوژراوەکانیشمان لە بیر چۆتەوە، من هەربیر لەم کلاَوخوودەیە دەکەمەوە کە چۆن بەرز بووەوە ئاسمان وپاشان هاتە خوارەوەو گوتی: گرم !!

شان هەڵتەکاندنێك و زەردەخەنەیەکی تاڵ!

ئایا باسی ئەو رۆژەم بۆ کردی کە تەرمەکانمان کۆکردەوە!؟

دەبوایە تەرمەکان لەناو کیسەی پلاستیکی دابنێین و گوریس پێچیان بکەین.

دونیا ئەوەندە ساردبوو پیاو خۆی لەبەر رانەدەگرت. سەرمایەکی قوتبی بوو.





تەرمەکان وەکوو پەیکەری سەهۆڵ بەستبوویان و شێوەی گاڵتەجاڕیان بە خۆیانەوە گرتبوو. نەماندەتوانی بیانچەمێنینەوەو ئەژنۆیان بنووشتێنینەوە بۆ ئەوەی بەناو کیسەکانەوە بچن. کیسەکان جێگای یەك هەیکەلی ئاساییان تێدا دەبووەوە. دەبوایە بازوو و قاچیان ئەوەندە پاڵ بدەین تا وەکوو شووشە دەشکان: تراق!

دەبوایە دیسان پاڵ بدەین تا جێگایەکی تریان دەشکێ بۆ ئەوەی بتوانین دەستەکانیان بخەینە سەر سینەیان. سەربازێکی ئەمریکی کورتە بالاَ لەوێ بوو، بە خۆی و بە هاوڕێکەی زۆر بەپەلە کارەکەیان ئەنجام دەدا. بە داردەست توند لە شوێنە بەستووەکانی تەرمەکەی دەدا، یان بەیەك دەست توند پێیەکی پاڵ دەداو برادەرەکەشی توند گوریس پێچی دەکرد. خێرا خێرا کارەکەی ئەنجام دەداو لەسەر تەرمێکەوە دەچووە سەر تەرمێکی ترو بە زۆریش دەم و چاوی نزیك بە چاوی بێ گیانی مردووەکە بوو و هەمیشە ئەم گۆرانییەی لەبەر خۆیەوە دووبارە دەکردەوە: (مۆنالیزا، مۆنالیزا، کاتێ کە زەردەخەنەم بۆ دەکەی، مۆنالیزا، خۆشم دەوێی!)

من بێدەنگ بووم، کە گوێم دابووە قسەکانی لە دڵی خۆمدا دەمگوت فرانسوا مەبەستی لە گێڕانەوەی ئەم چیرۆکە چییە؟ خەریکە مێشکم بۆ چ شتێ ئامادە دەکا؟ چونکە هیچ جارێ ئەم جۆرە چیرۆکەی، هەر تەنیا بۆ دڵخۆشی من نەدەگێڕایەوە؟ کە باسی ئەم شتانەی دەکرد، هەمیشە بۆ ئەوەی بوو ئینسان بۆ رووداوێ یان دەنگ و باسێك ئامادەبکا، هەموو جاریش بارودۆخێکی وا دەهاتە پێش کە ئینسان هەستی دەکرد راستی بۆ چووە و بەراستی ویستوویەتی شتێکمان نیشان بدا.

<u>شەو</u>

چوومە سەفارەت بۆ ئەوەی نانی ئێوارە لە کەشێکی میهرەبان و خۆییدا لەگەڵ (وینچزۆ تورنتا)ی سەفیری گەورەمان بخۆم. (تورنتا) دەزانێ چۆن هاوڕێیەکی واقیعی بێ. ماڵەکەی بەهەشتێکە لەناو دۆزەخ. بەلاَم دێڕەکانی ئەم شیعرە: ((مۆنالیزا، مۆنالیزا ...)) هێشتا هەر لەسەرمدا ماوە. ئایا (فرانسوا) مەبەستی لە

گێڕانەوەی ئەم رووداوە ئەوەبوو کە مرۆڤ لە جەنگ دا هەستی مرۆڤ دۆستی خۆی لەدەست دەدا؟

باوەڕناکەم، چونکە سەرەڕای ئەم هەموو شتانەی دیومن و ئێستاش دەیانبینم، هێشا هەر بڕوام بە مرۆڤ هەیە، دەمەوێ بڕوام بە مرۆڤ هەبێ. ئەویش بڕوای بە مرۆڤ هەیە بەڵام نازانم بۆچی بە پێچەوانەی بیروباوەڕی خۆی، دەیەوێ من نائومێدو هەناسە سارد بکا.

ئێستا خەریکم جانتاکەم ئامادە دەکەم. کوڕە گەورەکەی (تورنتا) بلووزە خورییە سەوزەکەی خۆی بەدەستیاو دامێ و گوتی:

– بە خوێنی نەکەی ها، باشە!

بلووزێکی ئەستوور و سەوزە. لە (هوئە) دونیا ساردە.

(٢٦) ی شوبات

یەك رۆژی رەبەق لە فرۆکەخانەی (تان سون نوت) چاوەڕێم کرد. لە حەفتی بەیانییەوە تا حەفتی ئێوارە لەوێ بووم ، هەر جوێنم دەدا. پاشان ناچاربووم گەڕامەوە شارو دوسبەی بەیانی دووبارە چوومەوە فرۆکەخانە تا دوای نیوەڕۆ چاوەڕێم کرد، ئەوەبوو رایانگەیاند فرۆکەی بار (کارگۆ) دەچێتە دانانگ). (کاترین) یش هەر بەم فرۆکەیە لە (هوئە) هاتبووەوە ئێرە.

لە پشتەوەی لۆرییەك دیم: پیس، شەکەت، پەڕپووت. دەستی بۆ هەڵتەکاندم و گوتی:

– ویاربە، دەچێتە جێگایەکی خۆش و رازاوە!

دەوری نیوەشەو بوو گەیشتمە (دانانگ). لەوێ خەبەریان دامێ ئەو کاتەی کە من لە فرۆکەخانەی (تان سون نوت) بووم و بێ هودە کاتی خۆم بە چاوەڕوانی بە فیڕۆ دەدا، ئاخر شەڕی (هوئە) رووی داوەو داستانەکە تەواوبووە.

دوا نەفەرەکانی ڤێتنامی باکووری بە نۆینی ژێر کۆشکی دەسەڵاتداریێتی دا رایان کردبوو و تەنیا ڤیت کۆنگی گیان لەسەر دەست لە (هوئە) مابوونەوە، تەقەیان دەکرد.

جەنگ لە کاتی هەدەر و خەیاڵاتی پڕو پووچ و رق و قینیش دروست دەبێ.





دووسبەی دەتوانم بچمە (فوبی) ئەویش بە فرۆکەیەك کە بەرێکەوت دەستم کەوتووە.

ئومێدێکی بێ هوودەم هەیە کە پێش نیوەڕۆ بگەمە شارو پێش ئەوەی شەو دابێ بگەڕێمەوە (فوبی)و راپۆرتەکەم لەو کاتەی کە دەمەویست رەوانە بکەم. بەڵام تەنیا یەك لۆری هەبوو دەبوایە سەعات (دە) بەرێ بکەوێ کەچی سەعات دووی نیوەڕۆ هێشتا بەرێ نەکەوتبوو.

تانکەکان لە لایەك و لۆرییەکان لە لایەك بوون. سەربازەکان بێرەو بەوێدا بڵاوببوونەوە و ئەفسەرەکانیش دیارنەبوون. باران دەباری. بارانێکی وردو توند! وەکوو تەم یان زریان وابوو، پاشان دایکردە رێژنە باران ورێگا ئەوەندە پڕ ئاو بوو تا ئەژنۆ کەوتینە ناو ئاو. جێب خێرا بە تەنیشتماندا تێدەپەڕین، شڵپ!! سەراپای لەشیان دەکردین بە قوڕو چڵپاو، لیتراو وەکوو لافاو بە لەشمان دەکەوت. ئەم لافاوە سەراپای لەشی قوڕاوی کردبووین و تەنانەت چووبووە ناو دەمیشمان.

لەپڕ زۆر تووڕە بووم. پشتم لە هەموو شت و هەموو کەس کردو بە لەرزە لەرز، بەپێ گەڕامەوە (فوبی)

لە (فوبی) چاوم بەو سەربازە کەوت و بینیم، بە دوودڵی هەنگاوی بۆ پێشەوە دەنا. سەربازێکی تر بە میهرەبانی رێی پێشان دەدا بەڵام ئەودیسان هەر دڵنیا نەبوو، دەستی چەپی لەناو دەستی یاوەرەکەی بوو و دەستی راستی بۆ پێشەوە درێژکردبوو نەوەك خۆی بە شتێ دا بدا. پێست رەش بوو. تەمەنی لە دەوری بیست ساڵیدابوو.

کوڕێکی قۆز بوو، دەم و چاوی ساخ و بێ برین بوو، پەڕۆشی لە چاوی نەبەستبوو، تەنیا چاویلکەیەکی رەشی لەچاو کردبوو. سەربازەکان بە نیگای غەمبارەوە خۆیان لێ لادەدا.، هەندێکیان رادەوەستان بۆ ئەوەی باشتر تەماشای بکەن. کۆلۆنێلیکی ریش سپی بە سیمایەکی سەنگین وەستا:

– سەرباز، ناوت چییە؟

– (سانفۆرد کالینز)، گەورەم!

– چاوت نەختێ دەبینێ؟

– نەخێر گەورەم، هەر هیچ نابینم.

– لە کوێ وات لێ هات؟

– لە (هوئە)، گەورەم!

کۆلۆنێلەکە دەستی لەسەر کڵاوەکەی داناو سەلامێکی سەربازی وەرگرت و گوتی:

– سەرباز، تۆ مایەی شانازی وڵاتەکەتی. من لە باتی وڵاتەکەم سوپاست دەکەم، سەرباز!

– سوپاست دەکەم، جەناب!

ئینجا سواری فڕۆکەیەك بوو کە یەکەو راست دەچووە (دانانگ).

منیش بۆم کرا سواری هەر ئەو فڕۆکەیە ببم. لەناو فڕۆکە هەموو سەربازەکان یارمەتیان دا بۆ ئەوەی لەسەر کورسی دابنیشێ. پشتێنەکەیان بۆ بەست و چەتری رزگارییان بۆ توند کرد. یەکێکیان (بنێشت)ی پێشکەش کرد بەڵام ئەو زۆر بە ئەدەبەوە رەتی کردەوە. ئای چەند سەنگین و نەفسبەرز و فەرمانبەردار دیاربوو! بە چ نەفسبەرزییەك سەری بۆ لای روناکی دەبرد، بە چ سەنگینییەك دەستی لەسەر چۆکی دانابوو و ناو لەپی دەستی دەدایە لای روناکی وەکوو ئەوەی بە دوای روناکیدا بگەڕێ.

ئەوەندە بە هەڵس و کەوتەکانی کاری لێ دەکردی، زاتت نەدەکرد پرسیاری لێ بکەی.

ئەو خۆی سەری قسانی کردەوە. کە فڕۆکەکە لەسەر زەوی هەستا، رووی کردە من و گوتی:

– تۆ ژنی؟

– بەڵێ!

– تکایە، وەرە نزیکتر.

لێی نزیکتر کەوتمەوە. دەستی لە جلی سەربازیم دا، ئینجا لە دەم و چاوم و پاشانیش بە نەرمی دەستی بە لووت و چاوو قژم دا هێنا.





– ئۆی! بەڵێ تۆ ژنی، قژت درێژە، کردووتە بە دوو کەزی و هەر کەزییەکت بە قردێلەیەك بەستووە. جلی سەربازیشت هەمووی لە قوڕو خۆڵ هەڵاتووە. ئەوە تۆ لەم دۆزەخە چ دەکەی؟

– من لێرە کار دەکەم، (سانفۆرد)، دەنووسم. حەز دەکەم چیرۆکی تۆش بنووسمەوە. حەز دەکەی بۆم باس بکەی؟

– ئۆ، بەڵێ! بێ گومان.

دەنگی ساف و خۆش بوو. خەڵکی (ئالا باما) بوو. سێ مانگ بوو لەگەڵ هێزی دەریایی هاتبووە ڤێتنام و دوای جەژنی ڤێتنامییەکان، یەکسەر ناردبوویانە (هوئە) بۆ ئەوەی لەوێ بجەنگێ. ماوەی بیست رۆژ لە (هوئە) جەنگابوو. یەکەم جار لە لای باشوورجەنگی بوو، پاشان چووبووە باکوور، لەوێ، دەوری سەعات دووی بەیانی ئەم رووداوەی بەسەر هات.

– سانفۆرد، ئەم رووداوە چۆن چۆنی بوو؟

– خەریك بوو خەو دەیبردمەوە، لە شەوقێك بەخەبەر هاتم. یەکەم جار شەوقێکم دی و ئینجا گوێم لە دەنگی تەقینەوەیەکی قایم بوو، بەڵام شەوقەکە لە دەنگەکە بەهێزتر بوو. وەکوو ئەوە وا بوو سەر لەبەری شەوق و روناکی رۆژیان خستبێتە سەر من. ئەو شەوقە ئاخر شت بوو دیم و هەر ئەو شەوقەش بوو کوێری کردم. بێ گومان ئەو کاتە هەستم نەکرد کە کوێر بوویم، شەو بوو، وامدەزانی تاریکییەکە تاریکی شەوە. کە سپێدەی داو هەموو گوتیان سپێدەی داوە، هەستم کرد هیچ روناکی سپێدە نابینم.

منیان بە ئوتومبێلی فریاگوزاری بردە نزیکترین دێ کە لە تەنیشت تۆپخانە بوو. دختۆر گوتی: ((من هیچم لە دەست نایە، تۆڕی چاوت سووتاوە، لێرە درێژ بە)) ئەو کاتە پێیان نەکرا بمهێننە شار چونکە هیلیکۆپتەرەکان بەردەوام خەریکی تەقەکردن و بۆمبا باران بوون.

– ئەی ئێستا (سانفۆرد)؟

– چەند رۆژێك لە نەخۆشخانەی (دانانگ) دەمێنمەوە و پاشان دەگەڕێمەوە شارەکەی خۆم. جاران لە چاپخانە کارم دەکرد، بەڵام ئێستا دەبێ کارێکی تر بۆ

خۆم بدۆزمەوە. کارێکی وابێ بۆ بابایەکی کوێری وەکوو من دەست بدا. بەڵام هەوڵ دەدەم ئەم بەسەرهاتە لە خۆم گەورە نەکەم، دەزانی! کە بیر لە هاوڕێ مردووەکانم دەکەمەوە، لە دڵی خۆمدا دەڵێم: (سانفۆرد، تۆ بەختت هەبوو، چونکە ئیتر جەنگ بۆ تۆ تەواو بوو!)

– سانفۆر، لە شارەکەی خۆتا، کێ چاوەڕێت دەکا؟

– تەنیا داپیرەم. باوکم، لە جەنگی دووەمی جیهانی، لە ئۆقیانووسی ئارام، کوژرا، دایکیشم لە شروێ باوکم، دوای دوو مانگ دیقی کردو مرد. پاش مردنی باوکم دەمی لە خواردن نەدا، ئیتر ئەوەبوو مرد. تەنیا داپیرەم ماوە بەڵام زۆر پیرە، تاقەتی ئیش کردنی نەماوە، تێ دەگەی؟

– بەڵێ، سانفۆرد، بە راستی تۆ کوڕێکی ئازای؟

– نەخێر، من مرۆیەکی ئاساییم. دەزانم ئەگەر کوێریش بم، هێشتا ژیان هەر جوانە. لە (هوئە)، کاتێ کە دختۆر گوتی: ((من هیچم لە دەست نایە، تۆڕی چاوت سووتاوە.)) تەنانەت نەشگریام.

برادەرە یاوەرەکەی هاتە ناو قسەکانمان و گوتی:

– ئاخ، ئێوە باش نایناسن. لە کاتی جەنگا هەوڵی دەدا سوود بەخش بێ، تەنانەت منداڵەکانی تری هان دەدا بۆ ئەوەی ورەیان نەڕووخێ. من لە ژیانما هەرگیز کوڕی وام نەدیوە. مرۆڤێکی زۆر بەرزە!

ئەمە کوڕێکی قژ زەردبوو، ناوی (دونیس مەجسکی)بوو.

– دونیس، دەمەوێ تا نەخۆشخانە لەگەڵتان بێم، دەتوانم؟

– ئاە، بەڵێ، بێ گومان دەتوانی، وانییە سانفۆرد؟

ئەفسەرێك لە فرۆکەخانەی (دانانگ) چاوەڕێی دەکردین. ئەویش وەکوو کۆلۆنێلەکە دەستی لەسەر کلاوەکەی داناو گوتارێکی کورتی داو گوتی کارە پاڵەوانانەکەی سانفۆرد وەکوو ئەوە وایە کە هەموو هێزی دەریایی ئەمریکا ئەم کارەی ئەنجام دابێ. بە راستی جێگای سەربەرزی وڵاتەکەمانەو ...

ئینجا ئێمەی سواری لۆرییەکی بچووک کرد و بە گاڵتەوە گوتی:

– ئۆی (کالینز)، هێشتا هیچ نەبووە، پەیامنێر دەورەیان داوی؟ پیرۆزباییت لێ





دەکەم.

بەڵام (کالینز) کپ و بێ دەنگ بوو، دەتگوت لە بیرو غایلەیەکی وا دایە ئێمە لێی بێ خەبەرین.

بە درێژایی ئەو ماوەیە، تەنیا یەك جار دەمی کردەوەو گوتی:

– دونیا هەتاوە؟

– بەڵێ، سانفۆرد، باران لێی کردۆتەوەو هەتاوێکی خۆشە!

–هەتاوێکی خۆشە ؟

– بەڵێ ، سانۆرد ، هەتاوێکی خۆشە .

– لەسەر پێڵووی چاوەکانم هەست بە گەرمایی خۆر دەکەم.

– بەڵێ، سانفۆرد.

– ئای تاریکی چەند ناخۆشە!

لە نەخۆشخانە، بردمانە بەشی چاو. هەرچەندە (مەجسکی) دەستی گرتبوو بەڵام تا گەیشتینە لای دختۆر دووجار لەتری بردو هەر وەخت بوو بەربێتەوە. ئینجا دختۆر (بارنت) بردییە ژوورەکەی خۆی بۆ ئەوەی فەحسی بکا .

من و(مەجسکی) لە داڵانی نەخۆشخانەکە دەستمان بە پیاسە کرد.

– خانم، بەدبەختییەکی چەند گەورەیە؟!

– بەڵێ، (مەجسکی)!

– من ناتوانم لێرە چاوەڕێ بکەم. دەچم قاوەیەك دەخۆمەوە. تۆش نافەرمووی؟

– نەخێر، (مەجسکی) تۆ بڕۆ، من نایەم.

ئەو هێشتا دوورنەکەوتبووەوە کە دختۆر هاتە داڵانەکەو گوتی:

– کوا (مەجسکی)؟

– دختۆر، چوو قاوەیەك بخواتەوە.

– ئەی تۆ کێی؟ خزمی نەخۆشەکەی یان هاوڕێی؟

– نەخێر، پەیامنێرم. لە (فوبی) تووشی (کالینز) بووم، بەدووی دا هاتم بۆ ئەوەی شتێکی لەسەر بنووسم.

دختۆر زەردەخەنەیەکی سەیری کردو گوتی:

– باشە، وابزانم خراپ نییە گوێتان لە کۆتایی چیرۆکەکەش بێ؟

– چۆن؟

– کۆتاییەکی خۆشی هەیە. جاروبار ئەم جۆرە چیرۆکانەمان لێ دەقەومێ! وەرە، وا چاکە کۆتاییەکەی بزانی، بۆ ورەشتان باشە.

– تێ ناگەم ...

– هەر ئێستا لە هەموو شتێ دەگەی. فەرموو تۆ وەرە دانیشە. چوومە نووسینگەی دختۆر (بارنت)، (سانفۆر کالینز)م بینی لەسەر لاتەختێك دانیشتبوو، تووڕە دیاربوو، بنێشتی دەجوی.

دختۆر (بارنت) بەرامبەر (کالینز) دانیشت و پەنجە گەورەو دۆڵە درێژەی بڵند کردو گوتی:

– دەی (کالینز) ئازابە، بە پەیامنێرەکەمان نیشان بدە کە چەند بەباشی دەزانی بژمێری. چەند پەنجە دەبینی؟

– زۆر باشە دختۆر، دوو پەنجە.

– کامە پەنجە دەبینی، (کالینز)؟

– پەنجەی گەورەو دۆڵە درێژە!

– ئەی ئێستا؟

دختۆر (بارنت) هەموو پەنجەکانی کردەوە.

– زۆر باشە دختۆر، پێنج پەنجە دەبینم. تۆ دەستی خۆت هەموو کردۆتەوە.

– مەرج دەکەم تۆ دەزانی تا بیستیش بژمێری، وانییە (کالینز)؟

– بۆچی تا بیست دختۆر؟

– چونکە تا بیست دەقیقەی تر، هیلیکۆپتەرێك دەگاتە ئێرەو بەو هیلیکۆپتەرە رەوانەی (فوبی) ت دەکەمەوە و لە (فوبی)ش بۆ (هوئە)، چونکە لە (هوئە) زۆر پێویستیان بە پیاوی وەکوو تۆ هەیە کە چاوت چاك دەبینێ بۆ ئەوەی گوللە بە ڤیت کۆنگەکانەوە بنێی. تێ دەگەی چ دەڵێم؟

(کالینز) هیچ وەڵامی نەدایەوە. تەنیا بە توندی بنێشتەکەی تف کردە لای دیوارو چاویلکە رەشەکەی لە چاو کردەوەو بە رووقایمی تەماشای منی کرد.





ئێستا دەبێ بە تەنیا بگەڕێمەوە (هوئە). لەو کاتەوە کە سانفۆر بەبیری هێنامەوە پیاو شتی بێزەوەرن، خۆم زۆر بە تەنیا دەبینم.

(٢٧)ی شوبات

ماوەی نێوان (فوبی) و (هوئە) پازدە کیلۆمەترە. جادەکەی راست و قیرتاوەو بەناو مەرەزەو زنجی حەسیرو گۆڕستانی کۆن دا دەڕوا کە پشتیان داوەتە گردو کێو.

ڤیت کۆنگ خۆیان لە چیاو گردو گۆڕستان و زنج و شینایییەکان شاردۆتەوەو لە بۆسەدان. هەر شتێ بە جادەدا بڕوا تەقەی لێ دەکەن و ئەگەر تەقە نەکەن، مینیان داناوەتەوە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، تەنیا ئەو رێگایە هەیە لە (فوبی) دەچێتە (هوئە) و بە پێچەوانەش، ئەویش بەرەنگاربوونەوەی مردنە. تەنیا لۆری سەربازی لەم رێگایە هات و چۆ دەکەن. لۆرییەکان دەبێ رۆژێ سێ جار ئەم رێگایە بڕن. بەڵام لەبەر ئەوەی بۆی هەیە دووبارە مین لە جادە دابنێنەوە، رۆیشتنی لۆرییەکان کاتێکی دیاری کراوی نییە. وا رێك دەکەوێ کە پێنج شەش سەعات چاوەڕێ دەکەین تا بەرێ دەکەوین. وەکوو ئەوەی دوێنێ رووی داو هەروەسا ئەمڕۆش.

لە سەعات دەوە لێرەین، ئێستایش سەعات یەکی دوای نیوەڕۆیە. دونیا ساردە. دەشتێکی سوورکان لە ژێر ئاسمانێکی بۆرو تووڕەدا دەکەوێتە بەرچاو. نە بنەدارێك و نە پنچکە گیایەك!!

دە لۆری سەربازی و چوار عەررادە تۆپ و لۆرییەکی بەنزین هەڵگرو چەند جێبێك بەریز وەستاون و چاوەڕوانی فەرمانی بەرێ کەوتن دەکەن. وا دیارە لە کیلۆمەتری هەشتەمدا، مینێکیان داناوەتەوە.

ئاخیری فەرمانی بەرێ کەوتن درا، بەڵام رێ پێشاندەری کاروانەکە، دیار نەبوو. ئاخیری هات. شکڵی منداڵێکی گەورەو خەپەی موو زەردی دەم و چاو وەك سێوی هەبوو. قوتوویەکی گۆشت مریشکی بە دەستەوە بوو، گوتی دەمەوێ بیکەمەوە. چەقۆکەمم دایە، گوتی چەقۆ بە کەڵك نایە. بە کلیلی قووتووشکاندن باشتر دەکرێتەوە. بە چەقۆکەم قوتووەکەم بۆ شکاند، بیریشم هەر لای چرای سەوزی بەرێ کەوتن بوو کە نیوسەعات زیاتر بە داگیرساوی نامێنێتەوەو وەختەکە خەریك

بوو دەڕۆیشت. گوتی مریشك ئاوایە بە بەستەڵەکی ناخورێ، کێ نەختێ کحوولی پێیە ئاگری پێ بکەینەوە؟ سەردەستەکە کحوولی پێ بوو، بە سەرنجێکی پڕ سووکایەتی دایە.

— ئەفسەر، چرای سەوزی بەرێ کەوتن داگیرساوە.

— دەزانم. پێویست ناکا پێم بڵێن، خۆم دەیبینم، تێ گەیشتی؟

منیش بە لانی کەمەوە مافی خواردنم هەیە، تێ گەیشتی؟ راپۆرتەکەت بۆ رەت دەکەمەوە، تێ گەیشتی؟

— زۆر باشە، ئەفسەری بەڕێز!

کحوولەکەی لە قوتوویەك کردو دایگیرساند و قوتووە مریشکەکەی لەسەر ئاگرەکە راگرت.

گەرم کردنەوەی خواردنەکە دە دەقیقەی خایاند، بەڵام کە دە دەقیقە تێپەڕی، ئەفسەرەکە گوتی مریشکەکە زیاد کوڵاوەو دەبێ دە دەقیقەی تر بوەستێ تا سارد دەبێتەوە. کە مریشکەکە نەختێ ساردبووەوە، ئەفسەرەکە دەستی بە خواردن کرد. ئەوەندە لەسەرەخۆ دەیخوارد، من ئەو بیرەم بە مێشکدا هات کە کابرا دەترسێ و بەدوای بەهانەدا دەگەڕێ بۆ ئەوەی بەرێ نەکەوین. دە دەقیقە، بیست دەقیقە، بیست و پێنج دەقیقە تێپەڕی و هەموو چاویان بڕیبووە دەمی ئەفسەرەکە، کە لەسەرەخۆ خواردنەکەی دەجوی و دەیخوارد.

ئاخیری ئەفسەرەکە، قووتی بەتاڵی فڕێ داو بە شێنەیی دەمی پاك کردەوەو گوتی: — چرای سەوز هەر پێیە؟

— بەڵێ جەنابی ئەفسەر.

— ئاه!

نائومێد دیار بوو. ئاخێکی هەڵکێشا، منگەمنگێکی کرد، سواری جێبەکە بوو. ڤیت کۆنگەکان لە گۆڕینی جێی مینەکان زۆر زیرەکن. گەڕامەوە لای لۆرییەکەم، سواربووم و خۆزگەم دەخواست ئەگەرمینێکیان لەسەر جادە دانابێتەوە، (کون) بە سەری بکەوێ و بتەقێتەوە.

لۆرییەکەی من لە دوای لۆری بەنزین هەڵگر دەڕۆیشت، ئەوانی ترم نەدەدی،





تەنیا ئەو سەربازەم دەدی کە داهاتبووە سەر رەشاشەکەی و لەگەڵ شەش سەربازی تری تفەنگ بەدەست و دوو تەلەفۆنچی کە هەمیشە لەگەڵ نەفەرەکانی تری دەستەکە لە پەیوەندی دابوون و لەگەڵ سەربازێکی هێزی دەریایی کە بەلەمەکەی لەلای سەرووی رووبارەکە لەنگەری گرتبوو. ئەم سەربازە ناوی (جانی) بوو. تەمەنی بیست و پێنج ساڵ بوو، دەم و چاوی پڕ زیبکەبوو، دوو گلێنە چاوی هەبوو ترسێکی گەورەیان لێ دەدرەوشایەوە..

— خانم، ئەوە تۆ چۆن دەتوانی ئاوها هێمن و ئارام بی؟

— بە!

— تۆ نابێ ئەوەندە هێمن بی. نیوسەعات تێپەڕیوە.

— بە!

— نازانم بۆچی نیو سەعاتی پێ چوو ئینجا بەرێ کەوتین!

— همم!

یەکەم جار هێمن و ئارام بوو، پاشان وەکوو ئەوەی ئاگری لە جێگایەك بەربووبێ، لە جێگا خۆی دەرپەڕی.

— همم!

ئەو کوڕە لە حاڵەتێك دابوو، لێم خۆش نەدەهات، تەنانەت ئەگەر کپ و بێ دەنگیش بوایە. لەوانەیە بەهۆی زیپکەکانی بێ: زل و سوور و ئاوساو! ئەگەر بێ دەنگ بوایە، رەنگە بمتوانیایە بەرگەی بگرم، بەڵام کاتێ زۆرەوی دەکرد، نەء.. بە تایبەتی ئێستا کە لە ترسناکترین شوێن دا بە خێراییەکی سەرسوڕهێنەر دەڕۆیشتین و هەستمان دەکرد ڤیت کۆنگەکان خەریکن تەماشامان دەکەن و تفەنگیان لەسەر پێیە. مەرەزەو گۆڕستانەکان کش و مات بوون و زنجەکان چۆڵ! تەنانەت یەك منداڵ چییە لە پشت پەنجەرەوە دیار نەبوو. ئەو فلیمانەت دەهاتەوە بیر کە پارتیزانەکان بەبێ جووڵەو بە بێ دەنگی خۆیان لە شوێنێ دەشاردەوە و کە لۆری ئەڵمانی دەهاتن، یەکەم رێژنەی گوللە بێدەنگییەکەی دەشکاند.

— دەزانی، ئەگەر جادەی رۆژهەڵاتیان لە مین پاك بکردایەوە، لەوانەیە ئەو رووداوەی بەسەر (هاری) هاوڕێم هات، رووی نەدایە. (هاری) پێش سێ رۆژ لە

نیوەی ڕێگای (هوئە)، بەسەر مینێك دا كەوت و تەقییەوە...

– جانی، بێ دەنگ بە!

– بێ دەنگ بم؟ چۆن دەتوانم بێ دەنگ بم، ئەی نابینی ئێمە لەكوێین؟ ڕاستەوخۆ لە دوای لۆری بەنزین هەڵگرین. نازانم لە قسەكەم دەگەی، یان نا؟ یەك گوللە بە تانكی بەنزین بكەوێ!! ... بۆی هەیە ئەوانی دی بە سەلامەتی لە مۆڵەكە دەربچن، بەڵام ئێمە بەبێ شك دەمرین.

– جانی، بێ دەنگ بە!

لۆری دەڕۆیشت و دوو سەربازە تەلەفۆنچییەكە قسەیان دەكرد و بەدەم قسەكردنیشەوە بە نیگەرانی و ناڕەحەتی سەیری ئەم لاو لایان دەكرد و جانی بێ دەنگ نەدەبوو.

– چاوەڕێی چ دەكەن! من لە تەقینەوە تۆقیوم. مامەم بە تەقینەوەی لۆكسی غاز مرد. من هەر ترسی ئەوەمە كە بەدەردی ئەو بچم. دەزانی ئەو بەلەمەی لەسەر رووبار وەستاوەو دەبێ بچم سواری بم، پڕ تەقەمەنییە؟

من ئەمەم نەدەزانی و نەشمدەویست بیزانم. بەهەر حاڵ بۆ من هیچ جیاوازی نەبوو. چونكە بەبێ چیرۆكی مامەیش و بەبێ چیرۆكی بەلەمەكەیشی، من ترسم لێ نیشتبوو. ئەم جادە ترسناكە هەر نەدەبڕایەوەو ئەم لۆرییە نەفرەتییەش بەو جادەدا دەڕۆیشت كە تا دەهات چۆڵتر و ترسناكتر دەبوو. ئەگەر بێ و ڤیت كۆنگ تەقەمان لێ بكەن، خۆزگە دەخوازم هەر هیچ نەبێ تەقە لە لۆری بەنزین نەكەن.

ئەویش خەریكە هەر وا قسە دەكا، لەپڕ حەوسەڵەم نەما:

– ئۆە! دە دەمت بگرە!

بەڵام تەنانەت بەم قسەیەی منیش هەر بێ دەنگ نەبوو.

– ئوە! خانم، شتێ هەیە ئایا دەیزانی؟ تۆ ژنێكی میهرەبانیت. نەخێر، بەراستی میهرەبان نیت. بەڵام تۆ باش بیری لێ بكەوە. ئەمەش بوو بە شێوەی قسەكردن لەگەڵ خەڵك؟ خۆ من هیچ قسەی خراپم لەگەڵ نەكردووی، تەنیا ئەوەندەبوو گوتم بەلەمەكەم پڕ تەقەمەنییەو ئەوانە ئێمەیان خستۆتە دوای لۆری بەنزین، من هەوەسم بەم ئیشەی ئەوان نایە ...





تا گەیشتینە (هوئە) من هەر ناڕەحەت بووم. بەسەر كەستەكاندا دەخزین و بە هەندێ شوێن دا دەڕۆیشتین كە ڕێگا نەبوو. لۆرییەكە لە لای دەستە راستی ڕێگا وەستاو (جانی) خۆی هەڵدایە خوارێ.

– باشە، ئاخیری ئەوە گەیشتینەجێ.

تۆ ئێستاش لێم تووڕەی؟

– نا، نا. خواحافیز (جانی)!

– خۆت دەزانی، ئەگەر بزانم ئێستاش لەمن عاجزی و بەم حاڵەوە جێت بێڵم، ناڕەحەت دەبم. ڕەنگە بێزارم كردبیت، ڕەنگە ...

– (جانی)، خواحافیز. دەبێ بڕۆم، داوای بوردن دەكەم.

– خواحافیز، سوپاست دەكەم.

(جانی) چووە لای بەلەمێك و سواری بوو و بەلەمەكە بە هێمنی و ئارامی لەسەر رووبارەكە كەوتە جووڵەو چوو لە بەلەمێكی تر نزیك كەوتەوە كە لە تەنیشت چەند درەختێكی ئەو بەری رووبارەكە وەستابوو.(جانی) دەستی بە نیشانەی ماڵاوایی هەڵتەكاند و سواری ئەویكەیان بوو و لەبەرچاو بزربوو.

گەڕامەوە لای پردەكە، خەریك بووم هەناسەیەكی ئاسوودەم هەڵدەكێشا، دەق لەو كاتەدا تەقینەوەیەكی گەورە زراوی ڕژاندین و وەكوو لێشاوێكی نهێنی بە زەوی داداین و جلی سەربازی لەبەر دادڕین و گوێمان هەر وەخت بوو لەبەر ئەو دەنگە بتەقێ.

– ئەوە چ قەوما؟

– كەس وەڵامی نەدامەوە. هەموو رایاندەكرد

– بەلەم، بەلەم، بەلەم!!

تەماشای رووبارەكەم كرد بەلەمەكەم لە شوێنی خۆی نەبینی: هەمووی ببوو بە دووكەڵ. چڕە دووكەڵێكی ڕەش جێگای گرتبووەوە، بەرەو ئاسمان بەرزدەبووەوە، شكڵی كوارگێكی بەخۆیەوە گرتبوو.

– ڤیت كۆنگەكان یەك گوللەیان بە بەلەمەوە ناوو تەقاندیانەوە.

كە ئاوەكە هێوربووەوە، تەنانەت یەك تەختە داریشی بەسەرەوە دیار نەبوو.

(با) ئاگرەکەی گەیاندبووە درەختەکان و هەستمان بە بۆنی غازی تەقینەوەکە دەکرد. غاز دەچووە ناو لووت و گوێمان و تووشی حاڵەتی خنکان ببووین.

– غاز! غاز!

سەربازێك رووبەندێکی بۆ لای من هاویشت و ئەفسەرێك هاواری کرد.:

– بەلەمەکە پازدە نەفەری تێدا بووە.

پازدە، ئەوەی پازدەمین تازە سواربببوو ناوی (جانی) بوو. دەم و چاوی بە زیپکەبوو و هەڵس وکەوتی تەحەمول نەدەکرا، هەمیشە لەو جۆرە مردنە دەترسا کە تووشی هات. منیش لە باتی ئەوەی دڵی بدەمەوە، بە خراپی لەگەڵی جووڵامەوە.

بەڵام (مۆنالیزا)، ئێستا ئیتر وەختمان نییە بگرین.

رووبەندەکەم بە سەر دەم و چاوم دا هەڵدەکێشم و کە گەیشتمە لای پردەکە لێی دەکەمەوە بۆ ئەوەی پاشماوەی (هوئە) ببینم.

شەو

هیچ شتێ نەماوە. رووبارەکە تەنیا شتی شکاوو وردو خاشی بەسەرەوەیە. ئەو پردەی دەچووە شار لەلای دەستە راست رۆچووبوو، وەکوو کەشتی ببووە دوو پارچە. ئەوانەی مابوون، پردێکی بچووکیان بە پەت و دار حەیزەران دروست کردبوو بۆ پەڕینەوە لە کەنارێکەوە بۆ کەنارەکەی تر. ئەم پردە بچووکە هەمیشە دەجووڵایەوە چونکە بە هیچ جێگایەك نەبەسرابووەوە. ئەوانەی مابوون، زۆر بە وریایی، یەواش یەواش سانتیمەتر بە سانتیمەتر بەسەری دا دەڕۆیشتن و دەپەڕینەوە.

ئەوانە هەریەکە شتێکی بە دەستەوەبوو: یەك لێفە، یەك پایسکل، یەك منداڵ و لەترسی بەربوونەوە دوعایان دەکرد زووتر بڕۆن لەبەر ئەوەی چاوەڕوانی خەم وکەسەرێکی زۆر گران بوو.

ئاخیری نۆرەی من هات. دەستم بە پەتەکانەوە گرت تا گەیشتمە لای باکووری رووبارەکە و بەو دیمەنەی لەوێ دیم، یەکسەر هەموو پەرستگا خۆش و جوانە وێرانبووەکان و موزەخانە جوانە پارچە پارچە بووەکانم لەبیر چووەوە.





گۆڕ هەڵکەن دەهاتن و دەچوون، هەریەکە کیسەیەکی پلاستیکی پڕ پارچە جەستەی ئینسانی بە کۆڵەوەبوو. سەرباز، تەرمی پارچە پارچەیان لە دوو خۆیان رادەکێشا.

چەند گردێك لە تەرمی کوژراوان هەڵنرابوو، لە ناخۆشترین شێوەدا بوون: یەکێ بە دانیشتوویی، یەکێ لە حاڵەتی خۆفڕێدان دابوو. ئەمە شارێکی مردوو نییە، رسواییە. رسوایی!!

ژنێك هات، جانتایەك و بێڵێکی پێ بوو. تەمەنی نزیك بیست ساڵ دەبوو. جوان و خشکۆك! قژی لەبن کڵاوی بە قەیتانێك هۆنیبووەوە. یەکەوراست چووە لای قۆپەنە خۆڵێك. جانتاکەی لەسەر زەوی داناو دەستی بە بێڵ لێدان کرد. بۆ ماوەی دە دەقیقە زەوی هەڵکۆڵی. ئەو شتەی بە دوایدا دەگەڕا زۆرقووڵ نەبوو. کە دۆزییەوە، بێڵەکەی فڕێ داو چۆکی دادا. تەماشای کرد. شتەکەی بینی بەڵام دەم و چاوی نەگۆڕا. بەهێدی بە پەنجە خۆڵی سەر دەم و چاوی پاك کردەوە و پاشان بە دەسماڵێك شتەکەی راکێشاو بڵندی کرد. ئینجا جانتاکەی کردەوەو شتەکەی لەناو جانتاکە نا. شتەکە گەورەبوو، وەکوو ئەوە وابوو بە جانتاکەوە نەچێ، بەرگری دەکرد وەکوو ئەوە وابوو کە هێشتا زیندوو بێ. ئیشەکە بۆ ژنێکی ئاوها ناسك مەیلەو لە توانا بەدەربوو. ئاخیری بە تەقەلایەکی زۆر و بە هێنکە هێنك تەواوی کردو ئینجا قەیتانی سەری کردەوەو جانتاکەی پێ بەست. بێڵەکەی هەڵگرت و لەگەڵ خۆی برد، لە کاتێك دا کە بۆن بۆگەنییەکی زۆر ناخۆش دەهات. من پشتم بە پارچە ئاسنێك داو دەستم بە ڕشانەوە کرد تا ئەوەبوو گوێم لە دەنگێك بوو:

– خانم، ئەوە سەرو دڵت تێکچووە، دەتوانم شتێکت بۆ بکەم؟

قەشەیەکی فرەنسی بوو. دەم و چاوی میهرەبان و رەنگی پەڕیبوو، کراسی دڕابوو.

– سوپاس باوکە، ئێستا باشترم!

– تازە هاتوویتە ئێرە؟

– بەڵێ، باوکە!

– بە تەنیا؟

– بەڵێ.

– خانم، بە گوێی من دەکەی لێرە زیاتر ناڕۆی!

– بۆچی؟

– بەبێ پاسەوان و بەم جلە سەربازییە، خەتەرە. ڤیت کۆنگی تفەنگ بە دەست حەز لە جلی سەربازیی ئەمریکی ناکەن. جلی ترتان لەگەڵ خۆتان نەهێناوە؟

– تەنیا بلووزێکم هێناوە، ئەویش سەوزە.

– هەر چۆن بێ لە کراسی بۆری مەیلەو سەوز باشترە. ئەویان لەبەرکە

منیش بە گوێ ڕایەڵی بلووزەکەم لەبەر کرد.

– باشە، چاك هات. ئێستا کەمتر لە سەرباز دەکەیت. هەرچی بێ من وام پێ باشە لەگەڵتا بێم.

– بۆ نا؟ فرەنسی لە هەموو کەس زیاتر شارەزای ڤێتنامن.

بەم جۆرە، من و قەشە بەناو کەستەکی لێك هەڵوەشاوەو پارچە ئاسنی تێك قۆپاو ئەو تەرمانەی تا ماوەیەکی تر پێیان سەخڵەتو ناڕەحەت نابن، دەڕۆیشتین. ئەمانە هەموو لەیەك دەکەن، سەد بێ یان هەزار، جیاوازی نییەو (مردنی کاتی جەنگ لەگەڵ مردنی کاتی ئاشتی بەراورد ناکرێ).

(فرانسوا)، راستە، ئەم چیرۆکەی کلاوخوودە ...

– باوکە، ژمارەیان چەندە؟

– پێنج هەزار، هەشت هەزار، کەس نازانێ. بێ گومان ئەمە ئەگەر ئەمریکی و ڤیت کۆنگەکان بەسەر یەکەوە حیساب بکەین.

بەهەر حاڵ، زەحمەتە بزانین ئاخۆ ئەمریکی کوشتاری زیاتریان داوە، بەم هەموو تۆپ و رەشاشەوە، یا ڤیت کۆنگەکان بەم هەموو چەکە قورسەیانەوە؟

لە رۆژانی ئاخرو ئۆخری شەڕەکە، هەموو شێت و هار ببوون: جگە لە کوشتارو تۆڵەکردنەوەی کوشتن بیریان لە هیچی دی نەدەکردەوە، هەموو لە هەموو بەرشك بوون. لیستێکیان بە ناوی بەرشکەکان کردبوو و بەرامبەر بە هەر ناوێك و زەربێکیان لێدابوو کە نیشانەی یەك تاوان بوو. ئەگەر دوو زەربیان لێ بدایە کابرا





مەحکووم دەبوو. هەندێ جار وا رێك دەکەوت تەنیا یەك کەس مەحکووم نەدەبوو، بەڵکو هەموو ئەندامانی خانەوادەیەك مەحکووم دەبوون: لەو حاڵەتەدا، ڤیت کۆنگەکان نیشانەی سووریان لە ماڵی ئەو کەسانە دەداو شەو دەچوون هەموو ئەندامانی خێزانەکەیان قەتڵ و عام دەکرد.

حوکمی ئەم کوشتنانە هەمووی بە شەو جێ بە جێ دەکرا. ڤێتنامییەکان ئیتر نە وەختی ئەوەیان هەبوو ناڕەزایی بەرامبەر بەم کارە دەربڕن و نە ئارەزووشیان لێ بوو.

ئێمە ئێستا وا لە گەڕەکی (بە دا ئوو) ین. نەوەدو پێنج مرۆی کوژراوی دەست بەستە لەناو قۆرتێك کەوتوونەتە سەریەك. ئەوانە لەبەر ئەوە کوژراون چونکە فەرمانی (تەقەکردن لە هیلیکۆپتەری ئەمریکی) یان رەت کردبووەوە و جێ بە جێیان نەکردبوو. هەر دەڵێی ئێمە لە (موتوزن)، یان (داخائوو)، یان لە (ئارد ئاتین) داین.

– (فرانسوا)، نە دونیا دەگۆڕێ و نە خەڵك، جا رەنگی پێستە، یان رەنگی ئالآیان هەرچی هەبێ.

ئێستا قەشە بڕوای وایە کە هێزی دەوڵەت ئەوانەی ناچارکردووە ئەم کوشتارە بکەن.

دوای (ئازادی)، دەوری دوو سەد ڤیت کۆنگی بەرشك، بەبێ هیچ جۆرە دادگایی کردن، یان تاوانێك، بە دەستی ڤێتنامی باشووریەکان کوژران. یەك گوللەو تەواو!!

قەتڵ و عامەکە ئەو کاتە دەستی پێ کرد کە هێزی دەریایی، کۆشکی دەسەڵاتداریتی داگیرکرد. ئەو دوو سەد نەفەرە تەنیا تەرمەکانیان دۆزرایەوە. ئەمانە زۆربەیان قوتابی یان مامۆستا یان راهیب بوون. رۆشنبیر و پیاوە ئاینییەکانی (هوئە) هەرگیزخۆشەویستی خۆیان بەرامبەر بەرەی ئازادی میللی نەدەشاردەوە.

– خانم، پێم بڵێ بزانم، ئێوە کە لە لایەکی تری دونیا دەژین، پێتیان وایە خەڵکی ئەولا بیر لەم شتانە دەکەنەوە کە لێرە روودەدا.

– گومانم نییە باوکە.

— ئایا ئاگاداری نین؟

— نەخێر ئاگاداری ئەم شتانە نین.

— بەڵێ، ئیتر ئاوهایە، کە خۆمان لە خۆشیدا بین، زەحمەتە بە خەیاڵماندا بێ خەڵکی تر لە بەدبەختیدان. هەر بەم جۆرەش کە خۆمان کلۆڵ و بەدبەخت بین، زەحمەتە بە خەیاڵماندا بێ خەڵکی تر بتوانن لە خۆشیدابن.

کە بیر بکەینەوە ئێستا لە پاریس ...

— ئێستا لە پاریس سەعات چەندە؟

— (٩)ی بەیانییە، باوکە. لێرەش پێنجی دوای نیوەڕۆیە.

— (٩)ی بەیانی ... منداڵ خەریکن دەچنە قوتابخانە. فەرمانبەر دەچنە فەرمانگەکانیان، کۆڵانەکانی پاریس پڕ پاس و ئوتومبێلی تایبەتین و لە کەنیسەیەکی زۆر رێك و جوان، دابی ناشتنی تەرمی کابرایەك دەکرێ کە لە خەودا مردووە و تەمەنی نەوەد ساڵ بووە، ئایا شتی وا دەبێ؟

— بەڵێ، باوکە!

— لە نەخۆشخانەیەکی پڕ کەرەستە، نەشتەرگەرێك خەریکی نەجات دانی ژیانی نەخۆشێکە کە دوای عەمەلیاتەکە لەناو نوێن پاڵ دەکەوێ، دختۆر و نەخۆشەوان بە دەوری دا دەخولێنەوەو بە دەزگای سەیرو سەمەرە ئیش دەکەن، بە مێشکی ئەلکترۆنی، ئەم هەموو دام و دەزگایەش بۆ یەك نەفەرە .

ئایا شتی وا دەبێ؟

— بەڵێ، باوکە!

— یەك پارچە گەچی ساپیتەی ئۆپێرا خەریکە بەردەبێتەوە، یەك تاقمە تەکنیککار و بیناساز و کرێکار دەچن بۆ ئەوەی سەیری بکەن و خەریکی چاك کردنەوەی دەبن. یارمەتی لە باشترین بیناسازی فرەنسیش وەردەگرن و ...

ئایا شتی وا دەبێ؟

— بەڵێ!

— بەڵام ئایا راگرتنی پارچە گەچێك بۆ ئەوەی بەرنەبێتەوە، یان نەجات دانی ژیانی نەخۆشێك کە دەبێ تا ماوە لەناو جێگا بکەوێ، بە کەڵك چ دێ، لە کاتێکا





کە رێ دەدەن سەر لە بەری شارێك بە تەواوی کاول ببێ و یەك جیل قەتڵ و عام بکرێ؟

ئینسان شێتە، خانم، شێت!

لەو کاتەدا، گەیشتینە شوێنێکی قەوغە و پڕ هات وچۆ، دەوری بیست تەرمی بێجامە لەبەر لە تەنیشت یەك ریز کرابوون. ئەمانە ئەمریکین؟ یان ڤێتنامی باشووری؟ هیچ گومانی تێدا نییە بە شەو ئەمانەیان غافڵگیر کردووە و هیچ نەشتەرگەرێ، هیچ نەخۆشەوانێ و هیچ مێشکێکی ئەلکترۆنی نەهاتۆتە فریایان. لەش و جلیان هەمووی خوێنی وشکەوەبووە.

گۆڕ هەڵکەنێ رووبەندێکی دژە غازی لە دەم و چاوی کردبوو. یەك یەك تەرمەکانی لە چەرچەفێکی پلاستیکی دەپێچاو ئینجا لە گۆزینگەوە تا گەردەن بە گوریس دەیبەست و دەیکرد بە بەستەیەکی تەواو. گۆڕ هەڵکەنێکی تر لەو ماوەیەداخەریك بوو قۆرتێکی لێ دەدا. هەردووکیان زۆر بە خێرایی ئیشی خۆیان دەکرد.

هەر زوو قۆرتەکە ئامادەبوو و گوریس پێچ کردنی تەرمەکانیش تەواو بوو.

ئینجا گۆڕ هەڵکەنی یەکەم بانگی گۆڕ هەڵکەنی دووەمی کرد: دەستیان پێ کرد بە دوو قۆڵی سەرو بنی بەستەیەکیان دەگرت و نەختێ بەلای راست و نەختێ بەلای چەپدا دەیانهەژاندنەوە و ئینجا (ترپ!) فڕێیان دەدایە ناو قۆرتەکە. چەند منداڵێکی پێنج شەش ساڵی لەوێ بوون ، تەماشایان دەکردن. لەسەر تەپۆلکە خۆڵێك وەستابوون و لەبەر بۆن بۆگەنی دەستیان بە لووتیانەوە گرتبوو. پێدەکەنین و یاریان دەکردو لەگەڵ جووڵانەوەی هەر بەستەیەك، بە کۆمەڵ هاواریان دەکرد: ((یەك، دوو، ترپ! یەك، دوو، ترپ!)) و لەگەڵ دەنگی نزمی بەربوونەوەی تەرمەکان دەستیان لەسەر لووتیان لا دەبردو بە شادومانی چەپڵەیان لێ دەدا. چاوم بە دوای سەرنجی قەشەدا گێڕا. دەم و چاوی رەنگ پەڕیوی لە بارێکی غەمبار و لێبوردەیی دابوو.

— خانم، ئەمانە تەنیا ئەوەندە رابواردنەیان هەیە. مردوو بازیچەی منداڵانن. بازیچەی منداڵان و کاڵای فرۆتەنی من! حەز دەکەم (مۆنالیزا)، کاتێ کە تۆ

زەردەخەنەت دەکەوێتە سەر لێو، مۆنالیزا ...  وێنەت بگرم. ئایا بە (دیافراگم) (٨) و (١٢٥) وێنەکەم باش دەردەچیٚ؟ یان بە (٥) و (٦) و (٦٠) باشترە بە فیلمی (تریکس) لەسەر پلە (٢٥) تەرازووی بکەم. (مۆنالیزا، کاتیٚ کە تۆ... )

حەز دەکەم یەکیٚ لەم مندالأنە گەورە بکەم. حەز دەکەم ئیشێکی وا بکەم لەو رسوایی و شەرمەزارییەی هەستی پیٚ دەکەم، بحەسێمەوە. هەست بە شوورەیی و شەرمەزاری دەکەم کە بەشداری جەنگێکی مرۆڤایەتی ئاوهام کردووە.

دێتەوە بیرم چەند شادو خۆشحالٚ بووم کە مرۆڤ توانی بچێتە سەر مانگ! بەلأم چوونە سەر مانگ بە کەڵك چ دیٚ، لە کاتێکا کە ئێمە لەسەر زەوی ئەو ئیشانە دەکەین کە من ئەمڕۆ لە (هوئە) بە چاوی خۆم بینیم؟ سەدان و هەزاران سالٚ تێپەڕیوە تا وای لێهاتووە  دوورترو بڵندتر بفڕین، کەچی هێشتا هەر ئەو حەیوانە کلۆڵەین کە ناتوانیٚ تەنانەت ئاگرێك بکاتەوە یان پێچکەیەك بێنێتە بەر چاوی خۆی..

ئەم هەموو ئامادەکارییە بۆ چوونە سەر مانگ، بە فیڕۆچوو، بۆچی؟ چ دەبوو ئەگەر کەمیٚ لەو هۆش و ئامادەکارییەمان لە پێناوی نەکوشتنی یەکترو کاول نەکردنی شارەکانمان بەکاربهێنایە؟

ئیلیزابێتا، دەتەویٚ بزانیٚ ژیان چییە؟ ئێستا من ئەم پرسیارە لە خۆم دەکەم: ئایا ژیان ئەو شتانە نییە، کە ئێستا وا تەماشایان دەکەم؟ مەبەستم مردنە!

لەگەلٚ ئەمەشدا، (لە وان مین) چی بۆ (تویت لان) نووسیوە؟

((ئەگەر لە نەجەنگابام پیاو نەبووم، دەمامەوە یەك لەشی لەرزۆرك و هیچی تر. ئیتر هیچ نازانم. هەست دەکەم زۆر تەنیاو غافڵگیرم!))

حەزم دەکرد (فرانسوا) لێرە بایەو یارمەتی بدابام. ترسێکی کت و پڕ دایگرتم، ترسی مردن نا، ترسی ژیان!.

<u>(٢٨) ی شوبات</u>

بلووزە سەوزەکە زۆر بە کەڵکم نەهات. لە دوورەوە ڕەنگی جلی سەربازی هەیە.

ڤیت کۆنگێك چاوەڕێی کرد تا کەوتمە بەر مەودای گوللەی و ئینجا تەقەی لێکردم. گوللەیەك بەسەر سەرم دا تێپەڕی و یەکێکی تر بە قۆڵی بلووزم کەوت.





خۆم بەسەر زەوی دادا. لەو کاتەدا یەکیٚ بە تووڕەیی هاواری کردو گوتی:

– ئێوە وا دەزانن لە کوێن؟ لەناو باخی شارن؟ ئینجا بوو بە ڕێژنەی گوللە.

سەربازی هێزی دەریایی ژمارەیان زۆر بوو، کەچی ڤیت کۆنگەکە یەك تاکە کەس بوو. ئێستا ئەوەتا لەسەر زگ کەوتۆتە سەر زەوی و تیرێژێك خوێنی لە لووت دیٚ.

پێی خواسی لەناو دەلینگی پانتۆلی دیارە. کزەبایەکی هێمن قژی نەرمی بلأو دەکاتەوە. مالابرا! ئەمشەو دەبوایە لەم دووەمان یەکیٚ بمرین، یان من، یان تۆ؟ تیرو پشك لە تۆ کەوتەوە. ئەگەر منیش مردبام هەر بێدادی بوو. بەلاٚ م تۆ بۆچی؟

هاوڕیٚ ڤێتنامییە باکورییەکەت لە بیرەوەرییەکانی دا نووسیویەتی: ((چ یاسایەکی نهێنی وجوود و بە زیندوویی مانی پیاو دیاری دەکات؟)) من ئەگەر سەرم چوار سانتیمەتر لەولا تر بوایە، ئێستا مردبووم. ئایا دەشیٚ ئەمە هەمووی ڕێکەوت و چارەنووس بیٚ؟

ئەم پرسیارەو زۆر پرسیاری تریشم لەبەردەم قیت بۆتەوە. ئەو سەربازەی هێزی دەریایی کیٚ بوو ژیانی منی نەجات داو خۆیشی نەجاتی بوو؟ خەڵکی کوێیە؟ بۆچی ئەمشەو دەق لەسەر ئەم چوارڕیانەی چارەنووسی ئێمە وەستابوو؟

ئەگەر ئەو لەویٚ نەبوایە، ئێستا من لەباتی تۆ مردبووم. ئایا خۆم بە قەرزاری بزانم؟ ها؟ بیٚ گومان دەبیٚ سوپاسی بکەم کە تۆی کوشتووە. ئایا پێویست دەکا سوپاسی بکەم؟ ئاخر کوشتن پیشەی خۆیەتی و ئەویش جگە لە جیٚ بە جیٚ کردنی ئەرکی خۆی هیچی تری نەکردووە. بەلأم کیٚ پیاو ناچار دەکا پیشەی سەربازی هەڵبژێریٚ؟

ئەو سەربازەی هێزی دەریایی ئێستا وا لە تەنیشتمە. لەسەر زەوی باخی دەسەلأتدارێتی دانیشتووین و شەو خەریکە نزیك دەبێتەوە. شاری کاول و وێران لە ژێر پێمانەوە دیارە، بەلأم کۆشکی دەسەلأتدارێتی ئەوەندە زەرەری پیٚ نەگەیشتووە. ڤێتنامییە باکورییەکان لەویٚ کشانەوە بۆ ئەوەی کۆشکەکە کاول نەبیٚ. دەشیٚ ئەویش بە ماوەیەکی کەم وەکوو گەچەکەی ئۆپێرای پارس کە خەریکە بەردەبێتەوە، نووژەن بکرێتەوەو دووبارە جیهانگەڕ رووی تیٚ بکەن و

دەلیلێك بە زمانی ئینگلیزی و فرەنسی و ئەڵمانی قسەیان بۆ بکا: ((ئەمە تەختی دەسەڵاتدارێتی ئیمپراتۆر (هام نگی) یە کە تا ساڵی ١٨٨٥ فرمانڕەوایی کرد. ئەمە ئەو ژوورەیە کە لە سەردەمی شەڕی ١٩٦٨ ، سەربازانی (هانۆی) خۆیان تێدا شاردبووەوە. کاتێ کە ئەمریکییەکان دزەیان کردە ناو ئەم باخە، باخ پڕ فیداکارو خۆگۆریکەر بوو، شەڕەکەیان چەند رۆژێك لەم باخەدا بەردەوام بوو.)) جیهانگەڕێك بەدەم باوێشك دانەوە دەق لەو شوێنەی ئێستا من وەستاوم، دەوەستێ: بێگومان بەردەکان پاك و چاك کراونەتەوە و قەوانە فیشەك و لەفافی برین پێچان و پەڵە خوێن و ئۆردوگای ئەمریکییە شەکەتەکان هەڵگیراوە.

سەربازەکە قاوەی بۆ لە قوتوویەکی بەتاڵ کردم و ئاوی پاڵێوراوی لەسەر کردو پێشکەشی کردم. ئاوی پاڵێوراو؟ تا ئێستا دەوری شەست نەخۆشی چاو قووڵکە (تاعوون) لە (هوئە) کەوتۆتە بەرچاو.

– بە شەکر، یان بێ شەکر؟

ناوی (تینك)ە. ئەفسەر (تینك).

دەم و چاوی وەکوو هی پێست سوورەکانە و نازانم ئیتر چ سیمایەکی تری ئەوانی بە دەم و چاوییەوە دیارە: گۆنای ئێسکن و لووتی بچووك و چاوی رۆژهەڵاتیانەیە. پاشان بۆی باس کردم کە باوکی یەکێ بووە لە پێست سوورەکانی (ئەکلاهما) و دایکیشی خەڵکی فلیپینە. بەر لە سی و چوار ساڵ هاتۆتە دونیا. دایك و باوکی حەزیان دەکرد ببێ بە مامۆستا بەڵام ئەو لە باتی ئەوەی ببێ بە مامۆستا، بوو بە سەربازی هێزی دەریایی.

– ئەفسەر، زۆر جار پرسیار لە خۆم دەکەم: ئایا چ شتێ وا لە پیاو دەکا پیشەی سەربازی هەڵبژێرێ؟

– ئەم هەستە بە زۆری لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا سەرهەڵدەدا. فلیمی جەنگیی (جان وین)!! ئایا دەتوانی مەزەندە بکەی چەند گەنج بە هۆی فلیمی جەنگیی (جان وین) لەناو چووین؟

– بەڵێ، بەڵام ئەگەر نەشکوژرێن، دیسان لەم کارەدا هەر بەردەوام دەبن.

– چونکە بێ هێزو بێ زاخن، چونکە حەز دەکەن پیاوەتی خۆیان بسەلمێنن،





چونکە وا دەزانن بە تفەنگێك دەبنە پیاو. چونکە لە سوپادا پێویست ناکا خۆیان بڕیار وەربگرن، لە سوپادا هەمیشە یەکێ هەیە بڕیاریان لە باتی دەدا، تەنیا ئەوەندە بەسە بە قسەی بکەین: لە خواردنەوە بگرە تا جل و بەرگ، لەو قەرەوێڵەی لەسەری دەخەوین تا ئەو رێگایەی دەبێ بیبڕین. بە هەر حاڵ ئاسوودەترە.

– لەبەر ئەوەیە تۆ بووی بە سەربازی هێزی دەریایی؟

– مەسەلەی من لەوە سادەترە. دەق وەکوو  چۆن ئەومێرد منداڵە حەڤدە ساڵەیەی (جان وین) دەبینێ دەچێ دەبێتە عەسکەروخۆی لە ئۆردوگادا دەبینێتەوە و هەمیشە سەر دەستەیەك بەدکاری لەگەڵ دەکا: سەری بە نمرە سفر دەتاشن، جلی تایبەتی خۆی لەبەر دادەکەنن، رەوانەی بن دووشێکی دەکەن بۆ ئەوەی  لە هەموو جۆرە بیرێك رووت بێتەوە و بە پاکی لەبن دووشەکە بێتە دەرەوە. تەنانەت لە خەونەکانیشی پاك بێتەوە، خەونی ئەوە کە ئەو خۆی کەسێکی سەربەخۆیە. پاشان دەست پێ دەکەن فێری دەکەن کە ئەویش کەسێکە، بەڵام چ کەسێك؟ پیاوێکی خاوەن ناوو خێزان؟ نەء، بەڵکو سەربازێکە خاوەن ژمارەیەك و دڵێکی پڕ غەم. غەمی سزادان و تەمبێ کردن، یان غەمی سەرنەکەوتن. ئینجا پاش سێ حەفتە هەست دەکا سەکەوتوو بووە، هەست بە بووغراییەك دەکات و هەست دەکا سەربازیی شتێکی زۆر چاکە! لەو کاتەشدا، ئەوان خەریکن دڵۆپ دڵۆپ شیلەی دەردەهێنن: وەکوو دەرزییکی ژێر پێستە. نیشتمانپەروەریتان پتەو دەکەن و لەناو ئاڵایەکتان دەپێچن و رێبازێکتان پێ دەدەن تا ئەو رێبازەتان تیا نەلەقێ، ئێوە پیاو نین، ئێوە سەربازێکی هێزی دەریایین.

بەش بە حاڵی منیش دەقاو دەق ئاوهابوو. من دەق وەکوو ڤیت کۆنگێ تاقی کردنەوەیەکی وام بینی.

– ئێوە ئەو کاتە هەستتان پێ نەدەکرد؟

– بەدی، هەستم پێ دەکرد، تەنانەت بڕیاریشم دا ئەگەر لە جەنگی کووریا بە سەلامەتی دەربچم، بە جلی تایبەتی خۆم بگەڕێمەوە. بەڵام پاشان کتێبی (توغیانی کین) م خوێندەوە. ئەم کتێبە منی راکێشا.

ئێوە دادگایی کردنی فەرمانـدەتان لەبیرە، کاتێ کە لە بەرامبەر دەستەی سەربازی وەستابوو و ئەوانیش ورەو هەڵس و کەوتیان هەڵدەسەنگاند، پاشان پێیان گوت کە پیاوێکی بێ توانایە؟ لە بیرتە؟

باشە، کاتێ کە دادگا تەواوبوو، ئەوەی تاوانباری کردبوو، سلاّوی وەرگرت و شتێکی گوت. گوتی:

– راستە ئەمە پیاوێکی بێ توانایە، بەلاّم ئەو کاتەی ئێمە ناچاربووین لەگەڵ هیتلەر بجەنگین، سەربازەکانمان ئەم ئینسانە بێ توانایانە بوون"

منیش لە دڵی  خۆمدا گوتم: (راستە، منیش وەکوو ئەو بێ توانایانە وام، تەنانەت ئەگەر خۆیشم بێ توانا نەبم ، جا کێ گوتوویەتی سەرباز دەبێ هەر بێ توانا بێ؟ دەبێ بۆیان بسەلمێنم کە سەرباز هەموویان بێ توانا نین، سەلماندیشم.)

– ئەفسەر، چۆن سەلماندت؟

– بە وەلاّمدانەوەی ئێوەی ئازادیخواز: کە بۆچی پیاوی ئاقڵ دەبێ ژیانی سەربازی هەڵبژێرێ؟ بە ژیانی پڕ سووکایەتی کردنی ئێوە، بە تایبەتی لە کاتی ئاشتی. لە ماوەی نێوان هەردوو جەنگی کووریا و ڤێتنام، لە کاتی ئاشتی، کەس ئاوڕی لە من نەدەدایەوە و بە هیچی نەدەزانیم و کەس نەیدەگوت: (تینك تۆ چ کارەی؟)

نزیکەی هەزار جار هاتە سەرم خۆم بە دەستەوە بدەم.

– خۆت بە دەستەوە نەدا؟

– ئەوەندەی نەمابوو خۆم بە دەستەوە بدەم. لە زۆر شت نائومێد بووم. وا نەزانی من هەوەسم بە (ئەمریکی کرێت) دێ؟

– دەڵێن ئەمڕۆ (ئەمریکی کرێت) لە (هوئە) زۆرە. ئەمانە دوو دوکانی دەست لێ نەدراویان شکاندبوو و هەموو کەل و پەلەکەیان دزی بوو: کامێرا، سەعات، تەسجیل. پەیامنێرێکی تەلەفزیۆن دیمەنی ئەم دزییەی ئەوانی گرتبوو.

– دەزانم، هەر ئەم شتانەشە کە زیاتر وام لێ دەکا خۆم بە دەستەوە بدەم، بەلاّم دەزانم ئەگەر خۆم بە دەستەوە بدەم، هەست دەکەم وەکوو قەشەیەکی لادراو وام.





بەلاّم من وام پێ باشە هەر بە قەشەیی بمێنمەوە تەنانەت ئەگەر ئیمانیشم نەبێ دابی دوعا و نوێژ بۆ ئەو کەسانە بەجێ دێنم کە ئیمانیان هەیە.

– ئەفسەر، تۆ خەریك بوو بڵێی بڕوات وایە کە بناغەی سەرەکی جەنگ شتێکی گەلۆرانەو نا دادپەروەرانەیە؟

– وا چاکە بڵێین گاڵتەجاڕییە، بەلاّم لە ئینسانێتی گاڵتەجاڕتر نییە.

کە باش بیری لێ دەکەینەوە دەبینین ئینسانیش حەیوانێکی گاڵتەجاڕە. لەگەڵ ئەوەی کە هۆشی هەیە، بەلاّم هەموو شتێ بە شێوەیەکی دڕندانە لەناو دەبات. دەچێتە سەر مانگ، بەلاّم لە ڤێتنامیش دەجەنگێ. بەلاّم لەگەڵ هەموو ئەمەشدا ...

– لەگەڵ هەموو ئەمەشدا، چی؟

– مەسەلەکە هەمیشە هەر وابووە. ئایا سەردەمی رێنیسانس (ژیانەوە)، سەردەمی دڕندەیی نەبووە؟ ئەی قڕاڵی رۆم؟ ئەی ساڵە زێڕینەکانی یۆنان؟ پێکەنینم دێ کە گوێم لێ دەبێ ماوتسی تونگ دەڵێ: ((جەنگ، بە جەنگ نەبێ لەناو ناچێ، ئەوەی حەز لە چەکیش ناکا، ناچارە هەڵیبگرێ)) چونکە بە جۆرێ ئەم قسەیە دەکا وەکوو ئەوەی خۆی شتێکی تازەی دۆزیبێتەوە. هەزاران ساڵە بەشەر ئەم قسەیە دووبارە دەکاتەوە و بە بیانووی ئەوەی گوایە دەیەوێ جەنگ ریشەکێش بکا، گرنگترین سەردەمی شارستانێتی خۆی خەڵتانی خوێن دەکا.

– ئەم قسەیە بەڵگەیەکی باش نییە بۆ بەردەوام بوونی جەنگ.

– هەقی تۆیە. بە تیۆری، وانییە. بەلاّم بە کردەوە تۆ قسەیەکی گەمژەلاّنە دەکەی. وەکوو ئەوە وایە کاتێ کە بمانەوێ لە خەیاڵی خۆماندا، بە روو کردنە مردن لەناو جەنگ، جەنگ لەناو بەرین. بە پێچەوانەشەوە، تا زیاتر کوژراو لە جەنگدا ببینین، زیاتر هەوەسمان دەکەوێتە سەر جەنگ. ئەمەش یەکێکە لە نهێنییەکانی رۆحی مرۆڤ. ئەگەر لەگەڵما نیت، فەرموو پێم بڵێ: کاتێ لە ولاّتێکا ئەوەی دزی بکا دەستی دەبڕن، بۆچی لەو ولاّتەدا ژمارەی دز لە هەموو شوێنێکی دی زیاترە؟ مەسەلەکە هەمیشە هەر وابووە، بەشەر ناگۆڕێ.

– منیش دوێنێ کە (ئارد ئاتین) و (موتوزن) و (داخائوو)م بینی لە دڵی خۆمدا وام گوت:

بەشەر حەیوانە. بەلاّم حەز دەکەم ئەم رایەم راست نەبیّ، لەوانەیە لە راستیدا، راستیش نەبیّ. نابیّ چاومان لەوەبیّ کە بەشەر تا ئاقلّتر ببیّ، باشتر دەبیّ. نەخێر، ئاقلّ بوون، باشتر بوون نییە. چونکە ئاقلّی بیّ رەحمی لەناو نابا، بگرە وا بزانم زیاتریشی دەکا. ئاقلّی و بیّ رەحمی وەکوو دوو سەرجەمی سارد و گەرمی پاتری وان: کە یەکیّ زیاد ببیّ، ئەوەی تر کەم دەکا: لە لایەکەوە شتی چاك دروست دەکەن و لە لایەکی ترەوە ئەو شتە چاکانە تێك دەدەن. ئەو شتانەش تا چاکتربن، زیاتر تێکیان دەدەن.

ئێستا شەوەو تەقە دەستی پیّ کردۆتەوە. من کە گوێم لە دەنگی هەر گوللەیەك دەبیّ، وەکوو ئەوەی زەنگە سوورە پێیەوە دابم، ئاوا لە جێی خۆم دەردەپەڕم، بەلاّم ئەم، هێمن و ئارامە، یاری بە ئەلەتریکەکەی دەکا و لەبەر روناکییەکەی سەیری ئەم لاو ئەولا دەکا: وەکوو ئەوەی بە دوای قەرەنتوویەك دا بگەڕیّ.

– ئەفسەر، لەوانەیە هەقی ئێوە بیّ.

– من لەوە دەترسم هەقی من نەبیّ. ئایا وات دەزانی من تا ئێستا بیرم لەم مەسەلانە نەکردۆتەوە؟ من چەند ساڵێکی دوور و درێژ هەر بیرم لەم شتانە دەکردەوەو سەری خۆم بەم بیرو لێکدانەوانە دەیەشاند، تەنانەت زۆر لەگوین بوو ئاخیری بکەومە شێتخانەش. بەلاّم ئێستا ئیتر وەرس بوویم و چیتر بیری لیّ ناکەمەوە، بە کەڵك چ دیّ! بە راستی، ئەم بیرکردنەوەیە بە کەڵك چ دیّ! هەر بۆ ئەوەی ببین بە جێی رەزامەندی ئێوەی ئازادیخواز؟ من ئەم ویژدانە زیندووەی ئێوە دەناسم و هەوەسم پیّ نایە. ئەو کاتەی کە لە رۆما یان لە نیۆیۆرك بین، زۆر ئاسانە ستایشی ڤیت کۆنگەکان بکەین، کاتیّ لەبەر مەودای گوللەیان نەبین، ئاسانە بەزەییمان پێدا بێنەوە، ئەوەش ئاسانە کە وەکووپەیامنێر بێینە ئێرە.

راستە ئێوەش کەوتنە بەر گوللە، وەکوو پێش دەقیقەیەك، ئێوەش گیانی خۆتان خستە مەترسی، بەلاّم ...

– بەلاّم؟ چی؟

– باشە، من ئەم رستەیەم لە شوێنێك خوێندۆتەوە: ((کاتیّ کە بە پلیتی دووسەرە دێینە ئێرە شتێکەو کە بە پلیتی یەك سەرەش دێین شتێکی ترە، وەکوو





من. تۆ کە لەناو جەنگدای، ئەمە رێت پیّ نادا ستاشی ئەوان بکەی و سووکایەتی بە ئێمە بکەی. چونکە کاتیّ، وەکوو ئەمڕۆ، کە بە سەلامەتی لە جەنگ دەرچووی، قەرزاری ئێمەی بیّ توانایت، ئێمەی (کرێت) و ئێمە کە شەڕە گوللە بۆ ئێوە دەکەین: بۆ نەجاتدانی ژیان و ویژدانی زیندووی ئێوە.

– بە راست بۆ کارەکەی ئەمڕۆتان، سوپاسم نەکردن، وانییە؟

– من بۆیەم وا نەگوت تا تۆ سوپاسم بکەی. گوتم ئەم رووداوە بۆ ئێوە شتێکی سادەو ساکارە. ئەوەی ویستی بتانکوژیّ، خۆی کوژرا، بەلاّم بە دەستی ئێوە نا. ئێمە بووین کە کوشتمان، خۆشیان بیّ و ترشیان بیّ.

رووناکی ئەلەکتریکەکەی خستە سەر ڤیت کۆنگەکە!

– ئەمانە، ئەم گەلۆرانە، هێشتا هەڵیان نەگرتووە. کوڕە وەرن ئەم (چارلی)یە لێرە هەڵگرن و ببیەن. دوو سەرباز رایان کرد و (چارلی) یان برد. (چارلی) ناوی خوازراوی ڤیت کۆنگەکانە. لەبەر ئەوەی دوو تیپی یەکەمی وشەی ڤیت کۆنگ (ڤی) و (سی) یە لە ئەلف و بیّ دا ، سوپای ئەمریکی لەباتی ئەوەی بڵێن (ڤی) و (سی) دەڵێن ڤیکتۆر و چارلی.

ئەم سەربازەش ناوی ڤیت کۆنگەکەی هەر وابرد. بەلاّم لەگەڵ هەموو ئەمەشدا، ئەگەر رۆژیّ بیّ و پلیتی گەڕانەوەم بەکار بێنم، قەرزاری ئەم سەربازەم، خودایا! حوکمی چاکی و خراپی شتێکی چەند زەحمەتە. ئایا من غەڵەت بووم کە تەنیا بۆ (لە وان مین) و (تویت لان) گریام؟ وابزانم بە هاتنە ئێرە گەیشتوومەتە بن بەست. ئەوەتا (تینك) بڕوای وایە کە ئێرە هەر هیچ نییە، دەڵیّ تۆ بڕۆ (خەسان) ببینە!

خەسان

<u>یەکی مارس</u>

شوێنەکە ناوی (خەسان)ە. کەوتۆتە قەراخ ناوچەی سنووری لاوس و ئەمڕۆ خەتەرترین داوی ڤێتنامی لیّ دانراوەتەوە.

شەش هەزار سەربازی هێزی دەریایی لەویّ ئابلّووقە دراون و وەکوو ئەوە وایە زیندانی کرابن و چل هەزار ڤێتنامی باکووری، ئەوە ماوەی چل و پێنج رۆژە ئابلّووقەیان داون و بەردەوام خەریکن گوللە بارانیان دەکەن، دەق وەکوو

رووداوەکەی (داکتۆ) وایە. گۆڕاییەکە بە تەپۆلکە دەورە درابوو، ئەمریکییەکان لەناو گۆڕاییەکە بوون و ڤێتنامییە باکوورییەکان لەسەر تەپۆلکەکان بوون.

بەلاّم لێرە بە پێچەوانەوەیە. لە (داکتۆ) ئەمریکی هێرشیان دەکرد، کەچی لە (خەسان) زات ناکەن لەناو سەنگەرەکانیان بێنە دەرەوە: لە سەنگەر هاتنە دەرەروەو گوللە پیێ نەکەوتن، وەکوو چوونە ناو ئاوو تەڕ نەبوون وایە. ئازووقە و تەقەمەنیان تەنیا  بە ڕێی ئاسمانییەوە پیێ دەگا. کە پریاسکەکان سووك بن، ئیشەکە ئاسانترە. پریاسکەکان بە چەتری ڕزگاری فڕیێ دەدەنە سەر گۆڕاییەکەو شەو، هەندیێ خۆگۆڕیکەر، دەچن کۆیان دەکەنەوە، بەلاّم کە شتەکان قورس بن، وەکوو شیشە ئاسن، کە بۆ سەنگەربەندی بەکاری دێنن، ئەوسا کارەکە بە زەحمەت دەکەویێ. فڕۆکەکە، کە بە زۆری (سی ۱۳۰) یە، بیێ ئەوەی مەکینەکەی بکوژێنێتەوە، دەنیشیێ و کە بەسەر زەویدا دەڕوا دەریچەی بنەوەی فڕۆکەکە دەبێتەوە. لەو کاتەی کە بەسەر زەویدا دەڕوا تا ئەو کاتەی دووبارە هەلێ دەفڕیێ، شیشە ئاسنە بچووکەکان بە گۆڕاییەکەدا وەر دەبن و زۆر بە دەگمەن وا ڕێك دەکەویێ، فڕۆکەی (سی ۱۳۰) بۆ ماوەی یەك دەقیقە دەوەستیێ و لە ماوەی ئەم دەقیقەیەدا لەسەدا بیست و پێنج بۆی هەیە بە هاوەنی ڤیت کۆنگەکان بتەقێتەوە.

گۆڕاییەکە، دەق وەکوو گۆڕستانی فڕۆکە و هیلیکۆپتەری لیێ هاتووە. هەندێکیان لە کاتی نیشتن دەپێکرێن و هەندێکیان لە کاتی هەڵفڕین. تەنانەت هیچ حەشارگەیەکیشیان نییە: ئەوەی بتوانیێ بە سەلامەتی دەرباز ببیێ قەرزاری ڕێکەوت  و خۆشبەختییە.

ئەودەورییانەی، کە بە تەنیشت سەنگەرەکان دا تێدەپەڕن، چوونیان هەر ئەو چوونە، هاتنەوەیان نییە. پێش دوو حەفتە، دوو دانە فڕۆکە تووشی ئەم بەلاّیە هاتن. یەکەمیان سی (۳۰) سەربازی هەڵگرتبوو: بیست و چوار نەفەریان بە ماوەی دە دەقیقە کوژران و پاشان شەش نەفەرەکەی تریشیان قەتلێ و عام کرد.

بەهەر حالێ، بۆ ئەوەی لە (خەسان) بە زیندوویی بمێنیتەوەو نەمریت، چارە هەر ئەوەیە خۆت لە پەنا سەنگەرەکان بشاریتەوە، بەلاّم ئاخر تا کەی؟

لەوە دەکا ڤێتنامی باکووری هیچ سوودیان لەو گوللە بارانەی شەوو ڕۆژ





وەرنەگرتبیێ. خەریکن نۆین لە ژێر زەوی لیێ دەدەن بۆ ئەوەی ئۆردووگای ناو گۆڕاییەکە داگیر بکەن. یەکیێ لەو نۆینانە دەوری سەد مەتر دوور لە سەنگەرەکانەوە سەر دەردێنیێ.

دەتوانین رووداوی (خەسان) لەگەلێ (دین بین فو) بەراورد بکەین.

بیێ گومان هەر بە ڕێکەوتیش نییە کە ژەنەرال (دیانگ) ی ڕزگارکەری (دین بین فو) پلانی بۆ ئەم کارە داڕشتووە.

شەش هەزار سەربازی هێزی دەریایی لەم پلانە ئاگادار کراونەتەوە و ورەیان زۆر خراپ رووخاوە.

دوێنیێ فڕۆکەیەکی (سی ۱۳۰) توانی بۆ ماوەی چوار دەقیقە لە گۆڕاییەکەی (خەسان) بوەستیێ و ئینجا بیێ ئەوەی هیچ گوللەی پیێ بکەویێ، دووبارە هەڵفڕی.

نامەیان فڕیێ داون، ئەونامانەی فڕییان داون پارچە کاغەزێکی بچووکی بیێ ناونیشانیان تێدایە. شیعری سەربازێکی هێزی دەریاییە، بە بنێشت بە زەرفێکەوە قایم کراوە.

دەقی شیعرەکە بەم جۆرەیە:

(شەو، گوێم لە زەوی هەڵکۆڵینیانە
وەکوو کرم و دار
بە بێڵکاری زەوی
بەرەو لای من دەخزێن
لە پشت شیشە ئاسن و
لە پشت فەردە قوم ، گوێیان لیێ رادەگرم
وەك مشك، لە تاریکی.
ئێمە مشکی تاریکین.
فەرماندە روخسەتی داوین چەنگ لیێ بدەین
دەڵیێ بۆ ورەمان باشە.
من نامەویێ چەنگ لیێ بدەم.
دەمەویێ لەناو ئەم گۆڕە

لەم چاوەڕوانییە تۆقێنەرە، را بکەم
ئەگەر بێمە دەرەو دەمکوژن
دوێنێ هاوڕێکەیان کوشتم
بە دووربین دیبوویان.
خودایە چەند بێزارم ، چەند بوغرام
پێیان گوتم لە پێناوی ئاشتیدا دەجەنگی.
بەلاّم بۆچی هەر دەبێ من لە بن عەرد، وەکوو مردوو
بەرگری لەم ئاشتییە بکەم؟
کەچی ئەوان تەنیا یاسا دادەنێن
بۆچی؟ بۆ ئەوەی من بە کوشتن بدەن.)

بەم جۆرە دەتوانین تێ بگەین بۆچی (خەسان) تاقی کردنەوەیە بۆ پەیامنێران. (خەسان) فێری ئازایەتیمان دەکا. گەلۆرانەیە. لە کاتێکا کەس داوای لە ئێمە نەکردووە فێری قارەمانی بین و ئێمەش بۆ ئەم کارە نەهاتووینەتە ئێرە. بەلاّم ئەمە بیرێکە خۆ لێ لادانی نییە. ئەمریکی ئامادەن نەفەر بە فڕۆکەی (سی ١٣٠) هەڵبگرن و لە ئێستاوە زۆر کەس ناوی خۆیان لە لیستی چاوەڕوانی دا نووسیوە. ئەم رۆژانە، لە ئۆردووگای هەواڵگری (دانانگ) یش، باس هەر باسی ئەوەیە ئاخۆ کێ ناوی خۆی نووسیوە بڕوا و کێ نەینووسیوە!

من و (دەرك) ناومان لە لیستەکەدا نییە. کە تووشی(دەرك) هاتم لە (هوئە) دەهاتەوە.

دەیەویست بچێتە (خەسان)، هەروەها منیش دەمەویست بچم، ئەگەرچی برووسکەیەکم لە سەرۆکی رۆژنامەکەمەوە بۆ هاتووە نووسیویەتی نەچمە ئەم سەفەرە. کات دەڕوا و ئێمە هێشتا نەمانتوانیوە بڕیاری خۆمان بدەین و کاتی خۆمان لە هات و چۆی نێوان خەوگاو باڕو باڕو خەوگا بە فیڕۆ دەدەین.

هەر جارەی کە یەکدی دەبینین، بە چاو پرسیار لەیەك دەکەین " باشە، ئا؟ یان نا؟ ". کاتێ کە قسە لە بابەتەکەش دەکەین، هەر قسەی پێشوومان دووبارە دەکەینەوە.





ئاخیری دەگەڕێینەوە سەر قسەی یەکەممان.

– تۆ چوویتە (داکتۆ)، وەزعی تۆ جیایە لە هی من.

– تۆش کۆتایی شەڕی (هوئە)ت دیوە، نزیکەی هەردووکمان وەزعمان وەکوو یەك وایە، دەرك!

– دەزانی؟ هەموو شەو، بیری لێ دەکەمەوە دەڵێم بڕیاری خۆمم داوە، پێش ئەوەی بنووم، بیردەکەمەوە: (سبەینێ ناوم لە لیستەکەدا دەنووسم.) یان ( نا، ناوم نانووسم.) و بەیانی کە لە خەو هەڵدەستم رای خۆم دەگۆڕم.

– بەهەر حاڵ، هەرکاتێ بمانەوێ، دەتوانین ناومان بنووسین و هەر کاتێ حەز بکەین دەتوانین خەتی بە سەردا بێنین. زۆرکەس وایان کردووە. بێ ئەوەی حیسابی ئەوە بکەین تا نۆرەمان دێ، ئیتر بارودۆخەکە گۆڕاوە و باشتر بووە.

– نا، ئیشی وانا، ئەمە گەلۆری دووچەندانە!

– دەزانم، دەرك!

– دەزانی، لەم چوونەدا ئیشمان دەست ناکەوێ. دەزانم (خەسان) شتی تازەی تێدا نییە: هەر شتێ پێویست بە نووسین بکا، تا ئێستا نووسراوە: چاوپێکەوتن لەگەڵ فەرماندە، گفتوگۆ لەگەڵ سەربازان، هەست و سۆزی مرۆڤایەتی. بەلاّم من بۆ خاتری راپۆرت نووسین نییە کە حەزدەکەم بچمە ئەوێ، تەنیا بۆ خاتری دڵی خۆمە، تێ گەیشتی؟

– بەڵێ!

– وا چاکە بڵێین بۆ خۆپەرستی و خۆ دەرخستنە. لەبەر ئەوەیە چونکە ئەوانی تر چوونەتە ئەوێ، یان خەریکن وا دەچن.

– بەڵێ!

– تا ئێستا چوومەتە شوێنی زۆر لە (خەسان) ترسناکتر و شتی وام دیوە پێویست ناکا ئارەزووی چوونە (خەسان) هەر بکەم، وەکوو جەنگی ئیسرائیل. چوونە ئیسرائیل کارێکی ئاسان نەبوو، هەروەها (هوئە) ش. بەلاّم ئەگەر نەچمە (خەسان)، ئەو حەلە هەمیشە لە دڵی خۆمدا دەڵێم (من نەچوومەتە (خەسان) و ئەوانی تر چوون....!)

– بەڵێ.

–ئیتر لێم دەبێ بە دێوەزمە. پێویستە لەم دێوەزمەیە رەها ببم. بە هەرحاڵ، دەبێ رۆژێ بێ و بتوانم بە خۆم بڵێم: (منیش لەوێ بووم.)

– خۆ ئەگەر بمرین، ئیتر ناتوانین ئەم قسەیە لەگەڵ خۆمان بکەین.

– تا ئێستا کەس نەمردووە.

– نەخێر، بەڵام بۆنی دێ کە چەندج کەسێك لەم رێگایە دەمرن و لەوانەیە یەکێ لەو چەند کەسە ئێمە بین. دەرك، ئەگەر بچین، لەوانەیە بمرین.

– لەوانەیشە یەکێ نەبین لەوانە. من حیسابم کردووە و زانیارییەکی زۆریشم پەیدا کردووە، لەو کاتەوە کە لە فڕۆکە دێینە دەرەوە تا ئەو کاتەی خۆمان فڕێ دەدەینە پەنا سەنگەرێك، تەنیا پەنجا چرکە دەخایەنێ. کارێکی دژوار نییە. ئەم ماوەیە تێری هەڵاتن دەکات و بایی گوللە قۆزتنەوە ناکا.

– دەزانم.

گرنگ ئەوەیە بە دروستی بڕۆین و بارو بنەیەکی زۆر وبێ هوودە لەگەڵ خۆمان نەبەین! باش رابکەین و بەرنەبینەوە: پاشان، کە شەو داهات، لەم سەنگەرەوە بۆ ئەو سەنگەر جێمان دەگۆڕین. دەتەوێ شتێ بڵێم؟ من بڕیارم داوە بچم.

– چ کاتێ، (دەرك)؟

– چەند دەقیقەیەکی تر، ئەی تۆ نایەی؟

نا، دەرك.

– باشە ... لەوانەیە منیش نەچم. سبەینێ دیسان قسەی لێ دەکەین.

– بەڵێ، وا باشترە، (دەرك)!

پێش نیو سەعات خەبەریان هێنا کە سێ پەیامنێر بریندار بوونە، لە سەنگەر هاتبوونە دەرێ بۆ ئەوەی هەوایەك هەڵمژن، هاونێك چەند هەنگاوێك لەولایانەوە تەقی بووەوە. یەکێ لەوانە (ئورات) بوو، ئەو کچەی لە (داکتۆ) بینیم.

(کەواتە (ئورات) یش چۆتە ئەوێ! ). من و دەرك کە ئەم شتانەمان زانی زیاتر دوو دڵ بووین. راستە من شۆڕە سواری جەنگاوەری ئارتەر پاشا نیم، راستە سەرۆکی رۆژنامەکەم نایەوێ من بچمە ئەوێ و بگرە چوونی لێ قەدەغەش کردووم،





راستە هەر ئەو شتانە لەوێ دەبینم کە لە (داکتۆ) دیومن ...

بەڵێ ... بەڵام...

(٢) ی ئادار

بۆ ئەوەی بتوانم مەسەلەکەی ئەمڕۆ باس بکەم، دەبێ بگەڕێمەوە چوار رۆژ پێش ئێستا.

ئەو رۆژە، بەیانییەکەی بە دوای هیلیکۆپتەرێك دەگەڕام بچێتە (فوبی) و، (سی ئێچ ٤٦) یێك هات سەرپەل براون دەیهاژوا. کابرایەکی وردیلەی، سیسی سوورکەڵە، لەسەر شکڵی فریشتەکانی سەردەمی راپەڕین بوو. ئینسان چوزانێ بۆچی بەرگی فەرماندەی هەوایی پۆشی بوو. هەر هێندە هات، یەکسەر خۆی بە ژووری رێکخستنی هات و چۆدا کرد. بە جۆش و خرۆشەوە پرسی ئەرکی ئەمڕۆی چییەو کە گوێی لە وەڵامەکە بوو وەکوو گوڵێکی ژاکاو بوو بە دوو کەرت.

– فەرماندە، لە (فوبی)یەوە بۆ (خەسان)

– (خەسان)؟

– بەڵێ، فەماندە.

– حەتمییە؟

– بەڵێ حەتمییە، فەرماندە.

– لە (خەسان) ، دەبێ چ بکەم؟

– دەبێ هەندێ شت بێنیتەوە، فەرماندە!

(سی ئێچ – ٤٦) هیلیکۆپتەرێکی زەبەلاحە، کاری هەڵگرتنی هیلیکۆپتەرەکانی دیکەیە. دەسکێك لە سیمێك بەسراوە، ئەو دەسکە لە هیلیکۆپتەر فڕێ دەداتە دەرەوە و ئەوەی پێویست بکا دەسکەکەی لێ گیر دەکاو بڵندی دەکاو بۆخۆی رایدەکێشێ. ئەمە لە بارودۆخی ئاساییدا، کارێکی هەر زۆر ئاسانە، بەڵام لە شوێنێکی وەکوو (خەسان)، خۆ کوژییە.

– ناکرێ سبەی بچم؟

– ئەمڕۆ، فەرماندە.

– هەوای تووشە.

– بە داخەوە، دەزانم.

– بەڵام بۆچی من؟

– فەرمانده، ئاخر دەبێ یەکێ هەر بچێ.

دانیشت و دەستی بە حیساب کردنی ڕێگا کرد. ئینجا لەسەر لا تەختێك دانیشت و کەوتە بیرکردنەوە. پاشان هەستا و چووە تاقیبی فەرماندەی دووەم و پێکەوە هاتنەوە. فەرماندەی دووەم کابرایەکی هێمن و لە سەرەخۆ بوو، خەندەیەکی گاڵتەجاڕی بە لێوەوە بوو.

بە هێدی چەند قسەیەکی کرد من تێی نەگەیشتم، ئینجا، بەرامبەر نەخشەیەك وەستا:

– ئێوە دەتانەوێ بچنە (فوبی)؟

– بەڵێ، جەناب.

– با بڕۆین.

سواربووین و دەرگای دواوەیان داخست. ڕەشاشچی لە تەنیشت ڕەشاشەکانیان دانیشتن. مەکینە دەستی بە گڕەگڕکرد. فەرمانده (براون) مەکینەکەی کوژاندەوە و لە پەنجەرە بچووکەکەیەوە سەری بردە دەرێ و گوتی:

– بورغییەکانتان باش توند کردووە؟

–بەڵێ ، فەرمانده هەموو بورغییەکانمان باش توند کردووە .

– وا چاکە چاوێکی تریان پێدا بخشێنین.

– ئەمر دەکەی، فەرمانده.

– پەروانەکان، پەروانەکان باش ئیش ناکەن.

– پێشتر باش ئیشیان دەکرد.

– نابێ تۆ وا بڵێی. تەکنیکارەکان بانگ کە.

تەکنیکارەکان بە سپانەو کلیل و مقاش هاتن. بازیان هەڵدایە سەر پشتی هیلیکۆپتەرەکە و هاتنە خوارەوەو گوتیان: پەروانەکان باش ئیش دەکەن.

گوتیان:

– تا ئێستا هیچ پەروانەمان نەدیوە، ئەوەندە بە باشی بخوولێتەوە.





–باشە، ئەوە خەیاڵم ئاسوودە بوو .

باشە فەرمانده ئامادەی ؟-

– ئامادەم.

دووبارە سوار بووینەوە. دووبارە دەرگای دواوەیان داخست، دووبارە ڕەشاشچییەکان لە تەنیشت ڕەشاشەکانیان دانیشتن. دووبارە مەکینەکە ئیشی کرد. هیلیکۆپتەرەکە نەختێ بەرزبووەوە و پاشان هاتە خوارەوە.

– سووکانەکان باش ئیش ناکەن.

– دەنا پێشتر باش ئیشیان دەکرد.

– نابێ تۆ وابڵێی. تەکنیکارەکان بانگ کە!

کە تەکنیکارەکان بە سپانەو کلیل و مقاشەکانیانەوە هاتنەوە، فەرمانده پێی گوتن بە باشی و بە وردی تەماشای بکەن و پەلەشیان نەبێ.

بەهەر حاڵ، سەفەرەکە هەڵوەشایەوە. کاتێ کە لەگەڵ فەرماندەی دووەم دوورکەوتنەوە، هەر پێدەکەنی ... وای پێ کەنی ... !

ئەمڕۆ (دەرك) هات و گوتی دەبێ پەیوەندی بە (سایگۆن) ەوە بکەم و خەبەرێکیان بۆ بنێرم. خەبەرەکە گرنگ نەبوو، بەڵام لە هیچە باشتر بوو. لەگەڵی چوومە بەشی تەلەفزیۆن و خەبەرەکە ئەمەبوو: پێش سێ ڕۆژ، هیلیکۆپتەرێکی (سی ئێچ ٤٦) لە نزیك (دانانگ)، حەڤدە کیلۆمەتر لە دووری (خەسان)، کەوتە بە رگوللەی ڤێتنامی باکووری. ویستبووی هیلیکۆپتەرێکی تر بە خۆیەوە بلکێنێ و ببیا، بە نارنجۆك تەقاندیانەوە. فڕۆکەوانەکەی هەوڵی دا خۆی لە هیلیکۆپتەرێکەوە فڕێی بداتە سەر هیلیکۆپتەرێکی دیکە، بەڵام هیلیکۆپتەرەکە بە زەوی کەوت و کەس بە زیندویی دەرنەچوو.

– (دەرك)، بەڵکو لە یەکێ بپرسی داخۆ فەرماندەی هیلیکۆپتەرەکە ناوی (براون) بووە؟

– هەرگیز ناوەکەیم پێ ناڵێن. بۆ دەتەوێ ناوی بزانی؟

– پاشان پێت دەڵێم. بەهەر حاڵ تۆ هەوڵێك بدە (دەرك)!

هەڵس و کەوتێکی بێ حەوسەڵەی کردو  رازی بوو. لە چەند کەسێکی پرسی.

پاشان لە بنکەی هیلیکۆپتەرانی پرسی.قسەی لەگەڵ کردن. ئەو هەر سوور بوو. گوێی دایە قسەکانیان و سوپاسی کردن.

هاتەوە گوتی: دەڵێن، نازانین! ئەگەر بشزانن، روخسەتیان پێ نەدراوە ناوی ئاشکرا بکەن. بەڵام ئەوە دەزانن کە پێش سێ رۆژ فەرماندە (براون) چۆتە (خەسان). بێ گومان دەبوایە رۆژێك پێشتر بچێ بەڵام مەکینەی فڕۆکەکەی تێکچووبوو و رۆیشتنەکەی دواکەوتبوو.

– ئەمەم دەزانی؟

– لە کوێ دەتزانی!؟

– خۆی مەکینەکەی خراپ کردبوو. نەیدەویست بچێتە (خەسان).

– کەواتە تەنیا هەر ئێمە نین کە نامانەوێ بچینە (خەسان).

– باشە، دەرك! ئێستا چ بکەین؟

– بە! دەڵێم بچم ناوم بنووسم. ئەی تۆ؟

– بە! من بیرێکم بۆ هاتووە. بێگومان بیرێکی ئاڵۆزە، پاشان پێت دەڵێم.

تەنیا هەر بیرێك نەبوو. من نەمویست لەم بارەیەوە قسەی لەگەڵ بکەم. ئەگەر قسەم لەگەڵ بکردایە، نائومێدم دەکرد. ئیتر بە تەنیا بڕیارم دا. سبەی دەچمە بەڕێوەبەری بنکەی هیلیکۆپتەران و داوا دەکەم جێگایەکم بۆ بگرن بۆ چوونە (خەسان)، بۆ ئەوەی کۆتایی بەم دوودڵییەم بێنم:

ئاخۆ ناوم بنووسم یان نەنووسم! وەکوو کاتێ کە بمانەوێ خۆمان فڕێ دەینە ناو گۆماوێك و نەزانین ئاخۆ ئاوەکەی ساردە یان نا. یەکەم جار یەك پێ و ئینجا پێیەکەی ترمان دەخەینە ناو گۆمەکەو ئینجا لە پلیکانەی گۆمەکە دەچینە خوارێ و پێمان تەڕدەکەین و زیاتر دەچینە خوارێ و بەم جۆرە زیاتر هەست بە ساردی دەکەین و لەناو ئاوەکە دێینە دەرەوە و واز لە چوونە ناو گۆماوەکە دێنین.

بۆ ئەوەی بچینە ناو گۆمی ئاو، دەبێ لەپڕ سەراوسەر خۆی تێ باوێین.

(٣) ی ئادار

دەبێ بنووسم، تەنانەت ئەگەر بە زەرەری خۆیشم بشکێتەوە و تەنانەت ئەگەر ببێ بە مایەی تەریق بوونەوەو رووشکانی خۆیشم. نووسین وام لێ دەکا باشتر لە





رووداوەکان بگەم.

لەگەڵ گەردو گۆڵی بەیانی چومە ئەوێ. گوتم ئایا بواری چوونە (خەسان) هەیە، یان نا؟ یەکەم جار بە چاوێکی سەیرتێم رامان و ئینجا گوتیان بەڵێ، پێش سەعات یەك، هیلیکۆپتەرێکی (سی ئێچ –٤٦) تەقەمەنی بۆ ئەوێ بار دەکا. پرسیم: ئایا لەسەر زەوی دەنیشێ؟ گوتیان: بەڵێ، بە داخەوە لەسەر زەوی دەنیشێ.

– ئایا فەرماندە رازی دەبێ منیش لەگەڵیا سواربم؟

– ئەمە پەیوەندی بە فەرماندە، خۆیەوە هەیە. لەوانەیە بەختت هەبێ و رازی بێ، بەڵام ئایا ئەوەندە پەلەتە بۆ (خەسان)؟

– بەڵێ، زۆر پەلەمە، چونکە هەر دەبێ ئەمڕۆ بۆ ئامادەکردنی راپۆرتێك بچمە ئەوێ.

– باشە، کەواتە فەرموو، لێرە دانیشە!

دانیشتم. لەسەر ئەو لاتەختە دانیشتم کە فەرماندە (براون) لە سەری دانیشتبوو، لە دوودڵی حەسابووەمەوە! مەیلەو خۆشحاڵ بووم. ئەگەر هەر ئێستا سوارم بکەن خۆشحاڵتریش دەبم. بەڵام چاوەڕوانی هەمیشەیی دەستی پێ کرد. لەم بێ کارییەدا، دەرفەت وەردەگری بۆ ئەوەی بەڵگەو بیانوو بۆ خۆت بێنیتەوە، حیسابات بکەی، هەموو لایەنێکی مەسەلەکە لەبەر چاو بگری. هەر واش کەوتەوە. یەکەم جار بێ ئۆقرەیی، ئینجا تووڕەیی و پاشان پەشیمانی. پاشانیش بیرم لە فەرماندە (براون) کردەوە. بە تایبەتی کە ئەم هیلیکۆپتەرە لە هیلیکۆپتەرەکەی ئەو ترسناکتر بوو، چونکە تفاقی بار کردبوو. واتە تەقەمەنی. پاشان (جانی) م هاتە بەر چاو، بەلەمەکەی (جانی) م بینی.

ترسام. وای دەنا بمتوانیایە ئەم ترسە دەربڕم. ترسەکەم ترسی ئنسانێکی گەورە نەبوو. وەکوو ئەو کاتە وابوو کە بە منداڵی لە راکێشانی دەسکی دەرگای ئۆتۆماتیکی کۆکا کۆلا ترسام. دەزگاکە لە لای دەستە راستم بوو، دەزانی، دەزگایەکە لەوانەبوو کە کاتێ دراوێکی دەخەینە ناو کۆلا کۆلایەکی لێ دێتە دەرەوە. یەکێك هات، دراوێکی هاویشتە ناوو دەزگاکە دەنگێکی شەق بردنی

لێوەهات و کچە بچکۆلانەکەم بینی ڕەنگی پەڕی بوو، بە هەموو هێزی خۆیەوە رایدەکرد. رایکرد بێ ئەوەی دەرگاکە لە دوا خۆی دابخاتەوە، لە کاتێکا کە دایکی بە قرەقڕ دەیگوت: ((کچۆڵەی گەمژە، بۆچی را دەکەی، دەرگاکە داخە!)) کچۆڵەکەم بینی، بە هێنکە هێنك خۆی کرد بە ژوورێکی کتێبخانەدا. نێوچەوانی بە پەنجەرەوە نووساند و تەماشای درەختەکانی ناو باخچەی کرد. بەڵام ئێرە ژووری کتێبخانەی لێ نییە.درەختی ناو باخچەی لێ نییە . تەنیا یەك کەس وا خەریکە بۆ لای من دێ. ئەویش ئەو کەسەیە کە پرسیارەکەم لێ کرد. وام زانی دێتە لام بۆ ئەوەی پێم رابگەیەنێ کە فڕۆکەکە بەرەو (خەسان) بەڕێ دەکەوێ. دووبارە گوێم لە دەنگی دەزگاکە بوو و چاوم بڕییە لێوەکانی: چاوم زەق بووەوە. پێی گوتم: ((قاوە دەخۆیتەوە؟ بۆت بێنم؟)) پێم گوت: "بەڵێ، سوپاست دەکەم." کە بە خۆو بە قاوەوە هاتەوە، من لەوێ نەمابووم. من لەناو سەنگەری ئاسنین و لانەی فڕۆکە و هیلیکۆپتەری بێ جووڵە، راکەراکەم بوو تا ئەوەبوو لە کۆتایی ڕێگاکە گەیشتمە باریکە ڕێیەك، لەو کاتەدا جیبێك هات. خۆم هەڵدا سەری: " دەتوانی بمگەیەنیتە ئۆردوگای هەواڵگری؟ " سواری کردم و لەوێ (دەرك) م بینی و لە کاتێکا کە لە شەرمەزارییان سوور هەڵگەڕابووم، مەسەلەکەم بۆ باس کرد.

(٥) ی ئادار

بێزارم لە چاوەڕوانی ناو فڕۆکەخانە! لە چاوەڕوانی ناو کیسە قوم، لە سەربازیی شەکەت ولەو بانگەشەی دەڵێ: ((لە کاتی هێرشی هاون مەترسن، را مەکەن، تەنیا خۆتان بە زەوی دادەن.))

لەم بۆن ئارەقەی لەشم، بێزارم، لەو چاوانەی شوێنت دەکەون چونکە ژنی، لەو کاتەی کە بێ هوودە و بە خوت و خۆڕایی لە دەستم دەڕوا، بێزارم لە (کام ران بی) ، ئێرە ئەو شوێنەیە کە دەبێ دابنیشم و چاوەڕێ بکەم بۆ ئەوەی بە فڕۆکە بچمە سایگۆن. شەوە. لە دوێنێ دوای نیوەڕۆوە بە فڕۆکە لە سەفەردام و شادومانم ئەگەر لەگەڵ سپێدەی بەیانی بتوانم سواری ئەم فڕۆکە بار هەڵگرە ببم کە دەچێتە فڕۆکەخانەی (تان سون نوت).

هەموو دەیانەوێ سواری ئەم فڕۆکەیە بن، تەنانەت ئەم ڤێتنامییەش کە





کاغەزێکی پڕ مۆر و نووسینی بە دەستەوەیە و بەرامبەر سەربازێکی پیر وەستاوە کە بەردەوام جوێنی پێ دەدا.

– هەی خەرفاو! گەلۆر! چ پەیوەندی بە منەوە هەیە کە ژنی تۆ لە سایگۆن خەریکە دەمرێ؟ ها؟ خۆزگە هەر ئێستا دەمرد!خوای دەکرد تۆش لە گەڵیا دەمردی! مەیموون، کرێت!

کابرای ڤێتنامی بە میهرەبانی و بە ئەدەبەوە وەستابوو. نائومێدیی شەنگی لەبەر بڕی بوو، نەیدەتوانی بێزاریی، یان بوغرایی خۆی دەربڕێ.

– ئاخر، جەناب تۆ گوێ بگرە. ئەم کاغەزە... ئەم کاغەزە ڕێم پێ دەدا سواری فڕۆکەی بار هەڵگر ببم.

– ڕێت پێ دەدا؟ توخوادا خۆیشت دەزانی چ دەڵێی؟ هەی مەیموون، گەلۆر! من دەبێ ڕێت بدەم، من... تێ گەیشتی؟ خۆت بە چ تێدەگەی (چارلی)، ها؟ مەگەر ئەمەماڵی خۆتە؟ پارەی بلیتیش نادا! ئێمە بۆ ئەمانە دەجەنگین، ملیاردەها دۆلار بۆ ئەم گەلۆرانە سەرف دەکەین و ئەوەتا ئەوانیش هیچ!!

– بەڵام جەناب!

– دەتەوێ شتێکت پێ بڵێم؟ تۆ ناچیتە سایگۆن! بڕۆ داوا لە ڤیت کۆنگەکان بکە بتبەنە سایگۆن، مەیموون!

– جەناب، تکا دەکەم!

بەڵام سەربازە پیرەکە دڵیشی وەکوو ورگی پڕ بەزو چەوری بوو. دەوری بیست ساڵ دەبێ ئەم بەرگە سەربازییەی پۆشیوە. بچووکترین نیشانەی بەزەیی و ئەدەب و مرۆڤایەتی لە روخساری بەراز ئاسای دا، ناکەوێتە بەر چاو. مستێکی لە کابرای ڤێتنامی داو تێی هەڵدا.

– لێرە بێزارم!!

بە تایبەتی کە ئەو سێ نەفەرە ڕەشەش لەوێ بوون کە بە من با هەر نەیانبینم: (جیمی) و(هاری) و( دان ). ئەوانەم لە (دانانگ) دیبوو، ئەگەر جارێکی تر بیانبینم، چاوم بە سایگۆن ناکەوێ. لە یەکەم چاوپێ کەوتن دا بەبێ ئازار دەکەونە بەرچاو. (دان) کوڕێکی قۆز و خۆش مەشرەبە. (جیمی) دێوێکی دەم بە

پێکەنینە. دەمێنێتەوە (هاری)، ئەویش کە باش تەماشای دەکەی، دەق شکڵی ئەو کەسانەی هەبوو کە پێ و قدوومیان شوومە. ئەو کەسانەی چاویان پیسە. رەنگی دەم و چاوی پەڕیوە، چاویلکەی کەسانی میوپی لە چاو کردووە.

بیر لە دوێنێ شەو دەکەمەوە، لەو قسانەی لەگەڵ یەکترمان کرد و لەو رووداوەی پاشان قەوما ...

– ئەوە لە (هوئە) دێیتەوە؟

– (هاری) بە جۆرێ ئەم پرسیارەی لێکردم وەکوو ئەوەی بیەوێ سەری قسان بکاتەوە.

– بەڵێ، ئەی ئێوە؟

– ئێمەش لە هەموو شوێنێك دێینەوە و لە هیچ شوێنێك نایەینەوە؟

– بەرزە! دەچنە کوێ؟

– نازانین، بۆ هەر کوێ رەوانەمان بکەن.

– یانی؟

(دان) قسەی پێ بڕی و گوتی:

–یانی ئێمە خۆشمان نازانین. دەچینە ئەو شوێنەی لیواکەمانی لێیە. لیوای سەدو سی و پێنج. با ئەوەش بڵێم کە جێگای وا هەیە، وانییە منداڵینە!؟

با، با ، بەدی کوو ؟

کە ویستمان لە فرانسیسکۆ بێینە ڤێتنام، پێیان گوتین شوێنی وا هەیە. (جیمی) پێکەنی. لە (کام ران بی) ش گوتیان هەیە. ئێستا مەسەلەکەتان بۆ باس دەکەم.

– با (دان) باس بکا، ئەو قسەزانترە!

(دان) گوتی:

– باشە! ئێمە لە سایگۆنەوە یەکسەر هاتینە (کام ران بی) و پرسیمان لیوای سەدو سی و پێنج لە کوێیە؟ دوای نەختێ دوو دڵی و چەند دەرزن تەلەفۆن، وەڵامیان داینەوە: (منداڵینە، لە (پلیکۆ) یە!). ئێمەیش سواری فڕۆکە بووین و چووینە (پلیکۆ)، لە سەرو سیمایان دیاربوو کە چاوەڕێی ئێمەیان دەکرد، بەڵام کە





ئێمەیان دی، ئێمەیان گەڕاندەوە: ((نا، منداڵینە! لیوای سەدو سی و پێنج لێرە نییە، لەوانەیە لە (چولی) بێ .!.)). سواری فڕۆکە بووین و چووینە (چولی) لەوێش لە سەرو سیمایان دیاربوو کە چاوەڕێی ئێمە دەکەن و چۆنیش! بەڵام لەبەر ئەوەی پێویستیان بە ئێمە نەبوو، ئێمەیان گەڕاندەوە: ((نا، منداڵینە، نا، لەوانەیە لە (ناترانگ) بێ ...)). چوینە (ناترانگ) و مەسەلەکە دووبارە بووەوە: ((بڕۆنە (هوئە)، لەوانەیە لەوێ بێ! ..)).

لە (هوئە) زۆری نەخایاند ئەفسەرێك هات و دووبارە ئێمەی گەڕاندەوە (دانانگ) و ئێستا ئەوەتا لێرەین.

گوتم:

–ئاخر شتی وا چۆن دەبێ؟! دەبێ غەڵەتێك لە کارەکەدا هەبێ، بۆچی هەموو جارێ دەتانگەڕێننەوە؟

(هاری) گوتی:

– (دان)، تۆ مەسەلە چۆن بووە ئاوا باست نەکرد. یان هەموو شتێ بڵێ، یان هەر هیچ مەڵێ.

(دان) گوتی:

– دەمت بگرە!

– نا، دەمم ناگرم! تۆ لەبەر ئەوەی ئیشەکەت دروست نییە، لەم داستانەتدا سوپای ئەمریکات کرد بە دەستەیەکی گەمژەو گەلۆر، تۆ باست نەکرد بۆچی هەموو جارێ ئێمەیان دەگەڕاندەوە: ((بۆیە دەیانگەڕاندینەوە چونکە وایان دەزانی ئێمە دمۆرین و ئەم قسەیە بە هەموو شوێنێدا بڵاوببووەوە و دەچووینە هەر شوێنێ یەکسەر دەیانگوت: " بیانگەڕێننەوە. دمۆرن! "

– هەر سێکتان دمۆرن؟

(جیمی) هاواری کرد:

– بێ گومان نا! بەڵام ئەوان وا تێ دەگەن کە هەر سێکمان دمۆرین، هەر بۆیەش لە سانفرانسیسکۆوە ئێمەیان، هەر سێکمان، بەگەڵ یەك دا، هەر بۆیەش رەوانەی ڤێتنامیان کردین تا لە بەلای ئێمە نەجاتیان ببێ. دەزانی کە گوللە بە شانی

فەرماندە کەوت، سەردەستە چی گوت:

– نا، نازانم!

– سەردەستەکە هەمیشە یاری بە شەشاگرەکەی دەکرد، وایدەزانی کاوبۆیە. ئاخیری، ڕۆژێ حەوسەڵەم نەما، هاوارم کرد و گوتم:

((گوێت لێ بێ، سەردەستە، ئاخیری گوللەیەك لە دەستی خۆت دەدەی)).

هێشتا ڕستەکەم تەواو نەکردبوو، گوللەیەك لە شەشاگردەکەی دەرچوو و بە فەرماندە کەوت. دەق وەکوو ئەوەی گوللەکە لە کەرە چووبێتە خوارێ، ئاوها لە جەستەی فەرماندە چووە خوارێ و ئەگەر فەرماندە نەیگوتایە ئیشەکە قەزاو قەدەر بووە و بە ئەنقەست نەبووە، سەر دەستەیان ڕادەکێشایە دادگای سەربازی. بەڵام سەردەستە لە من کەوتە گومان و پاشان لە (دان) و (هاری)ش بە گومان کەوت کە لەسەر من بە جواب هاتن و گوتی: ((بڕۆن، گوم بن، هەرسێکتان. بڕۆن با چیتر چارەی شوومتان نەبینم. ئێوە ئینسانی شووم و دمۆرن!))

(هاری) گوتی:

– (جیمی) گوێت لێ بێ. ئێمە ئینسانی دمۆر نین، بەڵام هەر کاتێ دەچینە هەر شوێنێ شتێ ڕوو دەدا با بە ئەنقەسیش نەمانکردبێ. ئەم ڕووداوانەش هیچ کاتێ ڕووداوی باش نین. (جیمی)، لە بیرتە؟

– سکتربە!

– سکتر نابم. بۆ وا دەزانی لە بیرم کردووە؟ ڕووداوەکەی فرانسیسکۆ دەڵێم. هەر سواری فڕۆکەکەی باری بووین، یەکسەر مەکینەکەی ئاگری گرت. یان ئەو فڕۆکەیەی پێی دەچووین بۆ (پلیکۆ)، ئەوەبوو بە شەستێر کون کون بوو و چوار کەس بریندار بوون. یان ئەو فڕۆکەیەی دەچووە (چولی)، هاوەنەکە ئەوەندەی نەمابوو بەسەر سەرمان بکەوێ. یان ئەو شەوە لە (فوبی)، کە لەناو سەنگەرێك خەوتبووین و ساروخێك بەسەر سەنگەرەکە کەوت و دە کەس کوژران و حەوتیش بریندار بوون. یان لە ئۆردوگای (ناترانگ) کە بۆری ئاوی گەرم تەقی و ئەفسەرەکە سووتا و لە ...

با پێتان بڵێم کە: من بڕوام بە خەرافات هەیە، بەڵام بەو ڕادەیە نا نەتوانم بزانم





ئەم سێ نەفەرە ڕەشە درۆ دەکەن.

هەر بۆیەش ڕازی بووم لە تەنیشتیان دانیشم کە دەیانەویست وەختەکە ڕاببوێرن. بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێم کە بینیم سواری فڕۆکەکەی من بوون، نارەحەت بووم! هەوڵم دا هەر بیریشیان لێ نەکەمەوە، لە دووری ئەوانەوە دانیشتم. دوای دەقیقەیەك دەرکەوتن.

– لە کلکەی دواوەی فڕۆکەکە، چوار کورسی لە تەنیشت یەك هەن.

– نا، ئێوە بڕۆن دانیشن!

– وەرە، ئێرە خۆشترە!

– نا، ئێرە باشە. لێرە دەبم.

– تۆش وا تێ نەگەی ئێمە شووم و دمۆرین؟

بەم جۆرە چووم لە تەنیشتیان دانیشتم. پشتێنەکانمان بەست.

فەرماندەی دووەم چۆنیەتی بەکارهێنانی چەتری ڕزگاری بۆ باس کردین. ئەوان دووبارە دەستیان پێ کردەوە:

– هیوادارین هەموو شتێ بە چاکی بڕوا!

– ئاخری دەبینی، شتێ هەر ڕوو دەدا!

– ئێستە کاتی ئەوەیە هاوەن باوێن.

– سی (٣٠) چرکەی تر دەتەقەومێ!

گوتیان سی (٣٠) چرکە. لەوساوە تا ئێستا (دە) چرکە تێپەڕیوە. چاوم بڕیوەتە کاتگرەوەکەم. سوێند دەخۆم بیست چرکەی تر ماوە. هەوڵم دا ئەم بیرانە لە سەری خۆم دەربکەم، بەڵام چاوم هەر لە کاتگرەوەکە بڕی بوو: دە، نۆ، هەشت، حەوت، شەش، پێنج، چوار، سێ، دوو، یەك، گرم!!

فڕۆکەکە لەگەڵ تەقینەوەکە هەژایەوە. هەروا بە حەپەساوی دانیشتبووین کە فەرماندەی دووەم هات و پێی گوتین هێمن و ئارام بین و گوتی ساروخی ڤیت کۆنگەکان بە ناوەندی گۆڕەپانەکە کەوتووە، بەڵام فڕۆکەکە زۆر کەم زیانی بەر کەوتووە. تانکی بەنزین ساچمەیەکی پێ کەوتووە، ساچمەیەکیش بە پەروانە کەوتووە و چوار ساچمەش بە کلکەی فڕۆکەکە کەوتوون.

گوتی بەداخەوە ناچارم بە فڕۆکەیەکی تر ڕەوانەی (سایگۆن) تان بکەم.

ئێستا وا هەرسێکیان لێرە وەستاون، وەك ئەوەی بیانەوێ دیسان سواری ئەم فڕۆکەیە بن. بەڵام باوەڕناکەم سەربازی پیر ئەمانە سواری ئەم فڕۆکەیە بکا.

وام پێ باشە، نەختێ لە دوور ئەوانەوە بوەستم.

خودایە چ شێتخانەیەکە! جەنگ شێتخانەیە شێتخانە!!





## بەشی حەوتەم

ئەم ڕۆژانە زۆر بە گەرمی باسی ڕووداوەکەی شانزەی ئادار دەکرێ. شانزەی ئادار کە (می لای) قەتڵ و عام کرا. ئایا دادگایی و قسەکانی ئەو کەسانەت لە بیرە کە دەستیان لەم قەتڵ و عامەدا هەبوو؟!

((هەموو ئەو کەسانەی هاتبوونە گوندەکە تەنیاو تەنیا بە نیازی کوشتن هاتبوون. دەستوور وا کە بوو (می لای) تا ئاخر مریشکی زیندوو لەناو ببەین و تێك و پێکی بدەین. نەدەبوایە (می لای) هیچ زی ڕووحێکی تێدا بمێنێ...))

((ژن و منداڵ و پیاو و کۆرپەکانمان لە ناوەندی دێ لە تەنیشت یەك دانابوو. تەواو شکڵی دوورگەیان پێك هێنابوو. سەرهەنگ ( کالی ) گوتی:

" خۆتان دەزانن دەبێ چ بکەن؟ ".

دوای ماوەیەك دووبارە هات و گوتی:

" ئەوە بۆچی تا ئێستا نەتانکوشتوون؟ "

من گوتم:

" وامان دەزانی ئەرکی ئێمە ئەوەیە تەنیا چاوەدێرییان بکەین، نەك بیانکوژین.

" خۆی دەستی بە تەقە کردو ئەمری بە منیش کرد تەقەیان لێ بکەم. تفەنگی (ئیم– ١٦)م داگرت، چوار مەخزەنی لەگەڵ دابوو، شەست و هەشت فیشەکی دەگرت. دەستم بە تەقە کرد. وا بزانم دە پازدە کەسێکم لێ کوشتن..."

((کابرایەکی پیر، خۆی لە پەنا ئەوانی دیکە نابوو. خۆی گرمۆڵە کردبوو. زۆر پیربوو. سەرهەنگ ( دایڤد میچێل ) هاواری کرد: ((بیکوژن!)) یەکێ گوللەیەکی پێوەناو کوشتی ...))

((لە گوندەکە، یەك گرد لە کەلەشی کوژراوان هەڵدرابووەوە. منداڵێکی

بچکۆلانەم لەناویان بینی تەنیا بلووزێکی لەبەر بوو. بە شێنەیی بۆلای کەلەشەکان دەچوو. کە لێیان نزیك کەوتەوە، دەستی یەکێ لە کوژراوەکانی گرت، لەوانەیە تەرمی دایکی بووبێ. یەکێ لە سەربازەکان چۆکی دادایە سەر زەوی و نیشانەی لێ گرت و بەیەك گولله کوشتی ...))

((بەبێ هۆ تەقەیان لە هەموو شت و لە هەموو کەس دەکرد. تەنانەت لە زنجی گرگرتووش. لە دانیشتوانی گوندەکە هیچ کەس تەقەی لە سەربازەکان نەدەکرد. ئێمە هیچ دەستوە کەرییەکمان لە خەڵکی گوندەکە نەدی، هیچ دەستوەکەری. تەنانەت ئەوەندەی تەماشامان کرد، کوڕێکی گەنجیشمان نەدی لە تەمەنی جەنگ کردندا بێ...))

((بڕوام بە چاوی خۆم نەدەکرد. دوو منداڵ لە ئاقاری دەڕۆیشتن. یەکێ پێنج ساڵی و ئەوەی تر دەوری چوار ساڵی دەبوو. سەربازێك تەقەی لە کوڕە بچووکەکە کردو کوڕە گەورەکە خۆی بەسەر برای بچووکی دادا بۆئەوەی چەپاڵەی بدا. سەربازەکە شەش گوللەی تری پێوەنا.

سەربازەکانی کالی، ئیشی سەیر و سەمەرەیان دەکرد. ئاگریان لە زنجەکان بەردەدا و چاوەڕێیان دەکرد تا دانیشتوانی زنجەکە دەهاتنە دەرەوە، ئەوسا تەقەیان لێ دەکردن ...))

((کە ئیشمان تەواوبوو، من و( بێلی) دانیشتین بۆ ئەوەی شتێ بخۆین، بەلاّم ئەو شوێنەی لێی دانیشتبووین لە کۆمەڵەی کوژراو و بریندارەکان نزیك بوو. هەندێکیان هێشتا هەر ناڵە ناڵیان بوو. من و( بێلی) هەستاین، هەموومان کپ و بێ دەنگ کردن، ئەوسا بە خەیاڵی ئاسوودە نانی خۆمان خوارد ...))

بەلاّم لەم کتێبەدا بە دوای باسی قەتڵ و عامی (می لای)دا مەگەڕێ، چونکە منیش وەکوو هەموو کەس ساڵ و نیوێك دوای قەتڵ و عامەکە، کاتێ کە (راد رایندهور) ی سەربازی ئەمریکی رووداوەکەی ئاشکرا کرد، ئەوسا پێم زانی. ئێمە هیچێکمان قەتڵ و عامەکەی (می لای) مان نەبینیوە، هیچێکمان نەمانبیستووە لە ناوچەی (کانگ نگای) شوێنێ هەبێ بە ناوی (می لای). (می لای) گوندێکی بچووکە کەوتۆتە بەینی جەنگەڵ و دەریا، تەنانەت لەسەر نەخشەی ڤێتنامیش





ناوی نەهاتووە.

تەنیا بە رێکەوت ئەگەر ئەو رۆژە سەر لەسبیانە هەتاوەکەی بمتوانیایە بە شەرم و سەر کزی خۆم بگەیەنمە ئەوێ. لەوانەیە ئەگەر رێکەوت یا چارەنووس بیکێشامایە ئەوێ، ئێستا نەمتوانیایە رووتاوەکەتان بۆباس بکەم.

ئایا هەشتاو پێنج پیاوی (چارلی) دڵ رەق، رێگەیان بە پەیامنێرێك یان غەوارەیەك دەدا بە زیندویی لەوێ بێتە دەرەوە. ئەم پرسیارەم لە بەردەم قیت بووەوە:

ئایا من خۆم هەرگیز وشەیەکم لە بارەی ئەم قەتڵ و عامە بیستبوو؟ نەخێر، هەرگیز. چونکە پەیوەندی کردن بە ڤیت کۆنگەکانەوە، کە تەنیا ئەوان دەیانتوانی ئەم خەبەرە بگەیەنن، شتێکی مەحاڵ بوو. نەشدەبوو لە ڤیت کۆنگەکان نزیك بکەویتەوە، مەگەر دەستگیریان بکردای و پاشان ئەگەر گوللە بارانیان نەکردبای دەبوایە سوپاسی خودا بکەی. ڤیت کۆنگەکان متمانەیان بە ئێمەی پەیامنێر نەدەکرد، چونکە ئێمە پێست سپی بووین، چونکە ئێمە بە روخسەتی ئەمریکییەکان هاتبووینە ڤێتنام و جلی سەربازی ئەمریکیمان لەبەر بوو. بەپێچەوانەوە، پەیوەندی کردن بە ئەمریکییەکانەوە زۆر ئاسان بوو. ئەم پەیوەندییە هەمیشە لە ئارادا بوو. تەنانەت دەتوانم بڵێم شتێکی تەوزیمی بوو. بەلاّم دیسان زۆر شت هەبوو نەمانـدەتوانی لە دەمی ئەوانی ببیستین. ئەوان سەربازەکانی خۆیان بە وێنەیەکی جوان و باش پێشانی ئێمە دەدا: ئەو کوڕە ئازایانەی لە پێناوی ئازادی و دیموکراتی دەجەنگن، ئەو کوڕانەی بنێشت و ئاوی نەبات بە منداڵان دەدەن و لێبوردەیی و پێشکەوتن بە دیاری پێشکەش بە گەورەکان دەکەن...

کوڕی چەند چاکن! ئەمانە نەوەی ئەو پیاوانەن کە ئەوروپایان لە ژێر چەکمەی نازییەکان رزگار کرد، بۆ ئەوەی زۆر بە چاکی دادگای (نورنبرگ) دابمەزرێنن. ئایا ساختەو درۆکردنیش وەکوو مردن و تۆقان بەشێك نین لە جەنگ؟!

وەکوو لەگەڵ زەوی تەخت کردنی گوندەکان. ئەو کوڕە ئازایانە کاتێ کە گوندێکیان چۆڵ دەکرد و خانووەکانیان دەسووتاند، هەر کەسێ لە کووخەکەی

نەهاتایە دەرەوە دەیانکوشت. بەڵام پەیامنێرەکانیشیان لای خۆیان گل دەدایەوە. جاری وا هەبوو بۆ ئەوەی زیندانییەکان ناچار بکەن ئیعتیراف بکەن، لە کاتی هەڵفڕینی هیلیکۆپتەر، پەتیان لە پێ دەبەستن و شۆڕیان دەکردنەوە و ئەگەر زیندانییەکان ئیعتیرافیان نەکردایە، ئەو کوڕە ئازایانە پەتەکەیان دەپچڕاند و زیندانییەکەیان لە ئاسمان بەردەدایەوە بۆ ئەوەی بەربێتەوە سەر زەوی و بمرێ. پەیامنێرەکان بە شێوەی  لابەلا ئەم ڕووداوانەیان دەبیست بەڵام هیچ بەڵگەیان بە دەستەوە نەبوو بۆ سەلماندنی قسەکانیان.

لە بیرتە؟ جەنابی (لانگ) بوو، ئەم مەسەلەیەی بۆ گێڕامەوە. (بەرخە سەوزەکان) یش بوون، ئەوانەی بە دوای ڤیت کۆنگەکاندا دەگەڕان بۆ ئەوەی سەرو زەکەریان ببڕن. بەڵام کێ دەتوانێ ئەم مەسەلەیە بۆ پەیامنێران بسەلمێنێ؟ پەیامنێرەکانیش نەیاندەتوانی هیچ بەڵگەیەك بۆ سەلماندنی قسەکانیان بە دەست بێنن، مەگەر دوای ماوەیەك، بتوانن لە ئەوروپا وێنەکەی هەر لەو (بەرخە سەوزانە) خۆیان بکڕن. وێنەکەش، پێنج کوڕی قەڵەوو دەم بە پێکەنین و قژ زەردی پێشان دەدا کە پێنج سەری بڕاویان بە دەستەوە گرتبوو و هەر سەرەو زەکەری خاوەنەکانیان لەزاری ڕا کردبوو... بگرە دەتوانی وێنەی ئەو ڤیت کۆنگەشیان لێ بکڕی کە بە پەت لە هیلیکۆپتەر شۆڕ کرابووەوە. ئێمە تەنیا دوو قەتڵ و عاممان بینی. قەتڵ و عامی (هوئە) کە ڤیت کۆنگەکان کردیان، چونکە ئەوانە پێش ئەوەی مقاشەکە دابگرن، نەیاندەپرسی تۆ بیرو باوەڕت چییە.

ئەوەی تریش قەتڵ و عامی (داك سون) بوو کە ئەمریکییەکان دەیاندایە پاڵ ڤیت کۆنگەکان، بەڵام وا نەبوو، تاوانباری ڕاستەقینەی ئەم ڕووداوە ڤێتنامییە باشوورییەکان بوون.

ئەمانە دوا بەڵگەی ئەو مەسەلەیە بوون کە بۆم باس کردی.

دەزانی ئەم بیرەوەرییانە تەنیا بەڵگەیەکن بۆ تاقی کردنەوە و هیچی تر، هەرگیز بۆئەوە نین کە شێتایەتی جەنگی خوێناویی ڤێتنام ڕوون بکەنەوە.

تۆ دەزانی ڤێتنام بۆ من تەنیا هۆیەك بوو بۆ لێکۆڵینەوەیەك و دەشمتوانی ئەم لێکۆڵینەوەیە لە هەر شوێنێکی تر ئەنجام بدەم. لە شوێنی تریش پیاو پیاویان





دەکوشت، جا بەهۆی ئەرکی شانیانەوەبێ یا هەر بە خەو و خەیاڵ. من کە ڤێتنامم هەڵبژارد، لەبەر ئەوەبوو کارەساتی ڤێتنام ببوو بە ڕەمز و ئەم ڕەمزە کەوتبووە ناو ژیانی ڕۆژانەمان. لەگەڵ هەموو ئەمەشدا، هیچ شوێنی تر نەبوو لە ڤێتنام باشتر بۆم بسەلمێنێ کە مەرج نییە هەر نازی بیت بۆئەوەی ببی بە پیاو کوژ، دەتوانی بە ناوی ئازادی و دیموکراتی و خۆشەویستیش، چەند قەتڵ و عام بە ناوی ڕایشی گەورە کراوە، ئەوەندە قەتڵ و عامە بکەی.

بەڵێ، دەزانم ئەمریکا وڵاتی (ڕادرایندهور) ە، کە ڕووداوی قەتڵ و عامی (می لای)ی بۆ خەڵك ئاشکرا کرد. هەروەها وڵاتی خۆپێشاندانیشە دژی جەنگی ڤێتنام و ئەو بڵاوکراوانەی کە بە خەم و تووڕەیی بەڵگەی ئەو تاوانە بڵاو دەکەنەوە، کەچی ئەوانی دیکە تەنانەت ئەم ڕوخسەتەش بە خۆیان نادەن.

بەڵام ئەوانەی دەیانگوت (من تاوانبارم)، تاوانەکەیان بەوەندە سووکتر نەدەبوو. ئەو تاوانبارانەی دان بە تاوانی خۆیان دەنێن، دیسان هەر بە تاوانبار دەمێننەوە چ ئەمریکی بن و چ ئیتاڵی و چ فرەنسی و چ ئەڵمانی وچ ئینگلیزی و چ ڕووسی. قەتڵ و عامی (می لای) یش وەکوو قەتڵ و عامی (سانت ئانا) و (مارزا بۆ تۆ) و (لیدیچە) و (بابی یار) و (هوئە) و (ئارد ئاتین) وایە.

ئەگەر بڕیاربێ دادگای (لورنبرگ) بە دادگایەکی ڕەواو یاسایی بناسین، دەبێ دادگایەکی تریش دابمەزرێنین: ئەم جارە دەبێ کوڕە ئازاکان لەسەر کورسی تاوانباری دابنیشن، ئەو کوڕە ئازایانەی دەستووریان دەردەکرد تەنانەت یەك زی رووح چییە لە گوند نەهێڵن، بگرە یەك مریشکیش!

بەهەر حاڵ، ئەم قسانەی من تەنیا ئیتالێیەکان، یان ئەڵمانەکان، یان ئەمریکییەکان ناگرێتەوەو بەس، بەڵکو بە شێوەیەکی ڕەها بۆ هەموو مرۆڤایەتییە: چ سپی و چ ڕەش و چ زەرد، چ پەشێمان و چ نا پەشێمان، چ کۆمۆنیست و چ ئازادیخواز. ئەوانە هەموو بە سیما وەکوو ئینسانی ئاسایی وان: ئارام و بە ئەدەب و کوڕی بە تەربیەت و باوکی میهرەبان و میللەتی بە ویژدانیش، ئەوانە نیشتمانی خۆیان خۆش دەوێ و جەنگ بە ئەرکی سەر شانی خۆیان دەزانن بەرامبەر بە وڵاتەکەیان.

ئەو دێوانەی کە خۆیشیان نازانن دێون و تەنانەت بۆی هەیە زریزەیەکیان بە ملییەوە بێ خاچێکی بچووك یان وێنەیەکی حەزرەتی مێرەمی پێوە بێ و وێنەی دایك و باوکیشیان لە گیرفان بێ و ئەگەر قسەیان لەگەڵ بکەی لەوانەیە بشتگرییێنن و باسی نیاز پاکی خۆیانت بۆ بکەن، ئینجا پاشان، سەر لە بەیانی رۆژێکی مانگی ئادار، سەر لە بەیانییەکی هەتاو، بە خاچی بچووك و، بە زنجیری باریك و، بە بانگەشەی شارستانێتییان، سواری هیلیکۆپتەرێك دەبن و شەش سەد کەس دەکوژن. بەبێ هیچ جۆرە دڵسۆزیی و بەزەییەك! ژنی دووگیان و پیرو منداڵ دەکوژن، (چونکە دەستوور وابووە!)

لە ڤێتنام، هەر وەکوو لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، و بیافرا و جەنگی دووەمی جیهانی و جەنگی گەورە، لە هەموو جەنگەکانی رابردوو و داهاتوو: قەتڵ و عامی رەواو یاسایی ئەنجام دراوەو ئێمەش کولتوور و رێ و رەسمی خۆمان لەسەر ئەوە بنیات ناوە.

ئێستا با بگەڕێینەوە سەر بیرەوەری ئەم چەند رۆژەی رابردوو.

ئەو رۆژانە هێمن و ئارام بوون، بەلاّم من لەبەر ئەوەی نەچووبوومە (خەسان)، نەختێ نارٍەحەت بووم. بەلاّم، رەها لە گرێ کوێرەی جەنگ، نە ئامادەی قبووڵ کردنی مەترسی و نە ئامادەی گۆبەندو هەرا ..!

لەوە بەدواوە تەنیا بەخێو کردن و گەورەکردنی منداڵێکی بچووکی ڤێتنامیم بەلاوە مەبەست بوو.

لە (هوئە) ئەم بیرە لەسەری دام، لە بیرتە؟ وەکوو ئەوە وابوو کە لەناو دۆزەخی کەلەشان،ترووسکاییەکم لێ دەرکەوتبێ.هەستم کرد بە پشکووتنی ژیانێکی تر، ئەو کوژراوە زۆرانەم لەبیر دەچێ کە دیبوومن.

بێ هوودە و مەیلەو مەحاڵ بوو!

ئەم بیرە وردە وردە بوو بە جۆرە نائومێدییەك و جارێکیان کە وەکوو پچڕانی کت و پڕی تەوژمی کارەبا، رووناکییەکەی کوژایەوە، چیتر بیرم لێ نەکردەوە. ئەمە تا زیاتر بەردەوام دەبوو، زیاتر هەستی سستی و بێ بایەخی تێدا دروست دەکردم کە تا ئێستاش هەر بە لامەوە بە نهێنی ماوەتەوە.





لەم بارودۆخە دەروونییەدا، ناسیاویم لەگەڵ (کا ئو کی) پەیدا کردو دووبارە چاوم بە (لون) کەوت. دوو دیداری بە قەدەر یەك گرنگ بوون، بەمەوە توانیم باشتر لە قسەکانی فرانسوا بگەم لە بارەی پاسکال و مرۆڤایەتی.

(٧) ی ئادار

ئارامی بۆ سایگۆن گەڕاوەتەوە و من نەختێ لە ئیسراحەت دام. وەکوو ئەوە وایە ئەم ئارامییە هەموو جۆرە هێز و تاقەتێکی جووڵانەوەی لێ بڕیبم و وەکوو ئەوە وایە وەرزێکی ژیانم تەواو بووبێ.

(دەرك)، بێ ئەوەی بچێتە (خەسان) گەڕابووەوە (دانانگ)، هەوڵی دەدا دڵم بداتەوە: " دەزانی، من تەنانەت هەوڵیشی بۆ نادەم! "

لەپڕ هەستم کرد بێزارم و پێم خۆشە لێرە بڕۆم. تەنیا بۆ خاتری دوو شت لێرە ماومەتەوە: یەکەم ئەوەیە رۆژنامەکەم داوای کردووە چاوپێکەوتنێك لەگەڵ جەنەراڵ (کی) بکەم و دووەم ئەوەیە لە کەللەی داوم هەتیوێك بە منداڵی خۆم قبووڵ بکەم و بەخێوی بکەم. ئەو کاتە بیری منداڵ بەخێوکردن لە سەری دام کە دیتم منداڵەکانی (هوئە) لە دەوری مردووەکان دەخوولێنەوە یارییان پێ دەکەن. بیرەکەم بۆ فرانسوا باس کرد و ئەویش گوتی:

" ها!! ئاخیری بیرێکی عاقلاّنەت کەوتە سەر! ".

(٨) ی ئادار

ناوی (تران تی ئان)ە، پێستەی دەم و چاوی وەکوو عاجی کۆن ناسکە. خاوەنی کارخانەیەکی مژاری کیمیاوییە و ماڵەکەی پڕیەتی لە کەرەستە و کارمەندی زۆری هەیە.

ئەمە رابەر و رێ نیشاندەری ئەو کەسانەیە کە دەیانەوێ منداڵێك بە رۆڵەی خۆیان قبووڵ بکەن. وەکوو خاتوونەکانی خاچی سوور وایە کە وادەزانن بە فرۆشتنی بەزەیی بەهەشت بۆ خۆیان مسۆگەر دەکەن. بۆ مەسەلەی منداڵەکە چوومە دیدەنی. یەکسەر پرسیاری لێ کردم : داهاتم چەندە، پاشەکەوتم چەند هەیە، ئایا کاتۆلیکییەکی باشم یان نا.

کە پێم گوت: نە ئەمەیانم و نە ئەویان، تووڕە بوو، بەلاّم کە پێم گوت:

پەرستگایەکی بچووکم لە زۆزان هەیە ، هەستم کرد زۆر شادومان بوو. وای دەزانی ئەوەی پەرستگای لە ماڵەوە هەبێ، بێ شك فریشتەیشی دیوە!

– پەرستگایەکی پیرۆز!

– بەڵێ، خانم!

– تۆش زۆر جار دەچیتە ئەوێ؟

– نا، خانم! بەڵام هەر کەسێ بیەوێ دەتوانێ بچێ.

– بێ شك تۆ ئەوە دەزانی کە ڤێتنامییەکان منداڵی خۆیان زۆر خۆش دەوێ، هەرگیز بە ئارەزووی خۆیان دەستبەرداریان نابن.

– دەزانم.

– بە تایبەتی کە بیاندەن بە بێگانان.

– بەڵێ، خانم.

– دەوڵەتەکەشمان بایەخێکی زۆر بەم مەسەلەیە دەدا و منیش یەکێکم لە چەند کەسێکی کەم کە ئەم ئیشەمان هەیە، بێ گومان ئەو شتەش رەچاو دەکەم کە دەوڵەتەکەمان جەختێکی زۆری لەسەر دەکا.

– شتی چی، خانم؟

– ئەوانەی منداڵیان دەوێ، دەوڵەت لاری نییە کچیان بداتێ، بەڵام رازی نییە کوڕیان بداتێ. چونکە کوڕەکان دەبێ پاشان بەرگری لە وڵاتی خۆیان بکەن و دەوڵەتی ئێمە سوورە لەسەر ئەوەی سەربازی ئایندە لە دەست خۆی نەدا.

– بەڵام منداڵێکی بچووك، خانم ....

– خانم، ئێمە هەمیشە لە حاڵەتی شەڕداین.

– تێ دەگەم، خانم ...

– جا من هەر ئەوەندە دەتوانم یارمەتیت بدەم کە کچێکی بچکۆلە بۆ خۆت هەڵبژێری، نەك کوڕێکی بچکۆلە.

– خانم، منیش کچێکی بچووکم بەلاوە پەسندترە.

نارەحەت بووم کە نەمدەتوانی بەرامبەر بە تۆپ و تانك پارچە گۆشتێك لە دەوڵەت وەربگرم. بەڵام کچێکی بچکۆلە باشتر بوو. کچی بچکۆلەی ڤێتنامی زۆر





جوانن و بە زۆریش دەبن بە ژنی جوان و نازدار، جوانیی هەرگیز لە ژیاندا شتێکی خراپ نەبووە، تەنانەت تۆڵەی کەم ئەقڵیش دەکاتەوە.

پەروەردگای (تران تی ئان) کەوتۆتە گەڕەکی (گو واپ).

بەیانی دەچم کچەکە وەردەگرم. ئایا دەیناسم؟ ئایا ئەو من دەناسێ؟

لە کاتێکا کە (فرانسوا) و (فلیکس) باس دەکەن گوایە بنکەی فەرماندەی ئەمریکا، (جۆنسۆن) ی لەبەردەم دووڕیانێك داناوە: بەرگری لە شارەکان بکەین یان لە گوندەکان، من بیر لە کچەکەی خۆم دەکەمەوە.

– سەرۆکی سەربازگە (ئارل ویلی) بۆ چارەسەرکردنی ئەم گیروگرفتە چۆتە واشنتۆن و وا دیارە ناکرێ لەیەك کاتدا بەرگری لە شارەکان و لە گوندەکان بکەن، (وست مورلند) یش ناتوانێ بڕیاری پێویست وەربگرێ.

– شەش سەد هەزار ئەمریکی بەس نییە؟ بە راست! ئەوە مەسەلە چییە! فرانسوا.

– مەسەلەکە راستە. دەتوانین وتارێکی لە بارەوە بنووسین. دەزانی؟

چارەسەری ئەم گیروگرفتەش دەبێ بە لێکدانەوەی سیاسی بێ نەك سەربازی.

ئایا ڤێتنامییە باکورییەکان لەسەر رێی (لینین) دەڕۆن کە دەڵێ دەبێ شۆڕش لە شار بکرێ، یان رێگەی (ماو) بەکاردێنن کە دەڵێ شۆڕش دەبێ لە لادێ دەست پێ بکاو ئینجا بگاتە شار. من ئەم مەسەلەیەم بە لاوە گرنگ نییە. ئەمشەو من تەنیا مەسەلەی کچۆڵەکەم بە لاوە گرنگە. ئەگەر ئەوم لەگەڵا بێ، ئیتر پێویستم بەوە نییە خۆم بدەمە بەر گوللە بۆ ئەوەی بۆ خۆم بسەلمێنم کە هێشتا زیندووم. ئەگەر ئەوم لە گەلا بێ ئیتر پێویستم بە چوونە (خەسان) و شوێنی وەکوو ئەوێ نییە، ئەگەر ئەوم لەگەلا بێ، کە لە فڕۆکەخانە وا بخوازێ سواری هیلیکۆپتەری پڕ تەقەمەنی بم، پێم شەرم نییە لەوێ ڕا بکەم و بڕۆم.

فێریشی دەکەم کە ...

دەنگی فرانسوا و فلیکس تێکەڵ و پێکەڵ ببوو.

– فرانسوا، تورات چییە؟ بەلای تۆوە ئەمانە پەیڕەوی تیوری (لینین) دەکەن، یان تیوری (ماو)؟

– وا بزانم پەیڕەوی تیوری (ماو) دەکەن.

– بەڵێ، بەڵام پێشتر تیوری (لینین) یشیان بەکارهێناوە، وانییە؟

– ئەی تۆ، رات لەم بارەیەوە چییە؟

– من بیر لەوە دەکەمەوە فێری بکەم یاری بە تەرم و جەنازەی مردووان نەکا، فێری دەکەم ئەوانە لە بیربکا کە بەناوی تیوری (ماو)، یان تیوری (لینین)، یان سەرمایەداری، ئیعدام کراون ...

کۆڵانەیەکی پیس و تەنگەبەر بوو، هەردوو لای، پڕ پاشماوەی وێرانە بوو. خەڵکی کۆڵانەکە بە چاوی دوژمنانە سەیریان دەکردین، چونکە جلی پاك و پۆشتەمان لەبەر بوو. ئەو خانمە دەوڵەمەندەی یاوەری منی دەکرد، لە زەنگی دەرگایەکی داو راهیبەیەکی ڤێتنامی لەناو دەرگاکە دەرکەوت. پیرو قەڵەو بوو، سەرنجێکی پڕ قینی هەبوو. ئەم دووانە چەند قسەیەکیان لەگەڵ یەکدی کرد، ئینجا راهیبە پیرەکە دەرگای کردەوە و بردمییە ژوورێك و لەوێ هەندێ پرسیاری لەم جۆرەی لێکردم:

– حەز دەکەی تەمەنی چەند ساڵ بێ؟

– حەز دەکەم زۆر بچووك نەبێ، چونکە سەفەرێکی دووری لەپێشە.

– سێ مانگی چۆنە؟

– ئۆە، نا. من ناتوانم کۆرپەیەکی ساوای شیرە خۆرە بەخێو بکەم.

– شەش مانگی؟

– نا، خوشکێ، نا! بەلانی کەمەوە تەمەنی ساڵێك یان ساڵ و نیوێك بێ بۆ ئەوەی بتوانێ خۆی خواردن بخوا.

– تکایە فەرموو لەگەڵم وەرە.

وەکوو ئەوە وابوو بۆ کڕینی سەگێ یان رەشەوڵاغێ بمبا.

وەکوو فرۆشیارێ کە بە لایەوە جیاوازی نەبێ کڕیارەکە شتەکە دەکڕێ یان نایکڕێ، بەڵام بێ گومان ئەگەر کڕیارەکە پارەیەکی باشی بدا، زۆر شادو خۆشحاڵ دەبێ.

بەم شێوەیە لە پلیکانە بردمییە سەرەوە بۆ ژوورێکی گەورەی پڕ تەختی





منداڵانە.

ئەوسا لەبەر دەم یەکەم ریزە تەخت وەستاو خێرا خێرا دەستی یەك یەك لە تەختەکان دەداو دەیگوت:

– ئەمە؟ ... یان ئەمە؟ ... ئەی ئەمە چۆنە؟

هەر تەختەو منداڵێکی رووت و بچووکی لەسەر بوو، دەم و چاوی پڕ جێگای سووتانی ناپاڵم، یان نیشانەی نەخۆشی تر بوو.

– ئەمە...؟ ئەمە ...؟ ئەمە ...؟

کە لە نیشاندانی تەختەکان شەکەت بوو، تووڕەیی و بێ ئۆقرەیی لێ دەرکەوت.

پاشان منداڵێکی سەیری کەلەش بچووکی سەر زلی پڕ جێ برینی هەڵگرت و وەکوو پریاسکەیەك فڕێی دایە باوەشی من.

– ئەمەت پێ باشە؟

ژنەکەی یاوەرم قسەکەی لێ وەرگرتەوە و گوتی:

– ئەمە زۆر بچووکە، زۆر بچووکە!

راهیبەکە بە پرتەو بۆڵە منداڵەکەی لێ وەرگرتم و لەسەر تەختەکەی دانایەوە و ئێمەی بردە ژوورێکی تر. ژوورێکی بچووك بوو، زیاتر لە قەفەسی دەکرد. کاسەیەکی پڕ برنجی کوڵاو لە ناوەندی ژوورەکە بوو، منداڵی یەك ساڵی و دوو ساڵی لە دەوری کاسەکە دانیشتبوون برنجیان بە دەست دەخوارد و سیمایان لە منداڵەکانی ژووری یەکەم ساختر دیاربوو. وا چاکە بەمانە نەڵێین (منداڵ)، چونکە شکڵیان وەکوو ئینسانی پیر وابوو کە ئەندامی لەشیان بە جادوویەکی شەیتانی بچووك بووبێتەوە. دەمارەکانی پێستی دەستیان زەق دیاربوو، دەتگوت بای کردووە، پێستی روومەتیان وشك و شل و خاو بوو، دەتگوت تەمەنیان نەوەد ساڵە. داهاتمەوە سەریان. یەکێ بە دووچاوی بادەمی غەمگین تەماشای کردم و بە دوو ئەنگوستی لەڕ زرانی لاواندمەوە و بە دوودڵی هەستم کرد لەوانەیە ئەمە بکەم بە کوڕی خۆم.

پێم گوت: تۆ کێی؟

بە چاوی غەمگین پێکەنی.

– دەتەوێ ببی بە کوڕی من؟ دە وەرە باوەشم!

لەو کاتەدا یەکێ بە دوو دەست بە تووڕەیی لە زەوی بڵندی کرد و بە دەنگێکی تووڕە گوێی کاس کردم:

– ئەی نابینی ئەم منداڵە کوڕە؟ کوڕ! کوڕ!

– با، دەبینم.

– باشە، ئاخر ئەمە دەبێ لە پێناوی وڵاتەکەی خۆی بجەنگێ.

کوڕە، وەك ئەوەی لە مانای قسەکانی راهیبە گەیشتبێ، قیژاندی ، بەڵام قیژانێکی ئەوەندە توند و ئەوەندە رەچاو نەکراو لەو کەلەشە بچووکە، کە ژنەی یاوەرم لە شەرمەزارییان رەنگی سوور هەڵگەڕا.

دوای ئەم قیژەیە، قیژەیەکی تری کردو دیسان قیژەیەکی ترو ئینجا قیژەی چوارەم ، تا وای لێ هات منداڵەکانی تریش لاساییان کردەوە و هەموو لە هەموو کردیانە گریان و قیژە قیژو پێ لە زەوی کوتان و ئەوەندە بە نائومێدی و ناڕەحەتییەکی قووڵ وایان دەکرد، هەر دەتگوت دەزانن چ دەکەن.

ئەم دەنگە لە ژووری ئەم منداڵانە چووە دەرەوە، گەیشتە ئەو ژوورەی منداڵە کۆرپەکانی تێدا بوو، ئەوانیش دەستیان بە گریان و هاوار کرد. دەنگەکە لە ژووری ئەوانەوە پلیکانەی بڕی و گەیشتە حەوشە و سی چل دەنگی تر تێکەڵ کۆرسەکە بوون، یان باشترە بڵێین ناڕەزاییان دەربڕی.

نیو سەعاتی پێ چوو تا دووبارە بێ دەنگی باڵی بەسەر شوێنەکەدا کێشایەوە و توانیم لە گەڕان و پشکنین بەردەوام بم.

بەڵام لەوە بەدواوە گەڕان بێ هوودەبوو. ئیتر لێکم نەدەکردنەوە چونکە ژمارەیان گەلێ زۆر بوو، وەکوو مردووەکانی (هوئە)، هەمووشیان بەیەك دەچوون. ئەگەر جیاوازیشیان هەبووبێ، وەکوو مردووەکانی (هوئە)، لێك جوداکردنەوەیان زۆر زەحمەت بوو، وەکوو ئەوە وابوو بتەوێ رەنگەکان لە تاریکی لێك جودا بکەیتەوە.

بە یاوەرەکەمم گوت:

– تکایە، با بڕۆین.

– وا زوو؟!!





– تکایە، سبەی دووبارە دێینەوە.

مەیلەو لەدوو خۆمم راکێشا. کە ئاوا بەدوو خۆمدا رامدەکێشا، چاوم روون بووەوە و دووبارە توانیم رەنگەکان لەیەك جودا بکەمەوە و لەناو ئەو رەنگانەدا دەم و چاوێکی خڕو بچووکم بینی بە سەرنجێکی ناشیرین تەماشای دەکردم.

– ئەی نەڕۆین، خانم!

لە خوار ئەم دەم و چاوە بچووکە، یاخەیەکی زل بوو، لە خوار ئەو یاخەشەوە بەروانکەیەکی دامەیی قۆڵ درێژ. لەسەر بەردێك دانیشتبوو، شانی بە دیوار دابوو. تەمەنی دەوری سێ ساڵ دەبوو. ئارەزوویەکی نهێنی و سەیر بەرەو ئەو منداڵە رایکێشام.

– خانم، با بڕۆین، تەکسیم بانگ کردووە. لەبەر چاوەکانی بوو، من ئەم ئارەزووەم تێدا پەیدا ببوو. چاوی: گەش و رەش و تیژبوو، لێوی بچووك و قەپات و سەیربوو! دیمەنی بە منداڵ نەدەچوو، بۆ نموونە شێوەی راگرتنی سەری، یان شێوەی لێك نزیکی پێیەکانی، یان شێوەی دوور دانیشتنی لەوانی دی.

– خانم، تەکسی ناتوانێ لەوە زیاتر گیرۆ ببێ!

– وا هاتم!

لە حاڵەتێکی تایبەتی دابوو، وەکوو ئەوەی نە هیچی بوێ و نە چاوەڕوانی هیچ بکا. لەوانی دیکە جیا بوو. تەواو. دەتوانم سوێند بخۆم بەشداری قیژە قیژو هات وهاواری ئەوانی تری نەکردووە.

– خانم، ئەگەر دەتەوێ با تەکسییەکە بە رێ کەم!

– نا، وا هاتم.

کە سواری تەکسی بووم، ئەو نەختێ لە جێی خۆی جوولایەوە. بۆ لەحزەیەك وام بە مێشکدا هات کە هەستاوەتەوە بۆ ئەوەی بەرەو لای من را بکا، بەڵام بۆ ئەوە خۆی جوولاندەوە تا باشتر پشت بە دیوارەکە بدا. دەمی نەختێ بەش کردبووەوە و چاوی بڕیبووە من.

– بەڵام ئەگەر بتەوێ ... وانییە، دایکی روحانی؟

راهیبەکە وەڵامی دایەوە:

– بەڵێ، بەڵێ!

وەکوو بازرگانێك هەستی کرد خەریکە موعجیزەیەك روودەدا، ئێستاش بۆی هەیە کارەکەی بەرهەمی هەبێ و بەم هەستەیا شادو خۆشحاڵ بوو.

– ئایا هیچتان دەست کەوت بە دڵتان بێ؟

لەوانەیە ئەم قسەیە بێ کە منی بزواند، ئەم ئاوازە دوکاندارانەی ئەو! لەوانەشە کچەکە خۆی بێ، بە تەواوی نازانم. ئەنجام، لەسەر کورسی تاکسی بزمار کوت دانیشتم و دەستم هێشتا لەسەر دەرگای نیمچە کراوەبوو، دەمەویست دابەزم، بەڵام لەشم لە دوو نەدەهات. دەرگام داخست و تاکسی بەڕێ کەوت و ئەویش وەکوو خەون و خەیاڵ لە پشت شووشەی پەنجەرەوە بزربوو.

دەوری نیوەڕۆ بوو. ئێستا سەعات پێنجە و هێشتا هەر بیری لێ دەکەمەوە.

حەزدەکەم بچمەوە ئەوێ بەڵام حکوومەتی سەربازیی گوواپ لە سەعات پێنج دەست پێ دەکا.

چۆنە بەو پسووڵەیە بچم کە روخسەتم پێ دەدا تا سەعات هەشت لە دەرەوەبم؟ نا، شتێکی گەلۆرانەیە، لەوانەیە (لون) دەستگیرم بکا. جا واباشترە پاشان بچم. ئەو منداڵە ترسم دەخاتە دڵ، دەق وەکوو ئەو ترسەی لە سەرەتای عاشقی دا تووشی ئینسان دەبێ، ئەو کاتەی کە عەقڵمان پێمان دەڵێ دەبێ غەم و ئازارێکی زۆر بخۆین، دەبێ وریابین زۆر لێی نزیك نەکەوینەوە و پاشان پێناوێك دێ و بە شێوەیەکی خێراترو باشتر لێکمان نزیك دەکاتەوە. لێ کاتێکا دەزانین ئاخیری گرفتار دەبین، بەڵام ئامادەین بۆ خاتری یەك دەقیقە خۆشی، هەزاران دەقیقە ئازار بکێشین.

<u>شەو</u>

بەیانیش بۆم ناکرێ بچمەوە ئەوێ. (فرانسوا)، کاتێکی چاوپێ کەوتنی بۆ لە (کائوکی) وەرگرتووم.

چاوپێکەوتنەکە لە سەعات یازدە دیاری کراوە، وا بزانم شتێکی باش دەبێ. ئەمشەو تا توانیم شتم لەسەر (کا ئوکی) کۆکردەوە.کەس باوەڕ ناکا ناودار ترین و بە دەسەڵاتترین پیاوی ڤێتنامی باشووری دۆن جوان بێ. پێش سێ ساڵ،





بەهۆی ئەو کچانەی ئەشقی ببوون و بەردەوام لە دەوروبەری دەخولانەوە و بە هۆی ئەو ویسکییە زۆرەی دەیخواردەوە و بە هۆی ئەو یانەی شەوانەی هات و چۆی دەکردن، ناوبانگی پەیداکرد، هەمیشەش هەر بەو جلە سەربازییە رەشەو ئەو مل پێچە ئاوریشمە مۆرە!

دەڵێن لە رادە بەدەر خەرافاتییەو بڕوای بە فاڵ هەیە. عاشقی سەیرکردنی شەڕە کەڵەشێرە، لە (تان سون نوت) خانوویەکی هەیە سەدان کەڵەشێری تیا بۆ شەڕە کەڵەشێر پەروەردە کردووە.

هەندێ جار بۆ پەیداکردنی کەڵەشێرێکی تایبەتی، ئەگەر پێویست بکا، ئامادەیە نیوەی ڤێتنام بە فڕۆکە ببڕێ و تەنانەت بەسەر حەشارگەی ڤیت کۆنگەکانیشدا تێپەڕێ! کابرایەکی گەندەڵە. رەنگە لەوانی دی گەندەڵتر بێ. پێویستی ماڵیی پەیوەندی بە بردنەوە و دۆڕاندنی قومارکردنەوە هەیە. ژمارەی لایەنگرەکانی هەر زۆر کەمە و ئەوانیش بەڵگەی جیاوازیان بۆ پەسند کردنی هەیە. یەکێ لەم بەڵگانە ئەوەیە، ئەوان وا دەزانن کە پێش چەند ساڵێ ژنە فرەنسییەکەی خیانەتی لەگەڵ کردووە و پاشان جێی هێشتووە و رۆیشتووە، بۆیە ئەم وەها تووشی کەمتەرخەمی بووە، هەروەها بڕوایان وایە کە باوکێکی چاکە بۆ کوڕەکانی و بۆئەوە دووبارە ژنی هێناوەتەوە تا منداڵەکانی بێ دایك نەبن و ... هی تر ...

هەندێ جاریش شتی چاکی لە بارەوە دەبیسی، بیروڕات نەختێ بەرامبەری دەگۆڕێ: حەز لە فیلمی (جیمز باند) دەکات و تەنیا گوێ لە مۆسیقای (بیتل) ڕادەگرێ و تەنیا کاتی لەگەڵ ئاوازی مۆسیقای برامس خەو دەیباتەوە. هەرگیز کتێبی جدی ناخوێنێتەوە، کتێبخانەکەی پڕ کتێبی پۆلیسییە.

رۆژێ (فرانسوا) دەچێتە سەردانی بۆ ئەوەی گفتوگۆی لەگەڵ بکا، لەسەر مێزەکەیا ئینجیلێك لە بەینی دوو کتێبی پۆلیسی دەبینێ و بە سەرسامی دەڵێ:

((پیرۆزباییت لێ دەکەم، دەبینم دەستت بە خوێندنەوەی شتی چاك کردووە ...))

(کا ئو کی) ئینجیلەکە هەڵدەگرێ بۆ ئەوەی  فڕێی بداتە ناو تەنەکەی زبڵ و وەڵام دەداتەوە:

" ئەمە، ئەمڕۆ بەیانی قەشەیەك بۆی هێنام! "

لەگەڵ هەموو ئەمانەشا، (فرانسوا) بەرگری لێ دەکا. ئێستاش بڕوای وایە کە ڤێتنام بە (کی) ناسراوە و لە هەموو کەسی لە ڤێت کۆنگەکان نزیکترە.

(فرانسوا) دەڵێ، جەنەراڵ (کی) ئەگەر بێ و ڕۆژێ بکوژرێ، بە دەستی پیاوەکانی خۆی دەکوژرێ نەك بە دەستی ڤێت کۆنگەکان. هەمیشە بە دەنگێکی گاڵتەجاڕانە دەڵێ: ((باش دەزانم ئەوەی بیکوژێ، کۆمۆنیست نییە)). سەرت سوڕ دەمێنێ کە قسەی لەگەڵ بکەیت و تێ بگەی سوشیالیستێکی ڕاستەقینەیەو بڕوای بە ئازادی ڤێتنامێکی یەك پارچە هەیە بە خەتێك نەکرابێتە دوولەت.

بە!! ئەم قسانەی (فرانسوا) هەمیشە سەیرو سەمەرەن. بەهەر حاڵ (فرانسوا) لە بیری کردووە پێم بڵێ کە (نگوین نگوك لون) نزیکترین هاوڕێی جەنەراڵ (کی)یە.

تا زیاتر بیری لێ دەکەمەوە، زیاتر بە لامەوە وەکوو شتێکی نەشیاو دەکەوێتەوە. تا بەلامەوە زیاتریش نەشیاو دەکەوێتەوە، زیاتر بڕوا دێنم کە هەرگیز ناکرێ پێشبینی شت بکەین، تەنانەت ناتوانین پێش وەخت پێشبینی هەڵس و کەوتی خۆیشمان بکەین.

زۆر بیرم بە مێشکدا دەهات، مەگەر دەتوانم دووبارە دەستی بگوشم!

ئێستا بۆتان باس دەکەم چ ڕووی دا.

لە ژووری چاوەڕوانی (کا ئو کی) بووم کە کەوتۆتە نهۆمی دووەمی کۆشکی دەسەڵاتدارێتی. دەوری دوو سەعات دەبوو چاوەڕێم دەکرد. بۆ ئەوەی بێ تاقەتیم کەم بێتەوە، لە دالانەکە دەستم بە پیاسە کرد و هەروا چاویشم بڕیبووە دەرگای ژووری (کائوکی)، لەپڕ دەرگا کرایەوە و یەك کۆمەڵە ئەفسەری ڤێتنامی لە ژوورەوە هاتنە دەرێ، یەکێکی وردیلەیان تێدابوو جلی مەدەنی لەبەر بوو، چاکەت و پانتۆڵێکی بۆر و کراسێکی بێ قەرەوێتی لەبەر بوو. لەبەر ئەوەی ئەم عەیامە کەم خەڵك بە جلی مەدەنی دەبینم، زیاتر لێی ورد بوومەوە. ئەمە کێیە؟ بەڵێ، خۆیەتی. ژەنەراڵ (لون)ە. پشتم تێ کردو ویستم بڕۆم، بەڵام تازە کار لە کار ترازابوو، منی دی بوو. زاری ترسناکی گوایە بە زەردەخەنە لێك کردەوە. باوەشی کردەوە و بەرەو ڕووم هات و بە شادومانی هاواری کرد:





((سەلام، چۆنی؟))

خەریك بووم ئەم ڕووداوەم بۆ (فرانسوا) دەگێڕایەوە، کە حەوسەڵەی نەماو لە شوێنی خۆی هەستاو دەستی بە ڕۆیشتن کرد. ئینجا ڕاوەستا و دووبارە گوێی دایە قسەکانم. دەم و چاو داچۆڕا بوو، خەندەیەکی ژەهراوی بەسەر لێوەوە بوو. بۆ جاری سێیەم پرسیاری کرد:

– ئەی تۆ؟ چیت کرد؟

گوتم هیچم نەکرد، دەتوانم چ بکەم. نەمدەتوانی تف لە چارەی بکەم، نەمدەتوانی داوای یارمەتی لە کەس بکەم، کەوتبوومە داوەوە کە...

– هەر هیچ نەبێ دەتتوانی پشتی تێ بکەیت و بڕۆی.

– ئێ ، نەمتوانی واش بکەم. هەروا بەبێ جووڵە وەستام و تەماشام کرد. سەرم سوڕما، نەك لەبەر ئەوەی جلی مەدەنی لەبەر بوو و سەروسەکوتێکی پێکەنیناوی هەبوو، بەڵکو بۆیە سەرم سوڕما چونکە یە کەیفخۆشی بەرو ڕووم هات و زۆر میهرەبانیش بوو.

لە وەڵامی قسەکەیا گوتم: باشم.

– ئێ ئێ، ئاوها! باشە، ئەوسا چ بوو؟

گوتم ئەوسا بە میهرەبانی ماچی کردم و دەستی گوشیم.

– تۆش دەستی ئەوت گوشی؟

– نا، من دەستی ئەوم نەگرت. ئەو دەستی منی گرت. ئەوە چەند جار دووبارە بکەمەوە. دەستی ڕاستەی گرتم و بۆ لای خۆی رایکێشا و رایگوشی.

بەم جۆرە ...

– تۆش لێ گەڕای دەستت بگوشێ، دەق وەکوو کۆنە هاوڕێیەکی باش.

– من تەنیا لێ گەڕام دەستم بگوشێ و تەواو! بەبێ دەنگیش! تووڕەش بووم. بەهیچ جۆرێ لەو جەنەراڵ (لون)ەی نەدەکرد کە تۆ دەیناسی. زۆر میهرەبان بوو.

– ئاوها! ...

– سوێند دەخۆم چاك و چۆنیەکەم زۆر سارد بوو، بەڵام ئەو هەستی بە وەزعی من نەکرد. تەنانەت تەوازۆیشی بۆ هێنامەوە کە لە چاوپێکەوتنی (کی) درەنگم

بەسەر هات، گوتی دانیشتنێکی کت و پڕو زۆر گرنگی لەگەڵ جەنەراڵەکان هەبوو.

– پرسیارت لێ نەکرد بۆچی کابرای دەست بەسراوی کوشت؟ پەیامنێرێکی باش! لەوە باشتر هەڵناکەوێ، تۆ لەوێ بووی، ئەویش لەوێ بوو، تۆ دەبوایە پرسیاری لێ بکەی: ( تۆ بۆچی کابرای دەست بەسراوت کوشت؟)

– دەمەویست پرسیاری لێ بکەم بەڵام نەمتوانی.

– ئاخر بۆچی؟

– لەبەر ئەوەی ...

(فرانسوا) لە قسەکانم نەدەگەیشت. من بۆیە ئەم پرسیارەم لە (لون) نەکرد، چونکە لەپڕ بەزەییم پێدا هاتەوە. دەزانم ئاسان بوو ئەم جۆرە پرسیارەی لێ بکەم. هەم کاتم بە دەستەوە بوو، هەم کەسیش نەبوو گوێی لە قسەکانم بێ، بەڵام لەو کاتەدا ئەو بێ دیفاع بوو، هەستم کرد چەند پێویستی بەوەیە کەس تفی لە چارە نەکات. وەکوو ئەوە وابوو کە ... وەکوو ئەوە وابوو کە ئیتر بەرگەی تەنیایی نەگرێ و نەیەوێ لەگەڵ هاوکارە گورگ سیفاتەکانی تری دا بێ.

وەکوو ئەوە وابوو کە ...

لە شوێنێکا چیرۆکی گورگێکی شەلم خوێندەوە کە گورگەکانی دی بە خۆیانەوە نەدەگرت، ئەویش شەو دەچووە لای سەگەڵ نەك بۆ ئەوەی بیانخنکێنێ، بەڵکو بۆ ئەوەی لە گەڵیاندا بێ. سەگەڵ بە گەرمی بە خۆیانەوە گرت و پێی نەوەڕین.

– فرانسوا، دەزانی (لون) ئەوکاتە دەق وەکوو ئەو گورگە شەلە وابوو.

– خەریکی ئەدەبیات دادەڕێژی و قسەی هەلەق و مەلەق دەکەی! (لون) شەل نییە، دووقاچی ساغ و سەلیمی هەیە، خۆزگە قاچێکی لەدەست بدایە. بەهەر حاڵ بە لانی کەمەوە دەبێ قاچێکی بڕوا ئەوجا دەتوانێ دەستی من بگوشێ. تۆ زۆر غەڵەت بووی، زۆر!!

لەوانەیە من غەڵەت بم، بەڵام بۆچی (فرانسوا) هەمیشە هەوڵی ئەوەیەتی هۆی ئەو کوشتنە بزانێ؟!

کە یەکێکمان تووڕ هەڵدا ئیتر پێویست ناکا غەڵەتەکانی روون بکەینەوە. کە بە دوای هۆی غەڵەتەکانی دا دەگەڕێین، مانای وایە هێشتا بە تەواوی تووڕمان





نەداوە.

دەبێ لەنگەری خۆم رابگرم بۆ ئەوەی بتوانم باس بکەم پاشان لەگەڵ (کا ئو کی) چ هاتە پێشەوە.

<u>شەو</u>

کە (لون) رۆیشت، چوومە ژوورێك دوو لاتەخت و گوڵدانێك و ئالأیەك و مێزێکی نووسینی پڕ تەلەفۆنی تێدابوو.

(کا ئو کی) لە نزیك پەنجەرەو پشت لە من وەستابوو. کە گوێی لە ترپەی پێی من بوو، ئاوڕی دایەوە و بەرەو رووم هات. بەڵام بەبێ زەردەخەنە و بەبێ هیچ جۆرە میهرەبانییەك. بەبێ بایەخی دەستی راستی بۆ پێشەوە درێژ کردو زۆر بە ساردی فەرمووی لێ کردم دابنیشم، ئەوسا خۆیشی دانیشت و کەوتە تەماشاکردنی من، منیش چەند چرکەیەك تەماشام کرد. دەبێ ئەوەش بڵێم کە هەستم بە هیچ شتێ نەکرد. لەگەڵ سەرنجی یەکەم، هەستت دەکرد ڤێتنامییەکە وەکوو هەر ڤێتنامییەکی تر. نە بالأ بەرز و نە قوتە، نە قەڵەوو نە لاواز، بە رووکار لەوانی دیکە جیا نەبوو. مەگەر سمێڵی رەشی کە لەسەر دەم و چاوی رەشتاڵەی روابوو. دەم و چاوی لەوانەبوو کە ئینسان هەوەسی پێ نایە، غەم و لووتبەرزی تێدابوو. نیگای تیژو غەمێکی قووڵی تێدابوو.

هەندێ لە قسەکانی ئێستاش لە گوێمدا دەزرنگێتەوە: " من تەنیا کەسم کە لەم بەری سەنگەر وەستاوم و زات دەکەم بڵێم سەر بە رژێمێکی لاواز و بێ تواناو گەندەڵم. من تەنیا کەسم کە دەڵێم ئەمریکییەکان نەهاتوونەتە ئێرە بۆ ئەوەی بەرگری لە ئێمە مانان بکەن، بەڵکو هاتوون بۆ ئەوەی بەرگری لە بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بکەن و موستەعمەرەیەکی نوێ لێرە دابمەزرێنن. ئەو هەڵبژاردنەی ئەمریکییەکان کردیان و من بووم بە یاریدەدەری سەرۆك، تەنیا شتێکی رووکەش بوو و بەس، خەڵك لە ترس و نەزانی دەنگیان دەدا."

یان: " من لە وشەی سوشیالیزم ناترسم. ئەمریکییەکانن کە ئەم وشەیە وەکوو جوێنێکی پیس بەکاردێنن و بەرامبەر بە ئازادی رایدەگرن. ئازادی بۆچی؟ بەرامبەر بە چی؟ ئەمڕۆ لە ڤێتنام ئێمە پێویستمان تەنیا بە یەك ئازادی هەیە،

ئازادی خواردن بۆ نەهێشتنی برسێتی. بۆ هوشیارکردنەوەی ویژدانی میللەت، دەبێ لە پێشا هەقیان هەبێ کاسە برنجێکیان بدەینێ، ئینجا وایان لێ بکەین لە پێناوی ئەو کاسە برنجەدا بجەنگن... "

بیر لەوە دەکەمەوە، ئەو ئەگەر، ئێستا لە سەنگەری ئەوبەر بوایە، ئێستا لە چ وەزعێکدا بوو؟ بێ گومان دەبوو بە لایەنگری (هوشی مینە).

ئەم قسەیەم بۆ کرد، بەڵام ئەو گوتی من (هوشی مینە)م بە لاوە گرنگ نییە چونکە سەر بە جیلێکی ترە: " ئەو تەمەنی حەفتا ساڵ زیاترە و من تەمەنم تەنیا سی و حەوت ساڵە، چ قسەیەکی هاوبەشمان هەیە بتوانین لەگەڵ یەکتری بکەین؟ بێ گومان من ڕێزم بۆ کەسانی پیر هەیە، من سەر بە جیلێکم ڕێزی زۆری پیرانیان لەلایە، بەڵام باوەڕناکەم پیرەکان بتوانن شتێ فێری ئێمەمانان بکەن بە تایبەتی کە ئەو شتە پەیوەندی بە دروست کردنی میللەتێك و ئایندەیەکەوە هەبێ. گوێ بدەیتە قسەیان، مانای وایە غەڵەتەکانیان دووبارە دەکەیتەوە.

بۆی هەیە (فرانسوا) هەقی بێ کە گوتی: " دەزانی، ئەو، لەوە زیاتر ڤێتنام دەناسێ کە تۆ بۆی چووی، ئەو، لەوە زیاتر لە ڤیت کۆنگەکانەوە نزیکە کە تۆ بۆی چووی. ئەگەر نەختێ ڕۆشنبیرتر بوایە، بێ شك ناوی لە مێژووی وڵاتەکەیا بە نەمریی دەمایەوە. "

(١١)ی ئادار

هەندێ جار ئازایی ئایدۆلۆجی، (فرانسوا) بەرەو جۆرە شێتییەکی عاقڵانە دەبات و هەندێ جار تینوێتی بۆ دادپەروەری، دەبێ بە مایەی ئەوە چاکە لە شوێنی وا بەدی بکا کە چاکەی تێدانییە. من وای بۆ دەچم کە (فرانسوا) بێ لێکۆڵینەوەی تەواو جۆرە ئومێدێك لەم (کا ئو کی)یەدا، دەبینێ .

نیوەڕۆیەو دەبێ بچمە گواپ. چاوەکانی ئەو کچە لێم جیا نابنەوە .هەندێ جار، لە کاتی پووچی و بێ هوودەییدا، لەگەڵ چاوی (کا ئوکی) و چاوی (لون) دەبن بە یەك شت. هەریەکە وەکوو ئەوەی تر وایە، بە قەدەر یەك، گەش و ڕەش و بێ شادین. ئەمانە چاوی ڤێتنامن.

هێشتا کاتی چاوپێکەوتنێکی ترم لە (کی) وەرنەگرتووە. بەڵام ناسیاویم لەگەڵ





ژنەکەی پەیدا کردووە. دەعوەتی (چا)ی کردم بۆ ڤێلای شەقامی (کونگ لی). ئێستا ماڵی لەوێیە. کە ناچاربوون خانووەکەی گەڕەکی (تان سون نوت) چۆڵ بکەن چونکە بە هاوەن وێران ببوو و ڤیت کۆنگ داگیریان کردبوو، هاتنە ناو ئەم ڤیلایەی شەقامی (کونگ لی).

ڤیلاکە شوورەیەکی بڵندی لە دەورە کراوەو چەند ڕەشاشچییەك پاسەوانی دەکەن. بەڵام هێرشی ڤیت کۆنگەکان بەمە ناگەڕێتەوە. شەو بۆ خەوتن دەچنە کۆشکی ئازادی و نوێنیان لەسەر زەوی را دەخەن و دەخەون.

گوتی: " ئێمە وەکوو سەربازان دەژین. وای بتدیبایە منداڵ چۆن فێربوونە لەگەڵ بیستنی یەکەم تەقە خۆیان لە ژێر لێفە بشارنەوە، وای لێ هاتووە تەنانەت ناشترسن. "

خانمی (کی) ژنێکی جوان و گەنجی بیست و حەفت ساڵەیە. دەم م چاوی وەك بلوور و لەشی وەکوو قامیشە. جلی ئەورووپی لەبەر دەکاو شت لە (مزون پیرکاردن) دەکڕێ. قژی هەمیشە ئارایش کراوەو هەمیشە بۆنی لێدراوە. دەق وەکوو ئەوەی بیەوێ بچێتە شانۆ. پێشتر قوتابی بیرکاری بووە لە زانکۆی (ناترانگ) و لە هێڵی ئاسمانی ڤێتنام میواندار بووە و، لە سەفەرێکا بۆ (بانکوك)، (کا ئو کی) ناسیوە:

" یەکسەر بۆ شێوی ئێوارە داوەتی کردم. گوتم بە مەرجێ داوەتەکە قبووڵ دەکەم، هەموو کارمەندانی ئەم فڕۆکەیە داوەت بکەی. "

ئەم قسەیەی منی پێ خۆش بوو چونکە پیاوێکی جیلی کۆنە. دوای شێو خواردن داوای لێکردم ناسیاوی لەگەڵ منداڵەکانی پەیدا بکەم و هەر زوو گوتی: من زیاتر بە دوای دایکێك دا دەگەڕێم بۆ منداڵەکانم، تا ژنێك بۆ خۆم و گوتی بە مەرجێ زەماوەندت لەگەڵ دەکەم کە منداڵەکانی منت وەکوو منداڵی خۆت خۆش بوێ و بە باشی بەخێویان بکەی و چاوت لێیان بێ.

ئێستا کچێکی بچکۆلەشمان هەیە: (دوین). حەز دەکەم ئەو کەسانەی مێردی من بە پیاوێکی بەدکار دەزانن، بێن لەناو خاوو خێزانەکەیا بیبینن. ئۆه! هەر ئەمن دەزانم پیاوی بەدکار چۆن زۆر بە چاکی دەتوانێ خۆی بە مێردێکی چاك، یان بە

باوکێکی چاك نیشان بدا. ئەی سروشتی راستەقینەی پیاو، هەر ئەو رەفتارە نییە کە لەناو ماڵ و خانەوادەکەی هەیەتی؟ دەسەڵات و جەنگ وێنەی شت لە شێوەی خۆی دەباتە دەرەوە. "

زۆر بە نەرمی ئەم قسانەی دەکرد، کە گوێم دایە، وای بۆ چووم رەنگە قسەکانی دەربارەی مێردەکەی راست بێ. (نگوین وان سام) ی تیرۆریستیش ئینسانێکی چاك بوو، ژنەکەی خۆی خۆش دەویست، کوڕەکەی خۆش دەویست و بە بیستنی دەنگی یەك لایلایە دەورووژا، بۆمبای کلیمۆریشی دروست دەکرد و بۆمباکەی پڕ ساچمە دەکردو بە یەکجار یەك دەرزەن خەڵکی دەکوشت.

(١٤) ی ئادار

دوێنێ پاش نیوەڕۆ، دوای دانە[1] رۆژێك چاوەڕوانی لە ڤیلاکەی شەقامی (کونگ لی)، دووبارە چاوم پێ کەوتەوە. کە لەگەڵ یاوەرە چەکدارەکانی هاتەوە، هەر رایکرد منداڵەکانی ماچ کرد، ئینجا خۆی فڕێ دایە سەر لاتەختێك و گوتی: (وای چەند شەکەتم!). لە شەکەتیش زیاتر، وا دەکەوتە بەرچاو کە تەواو داهێزراوە. هەموو لووتبەرزی و حاڵەتی جدی لەناو چووبوو.

بە درێژایی ئەو ماوەیەی قسەی لەگەڵ من دەکرد، (دوین) ی بچکۆلەی گرتبووە باوەش و ئەویش دەستی بچووکی لە سەر لووت و چاوی دەگێڕا. ئەو کاتە هەستم بە تاوان کرد کە لە کاتی پشوودانی چووممەتە لایان. بەڵام ئێستا پێکەنینم بەو هەستەم دێ. ئەو، رقێکی وای لە ئێمەی سپی پێست دەبێتەوە، تەسەور ناکرێ.

لێم پرسی:

" ئێوە رقتان لە ئێمە دەبێتەوە، وانییە، جەنەراڵ (کی)؟"

گوتی

" من لەوە گەورەترم کە ئێوەم خۆش بوێ. من زۆر شانازی بەوە دەکەم کە

[1] دانەرۆژ: نیوەیڕۆژ، لەبەیانی تا نیوەڕۆ (دانی سبەینێ_تاقی بەیانی)، لە نیوەڕۆ تا رۆژاوا (دانی ئێوارێ_ تاقی ئێوارە).





ڤێتنامیم، ئاساییم و پێست زەردم. هەرگیز بە خەیاڵم دا نەهاتووە کە نەژادی سپی لە ئێمە باڵاترە، بە پێچەوانەوە. "

پاشان لەوە تووڕەبوو کە ئێمە کەیفمان بە (لون) نەدەهات: " من هەرگیز رەخنەو سووکایەتی ئێوە قبووڵ ناکەم. ئەوە ئیشی منی ڤێتنامییە، کە هەڵس و کەوتی ڤێتنامیی تر هەڵسەنگێنم کە براو هاورەگەزی خۆی دەکوژێ. "

لەگەڵ ئەم قسەیە مووچڕکی پێدا هات. بەسەرزمان نەیدەزانی دادوەریی بەشەر بە زمانێکی یەکگرتوو دەکرێ، هەرگیز تێش ناگا. کابرایەکی نەزانە و زۆر لەم نەزانییەی خۆیشی رازییە:

" من هەرگیز نەمویستووە رۆشنبیر بم، پیاوی رۆشنبیر بە دەگمەن وا دەبێ پیاوی کردەوە بێ. کە تەمەنم هەژدە ساڵ بوو، ئارەزووم ئەوەبوو ببم بە لادێی و برنج بچێنم و گامێش بەخێو بکەم. من لەگەڵ لادێییان ئاسوودەترم چونکە ئەوان باسی مارکس و ئینگلیزم لەگەڵ ناکەن. "

نازانم ... لە لایەکەوە بە سووکی دادەنێم و لە لایەکی ترەوە پێی هەڵدەڵێم. هەست دەکەم خەریکە شتێکی تازەم بۆ دەردەکەوێ: ئێمەی سپی هەر هیچ لەم میللەتە نازانین، بەتایبەتی کە ویژدانی زیندووی ئازادیخوازانیش بە باشی تێیان نەگەیشتووە.

ڤێتنامییەکان هەر چەندە یەکتر دەکوژن بەڵام رقیان لەیەك نییە. ئەوان رقیان لە ئێمەیە، چونکە ئێمەین وامان لێ کردوون یەکتر بکوژن، ئەویش بە ناوی شارستانیەت، ئەو شارستانییەتەی بۆمبای گەورەتر دروست دەکا، چونکە ئێمەین مەرزەکانمان داگیر کردوون، چونکە ئێمەین ویژدانمان گەندەڵ کردوون، چونکە ئێمەین شارەکانمان کاول کردوون، ئاخیریش چونکە ئێمەین کردوومانن بە دوولەت: باکوور بۆ تۆ و باشوور بۆ من. بێ ئەوەی هەست بکەین ئەو (با) یەی لە باکوورەوە دێ، هەر ئەو (با) یەشە لە باشوورەوە دێ، هەروەها بەش بە حاڵی خەونەکانیشیان.

کاتێ کە جێم هێشت، شەوداهاتبوو، تازە هەستم کرد دەوری سێ سەعاتی تەواو قسەمان کردووە. بە دەم قسەکردنەوە تا بەر دەرگا بەڕێی کردم. گوتی: ئای

ڤێتنامی بوون، خەمێکی چەند گەورەیە! چەند دەردێکی گرانە کە هەست دەکەین کەوتووینەتە بەینی سێ دێو: رووسیا و ئەمریکا و چین.

گوتیشی لەم بارودۆخەدا ناکرێ پەیوەندی لەگەڵ یەکێ لەم سێ شارستانیەتە ببەستین.

هیچ لووتبەرزی و خۆهەڵکێشانێکی لەلا نەمابوو. لەبەر دەرگا وەستاو بە دەنگێکی بەرز گوتی: " سوپاست دەکەم، پاش نیوەڕۆیەکی خۆشم رابوارد، سوپاست دەکەم کە گوێت دایە قسەکانم. بە دەگمەن رێك دەکەوێ قسە بۆ یەکێ بکەم و یەکێ پەیدا بکەم گوێ لە قسەکانم بگرێ. من پیاوێکی تەنیام، زۆر تەنیا! ئەمڕۆ بەم قسەکردنەم لەگەڵ ئێوە کەمتر هەستم بە تەنیایی کرد. "

بەڵام من بە پێچەوانەوە، زیاتر هەستم بە تەنیایی کرد، چونکە خۆت دەزانی: ئالاّ، بۆ ئینسانێکی وەکوو من، مانای تایبەتی نییە. ئینسانی وەکوو من، لەو منداڵە دەکا کە بە شەوو رۆژێك گەورە بووبێ، ئیتر هیچ هەستی بەرامبەر بە دایك و باوکی نەبێ. ئەمانە تۆرەمەی میللەتێکن مەرزی سروشتی و زمانەوانی تایبەتی خۆیان نییە، بەڵام شتێکیان هەیە لای ئێمە نییە، شتێکە ( کا ئوکی) و ڤیت کۆنگەکان هەیانە، لەوانەیە (لون) یش هەیبێ. بەڵێ، ئەوان دەق وەکوو دوولای یەك گەلا وان. (فرانسوا)، ئەوانە بەلاش و حەلاش یەکدی دەکوژن!!

(١٦) ئادار

تازە، ئەو چاوپێکەوتنەی لەگەڵ (کی) کردبووم، بۆ رۆژنامەکەمم نارد. ئێستا سواری تەکسییەك دەبم و دەچمە گوواپ بۆ ئەوەی منداڵەکە بدۆزمەوە. ئایا دەمناسێتەوە؟ حەفتەیەکی بەسەردا چووە و منداڵیش زوو شت لەبیر دەکا. هیوادارم بە پیرمەوە بێ، بۆم بخنێتەوە و بمناسێتەوە!

شەو

نەختێ لە دەرگا سەوزەکە تێپەڕیم و پێچم کردەوە بۆ حەوشە. (ئەو) لەوێ نەبوو. ئینجا چوومە خەوگا و یەك یەك تەماشای منداڵەکانم کرد، لەوێش نەبوو. راهیبەیەك لەسەر بانێژەکە بەگەڵم کەوت، زۆر تووڕە بوو، ئەوەندە تووڕە بوو بە دایم دەستی دەجووڵاندەوە. دەزانم حەزی دەکرد بزانێ بۆچی ئەو خانمەی ئەو





رۆژە لەگەڵم بوو، ئەمڕۆ لەگەڵم نەهاتووە. پێم گوت وەختم نەبووخانمی (تران تی ئان) ئاگادار بکەمەوە، بەڵام ئەو فرەنسی نەدەزانی، چاوەڕێی راهیبەیەکی ترمان کرد کە فرەنسی دەزانی. ئاخیری هات: وردیلە و پیرو میهرەبان!

– فەرموو، دەتوانم یارمەتیت بدەم، بەڵێ؟

– بەڵێ، خوشکێ، من پێش هەشت رۆژ، هاتمە ئێرە و...

– بەڵێ، دەزانین، دەزانین.

– کچێکی بچکۆڵە لە حەوشە بوو ...

– کچی بچکۆڵە لێرە زۆرە ...

– بەڵێ، بێ گومان، بەڵام ئەویان ...

– ناوی چی بوو؟

– نازانم.

– بە سەرسامی تەماشای کردم:

– دەتوانی پێم بڵێی شکڵی چۆن بوو؟

– بەڵێ، بێ گومان، بەروانکەیەکی قۆڵ درێژی لەبەر بوو. تەمەنی دەوری سێ ساڵ دەبوو، نەخۆشی نەبوو ...

– ئێرە کچی بچکۆڵەی زۆرە کە تەمەنیان سێ ساڵ بێ و نەخۆش نەبن و بەروانکەی قۆڵ درێژیان لەبەر بێ ...

ناتوانی بە شێوەیەکی باشتر باسی بکەی؟

– دەم و چاوی خڕبوو، بەبێ جووڵە دانیشتبوو، لێرێهێ لە حەوشە لەسەر بەردێك دانیشتبوو ...

– ناتوانی باشتر روونی بکەیتەوە؟

– نا، خوشکێ، ناتوانم، بەڵام ئەگەر بیبینم دەیناسمەوە، دەزانم ئەویش ئەمن دەناسێتەوە. تکایە یارمەتیم بدە بۆ ئەوەی بیدۆزمەوە.

– بەڵێ، هەوڵ دەدەم، بەڵێ!

دەستمان بە گەڕان کرد. یەکەم جار حەوشە گەڕاین و ئینجا یەك بە یەکی خەوگاکان. کارێکی ترسناك بوو چونکە راهیبەکە منداڵی تری نیشان دام بۆ

ئەوەی هێورم بکاتەوە، بە تایبەتی زۆر سووربوو لەسەر یەکێکیان کە قژی قاوەیی و چاوی کاڵ بوو، پێی گوتم: ڤێتنامی قژ قاوەیی چاو کاڵ هەر زۆر دەگمەنە. بە جۆرێ قسەی دەکرد دەتگوت باسی ئەسپێکی پەلْ و پۆ توندو پۆڵ دەکا کە لە هەموو پێشبڕکێیەك دەباتەوە. کچەی قژ قاوەیی چاو کاڵ بە جۆرێ تێم نز ببووەوە دەتگوت دەڵێ: " بۆچی من نابەی؟ ها، بۆچی؟ "

بەلاّم من دڵم (ئەو)ی دەویست و خەریك بووم لە دۆزینەوەی نائومێد دەبووم و بڕیارم دا ئەم گەڕانە بۆ کاتێکی تر دابنێم، کە لە پڕ راهیبەکە بە بیری هاتەوە پێش شەش رۆژ چەند منداڵێکیان گواستبووەوە پەروەردگای (گیادین)، چونکە منداڵەکان نەخۆشی تایبەتییان هەبوو. گوتی: " بەڵێ، ئێستا، کە زیاتر بیری لێ دەکەمەوە، بە بیرم دێتەوە منداڵێکیان تێدابوو، ئەو سیفەتانەی هەبوو کە تۆ باسی دەکەی. بەلاّم ئەگەر غەڵەت نەبم، ئەو کوێر بوو، بەڵێ تەواو کوێر بوو،خانم!

لەحزەیەك بێ دەنگ و بێ جووڵە وەستام، ئینجا سوپاسی راهیبەکەم کرد و رووم کردە دەرگا، چوومە دەرەوە، تەکسییەکم بانگ کرد، تەکسییەکە وەستا، سواری بووم و، بێ ئەوەی یەك وشەی تر بڵێم، بەڕێ کەوتم. بێ ئەوەی پرسیار بکەم: " کام پەرەوردگای گیادین؟ "

ئێستا ئامادەم هەزار هێندە ترس، وەکوو ئەو ترسەی لە چوونە (خەسان) دایگرتم، هەزار گوللەی وەکوو ئەو گوللانەی لە (هوئە) بۆم هاتن و نەیانئەنگاوتم، هەزار بێ بەشی، ئەو هەموو بێ بەشی و ئەو هەموو مەترسی و ئەو هەموو تۆقانەی کە لە ڤێتنام دیم، ئیتر نازانم هەرچی کە هەیەو نییە، ئامادەم هەمووی بدەم، تەنیا بۆ ئەوەی بتوانم یەك رستە بە زمان دەربڕم: " کام پەروەردگای گیادین؟ "

ئەم رستەیەشم نەگوت:

بێ ئەوەی ئەو رستەیە بڵێم، ئەوەتا لێرەم، داهاتوومەتەوە سەر مێزێکی بچووك و حەیرانی شەوێکم کە تەواوبوونی بۆ نییە. جەنگ یەك سوودی هەیە: خۆمان لە خۆمان ئاشکرا دەکا.

(١٧) ئادار





رۆژێکی هەتاوی خۆشە، لەو رۆژانەیە کە حەیفە هیچ کەس بمرێ. ئاسمان وەکوو لاوانەوەیەکی نەرم وایە. ئەمڕۆ لە سایگۆن شەڕ نەبووە. ئایا بە راست، جەنگ لە ڤێتنام هەیە؟! دوو منداڵ لە شەقامی (گیا لونگ) بە دوای یەکتردا را دەکەن و پێ دەکەنن. پیرەژنێك لە شەقامی پاستۆر ئەناناس پاك دەکاتەوە و بە رێکی لە پشت شووشە بەندی دوکان لەسەر یەك هەڵیاندەچنێ. حەز دەکەم وا بزانم کە جەنگ هەر وجوودی نییە، کە دوێنێ هیچ نەقەوماوە، کە من نەچوومەتە گوواپ. حەز دەکەم لەبیر بکەم کە دەبوایە بپرسم:( کام پەروەردگای گیادین؟ ).حەز دەکەم گوێی خۆم بگرتایە کە (فرانسوا) گوتی: " تۆ دەزانی ڤیت کۆنگ کێیە؟ ڤێتنامییەکی مردووە! " ئەمە رستەیەکی تازەیە و لە سایگۆن بلاّو بۆتەوە، لەو کاتەوە کە چەند کەسێکی مەدەنی بەبێ هۆ کوژران، بە تایبەتی بە دەستی ئەو خۆفرۆشانەی تەقە لە هەموو شتێکی زیندوو دەکەن: منداڵ، مریشك، گوڵ. (فرانسوا) تۆ بێدەنگ بووی، ئەمڕۆ هەتاوێکی خۆشە، یەکێکە لەو رۆژانەی حەیفە هیچ کەس بمرێ، حەیفە هیچ کەس ئەزیەت بخوا، بەلاّم من هەروا لە ناو خۆم دا دەقنێمەوە و ئەزیەت دەخۆم.

(١٩) ی ئادار

ئەمە برووسکەی رۆژنامەکەمە:

(( چاوپێکەوتنەکە لەگەڵ (کا ئوکی) شتێکی بەرزبوو، پیرۆزبایی بۆ ریپۆرتاژی ڤێتنام خاڵ ئەگەر دەنگ و باسی تازە نییە مەمێنەوە خاڵ بگەڕێوە نیویۆرك بۆ ناو ئاژاوەی رەشەکان لە نیویۆرك بۆ دەقی ریپۆرتاژ پەیوەندیمان پێوەبکە خاڵ سوپاست دەکەین سەفەرت خێر بێ دڵسۆزتان. "

ئەم برووسکەیە ئەمڕۆ گەیشت و زۆر ئۆخژنی دڵم پێ هات.

لە دڵی خۆمدا دەمگوت ئەگەر بمەوێ بیبینمەوە،دیسان راست نییە کچێکی کوێر وەربگرم. کاتی ئەوەم نییە. بیست و چوار سەعاتی تر، ئیدی سەفەر دەکەم بۆ (هۆنگ کۆنگ) و (تۆکیۆ) و (سیتل) و (نیویۆرك).

ئاوها باشترە!

ئێستا دەچم بۆ ئروەی ماڵاوایی لە هەموو ئەندامانی (جوسپائو) بکەم و ئینجا

کەل و پەلەکانم دەپێچمەوە.

مالاوایيم لە هەموو برادەرەکانم کرد. کاتی نیوەڕۆ کە فراوینییان بۆ هێنام هەموویان لەوێ بوون. (دەرك) نارەحەت بوو، دەیگوت شادومانم کە پسمامم بەم زوانە دێ و ئەوەندە بە تەنیا نامێنمەوە.

فلیکس دەیگوت: " دەگەڕێیتەوە، ها؟ هەڵبەت دەگەڕێیتەوە، هەڵبەت تۆ دەگەڕێیتەوە! "

مارسیل دەیچپاندە گوێم: " ئێمە بەبێ تۆ تەنیا دەبین. "

تەنیا (فرانسوا) باسی شتی ئاسایی دەکرد لە کاتێکا کە سەرنجی وای لێ دەدام دەتزانی لە چاوەکانتەوە ناو مێشکت دەخوێنێتەوە و هیچ شتێکی لەبەر چاو بزر نابێ و تا ناخی مێشك و مۆخت دەخوێنێتەوە. کە گەڕاینەوە نووسینگەی کارکردنی، بەو میهرەبانییە رەقەی تایبەتە بە خۆی، دەستی لە پشت دام:

– سەخڵەت مەبە، ئاوها باشترە. دەزانی هەمووی هەوەسێك بوو. شتێکی باش بوو، بەڵام هەوەسێك بوو!

– نا، راست نییە!

– باش بیری لێ بکەوە، ئەو حەلە دەزانی راست دەڵێم. تۆ دوای (هوئە) هەستت دەکرد خۆت گوم کردووە و حەزت دەکرد خۆت بە شتێکەوە بەند بکەی، بەڵام منداڵ شت نییە، منداڵە!

– نا، من لە ناخی دڵمەوە دەمەویست!

– هەمیشە، هەموو هەر وا دەڵێن!

– رەنگە، دەبوایە باشتر بگەڕێم. زیاتر بیری لێ بکەمەوە، دەبوایە بزانم چ کاردانەوەیەکی لەسەر من بووە ... رەنگە، دەبوایە ...

– رەنگە! نارەحەتییەکی بێ هوودە بووبێ بۆ تۆ، نەك بۆ ئەو. (ئەو) نازانێ کە تۆ هەر هەیشیت. راستە سەیری تۆی دەکرد، بەڵام تۆی نەدەدی.

– تۆقێنەر و ترسناکە (فرانسوا)!

– ئەوە ژیانە! هەندێ جار وا هەست دەکەی یەکێ زەق زەق بە هەردوو چاو تەماشات دەکا، بەڵام لە راستیدا تۆ نابینێ. هەندێ جار هەست دەکەی یەکێکت





دۆزیوەتەوە کە هەمیشە بە دوایدا گەڕاوی، بەڵام لە راستیدا کەست نەدۆزیوەتەوە. ئەم جۆرە شتانە زۆر روو دەدەن. ئەگەر ئەم شتانە روو نەدەن، مۆجیزەیە! بەڵام مۆجیزە زۆر ناخایەنێ.

– من دێمەوە!

ئەم جارە دەزانم دێمەوە. هەموو قسە لە ئاژاوەی دووەم دەکەن و هەموو بڕوایان وایە ئەم ئاژاوەیە لە ئایندەیەکی نزیك روو دەدا، پێش هەڵکردنی (با)ی وەرزی، بەڵام ئەی (با) ی وەرزی نەهاتووە؟

بارانێکی بە خوڕ لە سایگۆن دەبارێ، کوێر وەکوو چاوەکانی (ئەو)! وەکوو چاوەکانی (کا ئوکی) و (نگوین وان لون)! وەکوو چاوە بە هەڵەچووەکانی من، وەکوو خەیاڵە پڕوپووچەکانی من، وەکوو سۆراغی بێ هوودەی من و وەکوو ئەو راستییەی نەمتوانی بیدۆزمەوە و هەشە.

دەزانم ئەو راستییە لەوێ هەیە. لەناو چاڵەکانە، بەڵام ئایا بۆ دۆزینەوەی ئەو راستییە هەر دەبێ بچینە ناو قوولایی ئەو چاڵانە؟!

# بەشی هەشتەم

ئینجا، بێنەوە بیرت، کە لە بارەی ئاشتییەوە دەستیان بە قسە کرد ، ئەو پیرەمێردەی لە تەلەفزیۆن دەرکەوت، ئەوەندە بە میهرەبانی قسەی دەکرد هەر دەتگوت هەموو دونیا نەوەی خۆیەتی.

سی و یەکی ئادار بوو، لە بیرتە؟ تازە چووبوومە ئەمریکا. هێشتا نیگای ئەو کچە کوێرەم لە چاودا هەر مابوو، هێشتا بۆن بۆگەنی تەرمەکانی (هوئە)م لەناو لووت مابوو. کە تەماشای ئەو پیرەمێردەت دەکرد، کە خەتی گەزندەی بە دەوری لێوە بچووکەکانەوە بوو، وەکوو ئەوە وا بوو تەماشای ئەو مەرگە بکەی کە لە بیری کردووی! لەبەر ئەوەی، دەزانی؟ لەبەر ئەوەی ئەو شەوە، هەر ئەو شەوە، چوار سەدو نەوەد هیلیکۆپتەری هەڵگری تۆپی بچووک، کە هەر دەقیقەی سی (٣٠) هەزار گوللەیان دەتەقاند، بەرەو (خەسان) هەڵفڕین. لەگەڵ چەند هیلیکۆپتەرێکی (ب – ٥٢)، کە هەشتا هەزار بۆمبایان هەڵگرتبوو، ئەمەش لە ژمارەی ئەو بۆمبایانە زیاترە کە لە جەنگی دووەمی جیهانی بەسەر ژاپۆن دا رژا. چەند گردێك لە تەرمی ڤێتنامییە باکوورییەکان لە تەنیشت ئۆردووگای هێزی دەریایی قیت بۆتەوە و تەرمی شێواوی ئەمریکییەکانیش لەسەر تەپۆڵەکان کەوتووە. لە هەموو شوێنێکا، هەر لە (کانگ تری) بگرە تا (وین لوی))، ژمارەی کوژراوی جەنگ زیادی کردووە.

چوار سەد (کیا – killed Action = kiA – کوژراوی جەنگ) پێنج سەد کیا، شەش سەد کیا. لەو جۆرە رۆژەدا، وشەی ئاشتی وەکوو پاسپۆرت وابوو بۆ ئەو کەسانەی دەیانەویست جێگای ئەو پیرەمێردە بگرنەوە، وشەی ئاشتی کالآیەکی خۆش فرۆش بوو، تایبەت بوو بەو کەسانەی دەیانەویست زیاتر رای خەڵك بۆ خۆیان رابکێشن.





پاشان رایانگەیاند: ئێستا بۆمبا باران لە ڤێتنامی باکوور کپ بۆتەوە، ئینجا گوتیان بڕیاریان داوە گفتوگۆ لەگەڵ (هانۆی) بکەن. جۆنسۆن ناچار بووە کەنارەگیر بێ: هەڵبژاردن نزیك بۆتەوە.

لە بیرتە؟ دەق لەو رۆژانەدا بوو، باشم لە بیرە چواری نیسانی ١٩٦٨ بوو، لەگەڵ کوشتنی ئەو پیاوەی بە درێژایی ژیانی هەر باسی ئاشتی دەکرد، ئاهەنگی درۆی گەورەی خۆیان گێڕا. کاتێ کە درۆی گەورەی خۆیان لەگەڵ کوشتنی ئەو پیاوەی بە درێژایی ژیانی هەر باسی ئاشتی دەکرد، را گەیاند، (مارتن لۆتەر کینگ)و قولە رەشەکانی، بۆ تۆڵە سەندنەوە کردیانە ئاژاوەو تانکی جەنگیی گەیشتنە بەرامبەر کۆشکی سپی و ئەو ولاتەی پێشنیاری ئاشتی دەکرد، تووشی جەنگی ناوەخۆ هات. من دەبوایە بچمە (مەمفیس) و (ئاتلانتا) و (واشنتۆن) و ئاگر و ئاژاوە و تەرمەکان ببینم و لەبەر ئەم گەلۆرییە تازەیەی بەشەر، چەندین کیلۆ کاغەز بە نووسین رەش بکەمەوە.

ئەم کارەم بەبێ بایەخ و بەبێ ئارەزوو ئەنجام دا. ئەو شتەی پێش ساڵێ دەیرووژاندم، ئێستا بەلامەوە گرنگ نییە. چونکە، بە راستی پێم بڵێ: ئەوەی لە شانشینی ماڵی خۆی دەکوژرێ چ جیاوازییەکی لەگەڵ ئەوە هەیە کە لەناو سەنگەر دەکوژرێ!؟ ئایا کارێکی دادپەروەرانەیە کە بۆ رووداوی یەکەم ئاگر لە شارێك بەر بدەن کەچی بۆ رووداوی دووەم تەڵە شخارتەیەکیش دانەگیرسێنن؟

پێم بڵێ: ئایا راستە ئەو زەلام کوژەی بە تەقاندنی دوو گوللە یەکێکی کوشتووە، لەسەر کورسی کارەبایی دابنێن، کەچی پووڵی یادگاری لە شەرافەتی ئەو کەسانە چاپ بکەن کە بێ ئەوەی دەستی خۆیان پیس بکەن، هەزاران گوللەیان تەقاندووە؟!

من دەزانم، کاروباری دونیا هەمیشە هەروا بووە. ئەوەش دەزانم کە مێژوو، سەرکەوتووەکان دروستیان کردووە. بەڵام من مێژوویەکم دەوێ، پیاو تەنیا لەبەر ئەوەی پیاوە، حیسابی بۆ بکرێ، نەك لەبەر ئەوەی سەرکەوتووە. من مێژوویەکم گەرەکە مەوجوودەکانی ژمارە نەبن، گۆشتی بەرامبەر تۆپ و تانك نەبن، بەڵکو جۆرە ئینسانێ بن کە مەرگیان، مەرگی هەر یەکێکیان، لە رق و ئازار دووربێ، لە

ئاژاوەو لە سووتان دووربێ، مێژوویەکم دەوێ بۆ مێشکی برینداری (پیپ) بگریە.

پیپ کێیە؟ تەنیا (پیپ)ە و بەس! سەردەستەکەت لە بیرە؟ سەردەستەی تەپۆلکەی (١٣٨٣) ؟

(پیپ) بریندار ببوو، (سام کاستن)ی هاوڕێی ئەم خەبەرەی بۆ نووسیم: " دەبێ ئاگاردارت بکەمەوە کە (پیپ) لە نەخۆشخانەیە. دەڵێن گوللە هیلیکۆپتەرەکەی پێکاوە. برینەکەی ئەوەندە غەدار نییە، بەڵام زەبرێکی بە سەری کەوتووە، ئیتر هیچ شتی بە بیر نایەتەوە.هەر بۆیەش ڕەوانەی ئەمریکایان کردەوە. ڕەنگە ئەو کاتەی کە تۆ ئەم نامەیە دەخوێنیتەوە، ئەو لە (بنسلڤانیا) بێ. ناونیشانەکەیت بۆ دەنووسم. بۆچی سەرێکی لێ نادەی؟

هەوڵم داو دۆزیمەوە. هەر زوو هاتە سەردانم. دەشەلی و یەك قوتووی پڕ وێنەی بە دەستەوە بوو.

بە هێمنی دانیشت و چاوە شینە حەپەساوەکانی تێ بڕیم.

– سەیری ئەمانە بکە.

سەیری وێنەکانم کرد.

– پیپ، ئەمانە وێنەی تەپۆلکەی (١٣٨٣)ن؟

– دەزانم. لەوە دەکا من ئەم وێنانەم گرتبێ.

– ئەی تۆ نەتگرتوون، پیپ؟

– بە بیرم نایە. من بە بیرم نایە چووبمە ڤێتنام.

– ئەدی، پیپ، تۆ منت لە بیرە؟

– هەڵبەت، تۆ و (سام کاستن) و (کاپتن شر)م لە بیرە. بەڵام لەوانی تر تەنیا سەرۆکەکانم لەبیرە، تەواو! بەڵام تۆ بە پێچەوانەوە، ئێستاش کەوشەکانی تۆم لە بیرە کە پۆستاڵی جەنگی نەبوون. تۆ بە چەپکە گوڵێکەوە هاتبووی.

– نا، پیپ، من بە چەپکە گوڵێکەوە نەهاتبووم، چڵە درەختێکم بە دەستەوە بوو کە هەر بۆ گاڵتە لەناو هاوەنێکی بەتاڵ چاندم.

– لە کوێ؟

– لە تەپۆلکەی ١٣٨٣.





– من لەوێ نەبووم.

– بەدی، پیپ، تۆ لەوێ بووی. تۆ منت بردە ئەوێ.

– بە بیرم نایە.

– ئەی شەڕەکەی ئەوێت لە بیر نییە، پیپ؟

– شەڕی چی؟

– شەڕ سەر تەپۆلکەکە.

– من هیچ شەڕم بە بیر نایە.

– ئەی تۆ چیت بە بیر دێ؟

– من تەنیا ئەو گەڵایانەم لە بیرە کە بە سەریاندا ڕژاندین.

– بە سەر کێ؟

– بەسەر من و ئەوانی تر.

– ئەوانی تر کێ بوون؟

– نازانم.

– ئایا ئەوان مردن.

– نازانم ... تکایە ئەگەر چوویتەوە ئەوێ لە بارەی منەوە قسەیان لەگەڵ بکە. هەوڵ بدە پێ بکەوی من چ بەڵایەکم بەسەر هاتووە. من ئەوەندەم بیر لێ کردۆتەوە، هەر وەختە شێت بم.

– بەڵام ئایا بەلاتەوە، شتەکە ئەم هەموو بیرکردنەوە و گەڕانە دێنی؟

– ئوە، بەڵێ، لەبەر ئەوەی خەڵك بە جۆرێ سەیرم دەکەن وەکوو ئەوەی ئینسانەکەی پێشان نەبم. دەزگیرانەکەم جێی هێشتم. بڕیار بوو لەم مانگەدا زەماوەند بکەین، تەنانەت کارتیشمان چاپ کردبوو، بەڵام کە منی بینی گوتی: هێشتا زۆر گەنجم، هێشتا هی ئەوە نیم خێزان پێکەوە بنێم، ئینجا گوتی: دەمەوێ پێش زەماوەند کردن بۆ خۆم دنیا ببینم. بەڵام من زۆر باش دەزانم لەبەر ئەوە نەبوو زەماوەندی لەگەڵ نەکردم، بەڵکو تەنیا لەبەر ئەوەبوو کە من تووشی لە بیر چوونەوە هاتووم. هەر بۆیەش وای بۆ دەچم لەوانەیە کاپتن (شر) بتوانێ یارمەتیم بدا.

(شر) لە نۆیێل ڤێتنامی جیٚ هێشتبوو، واتە پێش ئەوەی (پیپ) بریندار ببیٚ، بەلاٚم ئێستاش پیشەی هەر سەربازییە و لە (نیوجرسی) یە. تەلەفۆنم بۆ کرد. بە خۆشحاڵی خەبەری پێدام کە پێش چەند رۆژیٚ پلەی فەرماندەی وەرگرتووە و بۆ فراوینی یەك شەممە داوەتی کردم. لەگەڵ (پیپ) چووینە ئەویٚ.

کاتیٚ کە (پیپ) چاوی پێکەوت، رەنگی پەڕی و لەپڕ پرسی: " فەرماندە، ئایا تۆ دەزانی من چیم بەسەر هاتووە؟ ها، فەرماندە؟" (شر) هیچی نەدەزانی و تەنانەت وای بۆ چووم کە گویٚ بە بەسەرهاتەکەی نادا. بەلاٚم میهرەبان بوو. قەڵەوتر ببوو. هەر خۆشحاڵی خۆی دەردەبڕی بەوەی دووبارە چاوی بە ئێمە کەوتووە. لەسەر خواردن، قسەمان لە بارەی ڤێتنام کرد، گوتی: حەزدەکەم بە راوێژکاری بچمەوە ڤێتنام. بەلاٚم باسی بەسەرهاتی (پیپ) مان نەکرد. (پیپ) یش بە بیٚ دەنگی گوێی دابووە قسەکانمان. تەنیا جارو بار دەیپرسی: " ئاخ، دەنا یەکیٚ بیتوانیایە یارمەتیم بدا بۆ ئەوەی رابردووی خۆم بێتەوە یاد. ئێوە باسی شتی وا دەکەن کە من تەنیا لە رۆژنامەکان باسی ئەو رووداوانەم خوێندۆتەوە. " هەر جارەی کە ئەم قسانەی دەکرد، بە من بوایە بگەڕێمەوە ڤێتنام و بیرەوەری ونبووی بدۆزمەوە. بیردەکەمەوە: ئایا چیرۆکی (پیپ) بیانوویەك نییە بۆئەوەی بگەڕێمەوە ڤێتنام؟ ئەو ڤێتنامەی سەختترین کاتی ژیانی خۆم تێدا بەسەر بردووە. ئەو شوێنەی چاکە و خراپەی خۆم تێدا دۆزیوەتەوە، ئەو شوێنەی دەبیٚ لێکۆڵینەوەی تەواو نەکراوی خۆمی تێدا تەواو بکەم و کۆتایی بە نیمچە چارەنووسی خۆم بێنم.

خۆت دەزانی من باسی چ دەکەم.

من باسی ئەو شتانە دەکەم، کاتیٚ کە منداڵ بووم، لە قوتابخانە و کڵێسە و ماڵەوە فێریان دەکردین. ئەو شتانەیان فێر دەکردین کە دەبوایە پێمان بگەیەنیٚ و گیانی گەورەمان لەسەر دروست ببیٚ. مەبەستم عیشق و رق و دادپەروەری و بەزەیی و ئازایی و ئەو شتانەیە کە جەنگ بە راستەقینەیەکی تەواو دەزانن نەك بە وێنەیەکی زەینی.

ئەو راستەقینەی دەبیٚ بەرەو رووی ببینەوە و گرێیەکانی بکەینەوە: ئەم گریٚ





کردنەوەیە هەندیٚ جار بە نرخی رۆح تەواو دەبیٚ .

پێش جەنگ من ئەو شتانەم بە گەمە و گاڵتە دەزانی و هیچی تر. دەق وەکوو ئەو کاتەی یاری بە ئاوی گۆمێك دەکەین. پاشان من هەر لەویٚ خۆم لەناو دەریایەکی قووڵ نقووم کرد. دوور لە هەڵەوەڕی قوتابخانە و کڵێسە و ماڵەوە، ئایینی تاقانەی خۆمم دۆزییەوە: ئایینی مرۆڤایەتی. ئەو مرۆڤەی بووە بە جیٚ نشینی خودا: (پیپ) و (لۆن) و (نگوین وان سام). ئەو بەشەرەی کە دەبیٚ زیاتر لێی بکۆڵینەوە، ئەو بەشەرەی دەبیٚ مەحکووم بکریٚ. ئەو بەشەرە دەبیٚ هەر لەم زەمینە خاکییەدا بەخشینی بۆ بیٚ نەك لە بارەگای ئاسمانی، بەشەر بە سیفەتی بەرز و بە عەیب و شوورەییەوە. ئەو بەشەرەی کە ئازاری بۆ دەکێشین و پێی خۆشحاڵ دەبین.

ئێستا ئەم پرسیارەمان لە بەردەم قیت دەبێتەوە: ئایا پێویست دەکا ئەم جۆرە کارانە ئەنجام بدرێن، یان نا؟ بەدبەختی بۆ ئەو کەسانەبیٚ کە بە پێی بەهاکان، دادەنیشن دادوەری دەکەن و یەکسەر هەر کوشتارە و بەڵگەیەکی بۆ دێننەوە. بەهەر حاڵ مێشکی (پیپ) یش بە قەدەر مێشکی (مارتین لۆتەر کینگ) نرخی خۆی هەیە. لە دڵی خۆمدا دەمگوت: ئەگەر بچمەوە (سایگۆن)، بیٚ شك دەچمە (داکتۆ) و بیرەوەرییە ونبووەکانی دەدۆزمەوە، بۆ ئەوەی لەم رەشی و تاریکییە نەجاتی بدەم. گەڕامەوە ئەویٚ، لە بیرتە؟ سەرەتای مانگی مایس بوو کە لە هیندەوە گەڕامەوە ئەویٚ. بۆ ریپۆرتاژێك چووبوومە هیند و لەوێوە بە ڤیزایەك گەڕامەوە ڤێتنام. سایگۆن، جگە لەوەی بۆ خۆم، بۆ مەسەلەی ئیشەکەشم، هێشتا هەر بابەتێکی سەرنجکێش بوو.

کۆبوونەوە بۆ دەست نیشان کردنی شارێك کە کۆنفرانسی ئاشتی لیٚ ببەستریٚ ، بەرەو تەواو بوون دەچوو. کەچی لە ڤێتنام هەموو شتیٚ وەکوو تازە دەستی پیٚ کردبیٚ، بەو جۆرە بوو. (وست مورلند) تەختی فەرماندەیی خۆی بە یەکێکی لەخۆی رەقتر و جدیتر سپارد بوو. بەناوی (گریتۆن ئابرامز). قاو داکەوتبوو کە ڤیت کۆنگەکان خۆیان بۆ دووەمین ئاژاوە ئامادە دەکەن. هەر لەبەر ئەوەش بوو کاتیٚ کە لە (دەهلی نویٚ) چوومە (بنارس)و لەوێوە چوومە (پنجاب) و (کشمیر)،

گوێم بۆ دەنگ و باسی (سایگۆن) قۆڵاغ کردبوو. نزیکەی هەر هیچ هەستم بە دیمەنی سروشتی و ئینسانی ئەوێ نەدەکرد. ئەگەر لە رۆژگارێکی تری ژیانم بهاتبامایە ئێرە، بێ شك چێژم لە جوانی فیلی بە گوڵ و قاڵی رازاوە و لە دیتنی ژنی ساری پۆش و دەفری مس لەسەر سەر و لە دیتنی ئاییینپەروەرێکی قەراخ رووباری (گونگ) وەردەگرت، لە کاتێکا کە ئاسمان سوور هەڵگەڕابووو رۆژی سەر کەل وەکوو پەنگرە ئاگر وابوو.

هەڵبەت بیرم لە دیتنی ئەم جۆرە نەبوونی و هەژاریەی ئەو کەسانە دەکردەوە کە سەرپێچی ناکەن و ناجەنگن.. ئێستا کە یادی ئەو دیمەنانە دەکەمەوە، لە پووچی و بێهوودەیی زیاتر هیچم بە بیر نایەتەوە: لە ئینسانی ئاوها سەیرو لەبێدەگیی زیاتر هیچم بە بیر نایەتەوە.

لەپڕ هوشیار بوومەوە، بیستم ئاژاوەیەکی تازە لە ساگۆن سەری هەڵداوە. شێوەی بیستنی ئەم خەبەرەش شتێکی سەیربوو:

ئەم خەبەرەم لە داوێنی (هیمالایا)، لە (دارامشان)ی ( کشمیر)، لە رادیۆی دەستەیەکی تبتی بیست.

چووبوومە ئەوێ بۆ ئەوەی چاوپێکەوتن لەگەڵ خودانێکی خەڵوەتنشین بکەم: (دالائی لاما). چەند گرفتاری لوتف و میهرەبانی راهیبەکانی بووم، ئەوەندەش گرفتاری شارەزایی و ئاگاداری خۆی بووم. کاتێ لە قەراخ ئەو رێگایەی دەچووەوە دێ، لەبەر سێبەری درەختێك دانیشتبووم، بیرم کردەوە: رەنگە ئەو کەسانە حەقیان بێ کە نەك هەر تەنیا لە جەنگ و دڕندەیی بێ خەبەرن، بەڵکو هیچ لە لێپرسینەوەش نازانن، وەکوو ئەم هیندیانە و راهیبەکانیان. هەموو شتێکی دەوروبەریان وەکوو رووبارێکی ئارام، رێچکەی خۆی گرتووە و دەڕوا: نە بۆمبایەك، نە خوێنێك و نە سووکایەتییەك  بە مۆجیزەی لە دایکبوون. راستی، بەشدار کردنی ئەم جۆرە بارودۆخە، دەرمانی چ دەردێك دەکا؟ لێرە، جەنگەڵ کش و ماتە، تەنیا کزەبایەکی هێدی لە گەڵای درەختەکان دەداو دەیهەژێنێتەوە، قوللەی نووك تیژی (هیمالایا) وەکوو لوولەی بورجێکی پتەوو بریقەدار سەری قیت کردۆتەوە. لێرە، ترس مانای نییە، بە پێچەوانەوە وشەی خودا مانای هەیە.





بەبێ زەوقی لە شوێنی خۆم هەستام و گەڕامەوە لای ئەو گۆڕەپانەی ئوتومبێلم لێ راگرتبوو... ئەو گۆڕەپانە بچووکە قوتابخانەیەکی لێ بوو و ئەو قوتابخانەیە رادیۆیەکی لێ بوو دەنگ و باسی بە زمانی ئینگلیزی بڵاودەکردەوە:

- پێکهێنانی حکوومەتێکی نوێی هیندی.
- بۆی هەیە پاریس بۆ کۆنفرانسی ئاشتی دەست نیشان بکەن.

ئینجا ئەم دەنگ و باسە:

- (دوێنێ ڤیت کۆنگەکان شۆڕش و ئاژاوەیەکی تازەیان لە سەرانسەری ناوچەکانی باشوور بەرپاکرد. پارتیزانەکان بە هاوەن هێرشیان کردو ساروخێکی زۆریان لە گەڕەکە جیاجیاکانی پایتەخت گرت. فڕۆکەخانەی (تان سون نوت) کەوتۆتە بەر هێرشی ڤیت کۆنگەکان و زیاتر لە سەدو بیست و پێنج مەڵبەندی پارێزگا و شوێنی دامەزرانی ئەمریکییەکان کەوتونەتە بەر هێرش وپەلامار. چوار پەیامنێر و سیاسییەکی ئەڵمانی لە (چولون) کوژراون ...).

من دەبوایە ئەمڕۆ بچمە شاری (هاردوار)، شاری پیرۆزی هیندووان. بەڵام نەچووم. خێرا گەڕامەوە لای ئوتومبێل و بە لێخوڕەکەم گوت: ((با زوو بگەڕێینەوە (دەهلی نوێ)، دەبێ پێش سەعات نۆ بگەینە ئەوێ.))

فڕۆکە سێی بەیانی بۆ(سایگۆن) بەڕێ دەکەوت. پێ ڕاگەیشتم و سواربووم. لە کاتێکا بە نارەحەتی بیرم دەکردەوە:ئەم چوار پەیامنێرە کوژراوانە کێن؟ خوایە! کێن؟

هەر دەتگوت ئەم سەفەرە کۆتایی نییە و هەرگیز ناگەینە (سایگۆن). ناوی چوار کەسەکەیان نەگوت، ئەگەر ناویشیان گوتبێ من گوێم لێ نەبوو. لە دەهلی نوێ کەس نەیتوانی هیچ زانیارییەکم لەم بارەیەوە بداتێ. ئەگەر یەکێ لەو چوار کەسە (فرانسوا) بێ؟ یان دەرك؟ یان فلیکس؟ یان دۆستێکی ترم بێ؟!!

ئاخیری گەیشتمە جێ و دووبارە خۆم لە ڤێتنام بینییەوە. بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەکەم بە دەستە پاچەییەکی تاڵ و ناخۆش بە پایان بگەیەنم، هەر زوو زانیم هەرگیز ناکرێ بەشەر ببێ بە جێ نشینی خودا.

**(٧) ی ئادار**

(سایگۆن) دیسان ئاگری گرتبوو. شار دووبارە وێران ببوو. هالاۆی ئاگر و چڕە دووکەڵی رەش لە چەند شوێنێکی شار بەرز دەبووەوە ئاسمان. رووناکاییەکی سوور لە ئاسۆی باشووری رۆژهەلاتەوە دیار بوو، لەو شوێنانەی فڕۆکەی سکای رایدرزو فانتۆم بۆمبایان دەهاویشت و تەقینەوەی ترو ئاگری تریان لە دوای خۆیانەوە جێ هێشت.

لە (فوتو)، بە چەکی قورس تەقەیان دەکردو دەنگی یەکنەوای تەقەکان بە بەردەوامی دەکەوتە بەر گوێ و من سەرسام وسەراسیمە لە گۆڕەپانی فڕۆکەخانەی (تان سون نوت) وەستابووم و لە دڵی خۆمدا بیرم دەکردەوە: (نەدەبوایە بگەڕێمەوە. شتێکی پێویست نەبوو، دووبارە ئەم شتانە ببینم. تێرم دیوەو ئیتر بەس بوو.)

سەرێکی تەواو بۆز و مل پێچێکی شینم لە پشت لۆرییە سەربازییەکانەوە لێ دەرکەوت، بە هێواشی بۆ لای من دەهات: (فرانسوا)!!! لەپڕ هەستم کرد دڵم فەراحتربوو.

– چۆنی؟ باشی؟ برووسکەکەتم پێگەیشت.

– سوپاس خودایە، کە (فرانسوا) یەکێ نەبوو لەو چوار کەسە.

– ئەگەر تۆ برووسکەکەی منت پێ گەیشتبێ، مانای وایە بەرید هێشتا ئیش دەکاو ئەگەر بەرید هێشتا کار بکا، مانای وایە ئاژاوەی ئەم جارە زۆر گرنگ نییە.

– با، زۆر گرنگە و لە ئاژاوەی جەژنی (تەت)یش زیاتر درێژە دەکێشێ، چونکە لایەنی خۆدەرخستنی کەمترەو بە جدیتر وەرگیراوە و زیاتر حیسابی بۆ کراوە، تەنانەت دەتوانم بڵێم فێڵبازانەتریشە.

دەیانەویست شەوی پێش گفتوگۆی ئاشتی لە پاریس، هێزی سەربازی خۆیان دەربخەن، و زۆر چاك لەم کارەدا سەرکەوتوو بوون.

ئەو رێگایەی دەچووە شار، هات و چۆی پێدا زۆر کەم بوو. تەنیا تانك و لۆری هەبوو. پەنجەرەکان داخرابوون، بەلام هیچ تەقە نەدەکرا. رێگا کرابووەوە.

– (فرانسوا)، ئەی ئەوانە لە کوێن؟





– لە هەموو شوێنێکن. دووبارەی دەکەمەوە: لەوانەیە ژمارەیان لە جاری پێشوو کەمتر بێ، بەلام لە رووی چەکدارییەوە باشترن و پێکهاتەی وردیان هەیە. ئەم جارە ئیتر حیسابی خۆیان لەسەر ئەگەر و رێکەوت نەکردووە، ئیتر بانگەشەیان نەکردووە و شۆڕشەکەیان لە ژێر ئالای ڤیت کۆنگ بەرپا نەبووە. تەنیا بازوکە و تفەنگیان هێناوە. ئەمانە کاتی خۆیان تەنیا بە هێرش کردنە سەر بەڕێوەبەرایەتی پۆستە و سەفارەتی ئەمریکاو کۆشکی دەسەلاتدارێتی بە فیڕۆ نەداوە: زۆر بە شارەزایی و لێزانیی چوونەتە ناو گەڕەکەکانی (گوواپ) و (جاردن) و (خان هوی) و (بین هوئا)، پاشان دەستیان بەسەر (چولون)یش دا گرت. لە (چولون)، (بروس پیگوت) و (رونالد لارامی) و (مایکل بریچ) و (جان کانتول) کوژران.

کەواتە چوار پەیامنێرە کوژراوەکە ئەمانە بوون. من بە درێژایی یەك رۆژ و یەك شەو هەر پرسیارم لە خۆم دەکرد: (ئەوانەی کوژراون کێن؟ کێن؟ ) بەلام کە (فرانسوا)م دی سەلامەتە، ئیتر تەنانەت پرسیارم لەویش نەکرد بڵێم: (فرانسوا، ئەم چوار پەیامنێرە کێ بوون؟) (پیگوت)م دەناسی. کابرایەکی کەڵەگەت و میهرەبان و شەرمن بوو، رۆژێ بە تووڕەیی هاواری کرد: " پاڵەوانێتی یانی چی؟ کە باش بیری لێ دەکەینەوە، دەبینین هەر کەس هاتۆتە ڤێتنام، بۆتە پاڵەوان!! "

(فرانسوا) بەردەوام بوو:

– " سیاسییە ئەڵمانییەکەش، (ها سوروت فون کولنبرگ) دوای ئەوەی دەستیان بەست، کوشتیان و بەڵگەنامەکانیان قەپاند. ئەویش بەیانی یەکشەممە کوشتیان. "

(وینچنزۆ تۆرنتا)ی سەفیری گەورەمان باسی ئەم سیاسییەی بۆ کردم و پێی گوتم هەر دەبێ چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ بکەم: ئینسانێکی زۆر باش بوو. ئازادیخواز و پیاوی سیاسەت بوو.

– (لون) یش بە سەختی بریندار بووەو لە نەخۆشخانەیە.

ئەمەم نەدەزانی. نە رادیۆ و نە رۆژنامەکانی(دەهلی)، هیچیان ئەم خەبەرەیان بلاو نەکردبووەوە. خەبەرەکەم ئەوەندە بە لاوە سەیر نەبوو، ئەوەندەی ئەوەم بەلاوە سەیر بوو فرانسوا چۆن ناوی (لۆن)ی دەربڕی.

– کەی، کێ؟

ئەویش بەیانی یەك شەممە بریندار بوو. یازدە ڤیت کۆنگ بە چوار (آ.ك، ٥٠) و دوو بازووەکە لە نزیك پردی (بین هوئا)، خۆیان لە خانوویەکی نزیك جۆگا شاردبووەوە. (لۆن) لەگەڵ پۆلیسەکانی چوو بۆ ئەوەی ئەو شوێنەیان لە دەست دەربێنێ. توانی سێ کەسیان لێ بکوژێ. زۆر بە توندی خوێنیان لەبەر دەڕۆیشت، بەڵام کەس نەیتوانی فریایان کەوێ. ئینجا (لۆن) دەستی دایە (ئێم– ١٦) یەك و بە شێنەیی لە خانووەکە نزیك کەوتەوە و تەقەی لە خانووەکە کرد. ئەوسا دەستووری بە پیاوەکانی کرد بریندارەکان لەناو خانووەکە دەربێنن.هەر لەو کاتەدا لەناو خانووەکەوە بە (آ. ك – ٥٠) تەقەیان لێ کرد و گوللەیەکی بە ئەژنۆ کەوت و دەماری بڕی.

بیست مەتر دوور تەقەیان لێ کردبوو بەڵام ئەو زات و وورەی هەر بەرنەدابوو.

– وام دەزانی تۆ ئیتر هەوەست پێ نایە.

لە تووڕەییان هەڵس و کەوتێکی کردو گوتی:

– بەڵام من هەرگیز نکووڵیم لە ئازایەتی ئەو نەکردووە. لە کاتی ئاژاوەی (تەت) یش هەر پیاوێکی ئازابوو.

–ئەوەی ئەو لە کاتی ئاژاوەی (تەت)، کردی هیچ جۆرە دەسەڵات و ئازایەتییەکی تێدا نەبوو.

دیسان بەبێ ئۆقرەیی هەڵس و کەوتێکی کردو گوتی:

– من دەمەوێ بڵێم سەرۆکی پۆلیسی شار مەجبوور نییە ببێ بە پێش قەڕەوڵی چەند کەسێك و خۆی بچێتە شەڕی ڤیت کۆنگەکان. یەکێ شتی وا بکا، پیاوێکی ئازایە. دەمەوێ بڵێم سەرۆکی پۆلیسی شار ئەرکی ئەوە نییە بەرگری لەو کەسانە بکا کە ئیشیان کۆکردنەوەی بریندارانی جەنگە. ئەو، شتی وای کردووە، کەواتە پیاوێکی ئازایە.

(لون) بە سەختی برینداربوو، هەموو وایان دەزانی دەمرێ، تەنانەت لەزگ بوو قاچێکی بڕنەوە.

– ئەگەر بمردایە، تۆ پێی ناڕەحەت دەبووی؟





وەڵامی نەدایەوە.

– تۆ ناڕەحەت دەبووی ئەگەر قاچی (لون) یان بڕیبایەوە؟

وەڵامی نەدایەوە.

من ئەو شەوە تۆقێنەرەی گۆڕەپانی (کاتدرال) م بیرکەوتەوە کە (فرانسوا) بە ساردی پێی گوت: " دەتەوێ دەستگیرم بکەی؟ " (لون)یش بە دەنگێکی زرنگەدار گوتی: " جارێکی تر دەستگیرت ناکەم، یەك گوللەت لە تەپڵی سەری دەدەم ".

ئینجا ئەو رۆژەم بیرکەوتەوە کە (لون)م بە گورگێکی شەل تەشبیە کرد و (فرانسوا) لە وەڵامی منا گوتی گوایە من خەریکم ئەدەبیات دەهۆنمەوە و قسەی هەلەق و مەلەق دەکەم. ئینجا گوتی: (لون) دوو قاچی ساغ و سەلیمی هەیە، دەبێ بە لانی کەمەوە قاچێکی لەدەست بدا تا ئامادەبم دەستی بگوشم ...

– (فرانسوا)، لە نەخۆشخانە سەرت لێدا؟

– بەڵێ، بێ گومان. هەر چۆنێ بێ من پەیامنێرم، وانییە؟

– چیتان پێك گوت؟

– دەتەویست چ پێك بڵێین؟ ئەو ئازاری دەکێشاو زەبرێکی دەروونی خراپی پێ کەوتبوو. چاوی کردەوە و تەماشای کردم.

– تۆ دەستت گوشی؟

– چۆن دەتوانم دەستی ئەو پیاوە بگوشم کە نیوە روح بووە و لە قوژبنێك کەوتووە.

– ئەگەر ئەویش توانای نەبووبێ دەستی تۆ بگوشێ، لانی کەم خۆ تۆ دەتتوانی دەستی بگری و رایگوشی و زۆر بەکاوەخۆ پێی بڵێی: " ئەوەتا لێرەم! "

– ور ور ... ور ... ور ...

– (فرانسوا)، دەزانی منیش حەزدەکەم چاوم پێ بکەوێ.

– باوەڕ ناکەم شتی وا بکرێ. هیچ کەس روخسەتی نادرێ بچێتە سەردانی.

– بەڵام تۆ چاوت پێ کەوت. تۆ چۆن بۆت کرا بچی؟

– خەبەرم بۆ نارد وا لێرەم و گوتی روخسەتی بدەن بێتە ژوورەوە.

ئایا دەشێ رۆژێ بێ ئەوانە بن بە برادەر؟

چیرۆکێکی سەیرە! حەز دەکەم رۆژێ بێ و بینووسمەوە!!

بەڵام ئەگەر (فرانسوا) لەم هەستەی من گەیشتبا، ئیتر دەمی نەدەکردەوە قسە بکا.

(فرانسوا)، ماوەیەك بەر لە ئێستا دەفتەری بیرەوەری منی دی و گوتی:

-"ئاها! نەکەی لەپڕ ناوم لەم شتەدا بنووسی ها! "

وەکوو ئاگادارکردنەوەیەك ئەم قسەیەی کرد.

یادەوەری

راستی، لە بیرم چووە گرنگترین شتێ تۆمار بکەم کە ئەو بۆی باس کردووم.

ئەمریکییەکان زۆر باش ئاگاداری سەرو بنی ئاژاوەکە بوون. رۆژی (٢٦)ی نیسان خەبەریان دایە سەرۆکی ئاژانسەکانی دەنگ و باس و رۆژنامەکانی سایگۆن کە ژەنەرال (وینانت سیدل) حەز دەکا بیانبینێ و هەندێ دەنگ و باسی قەدەغە و نهێنی ئاشکرا بکا. پەیامنێران بەپەلە پڕووزێ چوونە (جوسپائو) و ژەنەرال بە چارەیەکی شێواو و پەشۆکاوەوە پێشوازی کردن. دەرگاکانی داخست و بە سکرتێرەکەی گوت لێ نەگەڕێ کەس سەخڵەتی بکا، ئینجا گوتی: " من کە داوام لە ئێوە کرد بێنە ئێرە، بۆ ئەوەم بوو دەنگ و باسێك هەیە دەمەوێ پێتان رابگەیەنم و داواتان لێ دەکەم، سەبارەت بەو پیشە ترسناکەی هەتانە ئاگاداری رۆحی خۆتان بن. داواشتان لێ دەکەم، ئەو دەنگ و باسە بە کەس نەڵێن کە ئێستا لای ئێوە ئاشکرای دەکەم، تەنانەت داوا دەکەم کە قسەکانم تۆمار نەکەن. ئایا دەتوانم متمانەتان پێ بکەم؟ پەیامنێرەکان یەك لە دوای یەك وەڵامی رەزامەندییان دایەوە و (سیدل) بەم جۆرە بەردەوام بوو:

" ئێمە لەم شەوەوە تا یەکی مایس، چاوەڕێی هەراو ئاژاوەی دووەم دەکەین لە سایگۆن، رەنگە چاوەڕوانییەکەمان لە یەکی مانگی مایسیش زیاتر درێژە بکێشێ. ئێمە زانیومانە بەلانی کەمەوە دوو لیوای ڤیت کۆنگ بەرەو پایتەخت کەوتوونەتە رێ و سوپای ئێمە ئامادەنییە بەرەو روویان بێتەوە ".

لەمە زیاتر هیچ قسەی نەکرد. بەڵام ئەو قسانەی بەس بوو بۆ ئەوەی چەند پەیامنێرێك شەوی (٢٦) ی نیسان تا بەیانی لە تەنیشت ئامێری دەنگ و باس





بەسەر ببەن و گوێ بۆ دەنگی تەقە رابگرن. ئەو شەوە هیچ رووی نەدا و ئەم ئارامییە تا شەوی شەممە و بەیانی یەك شەممەی چواری مایس بەردەوام بوو کە بارانێکی بە خوڕ دەباری. بێ شك لە کاتی باران بارینەکە بووە کە ڤیت کۆنگ بە چەکەوە هاتبوونە ناو شار. لەگەڵ گەرد و گۆڵی بەیانی دەنگی یەکەمین تەقینەوە هات و پەیامنێران هەستیان کرد ئەم دەنگە دەنگی تەقینەوەی هەمیشەیی هاوەن نییە و پاشان هەر زوو هەموو زانییان ئاژاوە دەستی پێ کردووە.

شەو

هەمیشە، شادبوونەوە بە برادەران شتێکی خۆشە! چوومە (فرانس پرێس) و لەوێ هەموویانم بینی: فلیکس، دەرك، لای لانگ و مرۆیەکی نوێش: کوڕێکی ئیتاڵی گەنج، پسمامی (دەرك)ە. ناوی (ئینۆ)یە. قژی بە گڵوازەو قاوەییە و ددانی سپییە. دەڵێ ئارەزوو دەکەم ببم بە وێنەگر. من وای بۆ دەچم ئەویش وەکوو من بە دوای شتێکدا دەگەڕێ کە ناوی جازیبەی جەنگە، یان رەنگە هەر بۆ دامرکاندنەوەی مەراقی دڵی هاتبێ. دەزانم هەر زوو لەم لێکۆڵینەوەیە بێزار دەبێ.

هەموو بە دیداری من خۆشحاڵ بوون، چاك و چۆنییان لەگەڵ کردم، بەڵام نەك بەو هەستەی جاری پێشوو لە ئاژاوەکەی (تەت) لەگەڵم رووبەڕوو بوونەوە. هەر دێن و دەچن. لە ژوورەوە دانیشتم و هەستم کرد دوێنێ بوو ئێرەم جێ هێشت. هیچ شتێ نەگۆڕاوە. قۆپەنە کاغەزی بن دیوار، پەرداخی تێکەڵ و پێکەڵ، قەوانی بەتاڵ، تفەنگ، رۆژنامەی سەر مێزی نووسین و هەراو هۆریاو دەنگە دەنگی ئەو چالاکییەی لە هەموو ئاژانسێکی دەنگ و باسدا هەیە. دەق وەکوو کەشی ناو کارگەیەکی قەوغا! دەرك بەبۆنەی هاتنی پسمامی خۆشحاڵ دیار بوو. هەستم کرد پسمامی خۆی زۆر خۆش دەوێ.

فلیکس زۆر شادو بە کەیف بوو، (فرانسوا) لە مانگی حوزێران سایگۆن جێ دێڵێ و بۆ پاریسی نووسیوە فلیکس لە جێگای ئەو بکەن بە سەرۆکی ئاژانس.

ئەم فلیکسە ئازیزەمان زۆر حەز لەم کارە دەکاو هەمیشە بۆت باس دەکا کە لە زەمانی فرەنسییەکانەوە هیند و چین دەناسێ و وایش دەردەخا کە زۆر باش شارەزای ڤێتنامە.

لە فرانس پرێس تەلەفۆنم بۆ (تورنتا)ی سەفیری گەورەمان کرد، ئەویش بە دەنگێکی پڕ شادومانی، گوتی: " بەخێر بێیتەوە! دەزانی، چاوەڕێمان دەکردی؟! "

ڕەنگە هەر لەبەر ئەوەش بیٚ، ئەو کەشە غەمبارەی شوباتی رابردوو بوو بە مایەی ناڕەحەتیم، ئەوەندە غافڵگیری نەکردم. لەوانەیە من  هەستی بەرەو رووبوونەوەی  رووداوم لە دەست دابیٚ ئیتر رووبەڕووی رووداو و ڕێکەوتی وەکوو ئەوەی رابردوو نابمەوە. ژوورێکم لە ئوتێلی کونتەنینتال پەیدا کرد و بە شادومانی چوومە ئەویٚ. بێنە بەر چاوت چەند خۆشحاڵم بەو ژوورەی پەیدام کردووە. پەنجەرەی بەسەر گۆڕەپانی (ئازادی) دا دەڕوانیٚ. من کە پشتم بە پەنجەرەی ئاسن داوە، لەبیرم کردووە کە بۆ ناوجەنگ هاتووم ، نەك بۆ رابواردن و گەشت وگوزار . دەق وەکوو دختۆریٚ وابووم کە جەستەیەك تویٚ تویٚ بکاو پاشان بچێتە چێشتخانەیەك و داوای گۆشتی کەم برژو خوێناوی بکا. تەنانەت لەگەڵ دەنگی بۆمبای دوای دەست پیٚ کردنی حکوومەتی سەربازیش، لەجێی خۆم راناچڵەکیم!

بەڵام تۆ وەرە ئەمانە ئەم هەموو بۆمبایە باوێن!!! ئەوەندە بەسە خەبەر وەربگرن ڤیت کۆنگێك لەفلانە گەڕەکە، ئیتر ئەو شوێنە لەگەڵ خاك تەخت دەکەن. دەق وەکوو ئەوەی لە تاقیبی زیکزیکەیەك، کە خۆی لەپەنا گەلای دارێك شاردبێتەوە، یەك جەنگەڵ وێران بکەین.

بیٚ گومان ئەم زیکزیکانە یاری بە (ب — ٤٠) ناکەن، بەڵکو زۆر بە ڕێك و پێکی تاقیبی یەك ئامانج دەکەن: پارچە پارچە کردنی (سایگۆن)! بیٚ ئەوەی بایەخ بە مانگرتنی شاگردی بەرەللای بۆرژوازی و ماوی ئەورووپا بدەن، یان بیر لە رۆشنبیری خۆپەرست و کاتۆلیك و مارکسی بکەنەوە کە بە وتار ناڕەزایی خۆیان دەردەبڕن. ئەوەش دەزانین کە (سایگون) هەرگیز نابیٚ بە (هانۆی). بەڵام ئایا (سایگۆن) ئەو گرنگییەی هەیە؟ جۆنسۆن بەرامبەر بە مێژوو بەڵگەی بۆ کردەوەکانی خۆی بەدەستەوەیە و دەستووری داوە بۆمبابارانی (هانۆی) رابگیریٚ. بەڵام ئەو جۆرە دەستوورەی بۆ راگرتنی بۆمبابارانی (سایگۆن) نەداوە. ئەم





پرسیارە لەخۆم دەکەم: ئایا تا ئێستاش هیچ جەنگیٚ بووە ئاوها ئازادی کارکردنی بە غەڵەت و خۆپەرستی بە بەشەر دابیٚ؟ ئەی ئەم کۆنفرانسی ئاشتییەی پاریس کەی دەست پیٚ دەکا؟

سبەی یادی ساڵانەی (دین بین فو)ە. چاوەڕێین شتێك بقەومیٚ، واچاکە لەناو شار دوورنەکەوینەوە. زۆر حەزدەکەم بچمە (چولون)، ئەو شوێنەی چوار پەیامنێرەکەی لیٚ کوژرا، یان دەتوانین بڵێین پێنج پەیامنێر، چونکە پیاوێکی گەنجی سەر بە تەلەفزیۆنی ئوستralia، بەناوی (فرانك پالموس) بە سەلامەتی دەربازببوو. دەبیٚ گفتوگۆیەکیش لەگەڵ ئەو بکەم.

<u>(٨) ی مایس</u>

قسەم لەگەڵ کرد. هێشتا ترسی رووداوەکە بەری نەداوە. بە درێژایی ئەو ماوەیەی بەسەرهاتەکەی دەگێڕایەوە، ترسی لیٚ نیشتبوو. ئەم ترسە لە چاوەکانییەوە شۆڕدەبووەوە بۆ زاری، لێوە لەرزەی پیٚ دەکەوت و لە زاریشییەوە دا دەڕژایە ناو دەستی و پەنجەکانی گرژدەبوون دەقوچانەوە.

ئاسان نەبوو هەموو شتێکی لیٚ بپرسی. بەڵام پاش ئەوەی قسەم لەگەڵ ئەو کرد، چوومە (چولون) و لەنزیکەوە شوێنەکەم بینی و ئێستا دەتوانم بەشێوەیەکی باشتر ئەو رووداوە بێنمە بەرچاوم. رووداوەکە بەم جۆرە بوو:

تەقە، پێش شوێنەکانی دیکە، لە (چولون) دەستی پیٚ کرد. (ئەوان) یش: (بروس پیگوت) و (رۆناڵد لارامی) و (مایکل بریچ) و (جان کانتۆل) و (فرانك پالموس)– بڕیاریان دا بە سواری مینی موك، کە جۆرە جێبێکی بچووکی ئینگلیزییە، بچنە سەردانی (چولون). دەزانی ئەمە جۆرە جێبێکی سپییە، هەر زۆر زۆر بچووکە،  هەڵبەت لەگەڵ جێبی سەربازی بەراورد ناکریٚ. بیٚ گومان  بە سەربازیان تیٚ نەگەیشتبوون چونکە جلی مەدەنییان لەبەربوو.

سەعات (دە) ی بەیانی بوو، لەبەر راکردنی خەڵك، هات و چۆ بەزەحمەت کەوتبوو. تەنانەت لە هەندیٚ شوێندا، (کانتۆل)، کە ئوتومبێلەکەی دەهاژوا، نەیدەتوانی زیاتر بڕوا. لە ناکاو جادە چۆڵ بوو، ئەویش بەخێرایی پێچی کردەوە شەقامێکی بچووك کە وای زانی شوێنی سەرەکی ئاگرەکانە. چووە ناو کۆڵانێکی

بچووك هیچ ئاگر دیارنەبوو. تەنیا سەنگەرێكی بەرمیلی بەتاڵی لێ بوو، ڕێی نەدەدا ئوتومبێل زیاتر بڕوا. بەرمیلەكان ئێستاش وا لەوێن.

(كانتۆل) بەهێدی گوتی:

– دەڵێی بە غەڵەت هاتووین.

(پیگوت) گوتی:

– لەوانەیە شەقامەكەی تەنیشت ئەمە بێ.

(لارامی) گوتی:

– وا چاكە زیاتر نەڕۆین. ئەم بێدەنگییە شتێكی تێدایە من تێی ناگەم.

لەو كاتەدا پیرەژنێكی ڤێتنامی قیژاندی:

– ڤیت كۆنگ! ڕاكەن! خێراكەن! ڤیت كۆنگ، خۆتان نەجات دەن. خێراكەن، ڤیت كۆنگ!

پیرەژنەكە خۆی لەپشت دەرگایەك شاردبووەوە، دەیقیژاند و بە زمانی ئینگلیزی ئەم قسانەی دەكرد.

(كانتۆل) هێدی كردەوە. ئیستاپی گرت. تەماشای (بریچ)ی كرد، كە لە تەنیشتی دانیشتبوو، ئینجا تەماشای ئەوانی دیكەی كرد، وەكوو ئەوەی بیەوێ رایان وەربگرێ. (بریچ) گوتی:

– من دەمەوێ زیاتر بڕۆم.

(لارامی) گوتی:

– من نامەوێ.

(پیگوت) گوتی:

– بۆ نەڕۆین؟ با بڕۆین.

ئینجا (كانتول) لە ڕۆیشتن بەردەوام بوو. حەفت هەشت مەتر زیاتر نەڕۆیشتبوو، كە هەموو شتێ بە چاوتروكانێك قەوما.

ڤیت كۆنگ. ڕاكەن! بوو بە ڕێژنەی گوللە.

ڤیت كۆنگەكان شەش كەس بوون و بە تفەنگی (آ.ك – ٤٢ ) لەپشت بەرمیلەكانەوە دەركەوتن. كابرایەكی قەڵەو و كەڵەگەت، جلی سەردەستەی لەبەر





بوو، دەستووری پێ دەدان. (كانتول) ڕەنگی پەڕی. ئوتومبێلەكەی داگیرساند و ویستی بسووڕێتەوە. ڤیت كۆنگەكان تفەنگیان لێ ڕاگرتن.

(كانتول) هاواری كرد: (Boachi – پەیامنێر! پەیامنێر!!)

(بریچ) هاواری كرد: پەیامنێر! پەیامنێر!!

(پیگوت) و (لارامی) و (پالموس)یش هاواریان كردو هەر ئەو وشەیەیان دووبارە كردەوە. هەموو بەیەكەوە هاواریان دەكرد بەجۆرێ كە زەحمەت بوو لە قسەكانیان بگەی. هێشتا هەر هاواریان دەكرد كە دایاننە بەر ڕێژنەی گوللە. (بریچ) لەسەر كورسییەكەی خۆی جووڵەی لێ بڕا، (كانتۆل) و (پیگوت) بەربوونەوە لای دەستە ڕاست و (پالموس) و (لارامی) یش كەوتنە لای دەستە چەپ. سەیركە، خوێنیان هێشتا هەر لەوێ ماوە. ئەو پەڵە قاوەییانەی شكڵی شەمشەمە كوێرانەیان وەرگرتووە.

تەنیا (پالموس) بەزیندوویی مابوو. چونكە لە بەینی (لارامی) و (پیگوت) دانیشتبوو، (كانتول) و (بریچ)یش لە پشتەوەی دانیشتبوون. كە لاشەی (لارامی) بەسەردا بەربووەوە، هیچ خۆی نەجووڵاندەوە، هەست و خوستی لەخۆی بڕی. لەو شوێنەوە، توانی هەموو شتێ ببینێ.

دیتی سەردەستە قەڵەوەكە، دەست بە شەشاگر بۆ لایانەوە هات و لوولەی شەشاگرەكەی لەسەر دڵی (بریچ) دانا. (بریچ) هاواری كردو گوتی: Boachi! ، سەردەستەش بەبێ بایەخی گوتی: Boachi! Boachi! ئینجا دوو گوللەی لە دڵی دا. ئەوسا چووە لای (كانتۆل) و (پیگوت). (پیگوت) برینەكەی لە چوارەكەی دی، سووكتر بوو. بە پاڕانەوە دەستی هێنایە پێش و گوتی: " نا، نا،پەیامنێر!! ، نا! " . بەڵام ئەو گوللەیەكی لە سەری (پیگوت) دا. ئینجا گوللەیەكی لە (كانتۆل) دا كە پرزەی لێ بڕابوو و قسەی نەدەكرد. ئێستا جگە لە (لارامی) و (پالموس) كەس نەمابوو. سەردەستەی قەڵەو هاتە لایانەوە. (پالموس) باسی دەكرد گوایە لەو ساتەدا خۆی مراندووە و هیچ جووڵەی نەكردووە. زانیویەتی ئومێدەواری بێهودەیە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئومێدی هەبووە شتێ ڕووبدا. ئەو شتەش ئەوكاتە ڕووی دا كە سەردەستە ویستی شەشاگرەكەی دابگرێتەوە. لەوكاتەدا

(پالموس) لە شوێنی خۆی ڤیت بووەوە و دەرپەڕی هەڵات. (پالموس) باسی دەکرد گوایە پێشتر زۆر رایکردووە، تەنانەت لە ئوستراليا، لە پێشبڕکێی راکردنی (٤٤٠ يارد) بەشداری کردووە و یەکەم دەرچووە، بەڵام لە ژیانی خۆیا هەرگیزاو هەرگیز وەکوو ئەو رۆژە، ئەوەندە تیژ غاری نەداوە. بەشێوەی زیگزاك غاری دەدا بۆ ئەوەی خۆی لە گوللە لابدا. کابرای ڤیت کۆنگیش گوللەی پێوە دەناو هاواری دەکرد و دەکەوتە دووی. (پالموس) تا ئاخیری کۆڵانەکە رایکرد، کۆمەڵانی خەڵك لەوێ وەستابوون، خۆی بەناو حەشیمەتەکەدا کرد. ئەوانیش گرتیانە ناو خۆیانەوە و شاردیانەوە. کەچی ڤیت کۆنگەکە هەر هاواری دەکرد و هەڕو گیفی لە خەڵکەکە دەکرد و دەیگوت بیدەنەوە، ئەگەر نا تەقە لەئێوەش دەکەم: " بیدەنەوە من! ئەوە هی منە! بیدەنەوە! "

پاش ئەوەی گوێم لە قسەکانی (پالموس) بوو، لەگەڵ (دەرك) چووینە ئەوێ. شەقامێکی بچووك و چۆڵ بوو، بێ دەنگیی وەك بەرد خۆی بەسەردا دابوو، بێدەنگییەکی وابوو گوێمان لە دەنگی هەناسەی ڤێتنامییەکان دەبوو کە خۆیان لە پشت پەنجەرەکان شاردبووەوە. دەستم لەبەر ئارەقە تەڕببوو، کامێراکەم لەدەست خزی و بەربووەوە سەر زەوی. بە درێژایی ئەو ماوەیەی لەوێ بووین تەنیا یەك دەورییەی ڤێتنامی خوارووومان بینی.

لە (چولون)، بیست و چوار سەعات، شەوو رۆژ، حکوومەتی سەربازی جڵەو بەدەستە. لە گەڕانەوەش دا کەسمان نەبینی. کە گەیشتینەوە فرانس پرێس، ئەوەندە شەکەتیمان بە سەرو سەکووتەوە دیار بوو، (فرانسوا) هاواری کردو گوتی:

" ئەرێ ، ئەوە چ بووە؟ دەڵێی مردوون! "

(فرانسوا) گوتی: من قسەکانی (پالموس)م بە تەواوی، سەد لەسەد قبووڵ نییە، گوتی: من وای بۆ دەچم (پالموس) زۆر شتی گوتووە و زۆر شتیشی نەگوتووە. (فرانسوا) بڕوای وایە (پالموس) ئەو شتانەی باسی کردوون، خۆی نەیدیون و بەرامبەر بەمەش شتی تری دیوەو باسی نەکردوون. گوتی: کە زیاتر پرسیار لە (پالموس) دەکەین، تووڕە دەبێ. (فرانسوا) گومانی لەم تووڕەبوونەی (پالموس)





هەیە. ئایا (پالموس) شتێکی لایەو دەیشارێتەوە؟ بەتایبەتی ئەگەر بیر بکەینەوە کە یەکێ لەم پەیامنێرانە چەکی پێ بووە! : ئاخر هەندێ پەیامنێری ئێرە چەکدارن ...

بەهەر حاڵ، (فرانسوا) نەیتوانیوە چیرۆکی (پالموس) هەرس بکا. من و ئەوانی تریش ناتوانین قسەکانی (پالموس) زۆر بە ڕاست وەربگرین. پەیامنێرانی رۆژاوا هەمیشە لەگەڵ ڤیت کۆنگەکان تەبا بوونە و چەندین ساڵ کاریان بۆ ئاژانسی دەنگ و باسی ئەوان کردووە و چەندین ساڵ بەرگرییان لێ کردوون و بە ئازایەتیی ئەوانیان هەڵگوتووە. ئەگەر خەڵك بە ڤیت کۆنگەکان هەڵدەڵێن، لەبەرئەوە نییە کە گوێ لە رادیۆی (هانۆی) رادەگرن، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە رۆژنامەی رۆژاوایی دەخوێننەوە. ئەوان نەدەبوو (پیگوت) و (لارامی) و (کانتۆل) و (بریچ) بکوژن ئەویش لە کاتێکا کە بە گاڵتەجاڕی وەڵامیان داونەتەوە. ڤیت کۆنگەکان کارێکی خراپیان کردووە، کارە کرێتەکانی ئەوانیش لەگەڵ کارە خراپەکانی (لون) جیاوازی نییە.

– قسەکەم راست نییە (فرانسوا)؟

(فرانسوا) گوتی:

– بێ گومان تۆ راست دەکەی. تۆ دەبێ ئەو راستییە بزانی کە هەرگیز ناتوانی یەك لایی حوکم بدەی. لەم جۆرە جەنگەدا، هەرگیز نە کەسێ بە تەواوی لەسەر حەقەو نە کەسێ بەتەواوی لەسەر غەڵەتە. لەبەر ئەوەی ئینسان ئینسانە. بەڵام من هەرچەندە هەوڵ دەدەم، ناتوانم باوەڕ بە خۆم بێنم کە ئەمە ئیشی ڤیت کۆنگەکانە.

– ئەی ئیشی کێیە؟

– چینییەکانی (چولون). ئەم چینییانەی (چولون) گەلۆری گەمژەو کرێتن. ئەوان رقیان لە هەموو پێست سپییەکە، بەلایانەوە جیاوازی نییە داخۆ ئەم پێست سپییە کێیەو کێ نییە. ئەوان تەنانەت رقیان لە ڤیت کۆنگەکانیش دەبێتەوە. بەلاش نییە کە من هەرگیز ناچمە (چولون). بێ گومان بۆی هەیە لەم مەزەندەیەما بە غەڵەت چووبم، بەڵام ئەوە دەزانم کە تا ئێستا هیچ پەیامنێرێك بەدەستی ڤیت

کۆنگەکان نەکوژراوە. ڤیت کۆنگەکان ئەگەر پەیامنێرێکیان دەستگیر کردبێ، وەکوو (کاترین) و (مازۆر)، چەند سەعاتێك گلیان داونەتەوە و پاشان ئازادیان کردوون. ڤیت کۆنگەکان سەربازی لەشکرێکی بەزەبت و رەبت و خاوەن بڕیارن و بەرەی ئازادی میللی لەم بارەیەوە دەستووری مسۆگەری پێداون ... نا، من بڕوا ناکەم، ئەم جۆرە رووداوە لە ڤیت کۆنگەکان ناوەشێتەوە: تەنانەت ئەگەر یەکێ لەم پێنج پەیامنێرە تەقەیشی کردبێ ...

نا. بێ شك ئەمە ئیشی چینییەکان بووە. ئەم چینییە هۆڤی و گەلۆرانە. ئەوان خۆیان بە ماوی دەزانن بەڵام هەر کاتێ دەرفەتیان بۆ رەخسابێ، گەلۆریی خۆیان بە باشترین شێوە پێشان داوە.

لەوانەیە قسەی (فرانسوا) راست بێ، بەڵام من وا تێ دەگەم ڤیت کۆنگەکان بووبن. هەست بە نائومێدییەکی زۆر دەکەم .حەزدەکەم بگریم.

تێبینی

ئەمڕۆ ئەو کوڕە میهرەبانەم بینی کە پێش چەند ساڵ لە (بۆینس ئایرس) ناسیم. ناوی (ئیگنا چیواز کورا)یە، لەلایەن بلاّوکراوەی (ناسیون)ەوە رەوانەی ئێرە کراوە. لەم رۆژانە، دەبێ رۆژێ فراوینی لەگەڵ بخۆم و لێی بپرسم رای لە بارەی کوژرانی (پیگوت) و (لارامی) و (بریچ) و (کانتول) چییە. لەوانەیە هەر ئەمشەو. ئێستا سەعات سێی دوای نیوەڕۆیە و هەر چاوەڕێ دەکەین لە یادی ساڵانەی (دین بین فو) شتێ بقەومێ. خودایە، تا ئێستا چند جار ئەم ناوەم بیستووە!

(دین بین فو)!

شەو

ئاخیری رووداوەکە قەوما ... بەڵام ئەو رووداوە نەبوو کە چاوەڕێمان دەکرد. دوای سێ مانگ شەڕ، ڤێتنامییە باکوورییەکان ئەو شتەی خەریك بوو ببێ بە (دین بین فو)ی تازەیان، لە دەستیان دا: خەسانیان لەدەست دا.

ئەم کارە لەپڕ شەو هاتە دی. ئەو تەپۆڵکانەی شەڕیان لێ بوو، جگە لە هەندێ پاشماوەی سوپای سێ سەدو چوار هیچی تریان بە سەرەوە نەمابوو. سوپای سێ





سەدو بیست و پێنجیش وەکوو هەڵم چووبووبە هەوادا. هەروەها یەکەمین پەنجا نەفەری دەستەی ڤیت کۆنگ توانیبوویان ئەو سەنگەرانە بگرن کە بە چەندین هاوەن و نێزەهاوێژ و رەشاشی قورس و کلاّوخوودەی کاری رووس و قوتووی پڕ فیشەك و کولە بارو چەند کوڵینگێك ئاخنرابوون. بێ گومان ئەم کارەی ئەوان مانای ئەوە نەبوو کە (خەسان) ئازاد بووە. نزیکەی هەفتەیەك کەمتری خایاند تا دەستەیەکی زۆری لیوای هێزی هەوایی و لیوای حەفتەمی سوارە گەیشتنە قونتاری چیا. دەستەکە پازدە کیلۆمەتریان مابوو بگەنە شوێنی شەڕەکە، نەیاندەتوانی رۆژێ یەك دوو کیلۆمەتر زیاتر بچنە پێش، چونکە رێگاکەیان بە قونتاری چیادا دەڕۆیشت و پڕ قۆرتی داپۆشرا بوو. ڤێتنامییە باکوورییەکان حەڤدە پردیان لەسەر رێگاکانی خەسان تێك دابوو و لەبەر ئەوەی وایان دەزانی ئەوەندە بەس نییە، سەراپای رێگاکانیشیان مین رێژ کردبوو بەڵام هیلیکۆپتەر و فڕۆکە و چەکی قورس و تانکی ئەمریکی توانییان بەربەستەکان لابەرن. ئێستا خەسان، وەکوو تراجیدییەکی بێهوودە و وەکوو شەهیدە بێهوودەکانی لە خاتیرەیەك زیاتر هیچی نەماوە. بێ هوودەیە ئەگەر بپرسن: لەم شەڕە کێ بردووتییەوە؟ لەم شەڕە کەس نییە بردبێتییەوە. تەنانەت نابێ ئەو پرسیارەش بکەین: ئەم جۆرە ئیشە بە کەڵك چ دێ؟ ئەم جۆرە ئیشە بە کەڵك هیچ نایە، جگە لەوەی پێنج هەزار مەوجوودی زیندووی هەژدە تا سی ساڵی لەناو بچێ.

ئامێرەکانی دەنگ و باسی فرانس پرێس، دەنگ و باسە نوێکە رەوانە دەکەن بۆئەوەی سبەی بە پێنج ستوون لە رۆژنامەکانی دونیا چاپ ببێ. من هەستم وەکوو هەستی شەوی پێش (داکتۆ) وایە. کاتێ کە لێپرسراوی ئامێری دەنگ و باس، شریتەکەی دووبارە لێ دەدایەوە بۆئەوەی پەیوەندی بە (مانیل) نەپچڕێ. شریتەکە بەدەم خولانەوە دەیگوت: " ئەمریکییەکان تەپۆلکەی (٨٧٥) یان جێ هێشت ... ئەمریکییەکان تەپۆلکەی (٨٧٥) یان جێ هێشت ... ئەمریکییەکان تەپۆلکەی (٨٧٥) یان جێ هێشت ... "

ڤێتنامییە باکوورییەکان خەسانیان جێ هێشت، بەڵێ، ڤێتنامییە باکوورییەکان خەسانیان جێ هێشت و :

خانم کوڕەکەی تۆ لە (داکتۆ) کۆچی دوایی کرد، هاوڕێ کوڕەکەی تۆ لە خەسان کۆچی دوایی کرد. بەداخەوە خانم! بەداخەوە هاوڕێ! لە رووداوەکە دەکۆڵینەوە، بێ شك غەڵەتێك بووە. مۆر: جەنەراڵ ( ویلیام وست مورلند). مۆر: جەنەراڵ (نگوین جیاپ).

(فرانسوا) کاتێ کە دوا رستەی دایە لێپرسراوی ئامێرەکە بۆئەوەی رەوانەی پاریسی بکات، گوتی:

– من لەو بڕوایەدانیم جەنەراڵ (جیاب) خەسانی نەویستبێ.

(فلیکس) گوتی:

– بێ گومان! ئەگەر بیویستایە، زۆر لە ئاژاوەی (تەت) باشتر دەیتوانی لەم کارەدا سەرکەوتن بە دەست بێنێ و ئەوەش دەزانین کە ئاژاوەی (تەت) هەرگیز نەدەبوو بە (دین بین فو)، بەلاّم (خەسان) شانی ئەوەبوو ببێ (دین بین فو)ی هەبوو.

(فرانسوا) گوتی:

– ئەو خەسانی زیاتر بۆ بانگەشە دەویست نەك وەکوو ستراتیجی. لەوانەشە ترسی لە ئەنجامی سەرکەوتنەکەی هەبووبێ چونکە گرتنی خەسان و پاراستنی، کارێکی قورس و بێ هوودەبوو بۆ (جیاپ).

(فلیکس) گوتی:

– بیری کردۆتەوە: " من دەست بەسەر خەسان دا دەگرم و خەڵك چەپڵەم بۆ لێ دەداو ئیتر ئەمریکییەکان ناتوانن زێرەڤانی رێگای هوشی مینە بکەن. بەلاّم پاشان چەند (ب – ٥٢) یەکم بۆ رەوانە دەکەن و هەموو شتێ لەگەڵ خاك یەکسان دەکەن ... وا چاکە بڕۆین و بەم کارەمان دڵخۆشیان بکەین تا ... "

(فرانسوا) قسەی پێ بڕی و گوتی:

– گوێ بگرە، رۆژنامەگەری رووداوی خەسانیان بەشیوەیەکی گرنگتر پێشان داوە و بە دوورو درێژتر نووسیویانە. دەزانی، ئەم رۆژنامەگەرییە بوو خەسانی لەسەر سینی زیو پێشکەشی جەنابی (جیاپ) کرد و گوتی : " جەنەراڵ (جیاپ) ئێمە خەسانمان کردە خەسان و ئێستاش تۆ هیچ ئیشت نییە ئەوە نەبێ کە





داگیری بکەی، (جیاپ)یش وەلاّمی دانەوە و گوتی: " بەڵێ، با نەختێ رابوێرین. "

ئەی تۆ نازانی جەنگ زیاتر بۆ رابواردنی جەنەراڵەکان پەیدابووە.

فلیکس گوتی:

– راست دەکەی!

(فرانسوا) گوتی:

– یاری شەترەنجمان هەیە، یاری تۆپی پێمان هەیە، یاری جەنگیشمان هەیە. ئەم یارییەی دواوە، بە سەدان و هەزاران سەرباز دەکرێ، سەربازەکانیش سەربازی مس نین بەڵکو سەربازێکن لە گۆشت و خوێن دروست بوونە و سپ و ساغ و زیندوون. ئەم سەربازانە دەدەنە جەنەراڵەکان بۆئەوەی یارییان پێ بکەن، ئەوانیش ژیانیان بە بڕیاری جەنەراڵەکان دەبەسرێتەوە. لە ئەنجامیشدا، یان سەربازە مسەکانمان دەشکێنن و یان دەگەڕێنەوە (نیویۆرك) و (هانۆی) بۆ لای دایك و باوکیان. بە تەکنیکی ئەم یارییەش دەڵێن ستراتیجی و بەزۆریش ئەم تەکنیکە پەیوەندی بە شعووری هیچ کەسێکەوە نییە، بەڵکو بە بەدهەرسی جەنەراڵەکان بەسراوەتەوە! نەختێ بیر لە جەنگی جیهانی یەکەم و لە (وردن) بکەوە: (وردن) قەسابێك بوو جلی جەنەراڵانی لەبەر بوو. شەوێکیان خەوی لێ زڕا، بڕیاری دا، سبەینەی پاشی دەست بە هێرش بکاو بۆ سبەینێ ئاگرێکی گەورەی هەڵگیرساندو سەربازە مسەکانی فڕێ دایە ناو ئەو ئاگرەو نزیکەی هەر هەمووی سووتاندن.

(فلیکس) گوتی: ئێمە هاتووینەتە ئێرە بۆئەوەی نارەزایی بەرامبەر قەسابی جەنگ پێشان بدەین.

– بەرامبەر گەلۆری و گەمژەیی جەنگ! (فلیکس) چونکە کاتێ کە جەنگ تەواو دەبێ قەسابەکە دەگەڕێتەوە ماڵی خۆی و میدالیای (لیژیۆن)ی دوو نووریی لە بەرۆکی دەدەن و کار کەناری دەکەن.

پرسیم:

–ئەرێ (فرانسوا)، تۆ قەت جەنەراڵێکت دیوە شعووری هەبێ؟

– ئایا ئەوانەی جەنگ دەکەن، مانای شعوور دەزانن؟ من هەمیشە گوتوومە سێ

جۆرە شعوور هەیە: شعووری ئینسانی، شعووری حەیوانی، شعووری سەربازی. دووەکەی بەرایی لە هەندێ خاڵ هاوبەشن، بەڵام سێیەمیان نەء. دەتوانی جەنەراڵی ئازا پەیدا بکەی، بەڵام جەنەراڵی خاوەن شعوور، بەو مانایەی ئێمە بەم وشەیەی دەدەین، هەرگیز!

– ئایا تۆ قەت جەنەراڵی بە شعوورت دیوە؟

– یەك جار، لە جەنگی کۆریا. ناوی (واکر) بوو. تاکە جەنەراڵێك بوو توانیبووی بنکەیەکی فەرماندەیی لەنێوان سەنگەرەکان و تۆپخانە دابمەزرێنێ. لە بنکە فەرماندەییەکەی، لەبەر هەراو هۆریا کەڕ دەبووین و خراپترین نانی دونیامان لەسەر سفرەکەی ئەو دەخوارد، چونکە پاڵە پەستۆی هەوای هاویشتنی تۆپەکان، لێ دەنەگەڕا هەویری نانەکە هەڵبێ. دەبوایە نانێکی خراپ بخۆین بۆئەوەی بە بیرمان بێتەوە کە پیاو، سەربازی مس نییە. بێ گومان پیاهەڵدانی ئەم جەنەراڵە، ڕێ لەوە ناگرێ بێ هوودەیی جەنەراڵێتی ڕەت نەکەینەوە. ئینجا چووە سەر بانێژەکە بۆ ئەوەی پشوویەك بدا.

<u>تێبینی</u>

تا بانێژەکە دوا بەدوای چووم.

کە تووڕەیی هەموو گیانم دادەگرێ، بە قسەکانی ئەو هێور دەبمەوە. ئەم پیاوە باشترین کەسە من دیبم. ناتوانم قسەکانی (مازۆر) ڕەت کەمەوە کە دەرهەق بەمەوە دەیگوت: " داوام لێ بکە ، بۆ خاتری ئەم پیاوە خۆم لە پەنجەرە فڕێ بدەمە دەرەوە، خۆم فڕێ دەدەم. چونکە ڕێزی دەگرم، بەڵام داوام لێ مەکە خۆشم بوێ چونکە پێم ناکرێ. پیاو ناتوانێ خۆشی بوێ. "

منیش بە پێچەوانەوە، وا دەزانم ئینسان پێی ناکرێ خۆشی نەوێ.

– (فرانسوا)، تۆ خەسانت دی بوو؟

– بەڵێ، هەڵبەت، چەندین جار چووبوومە خەسان، باش شارەزای خەسان بووم.

– دەزانی، من نەچووم، ترسام، کەچی ئێستا دەبێ چیرۆکی خەسان بنووسمەوە.





– من باسی چیرۆکی خەسانت بۆ دەکەم.

پاشان چووە ژووری کارکردنی خۆی و هاتەوە دوو وێنەی پێ بوو، وێنەکانی نیشان نەدام. لە تاریکی لەسەر عەرزی بانێژەکە دانیشت. دوو فڕۆکە بە نزمی دەفڕین و ساروخی نوور بەخشییان دەهاویشت.

– کاتی خۆی، شینایییەکی قاوە لە شوێنێك هەبوو بەناوی (خەسان). ئەو شوێنە ئەوەندە بێ بایەخ بوو، تەنانەت ناویشی کەم لەسەر نەخشەی جوگرافیای ڤێتنام نەدەکەوتە بەرچاو، هەندێ جار ناوی لە نەخشەدا هەر نەبوو.

بەڵام جێگایەکی خۆش بوو. ئەوروپا، یان باشتر بڵێم (توسکان)ی بە بیر دەهێنایەوە. گەڵیی سەوزو دەشتی پڕ گوڵ و گرد و تەپۆلکە! تەپۆلکەکانی زۆر ڕك بوون، زۆر نەرم و سەوزبوون! قاوەی باش دەهێنا چونکە خاکێکی باشی هەبوو، خاکەکەی سوور و بە پیت بوو، دەق وەکوو خاکی (توسکان) وابوو. ئاو و هەواشی خۆش بوو.خەسان یەك تاکە شتی خراپ بوو، ئەویش ئەو بەورانە بوون کە دەبوایە بە بەردەوامی تەقەیان لێ بکەی و بیانکوژی ئەگەر نا دەیانخواردی. خانمی(بوردو دوك)ی خاوەنی شینایی قاوەکە، بە درێژایی ڕۆژ و بگرە هەندێ جار بە شەویش لەسەر درەختەکان دەمایەوە بۆئەوەی بەورەکان ڕاو بکا. لە ژیانی خۆیا چل بەوری کوشتیبوو، دەیگوت: " بە کوشتنی بەور ناڕەحەت دەبم بەڵام هیچ چارەم نییە، وانەبێ کرێکارەکانی شینایی دەخۆن. "

خاوەنەکانی ئەم شینایییە فرەنسی بوون. ژنەکە ناوی (بوردو دوك) و پیاوەکە ناوی (ئۆژن پویلان) بوو، بەڵام هەموو کەس بە (باوکە پویلان) ناویان دەبرد. دەیانگوت پیاوێکی نائاسایی بوو، ریشێکی درێژی بەردابووەوە. زۆر ئازاو چالاك و کارا بوو. بە گەنجی هاتبووە خەسان. ئەو کاتە خەسان لە جەنگەڵ زیاتر هیچی تری تێدانەبوو: بە تەنیا دەستی بە چاندنی قاوەکرد و بە جۆرێ دڵی دایە ئەو زەوی و خاکە دەتگوت نیشتمانی خۆیەتی . پێکەنینم بەو کەسانە دێ کە باوکە پویلان بە داگیرکەر دەزانن، ئەو هیچ شتی بەزۆر لە کەس نەستاندووە، ماڵی کەسی زەوت نەکردووە.

(فرانسوا)، نەختێ بێدەنگ بوو بۆ ئەوەی رقی دەروونی دابمرکێتەوە، ئینجا بە

دەنگێکی هێدی و تفت و تاڵ لە شەڕە قسەکانی بەردەوام بوو.

شینایییەکە کەوتبووە دەوروبەریخانووەکەی، خانووەکەیشی لەسەر شێوەی خانووەکانی (توسکان) یان (ئوورنی) دروست کرابوو. بورجێکی بچووك لە ناوەڕاستی شینایییەکە بۆ کۆتران و عەنبارێك بۆ ئامێرو کەرەستەکان و حەوشێکیش لەبەردەم بیناکە، هەبوو. ئەم حەوشە بۆ وشك کردنەوەی قاوەبوو. خانووەکە وەکوو خانووەکانی ئێمە پڕ سەگ و پشیلە و مریشك و کەڵەباب و منداڵ و کرێکاری شادو دەم بە پێکەنین بوو. دوو فیل لەسەر تەپۆڵکەی تەنیشتی دەژیان. ئەمانە لەو رەوەیە جێ مابوون کە لە لاووسەوە بۆ ئاوخواردنەوە هاتبوونە ئەوێ. فیلەکان پیربوون و بەکەڵك هیچ نەدەهاتن، بەڵام خەڵکی چیا بە میهرەبانی، بە تایبەتی بۆ راگرتنی دڵی باوکە پویلان، چاویان لە فیلەکان بوو. باوکە پویلان گوتبووی:

" ئێمە نابێ گیانداری پیر بەر هەڵبدەین و لە کۆڵ خۆمانی بکەینەوە. "

(فلیکس)ی کوڕی باوکە پویلان و خانمی بوردو دوك، لەگەڵ ژنەکەی کە ناوی (مادلین) بوو و دوو منداڵەکەی کە ناویان (ماری)و (فرانسوا) بوو، لەوێ دەژیان

... ئاخرجار لەگەڵ (ژاك لوران) چوومە سەردانی و شەرابی بوژۆلەم بۆ برد.

دیسان نەختێ بێدەنگ بوو، ئینجا بە دەنگێکی ئارامتر بەردەوام بوو:

– پێش ئەوەی جەنەراڵەکان دەست پێ بکەن بە سەربازە مزەکانیان راببوێرن، خەڵك لە خەسان ژیانێکی خۆش و شادیان هەبوو. شینایییەکی تری قاوە لە نزیك شینایی قاوەی باوکە پویلان، هەبوو، هی کابرایەکی فرەنسی بوو بە ناوی (لینار). ئەویش پیاوێکی بەختەوەر بوو. زەماوەندی لەگەڵ ژنێکی ڤێتنامی کردبوو و دەوروبەری پڕ منداڵی نیمچە فرەنسی و نیمچە ڤێتنامی بوو. هەمیشە دەیگوت: " داوای یەك شت لەخوا دەکەم: لە خەسان بمرم! "

ئینجا جەنەراڵەکان دەستیان بە یاری کرد بە سەربازانی مس و لەوەبەدواوە ئیتر ئارامی لە خەسان نەما.

رۆژێ لە رۆژانی ساڵی ١٩٦٥، باوکە پویلان چووە (هوئە) و ئیتر نەگەڕایەوە. دوای چەند رۆژێك تەرمەکەیان دۆزییەوە گوللەیان لە دڵی دابوو. لەوانەیە چەند





کرێکارێکی قین لە دڵ و لەوانەیشە چەند سەربازێك کوشتبیان. کەس نەیزانی!

ئەم رووداوە ئەوەندە سەخت و ناخۆش بوو بۆ خاتوو( بوردو دوك)، بەرگەی نەگرت. یەکسەر (خەسان)ی جێ هێشت و گەڕایەوە فرەنساو لەوێ لە دێرێك دەستی بەئیش کرد.

لەو دێرە بوو کە ناسیاویم لەگەڵ پەیدا کرد. پیرەژنێکی قژ بۆز! وەکوو هەر پیرەژنێکی تر. هیچ نیشانەیەکی ئەو ژنەی بە رووەوە دیار نەبوو کە شەوو رۆژ لەسەر درەختان دەمایەوە و بەوری راو دەکرد. دوای ماوەیەك کوڕەکەیم ناسی کە ئێستا سەرپەرشتی شینایییەکە دەکا. ئەمەش وێنەکەیەتی.

یەکێ لەوێنەکانی نیشان دام. وێنەکە وێنەی پیاوێکی گەنج بوو، جلی موستەعمەراتی لەبەر بوو، چاو جوان و لێو بەخەندە!

– لە سەفەری یەکەمم بۆ خەسان، ناسیم. لەگەڵ هێزی دەریایی بۆ پشکنینی لاوس و دەوروبەری (چەپوون) دەرچووبووین. لە نزیك رێگای هوشی مینە ژمارەیەکی زۆر ڤیت کۆنگ خۆیان لە جەنگەڵی تەنیشت شاردبووەوە، بەتایبەتی لەسەر ئەو تەپۆلکەی باوکە (پویلان) دارسێو و دار کرۆسکێکی زۆری لێ چاندبوو. دوای ئەوەی لە سەفەرەکە گەڕاینەوە و گەیشتینە نزیك باخەکە. ئێستاش ئەو رۆژەم لە بیرە، پێکدادانێك رووی داو دوو کەس لە دەستەکەی ئێمە کوژران. من لە تەنیش شینایی باوکە (پویلان)، لەدەم ئەو رێگا خۆڵە سوورەی دەچووە فڕۆکەخانە، وەستام. لەوێ (فلیکس) م ناسی: پیاوێکی سی و پێنج ساڵی، چالاك و سەرنجکێش! باشترین قاوەی لە شینایی ئەوێ پەروەردە دەکردو حەزی دەکرد دار پرتەقاڵ لە خەسان بچێنێ.

لەگەڵ (فلیکس) بووم بە برادەر و هەر ئەویش بوو منی بە خاوەن شینایییەکی تر (لینار)، ناساند.

ئەو رۆژگارە، (لینار) پیاوێکی تووڕەو قیچکە تەنگ و دەم پیس بوو، بەجۆرێ باسی خەسانی دەکرد دەتگوت خەسان ژنێکی جادووگەرەو جادووی لێ کردووە!

دەیگوت: " من ئێرە جێ ناهێڵم. من دەمەوێ لە خەسان بمرم و هەرگیز ناچمەوە فرەنسا، مەگەر تەرم و تابووتم ببەنەوە ئەوێ. "

ئینجا (فلیکس) بە قەشەی خەسانی ناساندم، قەشەیەکی بێ قەڵەمڕەو بوو. چونکە لە خەسان، تەنیا ماڵی (پویلان )و (لینار) کاتۆلیکی بوون، (لینار) یش ئەوەندە بە دین نەبوو. بەڵام قەشەکە لەسەر داوای خۆی لەوێ مابووەوە و لادێییەکان زۆر خۆشیان دەویست و ئەویش لە ئیش و کار یارمەتی دە دان.

باوکە (پونسە) پیاوێکی گەنج و عاقڵ بوو، بەڵێ، قەشەکە ناوی (پونسە) بوو. لەگەڵ ئەویش بووم بە برادەر. هەر جارێ کە دەچوومە خەسان هەر دەبوایە سەری لێ بدەم. ئەمەش وێنەکەیەتی.

وێنەی دووەمی نیشان دام. وێنەکە وێنەی پیاوێکی گەنج و تێکسمڕاو بوو، ئەویش جلی موستەعمەراتیی لەبەر بوو. ریشێکی تۆپ و پڕ، دەم و چاوی داپۆشی بوو.

ئینجا جەنەراڵەکان بڕیاریان دا یاری بە خەسانیش بکەن و ویستیان یارییەکی گەورەی پێ بکەن. بڕیاریان دا پێگەیەکی هەوایی لەوێ دروست بکەن بۆئەوەی بتوانن رێگای هوشی مینە باشتر بخەنە ژێر چاوەدێری. پێگە هەواییەکەیان یەك کیلۆمەتر و نیو دوور لە شینایی (پویلان) دروست کرد.

ئەم کارەیان وەکوو ئەوە وابوو هەنگوین رۆبکەن بۆئەوەی مێش و مەگەز رابکێشن و بیانخەنە داوەوە.

لە ئاخرو ئۆخری کانوونی دووەم، ڤێتنامییە باکوورییەکان ژمارەیەکی زۆری تەپۆلکەیان داگیر کردبوو و لە شوبات (لانگ وی) یان داگیر کرد. ئەمەیان گوندێکی بچووکەو کووخە بچووکەکانی لەسەر ئاو دروست کراون.

ئەمە سەرەتای کارەساتەکە بوو.

دوو فڕۆکەوانی سەرنەکەوتوو لەو ئەرکەی پێیان سپاردرابوو لە گۆڕایی  هوشی مینەی نزیك لاوس دەگەڕانەوە. ئەمانە ئامانجی خۆیان نەپێکا بوو، ناچاربوون پێش نیشتنەوە، بۆمباکان فڕێ بدەن. لەو کاتەدا، یەکێ لەو دوو فڕۆکەوانە چاوی بە (لانگ وی) کەوت و گوتی مەزەندە دەکەم ئێرە جێگای ڤیت کۆنگەکان بێ، چەند بۆمبایەکی هاویشت و (لانگ وی) لەگەڵ خاك تەخت کرد و سەد لادێی زیاتر کوشت. (لانگ وی) چوار کیلۆمەتر لە خەسان دوور بوو.





ماڵی (پویلان) و (لینار)و باوکە (پونسە) ناچار بوون رابکەن بۆ (هوئە) و لەوێ کەوتنە ناو ئاژاوەی جەژنی (تەت).

(فرانسوا) ماوەیەك چاوی بڕییە وێنەی باوکە (پونسە) و چەند جارێك خووزی زاری قووت دایەوە و هەوڵی دا بەری فرمێسکی بگرێ.

– باوکە (پونسە) یەکەم کەس بوو مرد. رۆژی سێزدەی شوبات لە شەقامێکی نزیك قەڵای شار، کاتێ کە لە تەنیشت (لینار) و ماڵەوەیان دەڕۆیشت، گوللەیان لە پشتی دا. (فلیکس پویلان)یش دوای دوو مانگ، واتە رۆژی سێزدەی نیسانی رابردوو لەناو فڕۆکەیەك مرد کە پێی دەهاتەوە خەسان.

کارمەندانی فڕۆکەکە و ئەو سەربازانەی هاو سەفەری بوون توانیان خۆیان نەجات بدەن، بەڵام ئەو بەزیندوویی لەناو ئاگردا سووتا. مەزەندەم بۆ ئەوە دەچێ کە بریندار بووبێ بەڵام ئەو کوڕە ئازیزانە، بۆ ئەوەی کاتی خۆیان بە فیڕۆ نەدەن، یارمەتییان نەدا بوو، تێگەیشتی؟

– ئەی (لینار)؟ ئەو پیاوەی حەزی دەکرد لە خەسان بمرێ؟

– بەڵێ، کاتێ کە باوکە (پونسە) بریندار بوو، ئەویش بریندار بوو ئەو بەڵام نەجاتی بوو. رەوانەی پاریسیان کرد و لە پاریس مرد.

لەوە بەدواوە کەس شینایی قاوەی لە خەسان نەدی. نەك هەر شینایی قاوە، بگرە کەس هیچ شینایی تری لە خەسان نەدی.

سەری بڵند کرد، دیتم دڵۆپە فرمێسکێکی بەسەر گۆنادا هاتە خوارێ.

– ئەمەش چیرۆکی خەسان!!

<u>(٩) ی مایس</u>

کپی و بێدەنگی سپێدەی ئارام و هێمن، لەپڕ بە رێژنە گوللەیەك شڵەقاو مەرگ کەوتەوە کار، لە کاتێکا کە جلی ئەمریکی و جلی ڤێتنامی باشووری و جلی ڤێتنامی باکووری و جلی ڤیت کۆنگەکانی لەبەر بوو.

ژمارەی ڤیت کۆنگ لە شارچەندە؟ هەندێ دەڵێن سێ هەزارە. هەندێکی تر دەڵێن چوار هەزارە، بە وردی ناتوانین بڵێین چەند کەسن، چونکە بەردەوام هەر دێنە ناو شارو زۆربەشیان لە سنووری کەمپۆدیاوە بەناو مەرەزەی (تی نین) دا

تێدەپەڕن و دێنە ژوورەوە. ئامانجیان داگیرکردنی شوێنی ستراتیجی نییە، بەڵکو ئامانجیان کوشتنی ژمارەیەکی زۆری دوژمنە، لە کاتێکا کە ڕۆژ بەڕۆژ رق و قینییان زیاتر دەبێ و زیاتر تۆوی ترس و تۆقان لە دڵی دوژمن دەچێنن.

ئەوانە بە دەستەی پێنج نەفەری و شەش نەفەری و دە نەفەری دەجووڵێنەوە و تواناو دەسەڵاتیان لەوەدایە کە خێرا زەبر دەوەشێنن و یەکسەر پەرتە دەکەن: پەلاماریان هەرگیز لە دە دەقیقە تێناپەڕێ. بە زۆری کە هیلیکۆپتەر دەبینن، بزر دەبن. ئەو گوتارەی جەنەراڵی ڤێتنامی باکوور (نگوین چی تان) بۆ رابەران دای، تەواو واقیعییە. گوتی: " ئەمریکی وا تێ دەگەن بۆئەوەی سەرکەوتن بەدەست بێنن پێویستیان بە سەربازی زیاتر هەیە، نازانن لەم جەنگەدا، تەکنیکی جەنگی گرنگە نەك هێزو لەشکر. ئەمریکییەکان لە ئێمە بەتوانا ترن و هێزی سوپایان زۆر نوێیە، وەسف ناکرێ، ئێمە تەنانەت هەوڵیش نادەین لەم ڕووەوە ململانەیان لەگەڵ دا بکەین. وەکوو ئەوەی بمانەوێ برنج بە کەوچك و چەتاڵ بخۆین! ئێمە ناتوانین برنج نە بە کەوچك بخۆین و نە بە چەنگاڵ. ئێمە تەنیا دەتوانین برنج بە چیلکەی برنج خۆری بخۆین. جا بۆئەوەی بەسەر ئەمریکییەکاندا زاڵ بین، دەبێ وایان لێ بکەین بە چیلکەی برنج خۆری برنج بخۆن. هاوڕێیینە، لەبیرتان بێ کە جەنگی ڤێتنام بازنەی مستبازییە و ئەمریکییەکان مستبازی وان مست لە هەوا دەکوتن و شەڕە مست لەگەڵ (با) دەکەن. ئەم (با)یە ئێمەین. هاوڕێیینە، ئێوەش وەکوو (با) خۆتان بە چڕ و چاویان دابدەن. وەکوو (با) لە دەستیان راکەن. هاوڕێیینە، با خۆزگە بخوازین ئەم (با) یە هەرگیز نەنیشێتەوە"

یەك شەممەی پێنجی مایس، (با) یەك بەڕووی سایگۆن دا هەڵیکرد. (با) یەکی سەرکەش و غافیڵیگیر. جاریێ دەبوو بە مایەی خراپ کردنی بان و گاوێ ڕێدارێکی لە زەوی دەکوتا. (با) یەك لێرەو تۆفان و زریانێك لەوێ: لەو کاتەوە کە ئەو (با)یە هەڵی کردووە، لە هەرکوێ بین و بچینە هەر کوێ، هەست دەکەین حوکمی مەرگمان بەسەردا دراوە. کاتێ کەبیر دەکەمەوە تا چەند لەحزەیەکی تر (فلیکس) دێ بۆ ئەوەی بچینە دیدەنی شەڕگە، ئەم هەستە دامدەگرێ و پرسیار لە خۆم دەکەم: کام شەڕگە؟ ئۆف! بەهەر حاڵ چ سوودی هەیە، هەر وەکوو دوێنێ





لەگەڵ دەرك بە سەلامەتی لە (چولون) گەڕامەوە، ئەمڕۆش بە سەلامەتی دەگەڕێمەوە و پاشان لە ماڵی خۆم دەمرم. وەکوو ئەو سوێدییەی دوێ شەو، لە خەودا، گوللەیەك لە پەنجەرەی ژووری نووستنی چۆتە ژوورەوە و پێی کەوتووە و کوشتوویەتی.

<u>دوای نیوەڕۆ</u>

ئەو شوێنەی ویستمان دیدەنی بکەین پردێك بوو دەچووە خەسان. ئەوەندەی نەمابوو لەوێ مەرگمان بگاتە سەر. دانیشتوانی(سایگون) بەم پردە دەڵێن پردی عاشقانی بەدبەخت چونکە کاتی خۆی خەڵك لەوێ خۆیان دەکوشت.

ئەمریکییەکان بەم پردە دەڵێن ئیگریگ چونکە لەسەر شکڵی تیپی ( ئیگریگ–وای) دایە. سێ پردە لەناو یەك. تاقی سەرکەوتن چەند لە گۆڕەپانی کۆنکۆرد دوورە، ئەم پردەش ئەوەندە لە مەڵبەندی (سایگون) دوورە. ڕۆژێ، دوو سێ جار، لەوێ شەڕ دەگاتە ئەو پەڕی توند و تیژی. ئینسان تێ ناگا بۆچی ئەم هەموو کاتە بۆ گرتنی ئەم پردە بە فیڕۆ دەدەن.

ئەمریکییەکان، بەرامبەر چەند دەستەیەکی بچووکی ڤێتنامی، ئەوەندە سەرباز و تەقەمەنییان لە دەوروبەری پردەکە داناوە بایی شەڕێکی گەورەی وەکوو شەڕی (هانوی) دەکا.

تانك و تۆپ و بەلەمی بایەوانی لەناو رووبارو هیلیکۆپتەر بەردەوام بەسەر ئەم ناوچەیەدا دەسووڕێنەوە. بۆئەوەی تەقە لە چ کەسێ بکەن؟ ئەگەر ئەو (با) یە هەڵبکا، ئەوان تەنانەت پێ راناگەن جێی خۆشیان بگرن. ئەو کاتە بوو کە من چوومە ئەوێ. هەموو شتێ لەبەر چاوم هێمن و ئارام بوو جگە لە چەند ئاگرێك کە دووکەڵی دەگەیشتە ئاسمان (ناپاڵم)، هیچی تر دیار نەبوو.

تا دووڕێیانی پردەکە رۆیشتم و خەریك بووم خۆم بۆ گرتنی وێنەیەك ئامادە دەکرد، لەپڕ ڤیت کۆنگەکان دەستیان بە تەقە کرد. لەکام لاوە؟ نازانم هەر ئەوەندەم لەبیرە گوێم لە دەنگی تەقە بوو، پاشان گوێم لە دەنگی (فلیکس) بوو، خۆی لەپشت تانکێك شاردبووەوە و هاواری دەکرد: " خۆت بەسەر زەوی دادە، بەسەر زەوی! " خۆم بەسەر زەوی دادا. لەماوەی پێنج دەقیقە کە ئاوها لە

ناوەڕاستی پردەکە لەسەر زەوی کەوتبووم و ڕۆحی خۆم بەخوا سپاردبوو، نەمدەزانی دەمرم یان بە زیندوویی دەمێنم، هەستم کرد نە تانکێك، نە هیلیکۆپتەرێك و نە بەلەمێك، نە سەربازەکان، کەس هیچی نەکرد. کە بێدەنگییەکی وەکوو بێدەنگی کڵێسە باڵی بەسەر شوێنەکەدا کێشا، ئەوسا دەستیان بە وەڵامدانەوەی هێرشەکە کرد. دوای ماوەیەك ڕووداوێکی وەکوو ئەمە لە بەرامبەر ئوتێلی (ماژستیك) دووبارە بووەوە. فلیکس نەختێ وەستاو تەق! گوللەیەك مەترێك لەوەوە دوور لە دیوار چووە خوارێ. ئایا لەسەر بانێك تەقەیان دەکرد؟ یان لە کەشتییەك کە لە کەناری بەرامبەر لەنگەری گرتبوو؟ کەس نازانێ.

شەقام پڕ بوو لە سەربازی وررووژاو. کەوتنە جم وجۆڵ و هات و هاوار بەڵام کەس وەڵامی ئەو گوللەیەی نەدایەوە، چونکە نەیاندەزانی لەکوێوە هاتووە و تەقە لە کام لا بکەن.

ئەفسەرێکی ئەمریکی ئەمڕۆ قسەیەکی کرد، پێکەنینم پێ هات، گوتی: "دەستەو تاقمی ئێمە دەبێ ڕێ لە هەموو هاتنێك بگرن چ لە باشووروو چ لە ڕۆژاوا و چ لە باکووری ڕۆژهەڵاتی (سایگون)بێ. لەماوەی بیست و چوار سەعاتی رابردوو، چوار سەدو چل و پێنج کەس لە دوژمن کوژراوە، لەوانە دوو سەدو چل و دوو کەسیان لەناو پایتەخت کوژراون.

جڵەوی کاروبار بەدەست خۆمانەوەیە، ئەمڕۆ و سبەی دەبێ باشووری ڕۆژهەڵاتی (سایگون) لەوانە پاك بکەینەوە. "

قسەی هەلەق و مەلەق! ئێمەی پەیامنێر لەوە زیاتر هیچ ئیشمان نییە کە لە باکووری ڕۆژهەڵات بچینە باشووری ڕۆژهەڵات بۆئەوەی شەڕی نوێ ببینین و تۆماری بکەین!! وا دیارە ژمارەیەك ڤیت کۆنگ جلی سەربازییان لە بازاڕی دزان کڕیوە و لەبەریان کردووە و خۆیان کردووە بە سەربازی ڤێتنامی باشووری، هەندێکیش دەڵێن گوایە بە چاوی خۆیان دیویانە سەربازی ڤێتنامی باشووری تەقەیان لە سەربازی ڤێتنامی باشووری کردووە: کە بارودۆخ شڵەژاوبێ، ڕاست و چەوت لەیەك جیا ناکرێتەوە. شەپۆلی ئاوارەکان هەر بەردەوام بوو، ڕوو لە زیادبوونیش بوو. وەکوو ڕووبارێکی پڕ جەستەی شەکەت و بێدەنگ وابوو.





عارەبانەکانیان رادەکێشا، پایسکیل و ڕەشەوڵاغ و بەرازو منداڵ و کورسی و کڵاوی قووچ و جانتایان لێ بزر دەبوو و کە ڕووبارەکە دەنیشتەوە، ئەم هەموو ئاوماڵکە بەورد و هەڕاکراوی لەسەر قیری جادە بەجێ دەما. دەق وەکوو خوڕی وشکەوەبووی ڕووبار وابوو.

خودایە، ئەمە چ دیمەنێکی شەرم و فهێت و شورەییە!

ئەمڕۆ بەیانی ژنێك منداڵەکەی لەناو ئەم ڕووبارە بزرکردبوو، نەیدەتوانی پێ لەبەر پێ بنێ. دەیەویست بگەڕێتەوە. دەگریا، دەپاڕایەوە، بەڵام ڕووبارەکە هەر وەڵامی نەدەدایەوە، وەکوو ئاو بەبێ هەست و خوست رای دەپێچاو دەیبرد. کەوتبووە ناو تەوژمی ئاوو ئاوەکە رای دەپێچا، دەستی بەرز کردبووەوە، هاواری دەکرد و ناوی منداڵەکەی دەهێنا: " وئان! وئان!... وئاااان ...! "

**تێبینی**

ئەمڕۆ بە مەسەلەی (ئێگیناچیو ئەزکورا) وە گرفتارین. دوێنێ بەیانی، لەگەڵ دوو پەیامنێری تری ئاسیوشێیتد پرێس و نیوزویك بۆ وەرگرتنی دەنگ و باس چوونە (چولون). ویستیان لە نزیك شوێنی کوژرانی (پیگوت) و ئەوانی دیکەی بوەستن بۆئەوەی شوێنی ڕووداوەکەش ببینن. لە ئوتومبیلەکە دابەزی و ڕۆیشت و تا دوای نیوەڕۆ نەگەڕایەوە ئوتێلەکەی، بۆ شەویش نەگەڕایەوە کە بڕیاربوو بێ لەگەڵ من بەیەکەوە شێوی ئێوارە بخۆین. ئایا گرتوویانە؟ ئایا چووە دەنگ و باسێکی سەرنجکێش وەربگرێ؟ ئایا چۆتە باکوور؟ هەموو بە (نا) وەڵامی ئەم پرسیارانە دەدەنەوە، چونکە لەو بڕوایەدان تازە لە باکوور هاتۆتەوە و دوای حکوومەتی سەربازیش ناکرێ بە دوای دەنگ و باسی تازەدا بچێ. بە هەر حاڵ، دەزانم پیاوێکی بە ئەدەبە و ژوانی شێوی ئێوارە لەبیر ناکا.

ئێمە مەزەندەمان بۆ ئەوە دەچێ کە دەستگیر کرابێ، یان ... نا، نامەوێ بیر لە شتی وا بکەمەوە ...

(فرانسوا) گوتی ئەم شەو دەچمە ئوتێل بۆ ئەوەی بزانم (ئەزکوار) بەر لەوەی دەربچێ، ژوورەکەی بە چ بارودۆخێك جێ هێشتووە.

شەو

(فرانسوا) چووە ئەوێ. بارودۆخی ژوورەکە بە جۆرێکە دیارە خاوەنەکەی بەپەلە دەرچووە و بە تەمابووە زوو بگەڕێتەوە. ئامێری نووسینی، کاغەزێکی نیوە نووسراوی تێدایە، لەو کاتەی کە خەریکی چاپ کردنی نووسینەکان بووە، دوو پەیامنێری هاوکاری هاتوونەتە دووی، ئەویش کارەکەی خۆی بە نیوەچڵی جێ هێشتووە و لەگەڵیان چووە.

کاغەزەکە دوازدە وشەی لەسەر نووسراوە: " سایگون. (٨) ی مایس. لە مانگی مایسی ئایندە خوێنێکی زۆر دەڕژێ ... " و قەرەوێڵەکەی هەندێ کتێب و بیرەوەری پەرت و بڵاوی لەسەرە، چاکەت و پانتۆڵ و جلی سەربازی لەناو کانتۆرەکەی بەدارەوە کردووە، جا ئەستەمە لەگەڵ سەربازان دەرچووبێ. مەکینەی ریش تاشینی لە حەمامە. دەزانین هیچ پیاوێك بەبێ مەکینەی ریش تاشین سەفەر ناکا. برووسکەیەکی بۆ هاتووە، هێشتا نەیکردۆتەوە. برووسکەکە هی رۆژنامەکەیەتی.

(فرانسوا) لەو بڕوایە دایە (ئەزکورا)، نەچۆتە باکوور، دەستگیریش نەکراوە.بەڵکو تووشی چارەنووسێکی وەکوو چارەنووسی (پیگوت) و (لارامی) و (بریچ) و (کانتۆل) و (بارون) ی ئەڵمانی هاتووە.

فرانسوا بە چاکی نیشانەکانی (ئەزکورا)ی بۆ پۆلیس هەڵدا، بۆئەوەی تەرمەکەی لەناو تەرمە دۆزراوەکان بناسنەوە: بیست و هەشت ساڵی، کەڵەگەت، لاواز، قژ قاوەیی تۆخ، قژ گلۆوازە، مووی لاجانگ تەنك، دەم و چاو لاواز، گۆنا زەق، لووت درێژ، برۆ پڕ، چاو رەش. بلووزێکی قۆڵ درێژی سپی لەبەرە و پانتۆڵێکی خۆڵەمێشی لە پێیە و کەمەر بەندێکی کاڵی لە پشتەو پێڵاوێکی بێ قەیتانی لەپێیە.

(١٠) ی مایس

ئەویشیان کوشتووە. ئەمڕۆ بەیانی، وێنەگرێکی ژاپۆنی فلیمێکی بردبوو بە ئاسۆشێیتد پرێسی فرۆشتبوو. فلیمەکەی لە (چولون) گرتبوو. یەکێ لە وێنەکان تەرمی پێست سپییەکی تێدابوو. تەرمەکەی لە تەنیشت تەرمی ڤێتنامییەك لەسەر





شۆستە کەوتبوو. پانتۆڵێکی خۆڵەمێشی لەپێ بوو و کەمەر بەندێکی کاڵی لە پشت بوو و بلووزێکی سپی قۆڵ درێژی لەبەر بوو، پێڵاوی بێ قەیتان بوو. دەستیان لە پشتەوە بەستبووەوە و هەندێ لە پەتەکە لە ئانیشکی دیار بوو. گوللەیەکی ستوونی پێ کەوتبوو، دەم و چاوی نەدەناسرایەوە، ئاوسابوو و بەگوللە دابێژرابوو و خەڵتانی خوێن ببوو. لووتی خوار دیار بوو و گۆناکانی لووس ببوون. وێنەکەیان گەورەتر چاپ کرد، لاجانگەکانیش لاجانگی (ئەکزورا) بوون. قژەکەی قژی (ئەکزورا) بوو، هەنیەش هەر هەنیەی (ئەکزورا) بوو. گوللەیەکیشیان لە پاتکی دابوو، بۆیە دەم و چاوی بۆ پێشەوە چوو بوو. کوشتنێکی لەوپەڕی هێمنی و دڵڕەقی. نەك هەر تەنیا دەستیان لە پشتەوە بەستبووەوە بەڵکو گوللەی رزگاریشیان لە پشتە ملی دابوو.

تەرمی ڤێتنامییەکەی لە بەرامبەری کەوتبوو، دەستی وەکوو خاچ کەوتبووە سەر سینگی و دیمەنێکی وای هەبوو کە دەتدی لەجێی خۆت وشك دەبووی: پانتۆڵی خۆی پیس کردبوو، دەتگوت لە ترسان ئاگای لەخۆی بڕاوە.

وێنەکەیان بردە (جوسپائو) و پێشانی هەموانیان دا، هەموو سەلماندیان کە ئەمە تەرمی (ئەزکورا) یە. ئینجا بە دوای وێنەگرە ژاپۆنییەکەدا گەڕان بۆئەوەی پرسیاری لێ بکەن ئەم وێنەیەی لە (چولون)، لە چ شوێنێ گرتووە. بەڵام وێنەگرەکە چۆتەوە تۆکیۆ و تا چەند رۆژی تر دەستیان پێ ناگا. دۆزینەوەی تەرم بەهۆی وێنەکەیەوە کارێکی ئەستەمە: تەنیا یەك شۆستە و شووشە بەندی دوکانێك دیارە. تەنانەت (فرانسوا) چووە (چولون) بۆئەوەی شوێنەکە بدۆزێتەوە، بەڵام هیچی بە هیچ نەکرد.

(چولون) ئەوەندە گەورەیە، ئەوەندەی کۆڵان و شەقام تێدایە، وەکوو ئەوە وایە لەناو دەریادا بە دوای ئەنگوستیلەیەك دا بگەڕێین.

کەس قسەی نەدەکرد، کەسیش یارمەتی نەدەدا، هەموو بە ناحەزی تەماشایان دەکرد، تەنانەت ئەگەر بیشیگوتبا:

– من زۆر ترسام.

– فرانسوا تازە نایدۆزینەوە، وانییە؟

– وابزانم تازە نایدۆزینەوە، بێ شك لەگەڵ تەرمی تر لەناو قۆرتێك ناشتوویانە.

– فرانسوا، دەزانی ژنەکەی دووگیانە؟

– دەزانم. ئای لەم چینییە گەمژەلانە!

زۆر زەحمەتە زۆر!! لەوەش زەحمەتتر ئەوەیە بڕوا بکەین کە ئەمە ئیشی ڤیت کۆنگەکانە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوان، وەکوو ئێمە بۆی دەچین، قارەمانی دادپەروەری و ئازادی نین، دەردەسەرییە، دەردەسەری!! لەوەش دەردەسەریتر ئەوەیە کە بزانین ئەوان لەوانی دیکە باشتر نین. ئەوانیش وەکوو ئەوانی دیکە لە ئاژەڵ زیاتر نین. (لون) یش سەرەڕای هەموو کارەکانی، لەوانی دیکە تاوانبارتر نییە. لەوکاتەوە کە دیم (ئەزکورا) شیان بەدەستی بەستە کوشتووە، وەکوو ئەو ڤیت کۆنگەی کە بە دەستی (لون) کوژرا، زیاتر بڕوام بەم قسانەم پتەو بووە.

لەوانەیە شتێکی کەم و کرێت بێ ئەگەر چاو لەم نالەبارییە بپۆشین! بە هەر حاڵ پێنج کەسیان لە ئێمە کوشتووە، بەڵام هیچ چارەمان نییەو ناچارین چاوی لێ بپۆشین. ئەم ڤیت کۆنگانە تا ئێستا چند تاوانیان کردووە کە هیچ وێنەگرێ وێنەی نەگرتوون؟ وێنەگر بۆ ئیعدامی ئەو ڤیت کۆنگ و سەربڕینی ئەم ڤیت کۆنگ هەمیشە هەبووە و وێنەکەشی گرتووە.

کەچی هیچ وێنەگرێك لە ئیعدام کردنی ئەمریکییەك یان سەربڕینی ڤێتنامی باشوورییەك ئامادە نەبووە. خەریکە لە کردەوەکانی (لون) دەبەخشم.

– فرانسوا، ئایا تۆش بڕوات وایە کە دەبێ (لون) ببەخشین؟

(فرانسوا) برۆیەکی هەڵتەکاند و چەند لەحزەیەك قسەی نەکرد، پاشان سەری هەڵبڕی و گوتی:

– وشەی (بەخشین)، تایبەتە بە فەرهەنگی کاتۆلیکەکان. من زۆر دەمێکە ئیتر ئیشم بە کاتۆلیکەکان نەماوە، هەر چۆنێ بێ من وشەی (حوکم) پەسندتر دەکەم. هەر حوکمێك دەبێ بەڵگەی خۆی لەگەڵدا بێ. چونکە هەمیشە، هەموو کارێك بەڵگەو بیانووی خۆی هەیەو بە زۆریش بەڵگەو بیانووەکان باش و بەجێن.

ڕۆژێ، لە نزیك (سیئول) دەستە زیندانییەکی کووریای باکووریم دی: بریندارو جل شڕ. دەستەیەکی ئەمریکی، یان وردتر بڵێین دەستەیەکی پۆرتۆریکۆیی





دەیانبردن. لەپڕ پۆرتۆریکۆییەك خۆی بەسەر یەکێ لە زیندانییەکان داداو هەر لەو گۆڕە بەبێ هیچ هۆیەك سەرەنێزەکەی لە لەشی زیندانییەکە راکرد وەختە بڵێم کردی بە دوولەت. هەموو رایان کرد بۆئەوەی دەستی بگرن و لێ نەگەڕێن بیکوژێ، ئەویش سەرەنێزە خوێناوییەکەی بڵند کردو بە تووڕەیی هاواری کرد: " ئەمە برادەری منی کوشتووە! "

هەندێ جاری وا هەیە تەنانەت کەم و پەستترین کوشتنیش قابیلی دەرك کردنە.

– تۆ باسی (لون) دەکەی یان ڤیت کۆنگەکان؟

وەڵامی نەدایەوە و بەردەوام بوو:

– هەندێ جار ناتوانین لەیەك زللەش ببوورین. ڕۆژێ، لەگەڵ لیوایەکی ئینگلیزی لە باکووری (سیئول) بووم، ئەو کاتە کاپتنێکی زۆر قۆز و پۆشتەو ریش تاشراوی لێ بوو، فرەنسییەکی باش قسەی دەکرد. بۆی باس کردم کە لە جەنگی دووەمی جیهانی، باشترین سەر دەستەی لیواکەی، ئەرکی کوشتنی زیندانییە ئەڵمانییەکانی پێ درابوو. پاشان، مەسەلەیەکی ویژدانی هاتە پێش. ڕووداوەکە بەم جۆرە بوو:

زیندانییەکان دوو کەسیان تێدابوو، مام و برازا بوون: یەکەم جار کامەیان بکوژن بۆ ئەوەی تەمێ کردن و چاو شکاندنەکە سەختتر و قووڵتر بێ. بڕیاری دا، یەکەم جار برازاکە بکوژێ. کاتێ کە ئەم چیرۆکەی بۆ من دەگێڕایەوە، کابرایەکی کووریای باشوورییان بە بەرگی کووریای باکوورییەوە هێنایە لا: ئەمە یەکێ بوو لەو کەسانەی ئەمریکییەکان لە نزیك سنوور بە چەتری رزگاری دایان دەبەزێننە سەر زەوی بۆ ئەوەی سیخوڕی و قسە چنی بکەن.

کە گرتبوویان تازە ئەرکی خۆی جێ بە جێ کردبوو. ناوو پلەی خۆی بە ئینگلیزی گوت و ئینجا هەندێ کاغەزی لەناو پێڵاوی دەرهێناو بە ڕێزو حورمەتەوە دایە کاپتن.

کاپتن بێ ئەوی کاغەزەکە بخوێنێتەوە، دڕاندی و فڕێی دا. ئینجا کەوتە سەر کابرای کووری و تا توانی لێی دا. بە مست و پێ لەقە کەوتە گیانی.

ئەم جەنابە شارستانەی شاری لەندەن، ئەم جەنتلمەنە کە بێ شك شەکسپیری

لەبەرە، ئەم خوێرییە بێ سەرو پێیە کە بێ شك لای وایە دەتوانێ خەڵك فێری دیموکراتی بکا!!!

– تۆ باسی (لون) دەکەی، یان ڤیت کۆنگەکان؟

– هەندێ جار وا رێك دەکەوێ نازانی چۆن حوکم بدەی، چونکە نازانی ئاخۆ بەڵگە هەیە یان نا. وەکوو ئەو رۆژەی لەگەڵ لیوایەکی فرەنسی، لە کووریا چوومە سەر تەپۆلکەی (١٠٢١). بە جەنگەڵێك دا تێپەڕین، لەوێ کووریای باکوورییەکانمان  زۆر بە روونی دیار بوو. ئەفسەرێکمان بینی بە توندی فەرمانی پێ دەدان. ئەفسەرەکە زۆر بێ ئۆقرە بوو، ئاگای لەخۆی نەمابوو، لە پڕ تفەنگی لە دەست یەکێ لە سەربازەکانی خۆی راپسکاند و تەقەی لێوە هێنا سەربازەکەی بەردایەوە و کوشتی.

من ئێستا ئەم پرسیارە لە خۆم دەکەم: ئەوە بۆچی تەقەی لە سەربازی خۆی کرد؟ هەڵبەت گەیشتبووە ئەو پەڕی تووڕەیی ... (لون) یش ئەو رۆژە بێزار و شەکەت بوو. چەندین رۆژ و چەندین رۆژ بوو یەك لەحزە نەخەوتبوو، قەرەوێڵەی جێبێکی پڕ پاتری و قوتووی بوو، بە چاوی خۆی مەرگی سەربازەکانی خۆی دیبوو، لەوانەیە ئەوەشی دیبێ یەکێکیان بە دەستی بەستە کوشتبێ. نازانم. هەرگیز نەمزانیوە و نەمانتوانیوە تێ بگەین، ئاخۆ لەکام قۆناغ، سیفەتی ئاژەڵی کۆتایی دێ و بەشەر پەیدا دەبێ. یان بە پێچەوانەوە. دوای ئەوەی (لۆن) بریندار بوو، من چوومە (بین هوئا). شەڕ تەواو ببوو، سێ ڤیت کۆنگ لە گیانەڵادا بوون، لەباتی ئەوەی، وەکوو هەمیشە، گوللەی رزگارییان لە کەللە بدەن، پیاوەکانی (لۆن)، تەرمەکانیان لە تەنیشت یەك درێژ کردبوو، چاکەتەکانیان وەکوو سەرین لە ژێر سەر دانابوون. باران بە نەرمی دەباری و لەگەڵ خوێنی یەکێ لە بریندارەکان تێکەڵ دەبوو. ڤیت کۆنگەکە لەگەڵ ئاوی باران خشی و کەوتە ناو گۆمێك. ئینجا بەرازێك هات و دەستی بە خواردنەوەی ئاوی گۆمەکە کرد کە تێکەڵ بە خوێن ببوو. من دارێکی قایمم لە بەرازەکە دا. بەرازەکە رۆیشت بەڵام دووبارە هاتەوە، ئەوسا پیاوەکانی (لون) هاتنە یارمەتیم و بە پێلەقە فڕێیان دایە کەنارەکەی تر.

<u>تێبینی</u>





ئارەزووم لە هیچ ئیشێك نییە. دوو سەعاتم لە کاتی خۆم، لە دوکانێکی بچووکی شەقامی (گیا لونگ)، بە شووشتنی قژم بەسەر برد. قژ بڕەکە ژنێکی ڤێتنامی زۆر میهرەبان و بە ئەدەب بوو، ژنێکی وردە بورجوازی (سایگون) بوو. بۆی باس کردم کە زۆر باش (کائوکی) و (لون) دەناسێ. گوتی: لەو کاتەوە کە سەرهەنگ بوون دەیاننناسم. پاشان گوتی: هەرگیز هەوەسم بە (کا ئوکی) نەهاتووە، چونکە لووتبەرز و دەعیە گەورەیە، بەڵام لە بارەی کارەکانی (کا ئوکی) بڕوای وابوو کە کارەکانی ئەوەندە بەرزن بڕوا ناکرێن و لە وەسف نایەن. بە پێچەوانەوە زۆری کەیف بە (لون) دەهات و دەیگوت: (لون) پیاوێکی زۆر لەسەرەخۆ و زۆر ئازایە.

<u>(١١) ی مایس</u>

فڕۆکە (رەنجەر) ەکانی ڤێتنامی باشووری دوو (دەنگی با) یان لە فڕۆکەخانە راو کردبوو: ئەمانە ماوەی چوار رۆژ بوو بریندار ببوون و بەبێ خواردن و خواردنەوە  دەژیان و لەشیان پڕ ساچمەی بۆمبا بوو. هاوڕێکانیان لە شەڕێکی سووك، بێ ئەوەی گوللەی رزگارییان لێ بدەن، جێیان هێشتبوون چونکە خۆیان مراندبوو. یاسای ڤیت کۆنگەکان وایە هەرگیز بریندارەکانیان بە برینداری جێ ناهێڵن، هەمیشە گوللەیەکی رزگاریان لە لاجانگ یان لە دڵ دەدەن و دەیانکوژن.

دوو دارەبازەیان لەسەر زەوی دانابوو، دەق لەو گۆڕاییەی کە جاران مەیدانی رایسز بوو و ئێستا کراوە بە بنکەی فریاگوزاری. لەو جزوودانەی لە مەچەکیانەوە بەسرابوو، زانییان یەکێکیان ڤێتنامی باکوورییە، ئەفسەرێکی سوپای (هانۆی)یەو ناوی (نگوین وان جیان)ەو ئەوەی دیکە ڤێتنامی باشوورییەو سەر بە لیوای دووەمی سوپای نۆیەمی ڤیت کۆنگە و ناوی (تان وای تی) یە.

ئەفسەر (وان جیان) ناژی چونکە برینێکی قووڵی لە ورگی دایە. ورگی ئاوساوە و رانی لە دوو جێگا شکاوە. هەوڵیان دا بە عەمەلیات کردنی دەمارەکانی نەجاتی بدەن بەڵام بەم ئیشە، تەنیا توانیان چەند سەعاتێك مەرگی دوابخەن. کەچی (تان وان تی) نەجاتی بوو، ئەگەر خورتیان لێ بکردایە، دەیتوانی قسەش بکا. پاشان زانیارییەکی گرنگی دانێ: دوو لیوای ڤێتنامی باکووری بە تەمان لەلای (گوواپ)ەوە بێنە ناو شارو پەلاماری فڕۆکەخانەی (تان سون نوت) بدەن.

لیواکەی ئەم  لە دەلتای (مکۆنگ)، لە (لونگ ئان) بوو و چەکیان، چەکی چینی (آ. ك– ٤٧) و رۆکێت و بازوکە بوو. بەسەزمان (تای وان تی)! ئەشیعەکەی پڕ دەردو ئازار بوو، بەڵام دەردو ئازاری جەستەیی نا. بەڵکو دەردو ئازاری ئەوەی بۆچی ناچاربووە ئیعتیراف بکا.

لە تەنیشتیا چۆکم داداو ئەویش دەستی دایە مل پێچەکەی و بە هێدی گوتی: " تینوو ... تینوو ... تینوو ... " نەختێ ئاوم بەدەمییەوە کرد، بە چاوێکی پڕ سوپاس تێم راما، ئینجا گوتی: " برسی ... برسی ... برسی ... " ئەوسا دختۆرێکی جل و بەرگ سەربازی و دەم و چاو میهرەبان هات، داوای لێ کرد ئارام بێ و گوتی: خواردنت دەدەینێ.

ئینجا کاسە برنجێك و کەمێ سەوزەیان هێنا. دختۆر نەخۆشەوانەکەی رەوانە کردەوە، ویستی خۆی خواردن بە (تان وان تی) بداو گوتی وا چاکە کەم بخوا. دختۆر هەر جارەی، بە نەرمی و هێمنی، پێنج شەش دەنکە برنجی لەسەر زمانی دادەنا، هەموو جارێکیش دەیگوت:

" هێدی، ئەها!، ئاوها باشە! ... "

– دختۆر، تۆ ناوت چییە؟

– (نگوین نگوك کی)، بۆچی دەپرسی؟

(بۆچی دختۆر؟ ... ئەگەر پێت بڵێم بۆچی، بێ شك بە قسەم باوەڕ ناکەی. لەبەر ئەوەی، کاتێ کە غەمبار دەبم، ساتێ کە ناشکور دەبم، گاوێ کە ئەو شەللاتییانەم دێتەوە بیر کە (ئەزکورا) و ئەوانی دیکەیان کوشت، وەختێ کە ئەوخوێڕیانەم بیردەکەوێتەوە کە یەك گەڕەك لەگەڵ خاك تەخت دەکەن  بۆ ئەوەی یەك ڤیت کۆنگ کەم بێتەوە. شەللاتییەکانی پاریس،  شەللاتییەکانی واشنتۆن، شەللاتییەکانی (هانۆی) کە گوێ بەو کەسانە نادەن کە دەمرن، بەڵێ، کاتێ کە ئەم هەموو شتانەم دێتەوە بیر، بۆ سوکنایی و ئۆخژنی دڵم ئەم ناوە دووبارە دەکەمەوە: ( نگوین نگوك کی ... نگوین نگوك کی ... نگوین نگوك کی ... )

– بۆ رۆژنامەکەم، دختۆر!

– ئوە! توخوا ناوی من لە رۆژنامەکەت مەنووسە، مەگەر من چیم کردووە؟





– هیچ دختۆر، ئایا ماوەیەکی زۆرە لە سوپادای؟

– پێنج ساڵە.

– دختۆر، ئایا تۆ رقت لەم کابرایە نابێتەوە؟

– ئەمەش ڤێتنامییە. برایە. چۆن دەتوانم رقم لێ ببێتەوە. ئێمەی برای یەکترین.

– دختۆر، تۆ مەسیحی!؟

– نا، من هیچ دینم نییە.

پێش سەعاتێك هیلیکۆپتەرەکانی ئەمریکا دوو رۆکێتیان بەسەر پەرستگایەکی پەناهەندەدا بەردایەوە. دە نەفەر دەم و دەست گیانیان لە دەست دا و پازدە نەفەریش بە سەختی بریندار بوون.

وا دیارە لەم چەند رۆژانەی دوایی، چوار سەد کەس کوژراون و دوو هەزاریش بریندار بوونە.

ژمارەی ئەو کەسانەی بێ خان و ئەنوا ماونەتەوە دەگاتە بیست و نۆ هەزار کەس. ئەوانەیان لە قوتابخانەکان داناوە و قەشەی بەرگ سپی فێریان دەکەن لە دەرگای خودا بپاڕێنەوە و دوعا بکەن و سوپاسی بکەن. بەڵام ئاخر بەرامبەر بە چی؟

<u>دوای نیوەڕۆ</u>

ئەمڕۆ بەیانی کۆنفرانسی ئاشتی پاریس دەستی پێ کردو شەڕ هێشتا لە (چولون) و (گو واپ) و (خان هوی) و (بین هوئا) وپردی (ئیگریك) و گۆڕستانی فرەنسییان بەردەوامە کە ئەوە بوو پەیامنێرێکی تریان لەوێ کوشت.

ئەمڕۆ بەیانی شوێنی دابەزینی نوێنەرەکان لە پاریس دیاری کرا. نوێنەرانی ئەمریکا لە ئوتێلی (کریون) دابەزیون و نوێنەرانی ڤێتنامی باکوور لە ئوتێلی (لوتسیا) کە پلەیەك نزمترە: پاشان ڤێتنامییە باکورییەکان لە ئوتێلی (لوتسیا) رۆیشتن و گواستیانەوە ڤیلایەك.

ژمارەی خانووی وێران بووی (سایگون) دەگاتە حەڤدە هەزار و سەدو پەنجا خانوو. ئەمڕۆ بەیانی، هەموو رۆژنامەکان بەم ناونیشانە گەورەیە بڵاوبوونەوە: " ئاشتییە! "

لە (سایگون)، یاریدەدەری سەرۆکی کۆمار (کا ئوکی)، دە هەزار قوتابی چەکدار کردووە بۆ ئەوەی بەرگری لەشار بکەن. ئەوانەی لە باخی شار کۆکردەوە و پێی ڕاگەیاندن کە جەنگ هەر وەکوو خۆی بەردەوامە، تەنانەت ئەگەر بێگانەکانیش (واتە ئەمریکییەکان) نەیانەوێ بەردەوامی پێ بدەن.

من و (فلیکس) چووین گوێمان دایە قسەکانی.

(کا ئوکی) جڵەوی لە دەست بەربوو، هەر هاواری دەکرد: " ئەگەر ئەم بێگانانە نەیانەوێ لە ڤێتنام بڕۆن، من بەم جۆرە وەڵامیان دەدەمەوە: هەر ئەمڕۆ لێرە بارکەن بڕۆن. ئێمە لێرە پێشوازیمان لێ نەکردوون بۆ ئەوەی بە کۆمۆنیستەکانمان بفرۆشن. دەبێ ئاوها وەڵامی ئەم نیوکولونیالیستانە بدەینەوە کە بەرامبەر بەو پارمەتییە کەمەی بە ئێمەیان داوە، ڕوخسەت بە خۆیان دەدەن تف لە مێژووی چوار ساڵەی ئێمە بکەن و بڕیار لە بارەی چارەنووسی ئێمە بدەن. ئێمە هەرگیز دەوڵەتێکی بە دڵی ئەوانمان ناوێ و ئێمە هەرگیز پەیمان لەگەڵ دوژمن نابەستین."

(کا ئوکی) هەر ئەو (کا ئوکی) یەی هەمیشە، مەغروورو نائومێد و جودا لەوانی دیکەیە، ئەوەی کە لە جەنگ قاڵ بووە و بڕوای وایە: ئەگەر بمرین بە جەهەننەم!!

ئەمڕۆ بەیانی کەیفم بە (کا ئوکی) نەهات. ئەمڕۆ بەیانی کەیفم بە هیچ کەس نەهات.

سەفیری ئەمریکاش داوەت کرابوو بۆ ئەوێ، بێ خواحافیزی و بێ ئەوەی دەستی (کا ئوکی) بگوشێ ڕۆیشت و یەکسەر ڕاپۆرتێکی گەرم و گوڕی بۆ (جونسون) نارد. ئەوانە لەنێو خۆشیان دووبەرەکییان هەیە: شتێکی بێزەوەرە!! بەڵام کەس نازانێ داخۆ ئەم جۆرە ڕووداوو شەڕە ناوخۆییە، لە نێوان بەرەی ئازادی میللی و (هانۆی) یش دەقەومێ، یان نا؟ لەوانەیە ئەم جۆرە ڕووداوە لە بەینی ئەوانیش بقەومێ. ئەوەش هەر بێزەوەرە.

هەندێ جار بیردەکەمەوە چارەنووسی بەشەر بە دەست پیاوی نائاسایی و بێ ڕەحمەوەیە، ئینجا هەست دەکەم چارەنووسی بەشەر لە دەست بەدبەختی گەلۆردایە، هەر چەندە قژ بڕەکەی من هەوەسی بە ناوبانگی ئەوانە دێ و وەکوو





دوکاندار باسیان دەکا.

– لەگەڵ هەموو ئەمانەشا، ئەوان باسی میسالیات دەکەن، وانییە (فلیکس)؟

– ئایا پێویستی دەکرد بۆ تێگەیشتنی ئەوەی کە میسالیات جۆرە فێڵ و خەیاڵبازییەکە بۆ ئەو کەسانەی بە دوای دەسەڵاتی زیاتردا دەگەڕێن، بێیتە ڤێتنام؟ تۆ دەبێ ئەمە لە مێشکی خۆت بئاخنی کە ئەم جەنگە وەکوو جەنگەکانی تر تەنیا یارییەکی سیاسی پیسەو هیچی تر. لە باکوور هەروەکوو باشوور و لە ڕۆژهەڵات هەر وەکوو ڕۆژاوا ئەمریکییەکان و ڤێتنامییە باشوورییەکان لەگەڵ یەك تەبا و یەکگرتوون، هەست بە هیچ گرفت و ناڕەحەتییەك ناکەن. هەروەها ڤێتنامی باکووری و ڤیت کۆنگەکانیش تەبا و یەکگرتوون و هەست بە هیچ گرفت و ناڕەحەتییەك ناکەن.

زۆر حەز دەکەم لە باس و گفتوگۆی نێوان ئەندامی بەرەی ئازادی میللی و لێپرسراوانی هانوی ئامادەبم.

– فلیکس– ئەوانە ڕقیان لەیەك نابێتەوە.

– ڕاستە، بەڵام هەوەسیشیان بە یەکتر نایە. بەرەی ئازادی میللی گومانی لە دەسەڵاتی (هانوی) هەیە و (هانوی) ش ئەوانی قبووڵ نییە. ئەندامە گرنگەکانی سووپاکەیان زۆربەی ڤێتنامی باکوورین نەك ڤیت کۆنگ. ڤێتنامییە باکوورییەکان متمانەیان بە ڤیت کۆنگەکان نییە تا بیانهێننە ناو سوپا، تەنیا بۆ یەك شت سوودیان لێ وەردەگرن، ئەویش خۆبەخت کردنە. بگرە بە سیاسیش قبووڵیان ناکەن، هەوەسیان بە ئاشتییەکی دەم و دەستیش نایە: دەزانی، بۆ سەلماندنی ئەم قسانەم بەڵگەم بە دەستەوەیە. ئەو بەڵگەیەت دەدەمێ بیخوێنیتەوە، هێزی هەوایی لە (١٧) ی نیسان دۆزیویەتەوە.

نامەیەکی سیاسی سوپای ڤێتنامی باکووری:

کاغەزەکەی دامێ. کاتێ کە خەریك بووم دەمنووسییەوە، دختۆر (نگوین نگوك کی)م بیرکەوتەوە کە شەش دنکە برنجی دەرخواردی ڤیت کۆنگێك دەدا و بەردەوام دەیگوت: " هێدی، ئەها! ئاوها باشە ... "

[ ناوچەی گشتی سوپای سێیەم، یەکەی (٤٩١)، بەهۆی یەکەی (٤٩١) یشەوە

به یەکەکانی تر بگات. رۆژی (٤)ی نیسانی ١٩٦٨.

سەرنج: دوێنێ لێپرسراوی دەوڵەتی ئێمە، دەقی ئەو راگەیاندنەی بۆ ئاشکرا کردین کە دەوڵەتی ئەمریکا بڵاوی کردۆتەوە. راگەیاندنەکە باسی ئەوە دەکا کە دەوڵەتی ئەمریکا بۆمبا بارانی ڤێتنامی باکووری کەم کردۆتەوە. بێ گومان مەبەست لە راگەیاندنی ئەم خەبەرە ئەوەیە کە ورەی ئەندامانی یەکەکانی سوپای ئێمە بروخێنن و هوشیارییان لەناو ببەن و ویست و ئیرادەیان کەم بکەنەوە. جا لەبەر ئەوە دەستەکانی ئێمە دەبێ لە باری تەیاردا بن و بزانن کە ئەم خەبەرە تەنیا مەشقێکە لەلایەن دەوڵەتی ئەمریکاوە بۆئەوەی رای خەڵك بۆخۆیان رابکێشن وئێمە دەبێ وریا بین نەکەوینە ناو ئەم داوەوە. ئێمە بە توندی لە جەنگ بەردەوام دەبین و پێویستە هەموو یەکەکانمان بە تەواوی ئاگاداری ئەم شتانەی خوارەوە بن:

یەکەم: گفتوگۆی سیاسی شان بە شانی خەبات و شەڕکردن دەبێ.

دووەم: رازی بوون بە پێشنیاری گفتوگۆ کردن لەگەڵ ئەمریکییەکان، ئامانج و بڕوامان بە سەرکەوتنێکی تەواو، لەق ناکات.

سێیەم: ئەمڕۆ، پێویستە لە هەموو کاتێ زیاتر، تێ بکۆشین و تا هێز و دەسەڵاتمان هەیە سوپای ئەمریکییەکان و سوپا کارتۆنییەکان لەناو ببەین، هێرش بکەینە سەر بنکەو بارەگاکانیان و دزە بکەینە ناو ئەو شارانەی لەژێر دەسەڵاتی ئەوان دان.

ئێمە ناتوانین دڵ بە خەون و خەیاڵی ئاشتی خۆش بکەین، ئێمە ناتوانین پشوو بە تفەنگەکانمان بدەین. بە پێچەوانەوە پێویستە ئەوپەڕی سوود لە ئاژاوەی ناو دەستەکانی دوژمن وەربگرین و پێویستە سوود لە بایی بوونیان بە داگیرکردنی شوێنە داگیر کراوەکان، وەربگرین. پێویستە هەوڵ بدەین چەك ببەینە ناو شارەکان. دووبارەی دەکەمەوە: دەستەکانی ئێمە دەبێ بە تەواوی ئاگاداری ئەم مەسەلەیە بن و بەتایبەتیش نابێ دڵ بە خەیاڵی ئاشتی خۆش بکەن. دەبێ رابەرانی سیاسی و لێپرسراوانی سوپا ئەم دەستوورانەیان پێ رابگەیەنن، پێویستە دەستەکانیش لەلای خۆیانەوە خەڵك هوشیار و ئاگادار بکەنەوە،





پێویستە ئەم خەبەرە یەکسەر بخرێتە بەردەستی لیژنەکان. "

ئای، (سایگون) چەند ناشیرینە!

(١٢) ی مایس

هەموو ئازایەتی خۆم کۆکردەوە و لەگەڵ دەرك چووم بۆ (چولون). پسمامەکەیشی لەگەڵمان هات، لە ترسان شەلاڵی ئارەقە ببوو.

پسمام لەپڕ راوەستا و دەستی بە پاڕانەوە کرد: " نا، نا، دەرك! با بگەڕێینەوە، دەرك! " تازە هەستی کردبوو کە جەنگ تەنیا لەسەر پەردەی سینەما شتێکی خۆش و سەرنجکێشە.

من ئاراقەم نەکردبوو: ببووم بە بەرد.

کاتێ کە لە ترومبێل دابەزیم، پێم گۆد ببوو، ئەویش چ گۆد بوونێك!!... شەقامەکان چۆڵ بوون، رێگاکان چۆڵ بوون، تەنیا، پاسەوانێکی ڤێتنامی باشووری لە گۆشەیەکی شەقام تەقەی هەوایی دەکرد.

ئینجا بەلای ئەو کۆڵانەدا تێپەڕین کە (پیگوت) و (لارامی) و (بریچ) و (کانتول) یان لێ کوشتبوو. لەسەری کۆڵانەکە تەرمی پێنج ڤیت کۆنگ لە تەنیشت یەك کەوتبوون.

یەکێکیان ئەوەندە زل و کەڵەگەت و قەڵەو بوو، باوەڕت نەدەکرد ڤێتنامی بێ، جلی سەردەستەی لەبەر بوو.

دەستەکانی وەکوو خاچ کەوتبوونە سەر سینگی و قاچەکانی لێك ببوونەوە. زەبری بە سەرو ورگ و سینگ کەوتبوو، چاوەکانی وەکوو دوو تۆپ لە قەپێلك دەرهاتبوون و مێش و مەگەس گلێنەی چاویان داپۆشی بوو. دەمی کرابووەوە و مێش لەسەردەمی گزەگزیان بوو، مێشێکی ئەوەندە زۆر چووبوونە ناو دەمی، دەنگی گزەگزیان وەکوو دەنگی هیلیکۆپتەری لێ هاتبوو.

پێنج تەرمەکەی تریش بەرەوشێکی خراپ لە دووری ئەو کەوتبوون، یەکێکیان بەبێ دەم و چاو بوو، لە پارچە گۆشتێکی ئەنجنراوی دەکرد. دەوری سێ رۆژ بوو مردبوون. تەرمەکان بۆن بۆگەنییەکی وا یان لێ دەهات، کەس خۆی پێ لەبەر رانەدەگیرا. (دەرك) گوتی: " ئەمانە بوونە، بێ شك ئەمانە بوونە. هەر ئەو کوچە و

هەر ئەو دەستەو سەردەستەیە، سەردەستەیەکی قەڵەو. " خوایە لێم نەگرێ، هەستم بە هیچ بەزەییەك نەکرد و بە هێمنی وێنەم گرتن، لە کاتێکا کە لە دڵی خۆمدا بیرم دەکردەوە: (با پەلە بکەین نەوەك ئەو بەڵایەی بەسەر (ئەزکورا) هات بەسەر ئێمەش بێ.). پاشان بیرم کردەوە: (ئێوە پیگوت و لارامی و کانتول و بریچتان کوشت، رەنگە ئەزکوراش هەر ئێوە کوشتبتان، ئاخری ئەوا ئەوانیش ئێوەیان کوشت. بۆ ئێوەش هەموو شتێ تەواو!)

<u>شەو</u>

حکوومەتی سەربازی لە سەعات حەفت دەست پێ دەکا بەڵام بۆ ئێمەی پێست سپی، چاو پۆشی هەیە. ئوتێلی (کاراول) بەرامبەر ئوتێلی کونتەنینتالە. دوای شێو خواردن من و ئەوانەی لە ئوتێلی کونتە نینتال بووین چووینە ئوتێلی (کاراول) کە بەرزترین بانێژەی شاری هەیە. ئەوەندە بەرزە، لەو بەرزاییە هەموو شت و هەموو شوێنێ دیارە: باکوور، باشوور، رۆژهەڵات، رۆژاوا.

کورسی و مێزی بچووکیان لەسەر بانێژەکە ریز کردووەو پێش خزمەتی بەرگ سپی ویسکی و دۆندرمە و قاوەت بۆ دێنن دەق وەکوو (رۆما) یان (نیویۆرك): ئەوانەی دێن ئەمریکی و فرەنسی، پەیامنێر و دیپلۆمات و کارمەندن، بەخۆو بە ژنەوە دێنە ئەوێ، بەخۆ و بە ژنی بە بۆن و بەرامە و ئارایشدراو و مینی جوب پۆش:

" خانم، چۆنی؟ "

" ئەم حەفتەیە هەر دەبێ رۆژێ فراوینمان لەلا بخۆی! "

ئینجاپێ دەکەنن و بەزم و ئاهەنگ دەگێڕن، بە جۆرێکی وا ئینسان هەست دەکا لە شانۆ دانیشتوون. بەڵام ئێمە بەراستی لە شانۆ دانیشتووین. شوێنی تەماشا چییان بانێژەی ئوتێلی کاراولە و دیمەنەکە (سایگون)ی لە گیانەڵایە.

با بەشێوەیەکی باشتر پێتان بڵێم. ئێمە لێرە دانیشتووین، ویسکی دەخۆینەوە، دوندرمەی خۆمان دەلێسینەوە، بە جل و بەرگی یەکتر هەڵدەڵێین، کەچی لەو خوارەوە پیاوێك وا لەبەر ئاوزنگاندایە.

" ویسکی بە سۆدا، یان بە سەهۆڵ؟! "





تەماشای ئەو فانتۆمانە دەکەین کە بۆمبای ناپاڵمی هەزار کیلۆیی بەسەر گەڕەکێکدا بەردەدەنەوە. "

دۆندرمەی شوکلات یان دوندرمە ڤانێل؟! "

سەیری ئەو هیلیکۆپتەرانە دەکەین کە ساروخ لە دەستەیەك ڤیت کۆنگ دەگرن، یان سەربازی وردیلەی زەرد دا دەگرنە بەر شەستیر.

" ئۆی خانم جلەکەت چەند جوانە!و لەو خوارەش، ها سەیری ئەو بۆمبایە بکە! وا بەردەبێتەوە! ئاگرەکەت دی؟ ئاگرەکە بەرزتر بووەوەو چڕە دووکەڵ ئاسمانی تاریك کرد. " ئۆی، نایابە! "

دەنگی تەقینەوە لە دوای تەقینەوە دێ، دونیا دەهەژێ.

" ئۆی، شەڕە!". ئایا هەر ئێستا چەند بوونەوەری زیندوو لەبەر ئەم بۆمبایە لە حاڵەتی لەناوچوون یان مردن دان؟ ئایا چەند خانوو بەهۆی ئەم ناپاڵمە ئێستا بەسەر یەکدا دەڕووخێن و دەسوتێن!؟ لە ئاسۆوە، لای راستە گڕی ئاگرەو لای چەپە وێرانەی هاوەنە و ساروخی نوور بەخشی بەسەر شاردا دەپرژێ و هەر دەڵێی ئەستێرەی کلکداری جادوگەرانەیە، لەوانەیە جوانتریش بێ چونکە لە شێوەی ئەڵقە گوڵێکدایە.

" نا، بەلای منەوە زۆر لە مۆمی کێکێکی جەژنی لەدایك بوون دەکا! " دەزانی ئێمە وەکوو ئەو رۆماییانەین کە بۆ تەماشای مردنی شمشێربازەکان دەچوونە (کولیزە)، دەزانی، ئێمە وەکوو (نیرۆن)ین کە کاتێ خانووی هەژاران دەسووتا، ئەو خەریکی چەنگ لێدان بوو. بەهەر حاڵ، هەمیشە هەر هەژارەکان دەبنە قوربانی. جەنگ هەژارەکانی پەرگەی شار لەناو دەبا، نەك بورژوازییەکانی ناو شار. لە رۆماو پاریس و (کولیزە)، یان لە بانێژەی ئوتێلی کاراول، هەمیشە شێربازەکانن کە دەمرن، نەك دەوڵەمەندەکان. مەسیح هاتۆتەوە سەر زەمین بۆئەوەی فێری عیشقمان بکا. ئێمە هەموو بەیانییەکی رۆژی یەك شەممە دەچینە کەنیسەو بە دە جار دەربڕینی وشەی باوك و دەجار دەربڕینی وشەی حەزرەتی مریەمی پیرۆز و دەجار گوتنی ئامین، عیشق بۆ خۆمان دەکڕین. جا بۆچی نا؟ ئەمەدەقی دوعایەکە بۆ مردوان :

" ئەی باوکی ئاسمانان، ئەمڕۆ قەتڵ و عامی هەمیشەییان لێ درێغ مەکە، لە بەزەیی و عیشق و متمانە بە بەشەریەت و ئەو زانیارییانەی مەسیحی کورت پێی داوین، بەتاڵمان کە، چونکە هەر  وەکوو چۆن هەرگیز قسەکانی ئەو بە کەڵك هیچ نەهاتوون، ئێستاش دەوای هیچ دەردێك ناکەن، هیچ دەردێك."

ئەمشەو تەمسیلییەکە لە هەموو شەوانی دیکە خۆشتر بوو، چونکە ژمارەی تەماشاچییەکان لە هەمووشەوانی دیکە زیاتر بوو، خوێن لەسەر دەپی شانۆ زیاتر رژابوو و بڵێسەی ئاگر زیاتر بەرز ببووەوە. بڵێسەی ئاگر لەلای باکووری رۆژهەڵات لە هەموو لایەك زیاتر بوو، خانمەکان بە دەنگی ناسك هاواریان دەکرد دەیانگوت: " خودایە، ئەمشەو چ تەمسیل و شانۆگەرییەکمان  لەبەردەمە! ئۆی، باوەڕ ناکرێ، وای نایابە نایاب! "

من لە تەنیشت (فرانسوا) دانیشتبووم کە خەریك بوو ماوەی بۆمبا بارانەکانی بە کاتگرەوەکەی حیساب دەکرد. یەکێ لە رەوشتەکانی (فرانسوا) ئەم حیساب کردنەیە بە کاتگرەوە. کە ترووسکاییەك لە تاریکیی دا دەبینێ دوگمەیەکی کیتگرەوەکەی دادەگرێ کە پڕیەتی لە میل و ژمارە، لەگەڵ بیستنی دەنگی تەقینەوەکە، دووبارە دوگمەکە دادەگرێ. ماوەی نێوان دیتنی ترووسکاییەکە و بیستنی دەنگەکە حیساب دەکاو ئینجا بە حیساب کردنی خێرایی دەنگ، بە مەزەندە دەزانێ بۆمباکە چەند لە دووری ئێمە هاوێژراوە.

باسی کرد کە شێوازێکی تایبەتی هەیە بۆ ئەم حیساب کردنە و ئەگەر نەخشەیەکی جوگرافی هەبێ، زۆر باش دەتوانێ، بەبێ غەڵەت شوێنی بۆمبا بارانەکە دەست نیشان بکا. بە بیری نایە تا ئێستا چەند جار دوگمەکەی داگرتووە، سی جار؟ پەنجا جار؟ سەد جار؟ من تەنیا دەنگی کپ و یەك نەواو هەمیشەیی ئەو و، ئینجا جووڵانەوەی لێوەکانیم لەبیرە، کە زۆر خێرا دەست بە حیساب کردن دەکا.

دەوری نیوە شەو بوو کە گوتی: " بۆمبا لە نزیکەوە دەتەقنەوە، یەك لەدوای یەك دەهاوێژن. خەریکن (خان هوی) لەگەڵ خاك تەخت دەکەن. بەیانی دەچینە دیدەنی ئەوێ، بەڵام دڵنیام لەوێ هیچ شتێ نابینین! چونکە هیچ شتێ نەماوە.





<u>(١٣) ی مایس</u>

لەوێ هیچمان دەست نەکەوت. سەعات حەفت هاتە دوام و بەرەو پردەکە بەڕێ کەوتین. تەنانەت یەك سەرباز چییە پێی نەگوتین وریای ڤیت کۆنگەکان بین. پێست رەشێك خەریك بوو قاوەی لێ دەنا.

دوو نەفەری مووسیس خەریکی ریش تاشین بوون. بە روومەتی بە کەفەوە بە ئێمە پێدەکەنین، تەنانەت گوتیان:

– رۆژێکی خۆشە! رۆژێکی زۆر خۆشە!!

بەڵام ئەو رۆژە رۆژێکی خۆش نەبوو. ئاسمان هەور بوو، بۆ چزیلکەی سووتان دەهات. بەدەم هەڵمژینی ئەم هەوا بۆگەنە، لە ئوتومبێل دابەزین و بەسەر پردەکەدا رۆیشتین. هێشتا نەگەیشتبووینە ناوەڕاستی پردەکە. کە من بێ دەستی خۆم هاوارم لێ هەستا.

(خان هوی) نەمابوو. نە رێگایەك مابوو و نە خانوویەك. جگە لە چەند درەختێك کە ببوون بە خەڵووز و لێرەو لەوێ کەوتبوون، هیچ شتێ نەدەکەوتە بەر چاو. زەوی ببوو بە زەنەك، بۆڕییە ئاوەکان تەقی بوون و ئاو هەموو زەوی داپۆشی بوو.

ژنێك لەناو زەنەکەکە بەربووەوە، دەگریا: دەنگی ناسك بوو، وەکوو دەنگی مریشکێك وابوو کە جووجەڵەکانی بزر کردبێ. بەرازێکی سووتاوی لە تەنیشت بوو. ژنەکە خۆی بەسەر بەرازەکە داداو بەدەم گریانەوە وەرگەڕایە بەرازەکە لێیدا. لەولاتر قۆرتێك تازە هەڵکەنرابوو، کە لە پارچەی سێ ڤیت کۆنگ و ئێسکە رانێکی تێدابوو. ئێسکە رانەکە تەواو لە گۆشت پاك ببووەوە و ئەوەندە سپی و بریقەدار بوو، دەرسی ئێسکناسیی سەردەمی دانیشگای بیر هێنامەوە. لەولاشەوە کچێك لەسەر کەرپووچان کەوتبوو، بەڵام هیچ برینی لەلەشدا نەبوو. جلی سەربازی بەرەی ئازادی میللی لەبەر بوو، بەندی جانتایەکی توند بە دەستەوە گرتبوو. جانتاکەم کردەوە، سێ فیشەکی (آ.ك- ٥٠) و فیشەکێکی رەشاش و قوتووە پۆدرەیەك و لوولە ماتیکێك و شووشە گوڵاوێکی بچووکی تێدابوو، لەو شووشە گوڵاوە بچووکانەی لە سەرتاشخانە بە دیاری پێشکەشی دەکەن. شووشەکە

نەشكابوو، قوتووە پۆدرەكەش نەشكابوو. بەڵام كچەكە خۆی شكابوو،بەڵام نەتدەزانی كوێی لەشی بریندار بووە. لەوانەیە بە (با)ی بۆمبایەك مردبێ. ئینجا چەند تانكێكی لێ بوو لەگەڵ ژمارەیەك سەربازی هێزی دەریایی. ئاڵای ئەمریكا لەسەر یەكێ لە تانكەكان هەڵكرابوو.

لە دوورەوە، ئاڵایەكت لەتەك لاشەی سەگێك دەدی، لەگەڵ پێڵاوی منداڵێك و دیوارێكی رووخاو كە تاكە پاشماوەی قوتابخانەی (خان هوی) بوو. پاشان ژمارەیەكی زۆر قۆرتت دەدی، هەریەكە (٨) مەتر بەرین دەبوو. كپ و بێدەنگییەكی بەستەڵەك و كش و ماتییەكی رەها! تەنانەت (با)یشی نەدەهات بۆئەوەی ئەم (نەبوونە) لە خۆی ببا. تێگەیشتی؟ تەرمی دوو پۆلیسی دەست بە دەستە لە تەنیشت یەكێ لەو قۆرتانە كەوتبوو، ڤیت كۆنگەكان گوللەبارانیان كردبوون. ئاشكرایە ئەمانە حیسابیان لەگەڵ یەكتر یەكلاكردبووەوە. لە ژمارەكانەوە دەردەكەوێ كە كوژراوەكان زیاتر لە هەژارەكانی (خان هوی)ن. ئەمانە حەفت رۆژ لە ژێر ئازارو ئەشكەنجەی ڤیت كۆنگەكان دابوون، رۆژی هەشتەم ئەمریكییەكان هاتن و بە بڵندگۆ فەرمان پێ كردن: " چۆڵ كەن، چۆڵ كەن! " و هەموو ناچار بوون بە ریز بوەستن و رێگای پردەكە بگرنە بەر بێ ئەوەی تەنانەت یەك لێفە یان یەك مریشك لەگەڵ خۆیان ببەن ... پیرەمێردێكم بینی نزیك دەكەوتەوە. ئازیزێكی لێ بزرببوو، لەو دەورووبەرە لێی دەگەڕا. دەستی بە سەرییەوە گرت و ماوەیەك بەم جۆرە مایەوە. سەربازێك بنێشتێكی پێشكەش كرد و گوتی:

— فەرموو، بابە گەورە!

پیرەمێردەكە دەستی لەسەر سەری لابرد و بنێشتەكەی وەرگرت و زەردەخەنەیەكی بۆ سەربازەكە كرد. ئایا ئەم پیرەمێردە هەرگیز تووڕە نەبووە؟ هەرگیز هەڵنەچووە؟ ئایا رقی لەوانە نابێتەوە؟ نا.

ئەوان خوویان بە كاول بوونی ماڵ و كوژرانی كوڕەكانیان گرتووە. رق، لای بێچارەكان، هەستێكە پێویستی بە دەسەڵاتێكی زۆر هەیە. ئەگەر ئەمریكییەك بنێشتێكی پێشكەش بكا، ئەو زەردەخەنەی بۆ دەكاو بنێشتەكە دەخاتە زاری.





پیرەمێردەكە كاغەزی لە دەوری بنێشتەكە كردەوە و بنێشتەكەی خستە زاری.

سەربازەكە پرسی:

— بابە گەورە، حەزت لە بنێشتە؟

— بەڵێ، سوپاست دەكەم.

دوای پیرەمێردەكە، گۆڕ هەڵكەن هاتن: بە رووبەند و دەستكێشی پلاستیكی، لە لۆری دابەزین. ئەو كچەی جلی سەربازی لەبەر بوو هەڵیان گرت و فڕێیان دایە ناو لۆری. ئینجا ئێسكە سپییەكەیان هەڵگرت و لەناو لۆرییەكە فڕێیان دایە سەر كچەكە. پاشان چەند كەلە پارچەیەكی ڤیت كۆنگەكانیان كۆكردەوە سەر یەك، بەڵام لەبەر ئەوەی پارچەكان زۆر بچووك بوون، فڕێیان دایەوە سەر زەوی. دەستیان دایە بێڵ و قۆرتەكەیان پڕكردەوە و بە لۆری بەسەریدا رۆیشتن بۆئەوەی تەخت ببێ.

(فرانسوا)، بۆ ئەوەی سەرنجم لەسەر لۆرییەكە لاببا، گوتی:

— سەیركە، ئەم ئاوە چەند جوانە!

بۆڕییەكی شكاو ئاوی لێ دەهات و ئاوەكە دەڕژایە سەر پارچە ئاسنێك. هەور بەری رۆژی بەرداو تیشكی رۆژ بە ئاوەكە كەوت كە وەكوو هەزاران دانە ئەڵماس دەدرەوشایەوە. ئەڵماسەكان دنك دنك بە پارچە ئاسنەكە دەكەوتن و كە پێی دەكەوتن دەنگێكی خۆشیان لێ دەهات.

دووبارەی كردەوە:

— سەیركە، ئەم ئاوە چەند جوانە! لێرە تەنیا ئەم شتە هەیە كە خوڕو پاك و روون و بێگەرد بێ. بە هەر حاڵ، هەر كاتێ بە وردی چاوبگێڕی، شتێكی پاك و روون دەدۆزیتەوە.

من لە وەڵامدا نەمگوت ئاخر ئەم ئاوە ژەهراوییە ناخورێتەوە.

خەریك بووین دەگەڕاینەوە، یەكێ لەو چیرۆكانەی بۆ گێڕامەوە كە هەرگیز بەبێ مەبەست باسی ناكا، پێی گوتم:

— ئەم جارە چیرۆكەكە لە باشووری (سیئول) رووی دا. لە گەڵییەك كە پێیان دەگوت: گەڵی قەتڵ و عام، یان رەنگە پاشان ئەم ناوەیان لێ نابێ. هەر چۆنێك بێ،

بۆیە ناوی گەڵی قەتڵ و عامە چونکە سەد سەربازی هێزی دەریایی لەوێ کەوتنە ناو داوی کوورییەکان.

ئەم رووداوە لەو رۆژگارەبوو کە ئەمریکییەکان هێشتا (سیئول) یان داگیر نەکردبوو و فرەنسییەکان بە تانك دەچوونبیگرن. بیست رۆژ بوو سەربازەکان کوژرابوون، دونیا ساردبوو، تەرمەکان لەبەر سەرما بەستبوویان و ببوون بە پەیکەری شەختە. پەیکەرە شەختەکان رێگایان گرتبوو. دەستەکەی ئێمە ناچاربوون راوەستان بۆ ئەوەی بەسەر تەرمەکان نەکەون. چەند سەربازێك دابەزین و دەستیان پێ کرد تەرمەکانیان راکێشا بۆ قەراخی رێگا.

دوژمن دەستی بە تەقە کرد. فەرماندە دەستووری دا واز لە تەرمەکان بێنن و بگەڕێنەوە لای تانکەکان و بە ناچاری بەسەر تەرمەکان دا بڕۆن، یان باشتر بڵێین بەسەر برادەرەکانی خۆیاندا بڕۆن. لەبەر دەنگی گرەگرِی تانکەکان گوێمان لە هیچ دەنگی تر نەدەبوو. تانکەکان یەك لە دوای یەك بەسەر تەرمەکان دا تێپەڕین: بیست تانك بوون. کاتێ کە ئاخر تانك بە سەریاندا رۆیشت، ئیتر هیچ تەرم لەسەر رێگا نەمابوو، تەنیا فەرشێکی گەنم رەنگ و سەوز و بۆرت دەدی تیرەکەی لە دوازدە سانتیمەتر تێنەدەپەڕی.

شەو:

لەناو باخ دیم. تازە گرتبوویان، دەم و چاوی هەمووی برین و سووتان بوو. چاکەتێکی هێزی هەوایی ڤێتنامی لەسەر پانتۆڵ لەبەر کردبوو.

پێش ئەوەی لەگەڵ دوو سەدو دە نەفەری تری هاوکاری، خۆی بە دەستەوە بدا، چاکەتە سەربازییەکەی تووڕ هەڵدابوو. دەم و چاوێکی بچووك و حەپەساو و بێ تاوانی هەبوو.

بە فرەنسی قسەی دەکرد. (فرانسوا)، روخسەتی لە لێپرسراوانی ڤێتنامی وەرگرت و قسەی لەگەڵ کرد.

– ناوت چییە؟ تەمەنت چەند ساڵە؟

– (ژۆزف تان وان تیو). جەناب، تەمەنم بیست و چوار ساڵە، جەناب.

– خەڵکی کوێی؟





– (هانۆی) جەناب. دەستەکەمان لە رۆژی (٦) ی کانوونی یەکەمی (١٩٦٧) لە (هانۆی) بەرێ کەوت و رۆژی (٢٩) ی نیسانی رابردوو گەیشتە سایگون. رێگاکەمان هەمووی بەپێ بڕی، جەناب. پێنج مانگ بەپێ رۆیشتین، جەناب! رۆژێ دەوری دە سەعات دەڕۆیشتین، هەرگیز لە هەشت سەعات کەمتر نەدەڕۆیشتین، هەندێ جار شەویش، بە درێژایی شەو دەڕۆیشتین، جەناب!

– (ژۆزف)، ئێوە بە کام رێگەدا هاتن؟

– بە رێگای (لاوس) دا هاتین، جەناب. پاشان بە کەمبودیادا هاتین. رێگای کەمبودیا خۆشتربوو، چونکە رۆژێ تەنیا پێنج سەعات دەڕۆیشتین و جەنگەڵیش کەسی تێدا نەبوو. تفەنگیشمان پێ نەبوو، تفەنگەکانیان لێ وەرگرتبووین، پاشان لێرە، لە باشوور تفەنگیان پێ داین. کاتێ گەیشتینە شینایییەکان و بە برادەرانی باشوور گەیشتین، لەگەڵ ئەوان بە یەکەوە بەرەو سایگون کەوتینە رێ.

– (ژۆزف)، تۆ لەسەر داوای خۆت هاتی؟

– ئوە، نا، جەناب. من لە (هانۆی)، لە نووسینگەیەکی بچووك ئیشم دەکرد و نەمدەویست بێمە جەنگ، جەناب، من حەز لە جەنگ ناکەم جەناب، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا رەوانەی جەنگیان کردم جەناب، قانوون بوو جەناب. ئای دایکم چەند گریا! چەند گریا!

– تۆ چەکدار بووی، (ژۆزف)؟

– تەنیا یەك تفەنگم هەبوو جەناب. (أ.ك– ٥٠) لەگەڵ حەفت سەدو پەنجا فیشەك. بەڵام تەنیا شەست دانەم لێ هاویشت جەناب. حەز لە گوللە هاویشتن ناکەم جەناب. تا تۆ زیاتر تەقە بکەی و گوللە باوێی، ئەوان زیاتر گوللەت پێوە دەنێن، جا چ گوللە پێوەنانێك! جەناب.

بە ئێمەیان گوتبوو پێویستە بچینە (سایگون) و یارمەتی هاوڕێیانی باشوورمان بدەین. پێیان گوتبووین ئەمریکی ئینسانی بێ هێزن، بەڵام قسەکە هەر هیچ راست نەبوو. ئەوان هیچیان نەدەکرد هەر بە (ئیم – ٦٩) یان بە رەشاش و شەستیر تەقەیان لە ئێمە دەکرد. ئاخ، جەناب، ئەگەر دەتزانی چەند کەسیان لێ کوشتین!! ئێمە بەبێ ئازووقە خۆمان لە خانوویەك شاردبووەوە، تەنیا یەك جار توانیمان

مریشکێك بدزین، وای چەند برسی بووین! بەڵام برسێتییەکەمان بەرامبەر ترسی تۆپەکانی ئەوان هەر هیچ نەبوو. سەیرکە، هەموو گیانم بۆتە برین و بریان.

بازووم، قاچم. ئیتر ناتوانم بڕۆم.

– لەبەر ئەوەبوو خۆتان بە دەستەوە دا؟

– ئۆی، بەڵێ، جەناب! ئیتر خۆمان پێ ڕانەگیرا. خەریك بوو لە شەکەتییان دەمردین جەناب! ئۆی، جەناب ئیتر لە جەنگ شەکەت و بێزار بووین! شەکەت و بێزار! چ سەرکەوتووبین و چ شکست بخۆین، بەلامانەوە جیاوازی نییە. بە جەهەننەم!! هەرچی دەبێ با ببێ. من تەنیا یەك شتم دەوێ ئەویش ئەوەیە: کە ئەم جەنگە نەفرەتییە زوو بڕێتەوە. جەنگ شتێکی ترسناك و تۆقێنەرە، جەناب. زیندانی بکرێین لەوە باشترە بجەنگین.

ئێستا نۆرەی زیندانییەکان بوو. لە بەڕێوەبەرایەتی مەڵبەندی دەنگ و باسی دەوڵەتی، شەش زیندانییان بە ئێمە ناساند. هۆڵی گفتوگۆ پڕ پەیامنێری بێگانە و نوێنەری ئاژانسی دەنگ و باسی ناوەخۆ بوو.

(لینگ)، سەرۆکی ئاژانسی دەنگ وباسی ڤێتنام، لەتەك وەرگێڕێك دانیشتبوو، بە پێچەوانەی هەمیشە، جلی ناسراوی خۆی لەبەر نەبوو کە کراسێکی شەقامی کوندوتی ڕۆما و پانتۆڵێکی باند ستریتی لەندەن بوو.

بەڵکو جلی سەربازی لەبەر بوو و شەشاگرێکی قورسی لەبەر کەمەر بوو تازە کڕیبووی، هەڵبەت ئیجازەی هەڵگرتنیشی لە گیرفانەکان دابوو.

بە دەم و چاوێکی گەش و کراوە! بە قامك ئاماژەی کرد و زیندانییەکانیان هێنا.

پێنج ڤیت کۆنگ و یەك ڤێتنامی باکووری. ڤیت کۆنگەکان منداڵی دوازدە تا شازدە ساڵی بوون و جلی زیندانییان لەبەر بوو. زیندانییە ڤێتنامی باکوورییەکە کاپتنێکی چل ساڵی بوو، جلی سەربازی لەبەر بوو. دانیشتبوو، دەستێك و پێیەکی بریندار بوو. بردیانن بۆ سەر سەکۆیێ، شەش کورسی لەسەر داندرابوو. کە دانیشتن هەستمان کرد تەنیا زیندانییە ڤێتنامی باکوورییەکە پێڵاوی لەپێدا بوو، پێنجەکەی تر پێ خواس بوون.

(لینگ) گوتی: " ئێستا دەتوانن دەست بە پرسیارەکانتان بکەن "





کوڕیژگەیەکی شازدە ساڵی دەستی بە گریان کرد. تەماشای ئێمەی دەکردو دەگریا. فرمێسکی درشتی لە چەناگەی دەچۆڕایەوە و دەڕژایە سەر ئەژنۆی. لە پڕ پەیامنێرێکی خزمەتگوزاری ئاژانسی دەنگ و باسی (لینگ)، دەستی بە پرسیار کرد:

– کورە، بزانم، خوێڕی، تۆ ڤیت کۆنگی؟ ها؟ وەڵامم بدەوە.

– بەڵێ، من ڤیت کۆنگم.

– سەرسەری، بڵێ بزانم. چ کارێکت کردووە؟ ها؟ چ کارێکت دەکرد؟

– من چەکم بار دەکرد.

هەر دەشگریا.

– کوڕە، تۆ شەرم ناکەی؟ ها؟

– نەء..

هەردەشگریا.

– تۆ قەت نەتگوت بەم کارەت دەبی بە مایەی ناڕەحەتی دایك و باوکت، ها؟ گەلحۆ، بۆچی پێش ئەوەی ئەم ئیشانە بکەی بیرت لە دایکت نەکردەوە؟

– من دایکم نییە. خاو خێزانم نییە. هەموویان کوشتن.

بێدەنگییەکی کورت باڵی بەسەر شوێنەکەدا کێشا. هەموو ناڕەحەت بوون. ئینجا ئەو پیاوە میهرەبانە! ڕووی کردە کوڕیژگەیەکی دوازدە ساڵی کە بەبێ باکی پێیەکانی دەجووڵاندەوە. کوڕیژگەکە لە حاڵەتێکی وادابوو، دەتگوت هەر هیچ بایەخ بەو پرسیارانە و بەو دانیشتنە نادا.

– ها، تۆ؟ ریقۆ، تۆش ڤیت کۆنگی؟

– ئا، ئەی چۆن؟

پەیامنێرەکان پێکەنین.

– سەیرکەن چۆن دەڵێ: " ئەی چۆن؟ "، خوێڕی!

– بەڵام من ...

– باشە، تۆ چ ئیشت دەکرد؟ ها؟ چ ئیشت دەکرد؟

– من گەورەکانم لەناو پاس دی و سواربووم و لە گەڵیان چوومە شار، چونکە

ئەوان شارەزای شار نەبوون، لەوانەبوو بزربن. تەواو!

– تۆ شەرم ناکەی؟

– من!؟ نا، بۆ شەرم بکەم!

خەڵکەکە پێکەنین. کوڕیژگەکە دەم و چاوی حاڵەتێکی سەیری بەخۆوە گرت و دەمی بەش بووەوە، وەك ئەوەی بیەوێ بڵێ: " ئەو خەڵکە کێن؟ چییان گەرەکە؟ ئەوە بۆچی ئەمەیان وا بەبێ ئەدەبی قسەم لەگەڵ دەکا؟ ئەوە بۆچی ئەوانە بە قسەی من پێدەکەنن؟ ئایا من سەرو سەکوتم تا ئەو رادەیە پێکەنیناوییە؟ بۆچی ئەم کابرایە وا دەزانێ من دەبێ شەرم بکەم؟ دەبێ شەرم لە چ شتێ بکەم؟ پاشان دەمی داخست، کەوتە لێوە لەرزە، ئینجا دەستێکی بە دەم و چاوییەوە گرت و دەم و چاوی خۆی شاردەوە ... و گریا ... گریا ...

من لە شوێنی خۆم هەستام و هۆڵەکەم بەجێ هێشت.

پاشان پێیان گوتم غەڵەتم کرد رۆیشتم: چونکە ئیعتیرافەکانی کابرای زیندانی ڤێتنامی باکووری زۆر سەرنجکێش بوو. خۆیشی لەو کەسانەی کە توانییان خۆیان رابگرن و تا کۆتایی دانیشتنەکە لەوێ بمێننەوە!!

برووسکەم بۆ بەڕێوەبەرایەتی رۆژنامەکەم لێدا و نووسیم ئیتر هیچ شتێکتان لە بارەی ڤێتنام بۆ نانێرم. بەم زووانە ئێرە جێ دێڵم.

ئیتر نە بۆ ڤێتنامی باکوور سەفەر دەکەم و نە دەچمە داکتۆ. جانتاکەم دەپێچمەوە و دەڕۆم: منداڵی چاو بە گریان! تەرمی پارچە پارچەو ئەنجن ئەنجن! پەیامنێری کوژراو و خەڵتانی خوێن! مەگەر بێ بەزەیی و دڕندەییم لەوە زیاتر دەوێ؟ نەخێر، چیتر ناتوانم. ئەوەندە تووڕەبوویم، هێڵنجم دێتێ!!

ئای چ بڕوایەکم بە ئایین و بە بەشەر هەبوو!! ئەو بەشەرەی دەبوایە ببێ بە جێ نشینی خودا. ئێرە نە بەشەری لێیەو نە خودا. ئێرە تەنیا پڕاو پڕی جانەوەری دڕندەیە.

ئەم دەوڵەمەندانەی رۆما، جانەوەرن لە (کولیزە)ەوە، بۆ رابواردن هاتوونەتە ئوتێلی (کاراول). ئەم گلادیاتورانەش جانەوەرن، لە (کولیزە) هاتوونەتە (چولون) بۆ ئەوەی ئەمانە سەرگەرم بکەن. جەنەراڵەکان جانەوەرن کە بە خۆشی رادەبوێرن





و سەیرو سەفا دەکەن، دەست کوژەکانیشیان هەر جانەوەرن کە ژن لە کۆرپەکەی جودا دەکەنەوە. قسەکەرەکانی دەزگاکانی دوڵەتیش جانەوەرن کە زیندانیی گەنج ئازارو ئەشکەنجە دەدەن. منیش جانەوەرم کە هاتوومەتە سەیری ئەم دیمەنانە، بێ ئەوەی هیچ بکەم و هیچم لەدەست بێ.

بەسە! بەسە! بەسە!!!

ئەگەر منیش لەناو قەفەسی ئەم جانەوەرانە بمێنم کە خەریکی دڕاندنی یەکترن، وەکوو ئەوانم لێ دێ و ئیشی وەکووئیشی ئەوان دەکەم.

<u>(١٤) ی مایس</u>

بۆ خواردنەوەی بادە بیرەیەك هاتبووە باخچەی ئوتێلی (کۆنتە نینتال). ئێستا هەردووکمان لەبەر سێبەری درەختێك دانیشتووین و قسە لە گرفتی من دەکەین.

مێزەکەی تەنیشتمان، (کاترین)ی لێیە، جلی سپی هەمیشەیی لەبەرە. دەق وەکوو کچانی شەوو رۆژ وایە. (سیمون پاتری)ی وێنەگر، باس دەکا چۆن ڤیت کۆنگەکان لەبەر چاوی ئەو، (لون) یان بریندار کرد. (ئورات) بە گاڵتە پاشماوەی برینی ئەو گوللەیە پێشان دەدا کە لە خەسان لە سپیلکی پێی درابوو. لەلای دەستە راستیش، دوو ئەڵمانی باسی (کاترین) و (ئورات) یان دەکرد. یەکێ گوتی: " بەڵام زۆر خەپڵەو قەڵەوە! ". ئەوەی تر پێکەنی و گوتی: " هیچ کاتێ ژنی قەڵەو شتی خراپ نەبووە! ". لەلای دەستە چەپ، دوو ئەمریکی خەریکن باسی (باری زورتیان) دەکەن کە بەم زووانە دەگەڕێتەوە ئەمریکا. باس دەکەن، زورتیان بەتەما بوو لە یەکێ لە ولاتانی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا ببێ بە سەفیری گەورە، لەوانەشە، کێ دەزانێ؟ لەوانەشە بەتەما بووبێ لە (سایگون) ببێ بە سەفیری گەورە: بەختی خراپی هێنا!

بە هەر حاڵ، خۆت دەزانی پیاوێکی تا بڵێی پایەخوازە، بەڵام ئینسانێکی عاقڵیشە! گیرو گرفتی هەرە گەورە و گرنگی ئەوەیە کە: لە ئەرمەنستان هاتۆتە دونیا و ئەنگلوسەکسۆنی پێست سپی پروتستانی وەکوو (کابوت لاج) هەرگیز رێگەی نادەن بچێتە ناو تاقمەکەی ئەوان و ببێ بە یەکێ لە دارو دەستەکەیان.

دوای رۆژاوا، لە ئوتێلی (کونتە نینتال) چ دەبینین؟:

هەڵەوەڕی، بێکاری، بێهوودەیی، وەکوو کەترەخانە وایە، شەو ڕێگا بەکەس نادەن بچێتە دەرەوە. لە ئاسمانی پڕ ئەستێرەدا، مرەمڕی ئەو جانەوەرانە دێ کە شەڕ لەگەڵ یەك دەکەن. بەڵام ئێمە وەکوو ئەوەی گوێمان لە دەنگی باران بێ، ئاوها هیچ بایەخیان پێ نادەین.

– ... (فرانسوا)، بەم جۆرە دەشێ ئینسان بکەوێتە گومان و دوودڵی. لە سەرەتاوە گومان هەبووە ...

– کارل مارکس دەڵێ: " گومان و دوودڵی باشترین شتە من لە بەشەردا دیومە. "

منیش هەر وا دەڵێم. لەم ڕووەوە لەگەڵ یەکتر کۆکین.

لەوانەیە لە زۆر مەسەلەی تریش لەگەڵ یەکتر کۆك بین، بەڵام ئەمەیان شتێکی مسۆگەرە.

– بەڵێ، بەڵام ئاخیری گومان و دوودڵی دەبێ بە یەقین. (فرانسوا) من دەڕۆم، من لێرە دەڕۆم.

– چ زوو، چ درەنگ، ڕۆیشتن شتێکی زۆر سروشتییە: ناتوانی هەموو ژیانی خۆت لە ڤێتنام بەسەر ببەی. بەڵام من لەگەڵ ئەو رایەی تۆدا نیم کە دەڵێی: " بەشەر لێرەش فریشتە نییە"، تازە ئەمەت بۆ دەرکەوتووە و هەر لەبەر ئەمەشە لێرە دەڕۆی. بەلای منەوە تۆ زێدەڕەوی دەکەی.

– (فرەنسوا)، من چاوەڕێم نەدەکرد ئەمانە بە فریشتە ببینم، تەنیا چاوەڕێم دەکرد ئەمانە بە بەشەر ببینم.

ئەگەر چاو بە چەند دێڕێك لە بیرەوەرییەکانی ئەوچەند ڕۆژەی دواییدا بخشێنمەوە، هیچ نیشانەیەك و هیچ چاوپێکەوتنێکی تێدا نابینم بۆم بسەلمێنێ من لەناو کۆمەڵە بەشەرێك دەژیم. من بڕواو متمانەم بە بەشەر هەبوو، تۆ بۆ پتەوکردنی ئەم بڕواو متمانەیە هاوکاریت کردم. من وام دەزانی ئەوە دەهێنێ کە ئێمە خۆمان بۆ ئەمانە نارەحەت بکەین. وام دەزانی ئەرکێکمان بەرامبەر بەمانە هەیە، بەڵام دەبینم ئەمە ئەرکی ئێمە نییە، چونکە نارەحەت بوونی ئێمە، هیچ دەردێك دەرمان ناکا.





بە هێمنی زەردەخەنەیەکی جوانی کردو منیش تووڕە بووم.

– پێ مەکەنە (فرانسوا)، من دەمەوێ تێت بگەیەنم ئەو ئاوەی لە (خان هوی) دیمان و تۆ بە خۆشی و شادی تەماشات دەکرد و تەماشاکردنەکەی بوو بە مایەی ئەوە کە جەستەی ئەنجن ئەنجن و خەڵتانی خوێنی ئینسانەکانت لەبیر بچێ، ئاوێکی ژەهراوی بوو، نەدەخورایەوە.

دیسان پێکەنی. دەستی دایە جانتاکەی، ئەو جانتایەی بچووبایە هەر شوێنێ پێی بوو. جانتاکەی وەکوو جانتای ژنانە وایە، کامیرا و کاغەز و خڕیلەی فلیم و ئەو فیشەکانەی تێدایە کە لەسەر زەوی کۆی کردوونەتەوە. لەناو جانتاکەیا بە دوای شتێکدا گەڕا، کتێبێکی لەناو دەرهێنا. دەستی لەسەر ناونیشانەکەی دانا و شاردیەوە:

– من ئەمەم بە تایبەتی بۆ تۆ هێناوە. دەبینی (فرانسوا) چەند میهرەبانە لەگەڵ ئەو کەسانەی کە زوو نارەحەت دەبن.

– سوپاست دەکەم.

بە دوای لاپەڕەیەکدا گەڕا و کە دۆزییەوە، گوتی:

– بۆت بخوێنمەوە؟

– بەڵێ، فەرموو!

دەستی بە خوێندنەوە کرد:

– " بەشەر نە فریشتەیەو نە حەیوانە. بەدبەخت ئەو کەسانەن کە دەیانەوێ ببن بە فریشتە، کەچی دەبن بە حەیوان. شتێکی ترسناکە ئەگەر هەوڵ بدەین بە بەشەر نیشان بدەین کە کردەوەی وەکوو کردەوەی حەیوانی هەیە، بێ ئەوەی لایەنی مەزنایەتیشی، نیشان بدەین. هەروەها شتێکی ترسناکە ئەگەر بمانەوێ لایەنی مەزنایەتی پێشان بدەین بێ ئەوەی لایەنی پەستی و نزمیشی دەربخەین. هەروەکوو ئەوەش شتێکی ترسناکە ئەگەر لێ نەگەڕێین هەست بەم دوو لایەنە بکا. شتی چاکە ئەگەر هەردوو لای بۆ ڕوون بکەینەوە. "

– (فرانسوا)، کێیە ئەمەی نووسیوە؟

– یەکێ نووسیوویەتی، ساڵی (١٦٢٠) لە وڵاتی من، لە (ئەوورنی)، هاتۆتە

دونیاوە. دانیٚ ناوی (پاسکال) بووە. دەتوانم بەردەوام بم؟

– فەرموو.

– " دەشیٚ ئینسان نرخی خۆی بدۆزێتەوە، دەشیٚ خۆی خۆش بویٚ، چونکە سروشتێکی هەیە توانای چاکەی تێدایە. بەلاٚم نابیٚ سەبارەت بەمە، ئەو پەستییانەی خۆش بویٚ کە لە وجوودی دان، دەشیٚ رقی لەخۆی ببێتەوە، چونکە ئەمە توانایەکی پووچ و بیٚ هوودەیە. بەلاٚم نابیٚ سەبارەت بەمە، ئەم توانا سروشتییەی خۆش نەویٚ،دەشیٚ رقی لە خۆی بێتەوە، یان خۆی خۆش بویٚ. ئینسان توانای ناسینی راستی و بەختەوەریی تێدا هەیە، بەلاٚم لە راستیدا، نە راستی ئەبەدی و نە راستی دڵخۆشکەری تێدا نییە...

من، ئەو کەسانەی ستایشی بنیادەم دەکەن و ئەو کەسانەی سەرزەنشتی بنیادەم دەکەن و ئەو کەسانەی بنیادەم بۆ رابواردن بەکاردێنن، بەقەدەر یەك، سەرزەنشت دەکەم و ناتوانم پشتگیری هیچ کەس بکەم بێجگە لەوانەی بەدەم دەرد و ئازارەوە خەریکی گەڕان و پشکنینن. "

ئینجا کتێبەکەی هەڵدایە کۆشی من:

– ها، بیخوێنەوە. ئاسوودەت دەکا. خۆی کاتولیك بوو، لە ئاسماندا بەدوای بەهەشتدا دەگەڕا، بەلاٚم زۆر عاقڵ بوو!!

– دەیخوێنمەوە.

ئینجا لەناکاو گوتم:

– کەواتە هەر لەبەر ئەوەیە تۆ (لون)ت بەخشیوە؟ وانییە؟

کەوتە حاڵەتێکی جدی :

– من ئەوم نەبەخشیوە، من حوکمم داوە. بەڵیٚ، هەر لەبەر ئەوەبوو ...بەلاٚم لەبەر شتێکی تریش بوو، تۆ شتێکی تریش لە کتێبی پاسکال دەبینی:

" ئەگەر یەکیٚ شانازی بە خۆیەوە بکا، من بە کەمی دەزانم. ئەگەر خۆی بەکەم بزانیٚ، من شانازی پێوە دەکەم. بە بەردەوامی قسەکانی رەت دەکەمەوە، بۆ ئەوەی تیٚ بگا کە دێوێکە  کەس تێی ناگا. "

– تیٚ ناگەم.





– ئاسانە. ئێستا (لون) لە بارودۆخێکی خۆ بەکەم زانین دایە.

هەموو کەس یارمەتی دەدا بۆئەوەی خۆی بە کەم بزانیٚ چونکە رقیان لیٚ دەبێتەوە. ئەگەر ئەمریکییەکانیش ئێستا، کە وا ئەو لە نەخۆشخانە کەوتووە، داوای سەری لە دەوڵەت بکەن، زۆر بە ئاسانی سەریان دەست دەکەویٚ.

سەرۆکی تازەی پۆلیس ئامادەیە کارە تازەکەی وەربگریٚ، بیٚ گومان ئەو لە (لون) باشتر نییە، بەلاٚم بەلانی کەمەوە کەس لەکاتی کوشتنی ڤیت کۆنگێك وێنەی نەگرتووە. ئەمە ویژدانی ئەمریکییە ئازاکان ئاسوودە دەکا کە کوڕەکانیان دەنێرن بۆ ئەوەی لە ڤێتنام بە کوشتنیان بدەن و (لون) مەحکووم دەکەن.

– تۆش مەحکوومت کردووە.

– من روخسەتی ئەم کارە بەخۆم دەدەم، چونکە من خەڵکم نەناردووە لە ڤێتنام بە کوشتنیان بدەم. من روخسەتم هەیە کە مەحکوومی بکەم، چونکە من ئێستاش روخسەت بەخۆم دەدەم دادوەریی دەرهەق کارەکانی بکەم و لەوانەیە لەم دادوەرییەدا تەبرییەشی بکەم.

– جارێکی تر چاوت پیٚ کەوت، وانییە؟

– بەڵیٚ.

– کەی؟

– ئەمڕۆ.

– بە یەکەوە باسی چ شتێکتان کرد؟ چ شتیٚ رووی دا؟

لەبەر ناڕەحەتی هەناسەیەکی هەڵکێشا و سەیری دەوروبەری خۆی کرد بۆئەوەی بابەتێکی تر بدۆزینەوە بۆ گفتوگۆ. بەلاٚم هیچی تازەی لە دەوروبەر نەبوو. (کاترین) هێشتا هەر لەویٚ دانیشتبوو، روو گرژ و دەم و چاو بەبرین. (ئورات) نازو فیزی دەکرد و جوانی خۆی دەردەخست و پێش خزمەتێکی چاکەت سپی شەرابی بۆ دەهێنان.

– دەتەویست چ رووبدا؟ چوومە نەخۆشخانەو بە دوای دختۆردا گەڕام و کە دۆزیمەوە پرسیم بریندارەکە چۆنە، گوتی بەو عەمەلیاتەی بۆ دەماری خوێنبەری کراوە، لەوانەیە نەجاتی ببیٚ، ئەگەر نا ناچار دەبن قاچی ببڕنەوە. پاشان رووم

کردە ژوورەکەی. دەرگای ژوورەکەم کردەوە و چوومە ژوورەوە، ئینجا دەرگام داخست و لێی چوومە پێش و گوتم: " راستی، من دختۆرم دی، گوتی ئومێد هەیە قاچت نەبڕنەوە و نەجاتت ببێ. "

– بەبێ ئەوەی چاك و چۆنی لەگەڵ بكەی؟

– تۆ ئەگەر بە کابرایەك بڵێی قاچت نابڕنەوە، زیاتری هەوەس پێ دێ لەوەی کە چاك و چۆنی لەگەڵ بکەی، وانییە؟

– ئەی ئەو چی گوت؟ چی کرد؟

– دەتەویست چ بکا؟ بەبێ جووڵە لەسەر قەرەوێڵەکەی راکشابوو، سەیری کردم و دەستی بە گریان کرد.

– (لون) و گریان؟! باوەڕ ناکەم.

– خۆت دەزانی، هێشتا لەژێر کاریگەری زەبری دەروونی دایە. کحوولیش ... خۆ ناتوانێ بخواتەوە.

– زۆر گریا؟

– نەختێ.

– پاشان؟

– پاشان گوتی: " زۆر دەمێکە ناتبینم!

" منیش پێم گوت: " بۆ ئەم نەبینینە بەڵگەیەکی باشم بە دەستەوەیە، منم کە نامەوێ تۆ ببینم. " ئەوەندەشم گوت: " تۆ ئیشێکی کرێتت کرد، خۆت دەزانی. "

– ئەی ئەو؟

– هیچ وەڵامی نەدایەوە.

ئینجا پێم گوت: " کوشتنی پیاوێکی دەست بەستە، پێویستی بە ئازایەتی زۆر نییە.

" ئەوسا ئەو پێی گوتم: " دەستی نەبەسرابووەوە.

" منیش گوتم: " بەدی! دەستی بەسرابووەوە، تۆش دەزانی. دەتەوێ وێنەکانی ئەم دیمەنەت نیشان بدەم؟ "

– ئەی ئەو؟





– هیچ وەڵامی نەدایەوە.

من ئەم پرسیارەم لێ کرد، " تۆ بۆچی ئەم ئیشەت کرد؟ "

وەڵامی دامەوە: " رۆژێ پێت دەڵێم. "

من سوور بووم " یەکێ بوو لە پیاوەکانی خۆت؟ سیخوڕ بوو؟".

سەری دانەواند و گوتی: "نەء"

پاشان دووبارەی کردەوە: " رۆژێ پێت دەڵێم."

دوای ئەوە لە ژوورەکەی هاتمەوە دەرەوە. پێش ئەوەی بێمە دەرەوە پرسیم ئایا هیچت پێ ناوێ؟ و هاتمەوە دەرەوە.

شتێ هەیە دەتەوێ پێت بڵێم؟ من باوەڕ ناکەم، ئەو زیندانییەکانی ئەشکەنجە دابێ، یان بێ رەحمی دەرهەق کردبن، تەنانەت وای بۆ دەچم کە بەشداری لێکۆڵینەوەکانیشی نەکردووە.

(فرانسوا) لە بارەی شتی تریشەوە قسەی بۆ کردم، باسی کرد کە لە ئاخرو ئۆخری حوزێران لە ڤێتنام دەڕوا. دەچێتە بەرازیل بۆ ئەوەی لەوێ (فرانس پرێس) بەڕێوە ببا. ئینجا زۆر قسەی لە بارەی بەرازیل کرد. بەڵام خودایە، بەرازیل چەند دوورە. دەڵێی لە مانگ و مەریخیش دوورترە!! پاشان، بەبێ هیچ ئەگەرێك دووبارە مەسەلەی (لون) ی هێنایە پێشەوە.

– من تێ ناگەم بۆچی (لون) ت ئەوەندە بەلاوە بەرزە؟

گوتم:

– تۆ هۆیەکەی زۆر باش دەزانی. لەبەر ئەو هۆیانە بە لامەوە بەرزە، کە بەلای تۆشەوە هەر وایە. (لون) رەمزی یەك شتە: رەمزی پیاوێکە، بە لەناوبردنی دەروبەرەکەی، خۆیشی لەناو دەبا. من دەزانم ئەو دەتوانێ خۆی لەم دەردە نەجات بدا. دەزانی، ... (فرانسوا)، بەسەر ئەو تێبینییانەدا چوومەوە کە لە یەکەم چاوپێکەوتنم لەگەڵ ئەودا، تۆمارم کردبوو، شتێکی نزیك ئەمەم لەبیرەوەرییەکان نووسی بوو: " پرسیار لەخۆم دەکەم: ئایا چارەنووس چاوپێکەوتنێکی تری لەگەڵ ئەوا بۆ دیاری نەکردووم؟ کێ دەزانێ، لەوانەیە رۆژێ بێ و لەگەڵ سەرپێچی و پەیمان شکێنی خەڵك رووبەڕوو بێتەوە و من دووبارە بیبینمەوە و بە

دیداری شادو خۆشحاڵ ببم."

– ئینجا؟

– من بە کابرایەکی بەرزی نازانم، من هەمیشە ئەم پرسیارە لەخۆم دەکەم: ئایا ئێوە ئەم دووەتان، هاوڕێی یەکتر نین؟ ئەگەر هاوڕێن ...

– نەخێر، ئێمە هاوڕێی یەکتر نین و هەرگیز ناڵێین هاوڕێی یەکترین، بەڵام بۆی هەیە ببین بە هاوڕێی یەکتر، سەرەڕای ئەوەی کە لە هەموو لایەکەوە لەیەك جیاین ... ئەو خەڵکی (هانوی) یەو من خەڵکی (ئوورنی). ئەو زۆر قومار دەکاو دەخواتەوە و سەرخۆش دەبێ، تووشی هەر ژنێ بێ لەگەڵی دەخەوێ، من وانیم. ئەو سەربازەو ئەگەر بارودۆخی بۆ ڕێك بکەوێ دەبێ بە دادوەر، من وانیم. بەڵام بەهەر حاڵ، ... بەڵێ، بۆی هەیە کە ... من لەگەڵ ئەو زیاتر تێك دەگەین تا لەگەڵ ئەو ئەمریکییەی پێشتر لێرە بووە و کارێکی وەکوو کاری منی هەبوو.

لە یەکەم لەحزەوە کە یەکترمان ناسی، من هەوەسم پێ هات: لەناو باندێکی فڕۆکە یەکترمان بینی. ئەو ڕۆژگارە، ئەو فڕۆکەوانێکی سادەبوو و من تازە هاتبوومە ڤێتنام. بەلامەوە زۆر ناشیرین و زۆر عاقڵ و نائاسایی بوو. شێوەی قسەکردنی زۆر بە جۆش و خرۆش و بەتام و بۆ بوو. کاتێ کە گەیشتە دەسەڵات، تووشی خەفەت و غەمباری بوو: هیچ شتێ وەکوو دەسەڵات پیاو لەناو نابا.

پاشان لە (دانانگ) و (هوئە) دیم، کاتێ بە خۆی و (کا ئوکی) لەگەڵ بودایییەکان لە بگرەو بەردەدا بوو: شەڕی شەقام و کوشتار کارێکی ئاسان نەبوو بەڵام ئەوان سەرکەوتوو بوون. ئەو لە هەموو شوێنێ بوو، ڕێنمایی کار و کردەوەکانی دەکرد. خۆت دەزانی ئازایەتی هەمیشە رامدەکێشی!و دڵم لێ دەسەنێ.

– ئازایەتی جەستە، وانییە؟

– بەڵێ. بەڵام دوای ساڵێك هەستم کرد کە ئەمە تەنیا ئازایەتی جەستەیی نەبوو. ئەویش ئەوکاتەی دوو فرەنسی دەستگیر کرد کە بەلای منەوە ئینسانی زۆر بەڕێز بوون. جەنابی (گوکس) و جەنابی (گران ژان). (لۆن) ئەوساکە سەرۆکی پۆلیس بوو. چوومە لای ، گوتم: " تۆ ئیشێکی گەلۆرانەت کردووە، ئەوانە پیاوی بێ گوناهن، دەبێ ئازادیان بکەی، بەبێ ئەوەی فەرمانی دەرکردنیان دەربکەی. "





دوای ڕۆژێك تەلەفۆنی بۆ کردم و گوتی: " خەریکین فرەنسییەکانی تۆ ئازاد دەکەین! "

لە وڵاتیش دەری نەکردن ...

باشە، ئەمە ئەو شتەبوو کە دەمەویست بیڵێم. ئازایەتییەکی زۆری دەویست بۆئەوەی ئیعتیراف بە غەڵەتی خۆی بکا.

ئیعتیراف کردن بە غەڵەت، لەدەست دانی پلەو پایەیە. لە ئاسیا هەرگیز کەس ئامادەنییە پلەو پایەی خۆی لەدەست بدا. بەڵێ، بەم کارەی ئەو، زیاتر لێکی نزیك بووینەوە. جارێکی تر وا ڕێك کەوت دەوڵەت ویستی من لە وڵات دەربکا و لە ئاخر لەحزەدا (لون) فریام کەوت. لە بارەی دەرکردنی (مازۆر) یش زۆر درەنگ پێ کەوتم کە کەسانی تر ئەم بڕیارەیان داوە و ئەگەر (مازور) بیویستایە بمێنێتەوە و بیگوتبایە دەمەوێ بمێنمەوە، وابزانم (لون) دەیتوانی یارمەتی بدا. (لون) ... پەیمانێکی لەگەڵ من بەستبوو، هەرێی دابوومێ ئەگەر ڕۆژێ بێ و بڕیار بدا من دەربکا، دە دەقیقە ماوەم دەدا بۆئەوەی هەرچی حەزکەم جوێن و قسەی ناشیرینی حەواڵە بکەم و ئەوسا سواری فڕۆکە ببم و بڕۆم.

– باشە، تۆ ئەمە لە هاوڕێتی ئەو نازانی؟

– نا، ئەمە جۆرە لەیەك گەیشتنێکە. ئاسیا و دەریای ناوەڕاست ...

ئێمە، ئەم دووە، تاکە پەیوەندی نێوانمان ئەوەیە کە لە جیلێك هاتووینەتە دونیا کە خاوەنی یەك کولتوورە: کولتووری فرەنسی. ئێمە هەرگیز باسی فەلسەفە و پاسکالمان نەکردووە، کاتی ئەوەمان نەبووە. بەڵام هەمیشە بە زمانی ئارگو قسەمان لەگەڵ یەکتر کردووە ... پەیوەندی بەینمان پەیوەندییەکی مرۆڤایەتی بووە، تەواو! ... ئاخر پیلەکەو گفتوگۆ لەگەڵ یەك کردن و پاشان پشت لەیەك کردنیش جۆرە پەیوەندییەکی مرۆڤایەتییە. وانییە؟

ئەویش وەکوو هەموو بەشەرێك هەموو چاکەیەك و هەموو خراپەیەکی تێدا هەیە: کە بە هۆی جەنگەوە زیاتر قووڵ بوونەتەوە و ڕەگیان داکوتاوە.  نە تەنیا فریشتەیە و نە تەنیاحەیوانە، بەڵکو فریشتەو حەیوانە ...

(فرانسوا)، بە پاسکالەکەی و بەم مرۆڤایەتییە نەفرەتییەی، خەریکە دەمخاتە

ناو گومان و دوودڵییەوە. لەحزەیەك كتێبەكەم كردەوە، دەزانی چاوم بە كام رستە كەوت؟ بەم رستەیە:

" ئێمە ئارەزوومان لە راستییە و جگە لە گومان و دوودڵی هیچی تر لە خۆماندا نابینین! "

(١٥) ی مایس

نازانم پێم گوتوون یان نا كە هەر كاتێ هەست بە غەم و دڵتەنگی دەكەم، سواری تەكسییەك دەبم و یەكسەر دەچمە لای (وینـچزو تورنتـا). لەبەر ئەوەی نـا كـە نەختێ قسەكردن بە ئیتاڵی سوكنایی بە دڵم دەدا، بەڵكو لەبەر ئەوەی لە ماڵی ئەوا هەست بە ئاسوودەییەك دەكەم لە ژوورەكەی خۆم دەستم ناكەوێ.

لێرە هەموو شتێ جەنگم بیر دەخاتەوە، لەوێ هەموو شتێ لە جەنگ دوورم دەخاتەوە. وەكوو دوو منداڵەكەی كە هەراو زەنا دەكەن، وەكوو ژنەكەی كە بە هێمنی شكاتییان لێ دەكا. ئەو، نامەكانی من بە بەریدی دیپلۆماتی رەوانەی ئیتاڵیا دەكا و پوولێكی لێ دەدا وێنەی میكائیل ئەنجلۆی لەسەرە. ئەم (تورنتا) ئازیزە لە (خان هوی) و (چولون) دوورم دەكاتەوە، بەڕادەیەك وا دەزانم تاكە سەفیرێكی گەورەیە شایەنی ئەم نازناوە بێ. تاكە كەسێكە تا ئێستاشیاوی ئەم نازناوەی بێ و توانیبێتی لەناو مووزەخانەی مۆمیایی دیپلۆماسی بێتە دەرەوە، یان بە لانی كەمەوە تاكە كەسێكە تا ئێستا دیبم بەم جۆرە بێ.

" وەرە، باشە؟ هەركاتی دەتەوێ وەرە. بێ ئەوەی ئاگادارمان بكەیتەوە كە دێی، یان بەبۆنەی هاتنە ئێرە جلت بگۆڕی. تكایە وەرە، تەنیا ئەوەندەیە قاپێكی زیادە لەسەر مێز دادەنێین و بەبێ فەرموو فەرموو دادەنیشین و خواردنمان دەخۆین. ".

كە دەرگای ماڵی خۆت بۆ دەكاتەوە، دەرگای دڵی خۆیشت بۆ دەكاتەوە.

ئەمڕۆ وا لەوێم. كاتی فراوینە!

خواردنی چاك، شەرابی چاك، مێزێكی جوان و پەرداخی كریستاڵ و گوڵ. جاروبار بینینی ئەم شتانە پێویستە.

ئەم جۆرە حوكمێكی دادپەروەرانە ترو رەهاتری هەیە.

(تورنتا) دەڵێ:





" ڤێتنامییەكان بە قەدەر فلۆرەنسییەكانی رۆژگاری دانتی، داب و نەریت پەرستن. تەنیا گولف[2] و ژیبلنە[3]كانی فلورەنسە دەتوانن بەم دڕندەییەی ڤێتنام، بكەونە گیانی یەكتر.

منیش لەم بارەیەوە بیرم دەكردەوە: راستە. ئەو شتەی لێرە دەیبینم لەوە خراپترنییە كە پێش حەفت سەد ساڵ لە وڵاتی من رووی داوە. ئەو كاتەی فلۆرەنسییەكان، بە نۆرەی خۆیان، بەبێ یەك تۆزقاڵ بەزەیی خۆ بە خۆیی یەكتریان دەكوشت. ئەی بۆچی ئێستا وا ناڕەحەت بوویم؟ من خۆم بەدەست حاڵەتێكی عەسەبییەوە داوە. ئێستا دەچم بۆ ئەوەی جانتاكەم كۆبكەمەوە و بچمە باكوور. ئەمڕۆ سەعات چواری دوای نیوەڕۆ، فڕۆكەیەكی (سی – ١٣٠) یەكسەر دەچێتە (دانانگ). (دەرك) پێی گوتم: چونكە ئەویش لەگەڵ پسمامی دەچێتە ئەوێ. تەلەفۆنم بۆ كردو گوتم:

" دەرك منیش لەگەڵت دێم ".

من ئێستا وا لە فڕۆكەخانەی (تان سون نوت)م، چاوەڕێ دەكەم. (سی – ١٣٠) تاخیر بووە.

بەسەر ئەعسابی ناڕەحەتم زاڵ بوومە و تا رادەیەك ئارام و ئاسوودەم. بەڵام سەرەڕای ئەمەش، كتێبەكەی پاسكالم لەناو جانتاكەم داناوە.

---

١ گولف: بورژوازی میلان

٢ ژیبلنی: لایەنگرانی ئیمپراتۆر

# بەشی نۆیەم

لەوانەیە لەبەر مردنی (ئەزکورا) و (کانتول) و (بریچ) و (پیگوت) و (لارامی) بێ، چونکە زۆر ئاشکرایە کاتێ کە لە نزیکەوە کردەوەیەکی دڕندانە دەبینین، کاردانەوەمان بەرامبەر بەو بینینە شتێکی ئاسایی نابێ، بەڵکو کاردانەوەیەکی بە جۆش و خرۆش دەبێ. من دەمزانی کوشتنی ئەمانە هیچ جیاوازی لەگەڵ ئەو هەزاران تاوانە نییە کە بە درێژایی رۆژ دەیانبینین. بە ئەقڵ زۆر باش لەم راستییە دەگەم. بەڵام لە دڵەوە قبوولم نییە و لە ناخی ناخەوەم ئەم پێنج جەستەیە ئەوەندە ناڕەحەتیان کردم بەقەد ئەوەبوو کە جەستەی مارتن لۆتەر کینگ رەشەکانی واشنتۆنی ناڕەحەت کرد. بەرامبەر بە سووتاندنی دوکانەکانی شەقامی چواردەم، منیش ئەو ئافەرینەی بۆ ڤیت کۆنگەکانم هەبوو، سووتاندم.

لەوانەیە کاتی کەوتنی (لون)، کاردانەوەی (فرانسوا) سەخی تەبعانە و ئاقڵانە بووبێ. ئەمانە وایان کرد کە بۆلای (لون) بگەڕێتەوە.

(فرانسوا) کارێکی قووڵی لەمن کردبوو. ئەم هەڵوێستەی ئەو تێی گەیاندم کە (تۆقانی سایگون) لەوانی دیکە خراپتر نییە. تەنانەت فرانسواش دەتوانێ و دەبێ بتوانێ بیبەخشێ.

بەم بۆچوونە و بە سووربوونی زیاترەوە دەکەوتمە شوێن بیرو باوەڕەکانی پاسکال و هەمیشە لێکدانەوەیەکم تێدا دەدۆزییەوە کە هەمیشە ئەم خاڵەم تێدا تێبینی دەکرد: کە: هیچ شت هەمووی راست (حقیقة) نییە، تەنیا بەشێکی نەبێ، هەمووی غەڵەت نییە تەنیا بەشێکی نەبێ، کە: هەموو شتێ دروست و نادروستی بە تێکەڵاوی تێدایە. ئەوانەی کە تۆ رێزیان دەگری، دەشێ بن بە هۆی تێ شکانی تۆ و ئەوانەی تۆ رقت لێیانە، دەشێ ستایش و سەرسامیت بکەن.

پاسکال، رەهاکاری و ناخ کوێریی منی نەرم کردەوە. لەوانەیە ئەم نەرم





بوونەوەیە سەبارەت بە قسەکانی (تورنتا) بێ لەبارەی ژیبلن و گولفەکان.

پێم بڵێ، ئێستا کە حەفت سەد ساڵ بەسەر ئەو کاتەدا تێپەڕیوە، غەڵەتەکە هی کامەیان بوو؟: ژیبلنەکان یان گولفەکان؟ ئەگەر وەڵامەکەم پێ بڵێی، منیش پاش حەفت سەد ساڵی دی دووبارە پرسیارت لێ دەکەم: ڤیت کۆنگ یان لۆن، کامەیان لەسەر غەڵەت بوو؟ بەڵام تۆ ناتوانی وەڵامی من بدەیتەوە، چونکە راستی هەمیشە پەیوەندی بە کات و شوێن و پەیوەندییەوە هەیە، ئەگەر بتەوێ بە کەمەندیش بیگری، دیارە کارەکەت پووچ و بێ هوودەیە، وەك ئەوە وایە بتەوێ (با) بگری.

ئەی هەر پاسکال نەبوو گوتی: کەواتە دەوری بەشەر لە سروشتدا چییە؟ بۆشاییەکە رووی لە بنی بەڕیایە، هاماوێکە بەرامبەر بە نەبوون، دیاردەیەکە لەناو گوم و هیچ و هاماودا، بوونەوەرێکە دوور لە دەرك کردنی کۆتاییەکان، ئەنجام و بنیاتی شتەکانی بەلاوە رازێکی شاراوەیە و زۆر بە نهێنی ماوەتەوە. هەروەسا بێ تواناییەکە لەگەڵ دەرك کردنی ئەو نەبوونەی لێی پەیدابووە و ئەو بنی بەڕیایەی تووڕ هەڵدراوەتە ناوی، یەکسانە.

لەوانەشە لە راستیدا هەموویان هەر یەك شت بن.

دەزانی، سەبارەت بە هەرچی هۆیەکەوە بێ، من تا ئەمڕۆ ئەم بەشەی کۆتاییەم لە هاوسەنگییەکی نەناسراودا، ناسیوە.

ئەم هاوسەنگییەش ئەو وروژانەی کەم نەکردۆتەوە کە بە بینینی هەموو شتێ لام پەیدا دەبوو، بەڵکو بە هەستێکی قورستترەوە لای دروست کردووم. گومان و دوودڵم لەوەی کە بێ هوودە لێرە ماومەتەوە. ئەم بێ هوودەییە، ئەوەندە گەورە بوو و ئەم هەستە ئەوەندە نائومێد و بەزیوی کردم، کە سەر لە نوێ ئەو بڕیارەم دایە کە لە (داکتۆ) دابووم. ئێستا ، کە دووبارە بیرەوەرییەکانی رۆژانەم دەخوێنمەوە، هەست بەم مەسەلەیە دەکەم.

من بۆ ئەوە هاتمە باکوور تا بچمە دیدەنی تەپۆلکەیەك. تەپۆلکەیەك بیرەوەرییەکانی (پیپ) ی لێ بدۆزمەوە. لەبیرتە؟ لێرە دۆزیمەوە و کە دەستم خست، تووڕم هەڵدا.

ئێمە ئێستا لە ئۆردووگایەکی هێزی دەریایین: پەنجا کیلۆمەتر لە باکووری

رۆژهـەڵاتی (دانـانگ) دوورین، بەرامبـەرمان شـەڕی ئەمریکییـەکان و ڤێتنـامی باکوورییەکانـە. نزیکـەی شـەش کیلۆمـەتر لـەولاوە، ئـەوەی دەیبیـنم هـەمووی دەشتێکی سوورەبانە، یـەك پەڵـەی سـەوز دیـارە ئـەویش جەنگـەڵێکی بچووکە و ئەوان خەریکن لەویٚ یەکتر دەکوژن.

ئەمڕۆ لە بەیانییەوە، لەویٚ هاون لـە ئۆردوگاکـەمان دەگرن. فەرماندە پێی گوتم کـە چـاکەتی پاراسـتن لەبـەر بکـەم و کڵاوخـوودەی ئاسـن لەسـەر بنـێم. بـەڵام هەتاوەکـەی زۆر گەرمـە و وەختـە سـەرم لـەژێر کڵاوخـوودە بـسووتیٚ، چـاکەتی پاراستنیشم ئەوەندە قورسە دەڵێی مس کفت کراوە.

من نازانم سەبارەت بە گەلۆریی هاتنە ئێرە، چ بە دەرك بڵێم. بەهەر حاڵ، مەگەر چـیمان زەرەر کـردووە؟ تـەنیا جـەخت کردنەوەیـەکی تـرە لەسـەر ئـەم قـسەیەی فرانسوا: جەنگ گەلۆرییە!

ئەو جەنگەی لەناو ئەو جەنگەڵە بچووکە لـە ئارادایـە، بە راستی، جـەنگێکی بیٚ هوودەیە.

لەو جەنگەدا، نە هیچ شتیٚ بەدەست دیٚ و نە هیچ شتیٚ لەدەست دەچیٚ. بەلاش و حـەلاش هەڵگیرسـاوەو بـەبیٚ ئـەنجامیش کۆتـایی پـیٚ دیٚ. ئەمـشەو، سـبەی، دووسبەی!

بێجگـە لـە مـن، کـە تەماشـای دەکـەم و بێجگـە لەوانـەی هەڵیدەسووڕێنن، هـیچ کەسی تـر پێی نازانیٚ و تـەنیا دوو دێڕ لـە بڵاوکـراوەی (جوسپائو) پڕدەکاتـەوە. چـەند خێزانێکـی ئـەمریکی و ڤێتنـامی بـاکووری برووسـکەیان بـۆ دەچـیٚ، یـان خەبەریان پیٚ دەگا کە کوڕەکەیان، یان مێردەکـەیان،یان برایـەکیان  رۆژی (١٧) ی مایسی (١٩٦٨)، لە شازدەمین سـەنگەری پێشەوەی جـەنگ، لـە نزیـك (هـوی ئـان) کوژراوە. تـەواو! ئـەم جەنگەڵـە بچووکە کـە ئـەمڕۆ چـۆڵ و کش و ماتـە، بـە قـەدەر سەرەواوێکیش ئەنجامی جەنگ یان گفتوگۆی پاریس ناگۆڕیٚ.

– فەرماندە، ئەم شەڕە لە کەیەوە بەردەوامە؟

– ئەوە سیٚ رۆژە.

– ئایا ئەم جەنگەڵە بچووکە شوێنێکی ستراتیجییە؟





– نەء.

– ئایا ئەم جەنگە بەشێکە لە کردەوەیەکی تایبەتی؟

– نەء.

– ئەی چی؟

– نـازانم، تـیٚ ناگـەم. پـێش حەفتەیـەك دوو دەسـتەی ڤێتنـامی بـاکووری دزەیـان کرد بۆ ئێرە، دەستەی یەکـەم و دووەمـی ...  لەگـەڵ لیـوای سـیٚ سـەدو هەشـت و پاشانیش لەگەڵ دەستەی حەفتـەم وئینجا دەسـتەی بیستی هێزی دەریـایی تێك گیران و ئەم داستانە دەستی پیٚ کرد، تەواو. سەرەتا وام دەزانی ئەمانە دەیانـەویٚ (دانـانگ) داگیر بکـەن، بـەڵام پاشـان زوو بیروڕام گـۆڕا. ئەمانـە هـیچ چـاویان لـە (دانـانگ) نـەبوو. پـێش ئـەوەی هـیچ ئـارەزووی شـتی وابکـەن، زۆر بـە باشـی دەمـانتوانی یارییـان پـیٚ بکـەین، دەقـا و دەق وەکـوو چـۆن پـشیلەیەك یـاری بـە مشکان دەکا.

ئێرە شوێنێکی سووتماکە: نە درەختێك، نە ئاژەڵێك، نە خانوویـەك بـۆ داکردنـی ئازووقە و تەقەمەنی. زۆر باش دەمانتوانی بیانبینین و هـەرکات و بە هـەر جۆریٚ بمانویستایە دەمانتوانی بیانشکێنین چ بە تۆپخانە بیٚ و چ بـە هێزی هـەوایی و چ بە ...

– بەڵام، فەرماندە، بیٚ شك ئەوان هۆیەکیان بە دەستەوەیە بۆ ئەم کارەیان؟

– نـا. هـیچ هۆیـان نییـە. لانـی کـەم ئەگـەر ڤیـت کـۆنگ بوونایـە شـتێکمان لیٚ هەڵدەکڕانـد. بـەڵام لـە دوای ئـاژاوەی (تـەت)، ئێمـە هـیچ شـەڕمان لەگـەڵ ڤیـت کۆنگـەکان نـەبووە. ڤێتنامییـە باکوورییـەکان تـەنیا ئازووقـە و تەقەمـەنی بـە ڤیـت کۆنگەکان هەڵدەگرن، ئیتر بەکرێگیراوەکان دیار نین. ڤێتنامییە باکوورییەکان لە شـەڕی قـورس بەشـداری دەکـەن، وەکـو ئـەم شـەڕەی کـە لـە رووی پـۆلێن کردنـی دەسـتەکانەوە لـە ئاسـایی بـەدەرە. چـەکیان نمـرە یەکـەو جلیـان جلـە سـەربازیی سادەیەو تەنانەت سەربازەکانیش جیان: کەڵەگەت، قۆز، هـەموو لـە دەوری هـەژدە تا بیست و شەش ساڵین. لەوەدەکا دەستەیەکی بژاردەی سوپا بن.

– ئاخر، دەستەیەکی بژاردە، لەم جۆرە جەنگە بە کوشتن نادەن.

– منیش ئەم بیرەم لێ کردۆتەوە. ئەمانەیان تەنیا بۆ ئەوە ناردووە لە پێناوی هیچدا بەکوشتن بچن.

– ئەی ئێوە فەرماندە؟

– ئێمەیشیان هەر لە پێناوی هیچ رەوانەی ئێرە کردووە.

بیست کیلۆمەتر لێرە دوور، شەڕێکی تری وەکوو ئەمە لە ئارادایە. (کاپتن رابینز) لەو شەڕەدا بەشدارە، (رابینز)کە (لیندا )ی کچی (جونسون)ی لە کنە. لەوانەیە بەتایبەتی رەوانەی ئێرەیان کردبێ بۆ ئەوەی نیشانی بدەن کە کۆشکی سپی هاتۆتە ناو جەنگ و شتی تر ...

بەڵام بێ شك من لەوانە نیم کە خەمخۆری کاپتن (رابینز) بم. ها، ئەو سەربازە وردیلە پاسەوانەی ئەوەتا چاوەدێری لۆرییەك دەکا، بەلای منەوە زۆر لەو گرنگترە. ئەو سەربازە وردیلە کە فەردە قوم لەسەر یەك دادەنێ و ورتە ورت دەکا: " من بایەخ بەم جەنگە نادەم. منیش رام وەکوو برام وایە کە لە هێزی هەوایی ژمارە سەدو حەفتاو سێیەو دەڵێ: ئەم جەنگە جەنگێکی بێ هوودەیە، هەم بۆ ئەوان و هەم بۆ ئێمەیش. من هێشتا تێ نەگەیشتووم بۆچی لێرەم. ئێمە زۆر منداڵین، دەبوایە ئێستا لە پۆلی قوتابخانە بین، نەك لێرە ...

ئەوان هەموو رقیان لە ئێمە دەبێتەوە، چونکە هاتووینەتە ئێرەو ئێمە بە ئیمپریالیست دەزانن. من تەنانەت نازانم ئیمپریالیست یانی چی؟ ها؟ ئیمپریالیست یانی چی؟ تۆ دەتوانی پێم بڵێی؟ ئینجا دەستی بە گۆرانی کرد:

پیاو دەبێ چەند رێگا ببڕێ

تا بتوانی پێی بڵێی پیاو؟"

ئەگەر غەڵەت نەبم ئەمە گۆرانییەکی (پاپ دیلان)ە. پێشتر لە نیویۆرك گوێم لێ ببوو، ئەوەش بڵێین لە نیویۆرك ئەم گۆرانییەم بەلاوە بێزار و ناخۆش بوو.

چووینە دیدەنی ئۆردووگایەکی تر، کە رەوشی وەکوو رەوشی ئۆردووگای یەکەم وابوو. ئێستا لە (دانانگ) ین و دەرك شەکەتە.

– سەعات پێنج هەستاین، ئەم جلە سەربازییە نەفرەتییەمان لەبەر کرد، سواری لۆرییەك بووین و چووینە شوێنی تەقە، لەوانەبوو بکوژرێین. سواری لۆرییەکی





تر بووین و گەڕاینەوە (دانانگ). شەست دێڕ شتمان نووسی بۆئەوەی بڵێین، پازدە میل دوور لە باکووری رۆژاوا، دەستەکانی هێزی پێنجەمی دەریایی لەگەڵ دەستەکانی سێ سەدو بیست و هەشتی ڤێتنامی باکووری لە جەنگدان. دە نەفەر لێرە کوژراون و چل نەفەریش لەوێ. ئێمەیش وەختە بە هیلاك بچین تا تەلەفۆنێك بۆ (سایگۆن) وەردەگرین و دەنگ و باسەکەیان پێ رادەگەیەنین، ئەوانیش بە هیلاك دەچن تا دەنگ و باسەکە بە پاریس دەگەیەنن. ئەم هەموو ئەزیەت و ئەم هەموو ماندووبوونە لەپای چی؟ هەمووی بۆ ئەوەیە سبەی بەیانی چەند کەسێکی خەواڵوو لە رۆژنامە بخوێننەوە کە پازدە میل دوور لە باکووی رۆژاوا، هێزی دەریایی ...

بەڵام ئاخر ئەمە بە چ کەڵکیان دێ؟هیچ !!

دووبارە دەڵێم ئەمە بە کەڵك هیچ نایە. وەکوو ئەو شتانەی ئەمڕۆ دیمان. وەکوو ئەو شتانەی ئەمڕۆ کردمان، وەکوو هاتنمان بۆ ئێرە ...

لە بەیانییەوە تا ئێستا، ئەمە سێیەم جارە گوێم لێ دەبێ دەڵێن: " کارێکی بێ هوودەیە، بێ بەڵگەوبنەمایە. " سەربازە وردیلەکە وای گوت، فەرماندە وای گوت و ئێستا (دەرك)یش وای گوت. باشە، ئەگەر بێت و قسەیان راست؟ !

ئاسمانی (دانانگ) پڕ ئەستێرەیە و ئاوی کەنداو بە هەزاران تیشك و رووناکی دەبریقێتەوە. هەر دەڵێی چی ئەستێرەی ئاسمان هەیە رژاونەتە ناو ئاو.

لە کاتێکا کە بە غەم و نیگەرانی سەیریان دەکەم، پرسیار لەخۆم دەکەم: ئایا خودا هەیە؟ ئەگەر هەشبێ خودایەکە ... هیچ بایەخ و گرنگی بە ئێمە نادا. بەڵام ئەی بۆچی دروستی کردووین؟ ئایا بۆئەوە دروستی کردووین تا رەنج و ئازار بکێشین؟

بەیانی دەچمە (کی نون). روخسەتم وەرگرتووە بچمە دیدەنی ئۆردووگایەکی زیندانییانی ڤیت کۆنگ. بێ گومان ئەم کارە لە بەرنامەی سەفەرەکەمدا نەبوو، بەڵام ئیتر پەلەم نییە بۆ چوونە (داکتو) و تاقیب کردنی بیرەوەری (پیپ).

راستییەکەی هەستم بە شتێ کردووە، نارەحەتی کردووم: (دەرك) ئێستا پیاوەکەی جاران نییە، ئەو پیاوەی ئاقڵ و میهرەبان و دڵسۆز بوو. جەنگ بە

جۆرێ دایچۆڕاندووە و بەتاڵی کردووە ئیتر تەنانەت ئارەزووی پڕکردنەوەیشی نییە. ئیتر قسەمان ناگاتە یەك.

(١٨) ی مایس

پێنج ئۆردووگای زیندان لە ڤێتنامی باشوور هەیە. زیندانی ژنان و زیندانی پیاوان.بەڵام تەنیا لە یەکێ لەم زیندانانە ژن ژمارەیان لە پیاوان زیاترە. ئەویش زیندانی (کی نون)ە. چوار سەدو بیست و نۆ زیندانی ژن و سێ سەد زیندانی پیاو. هەندێکیان لەکاتی شەڕ گیراون و هەندێکیان بە هۆی جۆراو جۆری ترەوە. بەهەر حاڵ، تا کۆتایی جەنگ هەر بە زیندانی دەمێننەوە. هەژدە ساڵی و بیست ساڵی. گەنجێتییان لە پشت تەلبەندی زیندان بەسەر دەچێ و فەرماندە (کوك)ی سەرۆکی ئۆردووگا، جگە لە گیروگرفتی پەڕۆی تەندروستی هەست بە هیچ شتی تر ناکا.

– ئایا دەزانی، من خاوەن ژنم، بەڵام تا ئێستاش زۆر شت هەیە تێی ناگەم. لە تەمووزی (١٩٦٧)، کە منیان ڕەوانەی ئێرە کرد، ئەفسەر (وانتوك) لەلایەن دەوڵەتی ڤێتنامی باشوورەوە کرابوو بە لێپرسراوی ئێرە، لێی پرسیم چۆن توانیومە گیروگرفتی پەڕۆی تەندروستی (سانتی) چارەسەر بکەم. منیش پرسیم: پەڕۆی تەندروستی یانی چی؟ گوتی: فەرماندە، زیندانییەکانی تۆ ژنن!! باش تەماشای کردم بۆئەوەی بزانێ داخۆ لە مەبەستی گەیشتووم یان نا. گوتم: بەڵێ تێ دەگەم. ئینجا گوتم: باشە پەڕۆی تەندروستی چ پەیوەندی بەمنەوە هەیە؟ گوتی: چۆن چ پەیوەندی بە تۆوە هەیە؟ تۆ لێپرسراوی ئەم ئۆردووگایەی، ژنە زیندانییەکانیش هەموویان عازەبن. هەرە گەورەکەیان تەمەنی سی و سێ ساڵە، هەموو مانگێ پێویستیان بە چوار سەدو بیست و نۆ پاکەتی پەڕۆی تەندروستی هەیە.

– باشە، فەرماندە، ئاخری چت کرد؟

– تەلەفۆنم بۆ (M·C·V) کرد و مەسەلەکەم پێ گوتن. وتیان ئەمە گیروگرفتێکی نوێیەو دەبێ بیری لێ بکەینەوە. بەڵام لەم بارەیەوە هیچ وەڵامیان نەدامەوە. تەلەفۆنم بۆ سەرۆکەکەم کردو مەسەلەکەم پێ گوت. پێکەنی و گوتی من





ئیشم شەڕکردنە، لێپرسراوی کڕینی پەڕۆی تەندروستی ئۆردووی ژنان نیم و تەلەفۆنەکەی بڕی.

پاشان تەلەفۆنم بۆ جەنەراڵ کرد.

– بۆ جەنەراڵ؟

– بەڵێ. هیچ چارەی ترم نەبوو. کەس گوێی لە قسەم نەدەگرت. بە جەنەراڵم گوت: " داوای لێبوردن دەکەم، دەزانی جەنەراڵ، بۆ شتێکی نائاسایی سەخڵەتم کردووی. شتەکە پەیوەندی بە پەڕۆی تەندروستییەوە هەیە ... "

وای ئەگەر دەتزانی بە چ تووڕەییەك وەڵامی دامەوە: " ها؟ پەڕۆی تەندروستی چی؟

" من هیچ خۆم تێك نەدا، گوتم: " پەڕۆی تەندروستی بۆ ژنانی ئۆردووگا، کە مانگی جارێك پێویستیان پێ دەبێ." تەسەوور ناکەی، کەمن ئەم قسەیەم کرد، چ قەوما! هاواری کرد و گوتی: من سەربازم، دەبێ پلانی بارەگای سێ دەستە دابڕێژم، سەربازەکانی من پەڕۆی تەندروستی بەکار ناهێنن، تۆش ئەگەر جارێکی تر بۆ مەسەلەی وا قۆڕ سەخڵەتم بکەی، دەتدەمە دادگا و بەدەرکردنت دەدەم ...

ناچاربووم، خۆم بە تەنیا ئەم گیروگرفتە چارەسەر بکەم ...

– ئاخری گیروگرفتەکەت چارەسەر کرد؟

لە شانازییان دەم و چاوی درەوشایەوە و گوتی:

– هەڵبەت چارەسەرم کرد. سێ حەفتەی خایاند. نامەیەکم بۆ ژنەکەم ناردو داوام لێ کرد چارەیەکم بۆ بدۆزێتەوە. سێ حەفتەی پێ چوو تا وەڵامی هاتەوە. مەسەلەکەم بەو جۆرە چارەسەر کرد کە ژنەکەم بۆی نووسیبووم: لەفافمان لەسەر پەمۆی هیدرۆفیل داناو دامانە ژنە زیندانییەکان! ڕاستی، تۆش پێت وانییە ئەمە چارەسەرێکی زۆر باش بوو؟ ...

ئۆردووگاکە زۆر گەورەیە. کەوتۆتە دەشتێکی وشك وقاقڕو تەلبەندی دڕوو و داریان بە دەورەدا کێشاوە و لەهەر گۆشەیەکا دوو سەربازی دەست بە ڕەشاش وەستاون، پاسەوانی دەکەن.

بەشی ژنان بە تەلبەندی دڕوودار لە بەشی پیاوان جیا کراوەتەوە. بەڵام بەلاش

تەلبەندی دڕووداریان کێشاوە، چونکە ڤێتنامییەکان ئینسانی زۆر پارێزکارو نەجیبن.

تەنیا یەك جار وا رێك کەوت ژنێ ویستی بەسەر تەلەکاندا بپەڕێتەوە و بچێتە بەشی پیاوان، پاشان بۆیان دەرکەوت ویستبووی بچێ لە مێردەکەی بگەڕێ.

– چییان لە ژنەکە کرد، فەرماندە؟

فەرماندە بە توورەیی گوتی:

– پاسەوانان تەقەیان لێ کرد.

ئۆردووگای ژنانیش وەکوو ئۆردووگای پیاوان خانووی داری لێیە. هەر خانوویەك و چل قەرەوێڵەیان لێ داناوە. ناو ژوورەکان زۆر پاك و رێك و پێکە! ژنەکان زۆر پاك و خاوێنن . هەریەکە پانتۆڵێکی رەش و بلووزێکی سووری لەبەرە و هەریەکە کلاوێکی قووچی لەسەرە. دەوری ژوورەکان حەوشێکی گەورەیە، کە دەچنە ناو حەوشە، دەق وەکوو کەروێشکی بەتەلەوە بوو، تۆقاوو حەپەساون. کەس ناتوانێ تخوونیان بکەوێ. من ویستم لێیان نزیك ببمەوە بەلام نەمتوانی. کە منیان دەدی، زریکەیەکیان دەکرد و دەچوونە لایەکی تری حەوشەو لە قوژبنێك دەوەستان و سەریخۆیان لە پشت شانی ژنێکی تر دەشاردەوە، ئەگەر دیسان بمویستایە بچمە دوایان، دووبارە دەچوونەوە ژووری و ئەگەر لە ژوورەوەش بچوومایە دوایان، دووبارە رایان دەکرد بۆ حەوشە. کە ئەفسەر (فوك) ویستی دەستەمۆیان بکا، کێویتر بوون. بە یەکێ لەو کەروێشکانەی گوت: " وەرە ئێرە! "، کەروێشکەکە رای کردو هەلات، خۆی لەپشت دیوار و پاشان لەپشت پەنجەرەیەك شاردەوە. یەك سەعاتمات زیاتر پێ چوو تا سێ کەسمان لێ دەستەمۆ کردن:

ئەگەر دەتزانی کاتێ کە دەیانهێناننە لام، چۆن دەلەرزین! گوێم لە رنگ و هۆڕی دڵیان بوو.

یەکێ لەوانەی دیکە زیاتر تۆقابوو، پێم گوت:

– ئەوە لە من دەترسی؟ منیش وەکوو تۆ ژنم.

گوتی:

– تۆ جلی سەربازیت لەبەرە.





ئەفسەر (فوك) قسەکانی تەرجەمە کرد. وەختێکی زۆر پێوەبوو تا دەستەمۆی کرد و ناوی پرسی:

ناوی (تران تی نونگ) بوو، تەمەنی بیست و دوو ساڵ بوو، لەگەڵ خوشکە بچووکەکەی (تران تی کزە) هاتبووە ئەوێ. هەردووکیان لە (تای نین) دەستگیر کرابوون.

– (نونگ)، بۆچی دەستگیریان کردی؟

– نازانم.

– ڤیت کۆنگ لە گوندەکەتان هەبوون؟

– ئەوان هەندێ جار بۆ خواردن و جل و بەرگ دەهاتنە گوندەکەمان.

–تۆش ئەوەی پێویستیان بوایە، دەتدانێ؟

– بەڵێ، ئەگەر شتێکم هەبایە.

– (نونگ)، تۆ مامە (هو)ت خۆش دەوێ؟

– کێ؟

– سەیرکە، (نونگ)، تۆ باش دەزانی کێ دەڵێم، مەبەستم (هوشی مینە)یە.

– نا، من نایناسم.

– (نونگ) باوەڕ بە قسەت ناکەم.

– من لادێیم، قامیشە شەکر دەچێنم. منیان دەستگیر کرد چونکە ئاوم بە ڤیت کۆنگێك دابوو. هیچی تر نازانم.

– بەلای تۆوە ڤیت کۆنگەکان لە جەنگ دا سەرکەوتوو دەبن؟

– من بە لامەوە هەر هیچ گرنگ نییە داخۆ، ئەوان جەنگەکە دەبەنەوە یان دەیدۆڕێنن. من تاکە هیواو ئارەزووم ئەوەیە جەنگ تەواو ببێ و بتوانم بچم شوێنی ناشتنی (ئەو) بدۆزمەوە.

– شوێنی ناشتنی کێ، (نونگ)؟

– مێردەکەم.

– مێردەکەت کەی و چۆن مرد؟

– ساڵی (١٩٦٠) لەجەنگ کوژرا. تەنیا دوو مانگ بوو زەماوەندمان کردبوو.

– باسی مێردەکەتم بۆ بکە.

– نامەوێ باسی مێردەکەمت بۆ بکەم. تۆ جلی سەربازیت لەبەرە. نامەوێ!

بەدەم گریانەوە، دەم و چاوی، بە کڵاوی قووچی شاردەوە. داوام لە ئەفسەر فوك كرد لوتف بفەرموێ، روخسەتی بدا بگەڕێتەوە ئۆردووگا. دوای ئەو، (تران تی کزە) ی هەڵدایە پێشەوە.

– کزە، دەتەوێ قسە لەگەڵ من بکەی؟

– ئەگەر ئەمریکی نەبیت، قسەت لەگەڵ دەکەم، تۆ ئەمریکی؟

– نەء، کزە، من ئیتاڵیم.

– یانی چی؟

– ئیتاڵیا وڵاتێکی ئەورووپایە، زۆر لێرە دوورە. لە وڵاتەکەی تۆ دەکا، وەکوو ئێرە بچووکە و لەوێش برنج دەچێنن، بەڵام شەڕ ناکەن.

– باشە، قسەت لەگەڵ دەکەم.

– تەمەنت چەند ساڵە، کزە؟

– هەژدە ساڵم، هێشتا شووم نەکردووە. بڕیار بوو حەفتەیەك دوای ئەوەی دەستگیریان کردم، زەماوەند بکەم، جلی بووکێنیشم کردبوو.

– دەزگیرانەکەت لەکوێیە، کزە؟

– نازانم. سەرباز بردیان. ئەوەندەی گریام و هاوارم کرد، هەر بردیان. لەوانەیە لەم ئۆردووگایە بێ. تەنانەت جارێکیان ویستم بانگی بکەم، بەڵام کەس وەڵامی نەدامەوە و پاسەوانەکان خەریك بوون تەقەم لێ بکەن.

– کزە، تۆ ڤیت کۆنگ بووی؟

– نەخێر، من لادێییەکی سادەم و تەواو! بەڵام ڤیت کۆنگەکان داوایان لێ کردم ئەوەی پێیان دەوێ بۆیان ببەم و منیش نەمتوانی بڵێم: نا، ترسام. ئەگەر قسەم رەت بکردنایەوە، تووڕە دەبوون و سزایان دەدام.

– کزە، دایك و باوکت دەزانن تۆ لێرەی؟

– من کەسم نییە. رۆژێ لە ئاقاری هاتمەوە، دیتم دایك و باوکم نەماون. زۆر لێیان گەڕام، نەمدۆزینەوە.





– دەستگیریان کردوون؟

– لەوانەیە. لەوانەیە سەربازەکان لەگەڵ خۆیان بردبن، لەوانەشە ڤیت کۆنگەکان. بەڵام بۆ وایان کردووە؟ دایك و باوکم زۆر پیربوون.

– لە خێزانەکەتان، کێت ماوە، کزە؟

– خوشکم و برایەکی سێزدە ساڵیم. نازانم برام لەکوێیە، چونکە سەرباز خانووەکانیان سووتاند، هەموو خانووەکانیان سووتاند.

– ئەمریکی بوون یان ڤێتنامی؟

– ڤێتنامی بوون.

– کزە، تۆ دەزانی (هوشی مینە) کێیە؟

– نا. زۆر جار ناوم لە دەمی ڤیت کۆنگەکان بیستووە، بەڵام نازانم کێیە، قەت پێیان نەگوتووم کێیە.

سێیەمیان ناوی (ترونگ تی وان) بوو. پاش ئەوەی کە ناوی خۆی گوت، وەکوو بەرد بە بێ دەنگی وەستاو هیچ قسەی نەکرد. زارکردنەوە و بە قسە هێنانی شتێکی زۆر زەحمەت بوو. ئەفسەر (فوك) ناچاربوو بەرەڵڵای کرد. پاشان منی بردە ئۆردووگای پیاوان.

هەندێکیان پێڵاویان لە لاستیکی رزیو دروست دەکرد و هەندێکی تر نەخشی گوڵیان لەسەر قووماشی ئاوریشم دەکرد. نەخشی گوڵێك یان دیمەنێکیان دەدووری و بە هێمنی و کارامەیی دەزووەکەیان بە پەنجە بەم لا و بەولادا رادەکێشا. کابرایەکی قەڵەویان تێدابوو، چاوی لەسەر گوڵ چنینەکەی هەڵنەدەگرت، خەریك بوو گوڵێکی سووری گەورەی لەسەر قوماشی ئاوریشم دە دووری. بە ئافەرین و پیاهەڵدانەوە گوتم: " زۆر جوانە! " وەکوو پڵنگی تووڕە سەری هەڵبڕی و بە سووکی تەماشای کردم. بەدەم سەیرکردنی منەوە گوڵە سوورەکەی فڕێ دایە سەر زەوی. گوڵەکەم هەڵگرتەوە و بۆم راداشت، بەڵام شێوەی سەرنجی نەگۆڕا و گوڵەکەی لێ وەرنەگرتم و هەر لەناو دەستم مایەوە.

جا دەستی پێ کرد ... دەق ئەوکاتە دەستی پێ کرد کە خەریك بووم لە دەرگا دەچوومە دەرەوە. دەنگێکی ژنانە دەستی بە گۆڕانی کرد:

(toi co nguoi yen chet tran pleime toi co nguoi yen o chien phnd ... )

دەنگێکی زۆر خۆش بوو. بە هەواو ئاوازێکی زۆر خۆش وشەکانی دەردەبڕی.

لە ئەفسەر (فوك) م پرسی ئەم گۆرانییە مانای چییە. ئەفسەر ( فۆك ) گوتی:

گۆرانییەکی دڵدارییە: " زۆر جار ژنی زیندانی گۆرانی دەڵێن و پیاوی زیندانی بە گۆرانی وەڵامیان دەدەنەوە. ئەگەر نەختێ چاوەڕێ بکەی، هەر ئەو دێڕە بە دەنگی پیاوێك دەبیسی. "

نەختێ چاوەڕێم کرد و گوێم لێ بوو:

(toi co nguoi yen chet tran pleime toi co nguoi yen o chien phnd ... )

تەسجیلەکەم پێ کردو گۆرانییەکەم تۆمار کردو پاشان وەرمگێڕا. ئەو گۆرانییەی دەیانگوت ئەمەبوو:

ئازیزەکەم لە شەڕی پردی تەم تەمان مرد
ئازیزەکەم لە ناوچەیەکی جەنگی مرد
ئازیزەکەم لە شەڕی (دان سوی) مرد
لە شەڕی (چوب دونگ) مرد، لە (هانۆی) مرد
لە هەڵەتێکی سەر سنوور هەڵدێراو مرد
لەناو مەرەزە مرد، لەناو جەنگەڵی پڕ درەخت مرد
تەرمی لەسەر ئاوەو لە کەنار دووردەکەوێتەوە
تەرمی بۆتە خەڵووز و ڕەهابووە
دڵدارەکەم، تۆشم وەکوو نیشتمانەکەم
هەتاهەتایە خۆش دەوێ.
ڕۆژێ ناوت بە گوێی (با)ی تیژدا دەچپێنم.
بۆئەوەی (با) بە تۆی بگەیەنێ
ناوی من ناوی تۆیە، ئێمە هەردووکمان ڤێتنامین
زمانمان وەکوو ڕەنگی پێستمان یەکە
هەردووکمان گەنجین، لە دەنگی تۆپ ڕاهاتووین،





لە دەنگی تەقینەوەی بۆمبا ڕاهاتووین
لە منداڵییەوە،
لە بیستنی ئەم دەنگانە ڕایانهێناوین
لە بینینی کەلەشی ئەنجن ئەنجن ڕایانهێناوین
فێریان کردوین زمانی مرۆڤایەتی لەبیر بکەین.
ئازیزەکەم لە شەڕی (ئادو) مرد
لەژێر پردێك مرد، لە هەموو شوێنێ مرد
ئەمشەو مرد، ئەمڕۆ مرد، (سبەی) مرد.
لەپڕ و بەبێ چاوەڕوانی مرد
مرد، لەکاتێکا کە دەیزانی دەمرێ.
(هەمیشە) مرد، من بیری لێ دەکەمەوە:
ئایا گوێت لە دەنگمە؟

شەو

لە ئۆردووگای ئاژانسی دەنگ و باسی (کی نون)، وەکوو شاژن پێشوازییان لێ کردم. دەوری یەك مانگ بوو هیچ پەیامنێریان نەدی بوو. پرسیم:

– بۆچی؟ مەگەر لێرە هیچ شتێ روونادا

سەربازێ چێشتی لێ دەنا، گوتی:

– ئوە، بەدی خانم! شت روو دەدا، چۆن روونادا. هەرسێ ڕۆژ پێش ئێستا بوو، ڤیت کۆنگەکان هێرشیان هێنایە سەر ئێرەو سەردەستەیەکیان کوشت، بەڵام ئەگەر هیچ بقەومێ یان نەقەومێ، بۆ پیاوەکانی (سایگون) هەر وەکوو یەك وایە.

ئینجا چەند پرسیارێکی لە بارەی(سایگون) لێ کردم. هەرگیز (سایگون)ی نەدی بوو، (سایگون)ی بەلاوە زۆر دوور بوو " لە پاریس دوورتربوو. "

– بەڵام ئایا پاریس هەیە؟

ئەو فڕۆکەوانەی کلاوی لەبن هەنگڵی نابوو، گوتی:

– ئەمە چ پرسیارێکە؟ ئەی ئەوەنییە خەریکن لەوێ (ئاشتی) ئامادە دەکەن.

– چ ئامادە دەکەن؟

– ئاشتی.

– ئێستا لە پاریس سەعات چەندە؟

– راوەستە با حیساب بکەم جەناب. حەفت شەشی لێ بڕوا ... ئێستا سەعات یەکی دوای نیوەڕۆیە.

– من ئێستا پێت دەڵێم: ئێستا ئەوان خەریکن لە پاریس چ شتێ ئامادە دەکەن. ئەوان خەریکن فراوین ئامادە دەکەن.

– یاخوا ئەوانە لە زۆر خۆری بمرن، جەناب!!

– یاخوا تووشی ئەنفارکتوس بن، یاخوا بە ئەنفارکتوس بمرن!!

– زۆر راستە جەناب.

ئینجا فرۆکەوانەکە داوای بیرەیەکی کرد. دانیشت و خۆی ناساند: فەرماندە (ملتون) نازانم چی و چی!! پێی گوتم دەیەوی بچێتە (پلیکۆ) و گوتیشی ئایا باشتر نییە من سوود لەم دەرفەتە وەربگرم و لەگەڵی بچم!

پێم گوت: " نەء، سوپاست دەکەم. من سبەی بەیانی بە فرۆکەی بار دەچم.

بەم وەڵامە دەمکوتم کردو لە جێی خۆی دامنیشاند. ئێستا گوێم لە گۆرانی زیندانییان گرتووە ...

پاسکال دەڵێ گەورەیی ئینسان بەو بەدبەختییانەیە کە پێیان دەزانێ. درەخت هەست بە بەدبەختی خۆی ناکا، تەنیا بەشەر بەدبەختە،چونکە بەبێ زانین و ئاگاداری، ناتوانین بەدبەخت بین.

<u>(١٩) ی مایس</u>

تا سبەینێ ناتوانین بچینە (داکتۆ). هیلیکۆپتەر نییە. زۆربەی هیلیکۆپتەرەکانیان بەرداوەتەوە. ئێستا من بە ناچاری لە (پلیکۆ) ماومەتەوە. (دەرک) و پسمامەکەیشم بینی. دەرک هێشتا هەر غەمبارە و پسمامەکەی هێشتا هەر شاد و بەکەیفە: جەنگ لە سەرەتادا چەند خاپینۆك دەکەوێتە بەرچاو!! ئەم دواکەوتنە خێری تێدابوو بۆ دەرك. دەچێتە سەردانی گوندێکی کوێستانی. منیش لەگەڵی دەچم.

ئای خەڵکی ئەم کوێستانە چەند بە ئاسوودەیی و خۆشحاڵی دەژین! پێش





هاتنی ڤێتنامییەکان، کە پێیان دەگوتن کێوی، بە ماسیگری و راوو بێ ئازاردانی هیچ کەس، لەم گوندەدا دەژیان. دەشکرێ لە رووبەکەوە پێیان بگوترێ کێوی چونکە رووت و قووتن، بە نێزە ڕاو دەکەن و مانای نیشتمان نازانن. بێگانە لای ئەوان ئەو کەسەیە کە بچێتە ناو جەنگەڵەکەیان و کەروێشکەکانیان بترسێنێ، یان بەلەمرانی لە رووبارێکیان بکا و ئالاّ سوورەکانیان بشێوێنێ. کەس بە خەیاڵیدا نەدەهات ئەمانەش تێکەڵ جەنگ بن و بە ناچاری تووشی کوشتن ببن. ئەویش تەنیا بۆ ئەوەیخۆشی لە کوشتن وەربگرن ، نەك لەبەر پێویستی، یان بۆ بەرگری کردن. ئەمانە تەنانەت لەگەڵ بێگانانیش نەرم بوون. پەلاماری شیناییکەرە فرەنسییەکانیان نەدەدا کە بۆ دەناوهێنانی قاوە و نەیشەکەر ئیشیان پێ دەکردن.

تەنانەت رەفتاریان لەگەڵ ئەو قەشانەش باش بوو کە لەباتی دوعای (ئاو) و (باران) فێری دوعای (مریەم) و (عیسا) یان دەکردن، بگرە هەقیان بەو سەربازانەش نەبوو کە هاتبوونە ئەوێ و بەبێ ئەگەر تەقەیان دەکرد و گوللەیان دەهاویشت. زۆربەیان دەمردن بێ ئەوەی هۆی مردنەکەیان بزانن.

لە مانگی کانوونی یەکەمی رابردوو، گوندێ بە ناوی (داك سون) بە سارووخی نووربەخش و شەستیر لەگەڵ خاك تەخت و یەکسان کرا، تەنیا پێنج شەش ژن قوتار بوون کە خۆیان لە قۆرتێك شاردبووەوە.

ئەوانەی پەلاماریان دان کێ بوون؟

ئەوان خۆشیان نەیاندەزانی. ڤێتنامی باشوورییەکان ڤیت کۆنگەکانیان تاوانبار دەکرد و ڤیت کۆنگەکانیش ڤێتنامییە باشوورییەکانیان تاوانبار دەکرد.

ئەوانەی مابوونەوە دەیانگوت: سەربازەکان جلی سەوزیان لەبەر بوو. ڤیت کۆنگەکان جلی سەوزیان نییە، ڤێتنامییە باشوورییەکان جلیان سەوزە.

<u>دوای نیوەڕۆ</u>

ئەم ناوچەیە ناوی (پلشتەیە) و کەوتۆتە سەر بانوویەکی بەرزو پڕ ڤیت کۆنگە. رێگایەکی باریکی بۆ دەچێ کە بەو رێیەدا دەڕۆین هەمیشە چاوەڕێی بیستنی دەنگی گوللەیەك یان تەقینەوەیەك دەکەین.

یەك سوپا زۆر بە ئاسوودەیی دەتوانێ لە پشت درەختەکان یان لەناو دەشتی

قامیشی شەکردا خۆی بشارێتەوە. زۆرم پێ خۆش بوو کە (دەرك) بە هێمنییەکی تایبەتی ئینگلیزانە ئەم رستەیەی دەربڕی:

" دیمەنێکی چەند جوانە! لات وانییە ئەم دیمەنە (کۆرن وۆل)[4] بە بیر ئینسان دێنێتەوە؟

یەك سەعات زەحمەت و مشەققەتمان کێشا، تا خۆمان گەیاندە ئەوێ. ئێستا تەلبەندی دڕوودارمان لێ دیارە کە بە دەوری (پلشتە)دا کێشاویانە. (پلشتە) گوندێکی زۆر گەورەیە.

(دەرك) پرسی:

– ئەم تەلبەندە دڕووداره، بیرۆکەی کێ بووە؟

ئەمریکییەکەی یاوەرمان، زۆر بە شانازییەوە گوتی:

– هی ئێمە، ئا! هی ئێمە بوو! یەکسەر دوای ئاژاوەی (تەت)، ئەم کوێستانییە کلۆڵانە قەرزاری ڤیت کۆنگەکان بوون و بۆ ئەوەی بتوانین چاوەدێرییان بکەین و بیانکەینە لای خۆمان، بیرمان کردەوە واباشە لە گوندەکانیان دەریان بێنین و هەموویان لە میرەدێی پلشتە دابمەزرێنین.

تا ئێستا لەم ناوچەیەدا، توانیومانە لە شەست و شەش گوند، پەنجاو هەشت گوند بگوازینەوە.

بێ گومان ئەم شوێنە، ئێستا گوند نییە، پڕە لە خانووی شوورەدار، خانووەکانیان هێشتا هەر خانووی خۆیانە. بەڵێ، خانووەکانیان دارن و لەسەر ئەستوندە دروست کراون و ئەستوندەکان چونەتە ناو ئاوو بە نەردەوانە دەچنە ناو خانووەکان. بەڵام خانووەکانیان وەکوو خانووی سەربازی ئۆردووگا لەتەك یەك و بەشێوەی تەریب هەڵبەستووە، تەنانەت یەك درەختیشیان لە نزیکەوە نییەو بەلای ئەوانیشەوە خانووی بێ درەخت وەکوو خانووی بێ خودا وایە.

(دەرك)پرسی:

---

[4] پارێزگایەکە لە باشووری ڕۆژئاوای ئینگلتەرە، : :
conwall زۆربەی کەنارەکانی بەردەڵانە و دیمەنەکانی زۆر جوانە.





– بێ هیچ ناڕەزاییەك ئەم ڕاگوێزانەیان قبووڵ کرد؟

– بێ گومان ئیشەکە لە سەرەتادا، زەحمەت بوو، تێ گەیشتی؟ دەبوایە هەوڵ بدەین کەرامەتیان بریندار نەکەین، خوو ڕەوشتی خۆیان لێ قەدەغە نەکەین، زۆر بە هێمنی و بە هێواشی شارستانییان پێشان بدەین تەنانەت بێ ئەوەی هەست بکەن کە ئێمە چاکەی ئەوانمان دەوێ. ئێستا وردە وردە دەستیان پێ کردووە فێری ئینگلیزی دەبن.

ژمارەیەکیان بە ترسەوە لەم خانووە بێ خودایانەدا دەژین و ئێستاش هەر وەکوو جاران خۆیان بە قەرزاری ڤیت کۆنگەکان دەزانن، چونکە ئەو ژمارە ئەمریکییەی لەوێن، بەس نین.

(پلشتە) گەورەترین گوندی پارێزکارە، دە، دوازدە ئەمریکی تێدا دەژی، ئەنجامی ئەم کارەش بۆ ئەم کوێستانییە کلۆڵانە، بە یارییەکی دیپلۆماسی دەشکێتەوە کە بەزۆری بە دوژمندارییی یەکتر، یان بە کوشتن کۆتایی دێ.

(دەرك) پرسی:

– ئایا ئینگلیزی فێربوونی ئەمانە، بەشێکە لە بەرنامەی ستراتیجی ئێوە؟!

ئەمریکییەکە گوتی:

– وا چاکە بڵێین بەشێکە لە شاکاری شارستانێتی ئێمە.

ئاوازی قسەکردنەکەی تەواو میهرەبان و دۆستانەبوو. ئەوەندە بڕوای بە کارەکانی بوو، ئامادەبوو تەنانەت خۆی بۆ جێ بە جێ کردنی فیدا بکا، دەق وەکوو قەشەیەکی مزگێنیدەر!

پاشان بە زەردەخەنەیەکی شادی، گوتی:

– سەیرکەن، چەند زوو فێری ئینگلیزی بوونە. ئینجا چووە لای کوڕێکی بچکۆلە، کە بنێشتی دەجوی، و گوتی:

– How do you do? (چۆنی؟)

کوڕیژگەکە گوتی

– very good ! (زۆر باشم!)

– Beautiful day ,to day ! (ئەمڕۆ ڕۆژێکی خۆشە!)

- ! very fulBeaut  day (رۆژێکی زۆر خۆشە!)

بەناو تەلبەندە دڕووداره‌کاندا تێپەڕین و چووینە ناو جەرگەی جەنگەڵ. ئەم مزگینیدەرانە، ئاوپڕژ(دوش)ێکیان لە نزیك تاڤگەیەك دروست کردووە کە سەردەمێ ئەم بەهەشتەی سەر رووی زەوی ئاو دەدا. دەوری بیست منداڵی بچووکی کوێستانی بەرامبەر ئاوپڕژەکە ریزیان بەستبوو بۆئەوەی لە فەرماندەی تەندروستی رۆژاوایی فێری خۆشووشتن بن.

فێر کردنی خۆ شووشتنەکە بە عەریفێکی پێست رەش سپاردرابوو کە بە جۆرێ سابوونی بەدەستەوە گرتبوو هەر دەتگوت ئینجیلە بە دەستییەوە.

- (... ! This is The soap ) (ئەمە سابوونەکەیە!)

منداڵەکانیش بەیەك دەنگ دەیانگوت:

- (!soap) (سابوون)

- (! Now , you get  whashed) (ئێستا خۆتان بشۆن!)

منداڵەکان بەیەك دەنگ دەیانگوت:

- (! Wash) (بشۆن).

ئینجا یەك لە دوای یەك چوونە ژێر ئاوپڕژەکە و خۆیان شووشت، بەڵام هەمیشە سابوونیان لەدەست دەخزی و سەردەستەکە بەبێ ئۆقرەیی دەیگوت:

- ! And keep it strong , neddam (توند بیگرن، لەعنەتینە!)

یان دەیگوت:

- Gee how, hard it is to bring
civilazation to these damned monkyes !

(هێ ی! چەند زەحمەتە تا ئەو مەیموونە لەعنەتییانە فێری شارستانێتی دەکەی!)

دەق لەو کاتەدا کە ئەو قسەیەی دەکرد، منداڵێك پێی لەسەر سابوون خزی و بەربووەوە سەری شکا. لەگەڵتام، بەختی یار نەبوو، بەڵام بەهەر حاڵ، کە ئەمریکییەك سابوونت بداتێ، بێ شك تۆ لەسەری دەخزی و سەرت دەشکێ. بۆچی؟ چونکە ئەمریکی ئاوها دروست بوونە. کاتێ کە لە ڤێتنام دەیانبینم (ئایا





تەنیا هەر لە ڤێتنام)، ئەو چیرۆکە گاڵتەجاڕەم بیردەکەوێتەوە کە (فرانسوا) بۆی باس کردم.

چیرۆکەکەش ئەمەیە:

ماڵێکی ئەمریکی بڕیاریان دا ماوەی پشوویان لە خاکی پیرۆز بەسەر بەرن و دەق ئەوکاتە گەیشتنە ئەوێ کە (پونس پیلات) عیسای دادگایی دەکرد. لەپڕ ماڵە ئەمریکییەکە کەوتنە ژێر کاریگەری کابرای ئارامی کە هیچ بەرگری لە خۆی نەدەکرد، کەچی ئەوانی دیکە بەشێوەیەکی دڕندانە رەفتاریان لەگەڵ دەکرد، ماڵە ئەمریکییەکە، کە ئەم دیمەنەیان بینی سکیان بە کابرا سووتا و یەکسەر تەلەفۆنیان بۆ وەکیلەکەیان کرد و پێیان گوت  بەهەر جۆرێ بێ، یەکسەر سواری فڕۆکە بێ و بێ بەرگری لەو پیاوە جوامێرە بکا، گوتیان سەفەرەکە هەرچەندی تێ چوو گرنگ نییە: دە هەزار دۆلار، یەك ملیۆن دۆلار گرنگ نییە. تا سەعات سێی دوای نیوەڕۆ، وەکیل هێشتا نەگەیشتبوو. کوڕە بچکۆڵەکەی ماڵەکە بەپەنجە ئاماژەی بۆ سەر تەپۆلکەکە کردو هاواری کرد: " بابە، دایە، سەیرکەن چییان لەو پیاوە خاسە کردووە؟! "

مەسیح لە خاچ درابوو. ماڵە ئەمریکییەکە بەوپەڕی دڵسۆزی و میهرەبانی رایان کرد، بەسەر تەپۆلکەکە کەوتن و خۆیان گەیاندە خاچەکە. ئینجا نەردەوانەیەك و پلایزێکیان هێنا. کە بە نەردەوانەکەدا هەڵدەگەڕان دەیانگوت: " جەناب، وا هاتین! هاتین! "

بە پلایز میخی دەستی راستی مەسیحیان دەرهێنا، پاشان مێخی دەستی چەپیشیان دەرهێنا، ئەوسا مەسیح بەرەو پێش چەمایەوە و بە پێیەکانی بە خاچەکەدا شۆڕبووەوە.

ئەمریکی ئاوهان! دەمەوێ بڵێم ئەمریکی ئینسانی بەدخوو نین، یان بەلانی کەمەوە هەمیشە بەدخوو نین، بەڵام نەشارەزان!

<u>شەو</u>

ئەو فڕۆکەوانەی لە (کی نون) دیم، ئەو (ملتون) نازانم چی و چی یە، لێرە دووبارە دیمەوە. گوڕاحی زۆر خۆش بوو، چاکەت و پانتۆڵێکی شینی لەبەر

کردبوو. داوەتی کردم بۆئەوەی بە یەکەوە شێوی ئێوارە لە یانەی ئەفسەرانی (پلیکۆ)، بخۆین، بۆ نا؟

ئێستا وا لەگەڵ (ملتون) لە چێشتخانەم. هەست دەکەم بە هەموو ئەفسەرەکانی گوتووە کە ئەم شەو ژوانی لەگەڵ کچێك هەیەو بە هەموویانی گوتووە تا سبەی بەیانی سەخڵەتی نەکەن. بە دەیان چاو تەماشام دەکەن و دەیان دەست پێك دەکەون: " ئەها، ئەمە کچەکە خۆیەتی، دۆستەکەی (ملتۆن)ە! ". لەسەر مێزێکی درێژ دانیشتین، تازە خەریك بووین جێی خۆمان خۆش دەکرد کە لەسەر مێزەکە چاوم بە تێبینییەك کەوت (ملتۆن) بۆ هاوژوورەکەی نووسی بوو. نووسیبووی: ئەمشەو تۆ لە جێگایەکی تر بخەوە و ژوورەکە بۆ من چۆڵ کە.

کە (ملتون) هەستی کرد من تێبینییەکەم دی و خوێندمەوە، لە شەرمان سوور هەڵگەڕا، لەژێر لێوەوە منگە منگێکی کرد، وەخت بوو لە ناڕەحەتییان بگریە! خودایە، ئەمشەو شەوێکی چەند سەخت و قوڕە! تیپێکی بچووکی ئۆرکسترای کووری، لە ئاخری هۆڵەکە سەرقاڵی لێدانی ئاوازی ڕۆژاواییین.

ئەوانیش بە ڕێ و ڕەسمی نوێی شارستانێتی مزگێنیدەران پەروەردە کراون:

" وا هاتین، جەناب، هاتین! "

- Beautiful day to day !

- This is the soap !

- soap !

- Now ,you get washed !

- Wash !

- " وا هاتین، جەناب، هاتین! "

تووتییە کوورییەکان باڵیان لێك دەداو دەیانگوت:

(whipped cream !! .. whipped cream !)

بەڵام لەپڕ، ئۆرکسترا لە گۆرانی وەستا، دووسەد فڕۆکەوان هەستانەوە سەر پێ، بادەی بیرەیان هەڵدا و دونیا پڕ هاواری شادی بوو:

- بە سەلامەتی (دیك)! با هەموو بە سەلامەتی (دیك) بنۆشین! (دیك)!هیپ هیپ،





هوڕڕا!

ئینجا هەر بەو جۆرەی کە سەریان بەرەو دواوە بردبوو، تا دوا دڵۆپ بیرەکەیان هەڵقوڕاند و پێکەنین، زۆر پێکەنین.

- ئەم (دیك)ە کێیە؟ یەکێکە لە خۆتان؟

(ملتون) گوتی:

- بەڵێ.

- ئەمڕۆ، ڕۆژی لەدایکبوونیەتی؟

- نەخێر.

- بە ئیجازە دەچێ؟ ئەرکی لە ڤێتنام تەواوبووە؟

- نەخێر.

- باشە، ئەی بۆچی بە سەلامەتی ئەو نۆشیتان؟

- بە یادی ئەو نۆشمان کرد.

- بۆچی؟

- چونکە ئەمڕۆ بەیانی فڕۆکەکەی سەرەنگون بوو و مرد!

هەندێ جار ناشیرینترین پیاو دەزانێ چۆن خۆی جوان بکا. ئەگەر بڕوام بەم قسەیە نەبوایە، ئەمشەو بەوپەڕی نائومێدی دەخەوتم. جا گوێ بگرە (ملتون) دوای شێو، چی کرد:

کە شێو تەواو بوو، ویستی بەوانی دیکە پێشان بدا کە خەریکە لەگەڵ من دەچێتە دەرەوە. منیش بڕیارم دا ڕسوای نەکەم. من بەلامەوە گرنگ نەبوو ئەوان وا تێ بگەن ئێمە دەچین بۆئەوەی بە یەکەوە بخەوین. لەناو پستە پستی خەڵکەکە لە هۆڵەکە هاتینە دەرێ. کە گەیشتینە دەرەوە، داوام لێ کرد یەکسەر بمباتەوە ئۆردوگاکەم: ئیتر یارییەکە کۆتایی هات، بەڵام ئەو، کە نەیدەزانی لە شەرمەزارییان چ بکا، هەوڵی دا بە هەر جۆرێ بێ دڵم چاك بکاتەوە ، ئەوەبوو بە هێدی گوتی:

- پێت خۆشە، بە فڕۆکەکەی من گەشتێك بەسەر (داکتو)دا بکەین؟

بیری لێ بکەوە، من شتی وام چەند پێ خۆش بوو!! ئەگەر بمبا، لێی دەبوورم.

سواری جیب بووین و چووین گەیشتینە ناو گۆڕەپانی فڕۆکەخانە. چووینە تەك فڕۆکەکەی. فڕۆکەیەکی ناسراو بوو، (bird –dog، ئیکتیشافی) بوو، ئەوانەی شوێنی دوژمن بۆ بۆمبا باران دەست نیشان و ئامادە دەکەن و دوای بۆمبا بارانیش دەگەڕێنەوە بزانن داخۆ بۆمباکان باش پێکاویانە، یان نا؟

ئەمانە ئیشەکەیان پڕ مەترسییە، چونکە دەبێ زۆر نزم ببنەوە و بەیەك گوللە سەرەنگون دەبن.

دوو تەکنیکار بەرەو ئێمە رایان دەکرد، (ملتون) پێی گوتن:

– وس! بەکەس نەڵێن! هەر ئێستا دەگەڕێمەوە.

– ئاخر جەناب، ئاخر فەرماندە!

– وس! بڕۆن، بڕۆن!

منیش گوتم:

– فەرماندە، بۆی هەیە ئەوانە ئیشێکی گرنگیان بە ئێمە هەبێ!

– نا، نا! گەلۆرینە، سکتر بن، دەمتان بگرن!

(ملتون) سواری فڕۆکەکە بوو، من لە پشت دەزگای دێدەوانی دانیشتم.

کلاوخوودەمان لەسەر نا، کەمەر بەندمان بەست، بیرمان لە چەتری رزگاری نەکردەوە. مەکینەکان کەوتنە ئیش و فڕۆکەکە ئامادەبوو بۆ فڕین. لەبەر رووناکی لایت دوو تەکنیکارەکەمان دی تەماشای ئێمەیان دەکرد و بە نائومێدی دەستیان دەجوولاند و سەریان بادەدا، بەڵام (ملتون) هیچ بایەخی پێ نەدان:

"shut up fuclcing idiots ! I like a ride with my girl ! ".

(سکتربن هەی گەلۆری لەعنەتینە، من دەمەوێ لەگەڵ کچە برادەرەکەما گەشتێ بکەم!)

فڕۆکەکە بڵند بوو، لە بەرزایی دوو هەزار مەتر بەرەو (داکتۆ) رۆیشتین! ئینجا دەنگی (ملتون) گوێی کاس کردم: دەنگی لە مایکرۆفی کلاوخوودەکەوە دەهات.

– من! ... وای خودایە ... گوێت لەدەنگی منە؟

– بەڵێ فەرماندە ... چ بووە؟

– من! ... وای خودایە ... مەترسە ...





– بۆچی بترسم، فەرماندە؟

– چونکە ...

– بۆچی هیچ بووە، فەرماندە؟

– کورسییەکەم، خودایە! کورسییەکەم لە شوێنی خۆی نەچەسپاوە. دەجووڵێ. دەلەقێ، یا مەسیحی پیرۆز! فڕۆکەم پێ بەرزەفت نابێ.

– باشە، با بگەڕێینەوە، فەرماندە.

– ناتوانم.

– فەرماندە، هێمن بە!

من کە گۆرانی ترس دەڵێم، من کە لە ترسدا دەژیم، من کە ترس دەخولقێنم، من کە خۆم لە ترس دەدەم، ئێستا دەبێ داوا لەم گەلۆرە بکەم هێمن بێتەوە. بەراستی شتێکی سەیرە! بۆئەوەی لەناوم نەبا، نازانم چ بکەم:

خیانەتی خودانی تەکنیك! ئەم مزگێنیدەرانە ئیتر نازانن چ بە دەست و مێکشیان بکەن. (ملتون) کورسییەکەی پاڵدا، جووڵاندی، بڵندی کرد، فڕۆکەکەش وەکوو زەنگە سوورە شێت ببوو: بەرز دەبووەوە و دەهاتە خوارێ، بەدەوری خۆی دا دەخولایەوە و بەشێوەی ستوونی بەرز دەبووەوە.

چ دەبێ ئەگەر (سان کریستۆف)، فریای منی کافر بکەوێ!

بە پاڕانەوە گوتم:

– (سان کریستۆف)!

(ملتون) گوتی:

– چت گوت؟ پرسیم چت گوت؟

– (سان کریستۆف)!

ئاخری کورسییەکە کەوتە جێی خۆی و بەرەو (داکتۆ) رۆیشتین. لەوێ سارووخ باران بوو. پاشان وەکوو ئەوەی دەرزییەکی گەرمم لە گوێ رابکەن، ئاوها دووبارە دەنگی ناخۆشی هات:

– ئۆی، خودایە!

– فەرماندە، دیسان چ بووە؟

– کاربۆران خەریکە تەواو دەبێ.

– لەوانەیە ئەو دوو گەلۆرەش ویستبێتیان هەر وابڵێن.

– مە ... مە ... تر ...سە ... مەترسە!

– جارێ، تۆ خۆت مەترسە و زوو بمگەڕێنەوە! چاوەڕێی چ دەکەی!؟

تووڕە ببووم، وای چەند تووڕە ببووم! چی جوێنم دەزانی حەواڵەم کرد و کە لەسەر زەوی نیشتین، ئاخر دڵۆپە کاربۆران بوو بە هەڵم و هیچ نەما، هێشتا هەر تووڕە بووم.

دوو تەکنیکارەکە رایان کردە لامان و هاواریان کرد:

– ئاه! نەجاتتان بوو! فەرماندە، ویستمان پێت بڵێین، ویستمان پێت بڵێین تانکی کاربورانی تیدا نییە.

ئاخر ئەمریکی بە زۆری ئاوهان!

<u>(٢٠) ی مایس</u>

دیسان وا لە (داکتۆ)م. گەرد و گۆڵی بەیانی بوو کە گەیشتمە ئەوێ، نارەحەت بووم. لە (داکتۆ) بوو کە یەکەم جار جەنگم ناسی. تشرینی دووەم بوو، هێشتا هیچ شەڕم نەدی بوو. ئەم تێبینییەی (فرانسوا)م لە گیرفانی جلی سەربازی دا بوو: " مەترسە! ". بێ گومان نەمدەویست بترسم، بەلاّم سەرەڕای ئەمەش نەمدەتوانی رێ لە ترسانی خۆم بگرم.

هەر لەبەر ئەوەش چاوم بە جۆرێ لە قەپێلك دەرهاتبوو، دەزانم قەت جارێکی دی هەرگیزاو هەرگیز وایان لێ نایە. هەموو شوێنێکم لە بیرە: تەپۆڵکەکان، رووبارەکە، گۆڕەپانی فرۆکەخانە، خانووە دارەکان، هەرچەندە خانووەکان نەختێ گۆڕاون: بۆنموونە چادری پەیامنێران گەورەتر بووە و لە پەناگەیەك هەڵیان داوە. بەلاّم جەنەراڵ (پیرز) لەوێ نەماوە، هەروەها ئەفسەرە دەم و چاو مشکانییەکەش. (نورمن) و (باب)یش لەوێ نەماون.

لەوانەیە کوژرابن و لەوانەشە گەڕابنەوە نیشتمانی خۆیان. (نورمن)ی پێست رەش دەبوایە لە کانوونی دووەم بگەڕابایەوە ماڵێ، (باب)ی قژ زەردیش دەبوایە لە نیسان بگەڕابایەوە ماڵێ. لەو هەموو دەم و چاوانەی کە لە مێشکم ماون و تا





بیست ساڵی تر دەتوانم بیانناسمەوە، تەنیا گەنجێکم بینی کە بەیانی رۆژی (٢٣)ی تشرینی دووەم هێرشی کردە سەر تەپۆلکەی (٨٧٥). پشتی بە دیوارێکی فەردە قوم دادابوو، دەیەویست نینۆکی بە ددان بقرتێنێ بەلاّم دەستی ئەوەندە دەلەرزی ددانی لە نینۆکی گیر نەدەبوو و لەبەر ئەو لەرزینە تەقە تەقی پێك کەوتنی نینۆکەکان و چەقە چەقی پێك کەوتنی ددانەکانی دەهات.

– سەلام سەرباز! منت لە بیرە؟ دەمناسیتەوە؟

– بەڵێ.

– ناوت؟

– (ئالن).

– بەڵێ، راستە (ئالن). تۆ سواری ئەو هیلیکۆپتەرە بووی کە چووە ئەو هەورازە.

– هم.

– چووە سەر تەپۆلکەی (٨٧٥).

– هم.

– ئاخر پێنج شەممەی تشرینی دووەم بوو، لە بیرتە؟

– نینۆکی خۆی بەرنەدا، بەلاّم دەستی چەپی لەژێر رانی راستی شاردەوە، رەنگە بۆئەوەی بێ من هەست بە لەرزینی نەکەم، ئینجا بە سووکایەتی و بە منگە منگ گوتی:

– پف!

– (ئالن)، تۆ بۆچی ئەوەندە دەلەرزی؟ سەرماتە؟

– نا.

– (تا)ت لێیە؟

– نا. هی ئەعسابمە، بەس هی ئەعسابمە.

– چوویتە لای دختۆر؟

– بەڵێ، بەلاّم دختۆر گوتی شتێکی گرنگ نییە. هی ترسی زۆرە، تەواو!

– کێی تر لێرە ماوە؟

– نازانم، بەڵام من هێشتا لێرەم.

– لانی کەم نەکوژراوی، نەجاتت بووە.

– نەجات؟ چوار مانگی ترم ماوە، چوار!!

لەرزینی دەستی زیاتر بوو، جگەرەیەکم دایە بۆئەوەی چیتر نینۆکی خۆی نەقرتێنێ. ئاخیری دەستی لەسەر دەم و چاوی لابرد. دەم و چاوێکی زۆر جوان و ناسکی هەبوو، بەڵام ئەوەندە پیس بوو، هی ئەوە نەبوو تەماشا بکەی. چڵمی وشکی لە کونە لووتەکانی شۆڕببووەوە، ئێستا بە بیرم دێتەوە چاوەکانیشی پڕ ریپۆق بوون.

– دەبینی، هەموو شتێ بە خێرو خۆشی تەواو دەبێ. تۆش دەگەڕێیتەوە ماڵی خۆت و تەپۆلکەی (٨٧٥) لە بیر دەکەی.

– ئوە! لەو تەپۆلکەش خراپترمان دیوە!

– لێرە؟

– نا، لە سنووری کەمبۆدیا. (١٠) و (١١) کانوونی یەکەم. لەوێ تووشی ئەم لەرزۆکییە بووم. کڵاوخوودەکەمم بزر کردبوو. ئەوەندەی گەڕام و نەمدۆزییەوە، لەناکاو تووشی هێرش بووم. شوکر بۆ خودا ئەفسەرەکە بریندار بوو. ئەوەبوو توانیم کڵاوخوودەکەی ئەو لەسەر بنێم و حاڵم باشتر بوو. بەڵام لەرزینەکەم هەر بەردەوام بوو. جاری دواتر، لەرزینەکەم دوو چەندانی لێ هات. دەزانی؟ (٢٥)ی کانوونی دووەم دەڵێم. لە تۆپخانە. (کامپێل)یش لەوێ کوژرا. (کامپێل)ت لە بیرە؟ وانییە؟

کامپێل)م هیچ لەبیر نەبوو.(

– (کامپێل)ی هاوپۆلم، ئەوەی لە جۆرجیا ماڵیان لە شینایییەکی نزیک ماڵی ئێمە بوو، بە بیرت نایەتەوە؟

(کامپێل) حەڤدە رۆژ پێش دووی کانوونی دووەم هاتبووە ئێرە، بۆیە نەمدی بوو. بەڵام نەمتوانی پێی بڵێم کامپێلم نەناسیوە، چونکە وەك ئەوە وابوو زللەیەکی لێ بدەم.

– بەڵێ، بەڵێ، ئەوە بە بیرم هاتەوە!





– کێ هەیە (کامپێل)ی لەبیر نەبێ!! (کامپێل) (کامپێل) بوو!! یەکەم کەس بوو بە شەستێر کوژرا. گوللەی بە سەری کەوتبوو. تا ئەو رۆژە هەرگیز نەچووبووە شەڕ، من هەمیشە پێم دەگوت: " (کامپێل) کڵاوخوودەکەت بزر نەکەی! " بەڵام بزری کرد، چونکە داوەکەی نەبەستبوو و پاشان من ... هەستم کرد ... هەستم کرد ... دەزانی؟ لەکاتی جەنگا زۆر دوعا دەکەی، گوللە داوێی و دوعا دەکەی، دوعا دەکەی و گوللە داوێی، تەنانەت ئەگەر نەشبینی گوللە بە چ شتێکەوە دەنێی. من لە سەری بێ کڵاوی (کامپێل) بەولاوە هیچی ترم نەدەدی، لەگەڵ ئەوەشدا گوللەم لە درەختەکان دەگرت.

نازانم کەسم کوشت یان نا. چونکە خۆت دەزانی کە دەستیان لێ بدەین، هیچ هەستیان لێوە نایەو تێ ناگەین داخۆ مردوون یان نا. باوەڕ بە قسەم دەکەی؟

– بەڵێ، مادام تۆ وادەڵێی باوەڕ دەکەم.

– جگەرە نیوەکراوەکەی فڕێ داو گوتی:

– من بۆیە ئەوە دەڵێم چونکە راستە، ئەوان هیچ هاوار ناکەن، متەقیان لێوە نایە. نازانم ئەوە چۆن دەتوانن؟ جێی ستایشن. چونکە ئێمە هەر کەمێ بریندار بین، هات و هاوارمان دەگاتە ئاسمان. تەنیا (کامپێل) نەبێ کە تەنانەت هاواریشی نەکرد. چونکە بە گوللەی یەکەم مرد. دەتەوێ شتێکت پێ بڵێم؟

– شتی چی؟

– هیوادارم کەسم نەکوشتبێ، تەنانەت ئەو کەسەش کە (کامپێل)ی کوشتووە. سەبرکە، باشتر بۆت باس بکەم. لێرە هەموو ئەم قسەیە دەکەن:

" تۆ برادەری منت کوشتووە، منیش تۆ دەکوژم! "

ئیتر دەیانکوژن، پاشان برادەری ئەو کەسەی کە تۆ کوشتووتە دەڵێ:

" لەبەر ئەوەی تۆ برادەری منت کوشتووە، منیش تۆ دەکوژم. "

بەم جۆرە ئەویش تۆ دەتکوژێ.

ئەم کارە ئاوها بەردەوام دەبێ و هەرگیز کۆتایی نایە. راستی، پێم بڵێ بزانم: ئەم ئیشانە بە کەڵك چی دێن؟ ئایا ئەوەی مردووە بەم کارە زیندوو دەبێتەوە؟

من خۆم هیوادارم کەسم نەکوشتبێ: نە ڤێتنامی باکووری و نە ڤیت کۆنگ.

پێم بڵێ بزانم، ئەی ئەوانیش وەکوو ئێمە بەشەر نین؟ ئەی ئەوانیش کڵاوخوودەیان لێ بزر نابێ؟

لێرە هەموو دەڵێن: " دەبێ رقمان لەوانە ببێتەوە! "

بەڵام من خۆم ناتوانم رقم لێیان ببێتەوە. باوە(بیل) پێم دەڵێ: تۆ لەسەر حەقی!

ئەرێ تۆ باوە(بیل) ناس دەکەی؟

– نا.

– نا؟ کە قەشە پیتەرز لە تەپۆلکەی ٨٧٥ کوژرا، ئەوەبوو قەشە (واتەرز) بوو بە جێ نشینی ئەم و کە قەشە (واتەرز)یش مرد ئەم باوە (بیل)ە هاتە جێی ئەو. تۆ هەر دەبێ ئاشنایەتی لەگەڵ پەیدا بکەی.

دەزانی؟ من تەنیا کاتێ کە قسە لەگەڵ ئەو دەکەم، ئیتر دەستم نالەرزێ. بڕۆ بیبینە، لەناو چادرە. خاچێکیشی هەیە، دەیبینی؟

– بەڵێ، (ئالن) ئێستا گوێ بگرە، پرسیارێکی گرنگم لە تۆ هەیە:

– تۆ کەست دەناسی بە ناوی (پیپ)؟

– هم؟ کێ؟

– (پیپ)، ئەو کوڕەی هیلیکۆپتەرەکەی سەرەنگوون بوو. لە لیوای سێیەمی پیادەی سەربازیی دوازدەم خزمەتی دەکرد. بە هیلیکۆپتەرەکەی لەسەر تەپۆلکەی (٨٧٥) دەسووڕایەوە. کوڕێکی رەوشت بەرز و دەم و چاوی جوان بوو ...

– هم. نا. لێرە ئەوەندە هیلیکۆپتەر سەرەنگوون دەبێ کە ...

بۆچی لە باوە (بیل) ناپرسی؟ ئەو هەموو شتێ دەزانێ.

گەڕان بە شوێن چەنگە بیرەوەرییەك، دەق وەکوو ئەوە وایە لەناو هەزاران فیشەکی پەرت و بڵاوی ناو ئەم جەنگەڵە، بە دوای یەك فیشەك دا بگەڕێی.

تا ئێستا لە پێنج شەش کەسم پرسیوە، کەس (پیپ)ی لەیاد نییە. دەڵێن: " پێویستە لە بەڕێوەبەرایەتی سوپا بپرسی! " جا ئەوان دەتوانن چ وەڵامێکی ئینسان بدەنەوە؟

(پیپ) هەمیشە لە گۆزە گۆزو لەم تەپۆلکە چوونە ئەو تەپۆلکەو گەیاندنی دەنگ و باسی جۆراو جۆر بوو. هەر چۆنێ بێ، لە باوە (بیل)یش دەپرسم.





شەو

ئەویش هیچی نەدەزانی. گوتی: لە ماوەی مانگی شوبات و مانگی مارس ئەم جۆرە رووداوە جەرگبڕانە ئەوەندە قەوماون، ناتوانین هەموویان بناسین و ناوێکیان لەناو دەربێنین. ئینجا گوتی: بیرێکی لێ دەکەمەوە، هەوڵ دەدەم یارمەتیت بدەم. با بزانین چۆن دەبێ!؟

ئێستا دەمەوێ بۆتان باس بکەم ئەم باوە (بیل)ە کێیە کە (ئالن) لە بەرامبەریا دەستی لە لەرزین وەستا.

ئەمە پیاوێکە گەنج، تێکسمڕاو، تەمەن سی و چوار ساڵە. قژ شەکەری، چاو شین، دەم و چاو هەتاو بردوو و لووت پێست هەڵداو. لە قەشە ناکا. بەهەر حاڵ، لە جەنگا، قەشە لە سەربازان جیا ناکرێنەوە، مەگەر بەو دوو خاچەی بە ملیانەوە کردووە.

کە چوومە ناو چادرەکەی، یەکەم جار نەمبینی، چونکە لەسەر تەختەکەی راکشا بوو، لە پشتێن بەرەو سەرەوەی رووت بوو. ئێستا کە بیری لێ دەکەمەوە دێتەوە یادم کە پیلاویشی لە پێدا نەبوو. کە چاوی بە من کەوت، بێ ئەوەی کراسی لەبەر بکا، یان پێلاوی لەپێ بکا، بە هێمنی هەستاو ویسکییەکی پێشکەش کردم. پاش نیوەڕۆکەم لەگەڵ بەسەر برد، تا ڕادەیەك (پیپ) ی هەر لە بیر بردمەوە. ئەم باوە (بیل)ە ئینسانێکی زۆر سەیرە! بۆ نموونە هەر زوو پێت دەڵێ کە بە هیچ جۆرێ ئارەزووی لە قەشایەتی نەبووە: کاتێ لە زانکۆی (میامی) دەیخوێند، ویستبووی بچێتە (ئێف، بی، ئای). " ئەو سەردەمە، ئەمە کارێکی زۆر گرنگ بوو، وەکووپۆلیس دەمانتوانی سوودمان بۆ خەڵك ببێ ".

بەڵام لەپڕ بڕیارەکەی گۆڕی و بیری کردەوە ئەگەر ببێ بە قەشە سوودی بۆ خەڵك زیاتر دەبێ. ئەوسا وەکوو دەڵێن قەڵمڕەوێکیان لە فلۆریدا دایەو دە ساڵ لەوێ مایەوە. " رۆژم هەمووی بە حەوسەڵە چوون لە دەست وشکە پیرەژنی پیرۆز و ویژدانی قۆڕیان، بەسەر دەچوو. ئەگەر یەك شت هەبێ من نەتوانم بەرگەی بگرم، ئەو وشکەپیرەژنە پیرۆزانەن کە لەگەڵ گەردو گۆڵی بەیانی دێنە کەنیسە ".

– چیتر باوە (بیل)؟

– هەندێ جار سوێندم بەو شتانە دەخوارد کە ئاشنایان بووم، هەر لێشاوی منداڵانە بوو ڕەوانەی ڤێتنام دەکران. مانگی سێ ، چوار کەس ڕەوانە دەکران. لەم بارەیەوە کەوتمە بیرکردنەوە. پاشان لە دڵی خۆمدا گوتم: " تۆ گەنج و بەهێزی، ئایا باشتر نییە بە شوێن ئەم کوڕانەدا بچی!؟ " ئەو حەلە داوام پێشکەش کرد. ئینجا هەشت حەفتە دەرسی تایبەت بە ڤێتنامم خوێند.

دەزانی؟ لەوێ فێرت دەکەن چۆن وەکوو پێشەنگ بەناو جەنگەڵ دا بڕۆی و چۆن بەژێر تەلبەندی دڕووداردا تێ بپەڕی، دوای ئەوەی ڕێنمایی سەربازیمان دی، ئەوسا منیان بۆ جێی (پیتەرز) ڕەوانەی ئێرە کرد.

بۆ یەکەمین جار لە ژیانم هەستم کرد، بەرلەوەی قەشە بم ئینسانم. چونکە لێرە، ئێمە لە ژێر یەك یاخە، یان یەك جوببە ناشاردرێینەوە. لێرە نابێ کەس کەس تەفرە بدا. ئەگەر ئینسان نەبین، تەنیا بۆ ئەوە باشین شوڵلاقێکمان تێ هەڵبدەن.

– چ کاتێ بوو هەستت کرد: بەرلەوەی قەشە بیت، ئینسانیت!؟

– وا بزانم ئەوکاتە بوو کە مەرگم بینی. ئەو مەرگەی پێشان ئاشنای بووم مەرگی ناو نەخۆشخانە بوو. واتە مردوویەکی زۆر پاك، لەژێر لێفەو نەخۆشەوانێك لەسەرینگان! لە جەنگ، مردوو پیسە، تەنیایە، خەڵتانی خوێنە! کێ لە ماڵی خۆی ئەم جۆرە مردووە پیسە دەبینێ؟ ئەم شتانە تەنیا لە تەلەفزیۆن دەبینرێن: تەلەفزیۆنی ڕەش و سپی و زۆر بەرێزەوە لە فیلمێکی شەڕو شۆڕدا. شاشەی تەلەفزیۆن تەقەیەك پێشان دەداو پاشان جەستەیەك پێشان دەدا خوێنی لێ نایە، چونکە خوێنی سوور لە تەلەفزیۆنی (ڕەش و سپی) دەرناکەوێ. خوا کردی هەر زوو تەلەفزیۆنی ڕەنگاو ڕەنگ پەیدا بوو. تەلەفزیۆنی ڕەنگاو ڕەنگ یارمەتیمان دەدا بۆئەوەی باشتر هەست بە بابەتەکە بکەین. بۆ نموونە دایکم، وا تێ دەگا مردن لە جەنگا کارێکی زۆر پاڵەوانانەیە! تووك و نەفرەتی لێ بارێ ئەو کەسەی یەکەم جار قسەی لە قارەمانی کردووە، ئاخ دەنا دایکم لە تۆپخانەی (٢٥) بوایە! سێ کوڕ، لەوانەی دایکم دەیناسین، لەوێ کوژراون: یەکێ حەڤدە ساڵی، ئەوەی تر هەژدە ساڵی و سێیەم نۆزدە ساڵی. ڕاستی، بۆگەنی بووە!!

قەشە، مێزەکەی سندووقێکە، مستی لە مێزەکەی داو فڕە ویسکییەکی





خواردەوە:

– کە شەڕێك دێتە پێشەوە منیش لەگەڵ کوڕەکان دەچم، چونکە زۆر دەپەشۆکێن و زەندەقیان دەچێ. ئەو کاتە هەرگیز باسی خودا و بەهەشتییان بۆ ناکەم: " کاتێ کە هاتمە ئێرە وام دەزانی دەتوانم بانگەشەیەکی ئایینی باش لێرە بکەم، بەڵام وام نەکرد. ئێستا تەنیا هەوڵ دەدەم کە زاتیان بخەمە بەر، پێیان دەڵێم – (نارەحەت مەبن!). ئەوانیش بە قسەم دەکەن! بێ گومان یەکێکیان نەبێ کە جارێکیان گوتی: (بەسسە!!) ڕەنگە بۆیە وای گوتبێ تا هەست نەکا دوو ڕووە، پاشانیش ... پاشانیش کە دەمرن دوعایان بۆ دەکەم خوا لێیان خۆش بێ، کە ناشمرن، دیسان هەر دوعایان بۆ دەکەم خوا لێیان خۆش بێ. هەمیشە دوعا بۆ ئەوان و بۆ هەموویان دەکەم کە خوا لێیان خۆش بێ! : بۆئەمریکییەکان و بۆڤێتنامییە باکوورییەکان بۆ ڤیت کۆنگەکان.

– بۆ ڤێتنامی باکووری و ڤیت کۆنگەکانیش؟!

– بێ گومان!! هەموویان لەبەر چاوی من وەکوو یەك وان. هەموویان ئینسانن یەك دفن و دوو دەست و دوو قاچیان هەیە. تەنیا لەبەرئەوە دەجەنگن چونکە دەستووریان پێ دراوە. سەربازەکان لێپرسراو نین. من بم لەجێی هەر سەربازێك، هەرگیز گوێ بەم فەرمانە ئاسمانییە نادەم: "تۆ هەرگیز ناکوژیت!".

گوللە کاتێ کە دەتەقێ، بە داگرتنی پەنجەی ئەو نییە دەتەقێ، بەڵکو بەداگرتنی پەنجەی ئەو کەسە دەتەقێ کە ئەمی ڕەوانەی ئەم جەنگە کردووە.

دەزانی ... لەوکاتەوە کە قابیل هابیلی کوشت، جەنگ بۆتە بەشێك لە سروشتی بەشەر ... بەڵام لەبەرئەوە نییە کە جەنگمان قبووڵە، من بۆئەوە نەهاتوومەتە ئێرە تا بەرگری لە جەنگ بکەم، من لێرەم بۆئەوەی یارمەتی ئەو کەسانە بدەم کە دژی جەنگن.

دیسان نەختێ ویسکی تێ کرد:

زۆرجار وا ڕێك کەوتووە پرسیاریان لێکردووم: " باوە (بیل)، بۆچی ئێمەیان ڕەوانەی ڤێتنام کردووە؟ ". ئەوان ئێستاش هۆی هاتنی خۆیان نازانن. منیش تا ئێستا هۆیەکەی نازانم. تۆ دەڵێی ئەمە بۆ ڕاگرتنی کۆمۆنیزم بووە. بیرو باوەڕ، بە

گولله و بۆمباو کوشتنی کۆمەڵێك خەڵك، ناکوژرێ و لەناو ناچێ. بە پێچەوانەوە. ئەوانە پێویستە کار لەسەر رۆحی ئینسان بکەن، نەك لەسەر جەستەی. بەهەر حاڵ، تازە بڕاوەتەوە، ئەمریکییەکان ناتوانن لە هەر چوار گۆشەی دونیا جەندرمە بازی بکەن . لەم قسەیەدا حەق لەگەڵ پیری بچووکی (هانوی) دایە.

ئینجا پرسیارم لێ کرد داخۆ تفەنگیان داوەتێ یان نا!

وەڵامی دایەوە: " بەڵێ! "

پاشان پرسیارم لێ کرد ئایا کڵێسەی کاتۆلیك ئیجازەی بەکارهێنانی تفەنگی پێداوە؟

گوتی: " بەڵێ! "

– لەکاتی مەترسی ئیجازەی تەقەم هەیە، بەڵام ...

– بەڵام چی؟

– بەڵام هەرگیز شتی وام نەکردووە، بە تەمایش نیم وابکەم، مەگەر بۆ ...

– بۆ ... چی؟

– جارێکی تر پێت دەڵێم.

باوە(بیل)، بەیانی دابێکی دوعاو پاڕانەوە لەسەر تەپۆلکەکەی باکووری رۆژهەڵات، لە گۆڕەپانی تۆپخانەی (٢٥)، رێك دەخا. منیش دەچم.

ئایا ئەو شتانەی لەکاتی جەنگ دا، بۆمانم دەردەکەون، شی لە ئاسا بەدەرنین؟!

(فرانسوا)، (سترا دیواریوس) یێکی لە کووریا پەیدا کردووە. سترا دیواریوسێکی راستەقینەیە. شکی تێدانییە لە مووزەخانەیەك دزیویانە. عەریفێکی هێزی دەریایی داویە بە (فرانسوا). ئەویش ژەنیویە و لەبەر ئەوەی نەیزانیوە بیژەنێ، بەدەم گۆرانی:

" ئۆ، سوزانا وەرە سەمام لەگەڵ بکە "

ژێیەکی پساندووە.

<u>(٢١) ی مایس</u>

ئاسمان ئەوەندە شینە چاوت بە ژان دێنێ، جەنگەڵ ئەوەندە سەوزە دڵت دەگوشێ. کە بە بەینی شین و سەوزدا دەفڕین، جەنگمان لەبیر دەچێتەوە.





هیلیکۆپتەرەکە خولێکی داو لەسەر تەپۆلکەکە نیشت.

باوە (بیل) گوتی:

– ئەوا گەیشتین. ئەمەش تۆپخانەی (٢٥)!

هەر لە یەکەم سەرنجەوە، ئەو شوێنەم پێ خۆش نەبوو. یەکەم لەبەر ئەوەی تەپۆلکەکە تەپۆلکەیەکی سروشتی نەبوو، بەرزاییەکی بێ درەخت و بێ گیاو گوڵ بوو. جگە لە تەقەمەنی و پێنج شەش سەنگەرو دەوری سەد سەربازی پیس و ریشن، هیچی ترت لەسەر ئەو زەوییە رووتانە نەدەدی.

باوە (بیل) گوتی: ڤێتنامییە باکوورییەکان هەموو تەپۆلکەکانی دەوروبەریان داگیر کردووە، تەنانەت دامێنی ئەم تەپۆلکەیەشیان داگیرکردووە و رۆژێ دووجار تەقە لەم تەپۆلکەیە دەکەن و حەفتەی جارێکیش هێرشی بۆ دێنن! ئەگەر تا ئێستا نەیانتوانیوە داگیری بکەن، لەبەرئەوەیە کە دەم و دەست فانتۆم لە داکتۆوە دێن و ناپاڵمیان بەسەردا بەردەدەنەوە. بێ گومان رۆژ نییە تا شەو دادێ، دوو سێ کەسمان لێ نەکوژن.

بەم جۆرە تۆپخانەی (٢٥) نموونەیەکی بچووکی (خەسان)ە.

باوە (بیل)، جانتای بچووکی کەرەستەی پیرۆزی رازاندنەوەی بەدەستەوە گرتبوو، چووە شوێنێکی فراوان و دەستی بە ئامادەکردنی میحراب کردو بەم جۆرە دروستی کرد:

دوو قەوانی گوللە هاوێنی لە تەنیشت یەك چەقاند لەباتی دوو پایەو قوتوویەکی کارتۆنی لەسەر دانا. ئینجا جانتا بچووکەکەی کردەوە و دوو بوتڵی پلاستیکی بچووکی ئاوو شەراب و پەرداخێکی کارتۆن و پیاڵەیەك و قوتوویەکی بچووکی نانی پیرۆز و وێنەیەکی عیسای لەخاچدراوی لەناو دەرهێنا. هەمووی لەسەر قوتووەکە دانا. کڵاوی لەسەر کردەوە و جلی بە نەخش و داوو دورمان رازاوەی قەشانی کردە بەر. ئینجا هاواری کرد:

– هۆ!! کێ دەیەوێ، بۆ دابی دوعاو پاڕانەوە بێ؟!

دەوری سی سەرباز هاتنە پێش. فەرماندەکەیان گوتی:

– باوە، هەوڵ دە خێرا دابەکە تەواوبکە. دەمانەوێ سەما بکەین!

سەربازێکی بچکۆڵە گوتی:

– بەڵام باوە (بیل)، من دەمەویست ئیعتیراف بکەم.

– منیش!

باوە (بیل)، بە حەپەساوی سەری خۆی خوراند. نیمچە سەرنجێکی لە فەرمانده داو ئینجا نیمچە سەرنجێکی لە تەپۆلکەکان داو گوتی:

– هەموو چۆك دادەن.

سەربازەکان چۆکیان دادا.

– خودایە! بەبێ کڵاو!

سەربازەکان بە پستە پست کڵاوەکانیان لەسەر کردەوە.

– بێدەنگ!!!

سەربازەکان بێ دەنگ بوون:

" Egos vos ab solvo in homine bartis et filli et spiritus sanct .Amin!"

( بە ئارامی بخەون رۆڵەکانم، ئێوە کوڕی ئازا بوون! ئامین! )

– رازی بوون؟

– ئە ئاوا؟ بێ ئەوەی هیچ لە ئێمە بپرسی؟

– دەتانەوێ چ شتێکتان لێ بپرسم؟ مەگەر ئێوە لەم دۆزەخە شەش مەترییە دەتوانن چ گوناهێك بکەن؟!

ئینجا چووە پشت میحراب بۆئەوەی دوعا بکاو کوڕەکان بەرامبەری دانیشتن.

هەندێکیان لەسەر زەوی و هەندێکیان لەسەر فەردەی قوم.یەکێکیان مەیموونێکی بچووکی پێ بوو، چووبووە سەر شانی. لەو بیست دەقیقەیەی دابەکە ئەنجام درا، هیچ شتێ رووی نەدا.

دە کیلۆمەتر دوور لە لای باشووری رۆژهەلأت، دوو فانتۆم خەریك بوون ناپاڵمیان بەردەدایەوە و ئاسمانی شینیان بە چرە دووکەڵی رەش پیس دەکرد.

نەختێ دوورتر لە باکووری رۆژاوا، دەنگی تەقەی تۆپێك دەهات. کەچی لێرە هیچ!! باوە (بیل) پەرداخی کارتۆن و پیاڵەکەی بە دەستەوە گرت و داوای لێ





خۆش بوونی لەخوا کرد.

کوڕەکان دەستیان بە دەم و چاویانەوە گرتبوو و دوعایان دەکرد. ئەم دابە بەوپەڕی ئارامی سەرتاسەری و بە کش و ماتییەکی تەواو، بەڕێوە چوو. لەم بێدەنگییەدا، کوڕەکان هەموو هەستانەوە و بەڕیز وەستان و باوە (بیل)، هەریەکە و نانێکی پیرۆزی گەورەی لەسەر زمانی دانان کە وەکوو ئاوی نەباتی نەعنا وابوو و دوعای بۆ کردن:

" نا، تۆ ناتوانی، ئارام بە! ". مەیموونە بچووکەکە ئارام بووەوە.

دەستە بچکۆڵەکانی لەسەر سەری کوڕە گەنجەکە دانا و بەدەم هاوارەوە، بە ئارامی دەستی بە سەریدا هێنا.

لەماوەی ئەم بیست دەقیقەیەدا، بیرم دەکردەوە:

بۆچی ڤێتنامی باکووری تەقەمان لێ ناکەن؟ ئەوان بە دووربین و بێ دووربینیش ئێمەیان دەدی، ئایا بە ئەنقەست تەقەیان لێ نەدەکردین؟ ئایا چاوەڕێی تەواوبوونی دابی دوعا و پاڕانەوەیان دەکرد؟ هەڵبەت ئەمە بیرێکی گەمژەلأنەیە، بەڵام من وای بۆ دەچم کە چاوەڕێی تەواوبوونی دابی دوعا و پاڕانەوەیان دەکرد و بەو دەلیلەش وا دەڵێم کاتێ کە دابەکە کۆتایی هات و باوە (بیل) کەرەستەی دوعا و پاڕانەوەکەی کۆکردەوە، یەکەمین هاوەن، راستەوخۆ لە ناوەندی ئۆردووگا بە زەوی کەوت. من یەکسەر خۆم فڕێ دایە پەناگەیەك و دووەمین هاوەنیان هاویشت ... ئینجا سێیەم و چوارەم و پێنجەم. تۆپخانەش وەلأمی دەدانەوە. دەنگی هاویشتنی هاوەنەکانی ئێرە، دەنگی تەقینەوەی هاوەنەکانی ئەوانی بزر کردبوو. دەق وەکوو ئەوکاتەی کە بوومەلەرزە دێ و زەوی دەلەرزێ. لە بیرمە چاوی خۆم نوقاندبوو، پاشان لە نزیك خۆمەوە گوێم لە تەقینەوەیەك بوو و تا توانیم چاوم زەق کردەوە. لووتی پێست هەڵداوو زەردەخەنەی باوە (بیل)م لەسەر سەرمەوە بینی، بە دەستی چەپە باوەشی پێدا کردم و گوتی: " ناڕەحەت مەبە، هێرشێکی بچووکە، زۆر ناخایەنێ! ".

بە پێچەوانەوە، زۆر زۆریش درێژەی کێشا: نازانم ماوەی چەند لەو کونە ماینەوە، تەنانەت کە دەنگ و هەراش نیشتەوە، یەکێ هاواری کرد: " لە کوێن

هەر لەوێ بمێننەوە! ".

لەم کش و ماتییەدا، دەستی بە قسە کرد، وا بزانم بۆئەوە قسەی دەکرد تا من بخافڵێنێ و زاتم بخاتە بەر. بە تەواوی لە بیرم نییە چۆن سەری قسەی کردەوە. قسەیەکی لە بارەی کڵێسەوە کرد، گوتی: شکڵی کڵێسە وەکوو شکڵی قەڕابەی شەرابسازی وایە، کە هەرچەندە تریێ لەو قەڕابەیە بکەین هەرگیز نازانین داخۆ پاشان شەرابی لێ دروست دەبێ، یان سرکە، قەشەیش لە کڵێسە وەکوو تلییە تریێیەکی ناو قەڕابەکە وایە، لەگەڵ تلییە تریێیەکانی تر تێکەڵ دەبێ و دەیەوێ را بکا. هەندێ شتی ئاوهای گوت.

بەڵام زۆر باشم لە بیرە کە ئەو پرسیارەم لێ کرد: " باوە (بیل)، تۆ خەریکە ئیمانت نامێنێ، وانییە؟ ".

وەڵامەکەیم زۆر باش، وشە بە وشە، لە بیرە:

– نا، ئیمان هەمیشە هەر هەیە، تەنانەت پتەوتریش دەبێ، چونکە ئەم رووداوانە خەتای خوا نین، خەتای خۆمانن. ئێمە نەمانتوانیوە لە ماوەی ئەم دوو هەزار ساڵەی مەسیحییەت کارێکی بەرجەستە ئەنجام بدەین، ئەی وانییە؟ ئێمە تەنیا توانیومانە ئاگری شەڕ خۆش بکەین، ئێمە تەنیا توانیومانە مافی شەخسی زیاتر بکەین و چاو لە بیروباوەڕی نوێ بپۆشین ... "

لەیادمە، بیرم دەکردەوە شتێکی چەند سەیرە! لە کاتێکا کە زەوی دەلەرزێ، ئێمە لەناو گەرداودا بین و باسی شتی وا بکەین! ئەوەشم لە بیرە، کە بازووەکانیم بینی وەکوو بازووی باوك باوەشیان پێداکردبووم، لێم پرسی:

ئایا هەست بە نەبوونی ژن دەکەی؟

گوتی: ئا!

– ئا، بەبێ هیچ دوودڵییەك، بەڵام ئەمە گیروگرفتێکی گەورە نییە، چونکە هەرچەندە بارێکی قورسیشە، دەبێ هەڵی بگرین! زایەند بایەخی خۆی پاراستووە، بەڵام واجب نییە. گیروگرفتی ناڕەحەت پەیوەندی بە جەستەوە نییە، گیان ئازار دەدا. ئێمە لە چاخی قین و (کوڕی رۆژبوون) دەژین، بەڵام رەفتارمان وەکوو ئەو سەردەمە وایە کە تەنیا ئەسپمان بۆ جێ بە جێ کردنی کارەکانمان





بەکار دەهێنا. لەبیرمان کردووە کە کۆمۆنیستەکانیش بەشێوەی خۆیان دوعا دەکەن و وەکوو ئێمە بە دوای خوادا دەگەڕێن ... ئەی جەنگ ... تۆ بڕوات چۆنە؟ پێت وایە جەنگ بەشەر چاکتر دەکا، یان خراپتر؟

– جەنگ، بەشەر خۆی چۆنە، بەو شێوەیە نیشانی دەدا، واتە بە دڕندەیی.

– نا، جەنگ بەشەر چاکتر دەکا. هەندێ وەکوو ئێمە تووڕەو روو گرژ دەبن و هەندێکیش ئیمانیان لەدەست دەدەن، بێ گومان من ئەوانە مەحکووم ناکەم. چونکە ئەم کارەی ئەوان کاردانەوەیەکی غەریزییە بۆ مەحکووم کردنی خودا، کاتێ کە کارو کردەوەی نەنگ و خراپ دەبینین. بەڵام زۆربەیان هەست بەوە دەکەن کە خودا ئەوانی بۆ جەزرەبەدان خەڵق نەکردووە، خودا شەترەنجبازێکی بێ رەحم نییە ...

ئەها، سەرتان دانەوێنن!

هێرشەکە چڕو فراوانتر بوو. نارنجۆکێك لە نزیك پەناگەکەمان تەقییەوەو خاك و خۆڵ و کەرپووچی فڕێ دایە ئاسمان.

– باوە (بیل)، خودا چییە؟

– خودا، ویژدانێکی چاکەیە لەناو نیهادی ئێمەدایە و هەمیشە ویژدانی چاکمان بە دیاری پێشکەش دەکا، بەڵام ئێمە هەمیشە دیارییەکەی ئەو رەت دەکەینەوە.

– باوە (بیل)، دوای تەواو بوونی جەنگ، تۆ چ دەکەی؟

– لەوانەیە واز لە پایەی قەشاتی بێنم.

– بۆچی، باوە (بیل)!

– تا ئێستا نازانم، لەوانەیشە بزانم: هەندێ جار، کە ئەم بێ دادییانە دەبینم، دەڵێم دەست بدەمە ئەو تفەنگەی کە داویانەتە من و تەقە لەو بێ دادییانە بکەم، و بە هاوار داوای بوردن لە خوا بکەم.

لەوکاتەدا دەنگی هاوارێك هات، بەڵام هاواری داوای بوردن نەبوو لە خوا.

– دایە! دایە! دایە!

باوە (بیل) لە قۆرتەکە چووە دەرەوە، منیش بە دوایدا چووم، گەنجە مەیموون بەدەستەکەم بینی تەنیا دەست و دەم و چاوی پێوە مابوو.

باوە (بیل) چەمایەوە سەری و گوتی:

" بە ئارامی بخەوە رۆڵە، تۆ کوڕێکی ئازابووی! ".

هێرشەکە بڕایەوەو باوە بیل چووە لای هاوارەکانی تر و ناڵە ناڵەکانی تر. بەڵام زۆر خێرا گەڕایەوە و پێی گوتم: فەرماندە دەیەوێ رەوانەی (داکتۆ)ت بکا.

فەرماندە پێی وایە ئیتر هێرشەکە چیتر بەردەوام نابێ و ئێستا هیلیکۆپتەر دەیەوێ هەڵستێ. بڕۆ، من دەبێ لێرە بمێنمەوە، پێویستییان بەمن هەیە.

ئینجا سواری هیلیکۆپتەر بووم و چەند لەحزەیەك بەرلەوەی لەسەر زەوی بەرزبینەوە، باوە بێل هاتە سەرێ و هاواری کرد و گوتی:

– لە بارەی (پیپ) واچاکە بچیتە تەپۆلکەی (١٣٤١)، بۆ لای فەرماندە (گریزلی)، لەوانەیە ئەو بزانێ.

(٢٢) ی مایس

بە هیلیکۆپتەر چوومە ئەوێ. هیلیکۆپتەرەکە دەرمان و لیمۆی ترشی بارکردبوو. لەم گەشتەدا، رووداوێکی بچووکم لێ قەوما. کاتێ کە بەسەر چڕترین جەنگەڵ دا دەفڕین، تررووسکاییەکمان بینی، رەنگە تررووسکایی ئاوێنە بووبێ، رەشاشچییەکە گوتی:

" ڤیت کۆنگن! ".

فڕۆکەوانەکە، فڕۆکەکەی نزمتر کردەوە بۆئەوەی بیاندۆزێتەوە. دوای (دە) دەقیقە کە هیچ رووی نەدا، لە پڕ ڤیت کۆنگەکان تەقەیان کرد. ئەمریکییەکانیش تەقەیان کرد: لە راستیدا، لیمۆ ترشەکان بوون منیان لە (ئەنفارکتوس) رزگار کرد. فڕۆکەکە، کە خێرا سووڕایەوە، لیمۆ ترشەکان وەکوو بۆمبا بەسەر و کەللەم کەوتن و نازانم بۆچی ئەو بیرەم بۆهات کە منیش ئەرکێك جێ بە جێ بکەم، ئەو ئەرکەی کە کەس داوای لێ نەکردبووم جێ بە جێی بکەم: رزگارکردنی لیمۆ ترشەکان و گەیاندنیان بەسەر زەوی! لەوانەیە لەو کاتەدا پێویستم بەوە بووبێ کارێك ئەنجام بدەم و بەبێ کاری دانەنیشم و هەر تەنیا بە تەماشاکردن بەس نەکەم. هەرچۆنێ بێ، توانیم نیوەی لیمۆ ترشەکان نەجات بدەم. زۆر خراپ نییە کە هەست بکەین شتی ترمان لە دەست نەداوە: کارێکی گەلۆرانە بوو، بە





بەفیڕۆدانی هەندێ گوللە و هەندێ لیمۆی ترش کۆتایی هات.

ئێستا، کە لە تەپۆلکەی (١٣٤١)، لەسەر فەردە قوم دانیشتووم و چاوەڕێی دیداری (گریزلی) دەکەم، بیر لە لیمۆ ترشەکان ناکەمەوە، بیر لە (پیپ) دەکەمەوە. باوە (بیل) کەسێکی وا نییە بەبێ هوودە رەوانەی تەپۆلکەی (١٣٤١)م بکا. شەوی دووشەممە، یان سێ شەممە بوو کە باوە (بیل) دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر، زانی دەشێ بیرەوەری بزربووی (پیپ) لێرە بدۆزمەوە: لە ژێر گەلای دار شاردرابێتەوە، بە لقەدارێك هەڵواسرابێ، یان کەوتبێتە ناو قۆرتێك.

دڵنیام ئەگەر ئەم بیرەوەرییە دڵۆپە ئاوێکیش بوایە، شەوق و درەوشانەوەم لە ژێر خۆرەتاودا دەدی. بەڵام ئاخر ئەم (گریزلی)یە بۆچی لە چادرەکەی نایەتە دەرەوە؟ دەڵێن خەریکی گفتوگۆیە لەگەڵ دوو جەنەراڵ کە تازە لە (پلیکۆ)وە هاتوون. داخۆ ئەمانە چ جۆرە یارییەکی کوشندەی بۆ پێشنیار دەکەن؟ گەرمایەکەی ئینسان کوێر دەکا، زەوی لەناو قۆرتەکان شەقی بردووە و وەکوو ئارد بۆتە پۆدرە. سەربازەکان لە پشتێن بەرەو ژووریان رووتە. گوللە ئاسن دەگوازنەوە و شانیان شەلاڵی ئارەقە بووە. زۆربەیان پێست رەشن، هیچێکیان سەر بە دەستەکەی (پیپ) نییە. لە دەستەکەی (پیپ)، تەنیا (گریزلی) ماوە کە ئەوکاتە رابەری لیوای سێ بوو. کاتی خۆی پێش ئەوەی بچینە سەر تەپۆلکەی (١٣٨٣)، کاپتن (شر)، بەمنی ناساند. کوڕێکی قۆز بوو، لەشی هەموو ماسوولکە بوو، پڕ قوم و دەم بەسۆز بوو.

شەو

ئەوەی کە دیم، بە پێچەوانەوە، پیرەمێردێکی: لاواز و شەکەت بوو، دەم و چاوی لەبەر غەم و خەفەت داچۆڕا بوو، ماسوولکەکانی وەکوو ئاو شل و خاو ببوون و شۆڕ ببوونەوە. گۆنامانی لۆچ لۆچ ببوون ولالغاوەکانی شۆڕببوونەوە. بە چاوی کپەوە سەیری کردم، لێم پرسی:

– (گریزلی)، تۆ ماوەی چەندە هاتوویتە ڤێتنام؟

وەڵامی دامەوە.

– حەفت مانگە، بەڵام دەبێ دوازدە مانگی تریش لێرەبم.

ئینجا دەستی بڵند کرد و بۆلای تەپۆلکە سەوزەکانی راداشت و یەك یەك تەپۆلکەکانی نیشان دام و لە کاتێکا کە دەم وچاوی لە رقان دەلەرزی، گوتی:

– تۆ هەست بە سەرنجیان دەکەی؟ ئێستا وا تەماشامان دەکەن. ئێمە هیچمان لە دەست نایە. ئەگەر ئەوان نەیەنە دەرەوە، ئێمە هیچمان لە دەست نایە. ئەوان دەزانن ئێمە لەکوێین، بەڵام ئێمە نازانین ئەوان لەکوێن. ئێمە تەنیا دەبێ چاوەڕێ بکەین و تەواو! چەندین حەفتە و چەندین مانگ بەم بێ دەنگییە دێ و دەڕوا: توخوا وەرنە دەرەوە!!

بەڵام کەس نەهاتە دەرەوە، تەنانەت هیچ دەنگێ نەهات گاڵتەی پێ بکا. پاشان گوتی:

بەم زووانە (با) ی وەرزی هەڵدەکات و هەور ئاسمان دادەگرێ و ئیتر ناتوانین ئامێری پەیوەندی هەوایی بەکاربێنین، تەنیا (ب– ٥٢) نەبێ، ئەوسا بۆی هەیە زەردەکان لە پەناگاکانیان بێنە دەرەوە و بێ دەنگی بشکێنن، ئەو بێدەنگییەی کردبوونی بە قەرەنتو و لەوانەیە هەڵبکێشن تا دەگەنە ئۆردوو، بێ ئەوەی گوێ بە (با) و (باران) و زەوی قوڕاوی بدەن.

ئاخری (گریزلی) دەیانبینێ و خەفەت بۆ ئەوکاتانە دەخوا کە بەبێ ئیش و بەبێ جووڵە دانیشتبوو و لێیان دەپاڕایەوە بێنە دەرەوە. لێگەڕام قسەکانی بکا، ئینجا لێم پرسی داخۆ (پیپ)ی لە بیرە یان نا؟ زۆر باشی لەبیر بوو. لام وایە من ئێستا هەموو شتێ دەزانم، بەڵێ بیرەوەرییەکانم دۆزیوەتەوە، دڵۆپە روونا کییەیەکە لەناو دەستم دایەو نازانم چی لێ بکەم.

(پیپ) نازانێ ئەوان لەسەر ئەم تەپۆلکەیە بەریان هەڵدابوو. رۆژی (٢٦)ی شوبات، ئەوکاتەی شەڕ بۆ داگیرکردنی تەپۆلکەی (١٣٤١) دەستی پێ کرد. دوو مانگ دەبوو لیوای دووەمی پیادەی سەربازی، بە تۆپی (١٥٥) بۆمبا بارانی دەکرد. ئەو رۆژە، دوو دەستە لەگەڵ چل و دوو هیلیکۆپتەر، کە هەر هیلیکۆپتەرە و پێنج کەسی تێدابوو، چوونە ئەوێ. دوو هیلیکۆپتەرەکە دەم و دەست سەرەنگون بوون، لە هیلیکۆپتەری یەکەم نەیانتوانی کەس رزگار بکەن، و لە هیلکۆپتەری دووەم تەنیا یەك بریندا ریان راکێشایە دەرەوە. بێ گومان هیچ کەس





دڵنیا نەبوو کە ئەم بریندارە (پیپ)ە بووە. بەڵام هەندێکیان بەبیریانە کە بریندارەکە سەر دەستەیەکی تەپۆلکەی (١٣٨٣) بوو و ئەژنۆی لە هەموو شوێنێ زیاتر بریندار ببوو، کاتێکی زۆری دەویست بۆ هێنانەوەی. (کوش) فەرماندە بوو و دەستەکەی (کوش) ناچاربوون، بەبێ هیچ جۆرە دەستەبەرێك، ماوەیەکی زۆر لەوێ بمێننەوە، خۆیان لە زارکی تۆپێك حەشاردابوو. ڤێتنامییە باکوورییەکان بەبێ پچڕان تەقەیان لێ دەکردن. بەڵام شەڕەکە وازوو تەواو نەبوو: لانی کەم سێ رۆژی خایاند. سێ رۆژی تۆقێنەر، کاپتن (چیو هو) ی فەرماندەی ڤێتنامی باکووری، لە بارەی ئەو شەڕەوە گوتبووی: " تۆقێنەرترین و خوێناویترین شەڕبوو تا ئێستا رووی دابێ. " خۆی لەو شەڕەدا سەد و پەنجا نەفەری لەدەست دا.

(پیپ)ی بریندا ریش، بێ ئەوەی بتوانێ خۆی بشارێتەوە، یان رابکات، دەوروبەری هەمووی تەرم بوو، تەماشای ئەو شەڕەی دەکرد. ئەوەندە زۆر تاسا و حەپەسابوو، هەموو یادەوەرییەکانی ئەو رۆژەی لە بیرچووەوە و هەموو یادەوەرییەکانی ڤێتنامی لەگەڵ خۆی راماڵی. تەنیا لایەنی خۆش و چاکی ئەو یادەوەرییانەی لەمێشکدا ما: وێنەی (شر) و چەپکە گوڵەکەی من، کە چەپکە گوڵ نەبوو، لکە دارێك بوو. خەیاڵبازی خۆی، یان پێویستی بۆ نەرمی و بەخشندەیی، لێی کردبوو بە چەپکە گوڵ .

باشە ئێستا من چ بکەم؟! ئەم هەموو شتانەی پێ بڵێم؟

خەریکە دەگەڕێمەوە (پلیکۆ) بۆئەوەی لەوێ فڕۆکەیەکی بار پەیدا بکەم و پێی بچمەوە (سایگۆن).

(داکتۆ)م بەجێ هێشت. ئیتر ئارەزووی مانەوەم لە (داکتۆ) نەما.

کاتێ کە لەوێ رۆیشتم گۆڕەپانی فڕۆکەخانە پڕ دەستەی سەربازی بوو: لیوای سێیەمی پیادەی سەربازی چوارەم، لیوای سێیەمی پیادەی سەربازی پێنج و شەشەم، دوودەستەی هێزی هەوایی سەدو یەك و ئەوانی تریش خەریك بوون وەکوو مێروولە لە ورگی (سی – ١٣٠) دەهاتنە دەرەوە. چەند کەس لەم سەربازانە، سبەی رووداوەکانی ئەمشەو و سەفەری ڤێتنام لەبیر دەکەن؟ بۆ دەبێ من بیرەوەری (پیپ)، بەبیر خۆی بێنمەوە؟ سەبارەت بەچی؟ بۆئەوەی چ لەو

بیرەوەرییە بکا؟ بۆئەوەی دیسان ئەو جەزرەبەیەی لەلا دووبارە بێتەوە؟ لەگەڵ ئەو هەموو تەرمەی لە دەوروبەری کەوتبوو و (کوش)، کە خۆی لەناو زارکی پۆپ شاردبووەوە؟

نا، گەڕان و لێکۆڵینەوەکەم بێ هوودەبوو، پێویست ناکا دووبارە لەناو ترس و تۆقانەکانیا نوقمی بکەمەوە.

ئێستا بزانە من چ لەو دڵۆپە روناکییە دەکەم:

فڕێی دەدەمە سەر عەردی، بە پۆستاڵی زلم بەسەری دەکەوم و وردوخاشی دەکەم، دەیکوژێنمەوە، ها، ئاوها!!!

ئێستا لە تلْت و سرپاتێك زیاتر هیچی لێ نەماوەتەوە.





## بەشی دەیەم

دەبێ لەم رۆژانەی دوا دواییدا، ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی خۆم بەشێوەی نامەیەکی پوخت و پاك کراوە، بۆ خۆم روون و یەك لا بکەمەوە.

ئەم پرسیارەم هاتۆتە پێش:

" ئایا پێویستی دەکرد ئەو هەموو شتانە ببینم کە لەم ماوەیەدا دیومن؟و ئایا پێویستی دەکرد حوکم بەسەر ئەو شتانەدا بدەم کە دیومن؟ ".

ئاخیری، ئەنجامەکەم بەهۆی یەکێکەوە هاتە دەست کە بڕوام وابوو رەمزی بەدکاری و بەد رەفتارییە: جەنەراڵ (نگوین نگوك لون). ئەگەر توانیم تەنیا چند سەعاتێك پێش دەرچوونم لە (سایگۆن) بەدەستی بێنم، ئەمە تەنیا سەبارەت بە دادپەروەریی بوو و هیچی تر: ناواخنی کەلەفی کامواکەم دۆزییەوە. کەلەفی کاموا جۆرە یارییەك بوو بە منداڵی فێری ببووم. کە بچووك بووم، دایکم کەلەفی کاموای دەکڕی و لە پارچە کاغەزێکی دەپێچا. کاغەزەکە یان کاغەزێکی سپی بوو، یان پارچە رۆژنامەیەك بوو، یان وەسڵی حسابێك بوو. هەمیشە مەراقم دەگرت بزانم کەڵەفە کامواکە چی تێدایە، دایکم تا زیاتری دەچنی و کامواکە کەمتر دەبووەوە، من مەراقم زیاتر دەبوو. بیرم دەکردەوە: " داخۆ ئەم جارە کامواکە چی تێدایە؟ ".

کە کەڵەفە کامواکە تەواو دەبوو، لوولە کاغەزەکەم هەڵدەگرت و بە پەنجە بچووکەکانم لووسم دەکرد.

دووبارەی دەکەمەوە: هەندێ جار لەوانەبوو تەنیا پارچە کاغەزێکی سپی بێ، کە دەمکردەوەو دەمدی پارچە کاغەزێکی سپییە، لەڕادە بەدەر ناڕەحەت و نائومێد دەبووم. بەڵام ئەگەر کاغەزەکە شتێکی لەسەر نوسرابوایە، دەمدایە دایکم بۆئەوەی بۆم بخوێنێتەوەو منیش بە خۆشی و بە پەرۆشەوە گوێم دەدایە

خوێندنەوەکەی. تەنانەت وەسڵی حیسابی دوکانیش بەلامەوە چیرۆکێکی تێدابوو. بەڵام ڕۆژێکیان، دوای نیوەڕۆ، لوولە کاغەزەکە باسی چیرۆکێکی تێدا بوو. دەزانی کام چیرۆك؟ چیرۆکی ئەو بۆقەی بوو بە ئینسان.

لەگەڵ (نگوین نگوك لون) یش شتێکی مەیلەو ئاوهابوو. چەند مانگێ بوو بیرم دەکردەوە: ئاخۆ (لون) لەناخی ڕۆح و بیر و گیانی خۆیدا چ جۆرە هەستێکی هەیە؟ هەرچەندە (فرانسوا) هەست و نەستی (لون)ی بۆ باسکردبووم ، لەگەڵ ئەوەشدا ئارەزووم دەکرد خۆم بە تەنیایی بیدۆزمەوە و ئەگەر بەرێکەوت، مەوجوودێك یان ڕازێکی بێ بایەخ و یان ئەو بۆقەی بوو بە ئینسانی لێ شاردبمەوە، دەمەویست خۆم بە تەنیایی بیدۆزمەوە و هەڵیسەنگێنم.

ئێستا تۆ وا بیرەوەری ڕۆژانی دوا دوایی منت لە ڤێتنام لەبەر دەست دایە. ئەوکاتە هێشتا وەڵامی پرسیارەکەمم دەست نەکەوتبوو، هێشتا هەر بەدوایدا دەگەڕام، لە بیرتە؟ من وەڵامی پرسیارەکەمم لە ڤێتنام دەست نەکەوت، لە جێگایەکی تردا دۆزیمەوە.

(٢٤) ی مایس

باوەڕم نەدەکرد جەنەراڵ (لون) ڕازی بووبێ من بچمە لای. قیژاندم و لە (فرانسوا)م پرسی:

– کەی؟

گوتی:

– هەر ئێستا. چاوەڕێت دەکا. خێراکە بڕۆ.

دەبوایە بەرەو نەخۆشخانەی (گراڵ) ڕابکەم. لەپڕ هەستم کرد هیچ پرسیارم نییە لێی بکەم. تەنانەت ئەو پرسیارە باوەش کە دەبوایە لێی بپرسم ئیتر بە لامەوە گرنگ نەبوو. بەڵام بەهەر حاڵ، خۆشحاڵ بووم کە دووبارە دەیبینم.

دوای نیوەڕۆ

چوومە ژوورەکەی، بێ ئەوەی کەس ڕێم لێ بگرێ. تەنانەت پۆلیسێك یان سەربازێك چییە چاوەدێری ژورەکەی نەدەکرد. هەر ڤیت کۆنگێ بە سووك و ئاسانی دەیتوانی بچێتە ژوورەکەی و بیکوژێ و بە هێمنی بێتە دەرەوە.





لەدەرگام دا، کەس وەڵامی نەدامەوە. چوومە ژوورەوە، بە هێدی و لەسەر پەنجەی پێ چوومە لای قەرەوێڵەکەی. دڵڕەقترین پیاوی ڤێتنام، ئەو پیاوەی ژەنەراڵەکان لەبەری دەلەرزین، لەسەر قەرەوێڵەیەك و لەژێر لێفە، وەکوو منداڵێکی بێ هێز و بێ دەسەڵات دەکەوتە بەرچاو.

دوو کەسی تر لە ژوورەوە بوون: ژنێکی وردیلەی سیما سەنگین و پیرەمێردێك کە ڕۆژنامەی دەخوێندەوە. ژنەکە لەجێی خۆی نەجوولایەوە بەڵام پیرەمێردەکە هەستا و دەستی گوشیم و گوتی: " من باوکیم و ئەمەش ژنیەتی. قسەی لەگەڵ مەکە، خەوتووە! " بەڵام لەوکاتەدا (لون) چاوی کردەوەو منی بینی، ویستی زەردەخەنەیەك بکا بەڵام پێی نەکرا.

هەوڵی دا سەری بڵند بکا، بەڵام سەری بەربووەوە سەر سەرین و بە هاوارو ناڵەیەکی تیژ گوتی: " ئای قاچم! ".

من نەمزانی چ بڵێم.

– جەنەراڵ، ... من ... ڕۆژباش جەنەراڵ (لون).

دەستی بە گریان کرد. سەرنجی لەسەر من هەڵگرت و چاوی بڕییە ساپیتە و فرمێسك لە گۆشەی چاوەکانی قەتیس ماو پاشان بەسەر گۆنا و لووتیدا هاتە خوارێ. هەروا فرمێسکی دەڕشت.

– فەرموو، لەسەر ئەم کورسییە دانیشە.

– ئاوازی دەنگی هیچ نەگۆڕابوو. دەنگی هەر وەکوو خۆی بە چرپەو هێدی و غەمگین بوو، بەڵام ئەم جارە دەنگی، نەرمییەکی تایبەتی تێدابوو، پێشتر وا نەبوو.

کورسییەکەم هەڵگرت و چوومە نزیکییەوە.

– وەرە نزیکتر، نزیکتر!

– چوومە نزیکتر. بە دەستێك مەچەکی دەستی گرتم و دەستەکەی تری بردە ناو گیرفانی بێجامەکەی و لە شتێ گەڕا، وێنەیەکی مەسیحی دەرهێنا تاجێکی چقڵی لە سەرو زەردەخەنەیەکی بەژانی لەسەر لێوانەوە بوو.

– ئەمە ... ئەمە منی پاراست ... ئەمە ... ئەمە منی خۆش دەوێ ...

پشتی وێنەکە بخوێنەوە ... سەیرکە چ نووسراوە.

من تاساوو حەپەسا بووم. نووسینی پشتی وێنەکەم خوێندەوە:

" بیر لەوە بکەرەوە کە چاوەدێریت دەکات و تۆی خۆش دەوێ و لەگەڵتایە بۆئەوەی درمانێك بۆ دەردەکانت بدۆزێتەوە."

بە بەزەو سۆزەوە وێنەکەم دایەوە. ئەو هەر دەگریا. وێنەکەی لە لێوی نزیك خستەوە:

– بەڵێ من بڕوام بەمە هەیە، چونکە ئەو رۆژە بەیانییەکەی زۆریان مردن، کەچی من ... من کە بە زیندوویی ماوم و نەمردووم لەبەرئەوەیە کە ئەمە پارێزەر و چاودێری منە.

ئایا ئەو رۆژەت لە یادە کە لە منت پرسی:

" ئایا بڕوات بەخوا هەیە؟ " و من وەڵامم دایتەوە: "نەء"؟

من هەمیشە بڕوام بە خودا هەبووە. بمبوورە ئەگەر دەگریەم ... ناتوانم بەری فرمێسکم بگرم. بەهەر حاڵ، گریان تەسکینی دڵم دەدا، یارمەتیم دەدا بۆئەوەی باشتر خۆم لەبەر ژانی قاچم و ئەو ژانەی لێرە، لە دڵمایە، رابگرم.

مەچەکی دەستی بەردام و دەستی لەسەر دڵی دانا. بەڵام دووبارە زەندەی دەستی گرتم و رایگوشی وەك ئەوەی پێی وابێ من ئەمەم لەوی چاوە!

– ئەو رۆژە پێم گوتی...بەڵام تۆ بڕوات بە قسەکەم نەکرد.ئایا ئەو رۆژەت لە بیرە؟

– ئەو رۆژە؟

بەڵێ ئەو رۆژەی کە وەخت بوو لەتینوان بخنکێم و ئەویش هەر ناو بەناو پێی دەگوتم: ویسکی دەخۆیتەوە، یان بیرە؟ ویسکی یان بیرە؟ منیش لە وەڵامدا دەمگوت: بیرە، سوپاست دەکەم. بەڵام بیرە هەرگیزاو هەرگیز نەهات و نەهات. ئێستاشی لەگەڵ دابێ هەر نەهات و من هەروا بە تینوێتی مامەوە. ئایا پیاوەکەی ئەو رۆژە، هەر ئەم پیاوەبوو کە ئێستا لەسەر ئەم قەرەوێڵە راکشاوە؟

– ئەو رۆژەت لەبیرە؟ پێم گوتی: " من بۆ ئەوە خەڵق نەکراوم ببم بە  پۆلیس، یان سەرباز و من حەزم لە جەنگ نییە. " بەراستم بوو! هەندێ کەس لە جەنگ





تووشی حالۆری دەبن و جەنگیان خۆش دەوێ، بەڵام من نا. لە جەنگ دا، جگە لە ترس هەست بە هیچی دی ناکەم.

پێش جەنگ دەترسم، دوای جەنگیش دەترسم ... من لە کارەکەی خۆم بێزارم. هەمیشە بێزار بوویم. ئەو ئیشەی حەزی لێ نەکەین، ئەنجامەکەی تەحەممول ناکرێ. هەمیشە حەز دەکەم لە شوێنی کارکردنم دوور بم و بەجل و بەرگی خۆم بم. لە جلی سەربازی بێزارم، بگرە لەم بەتانیەش بێزارم.

بە تووڕەیی بەتانییە سەربازییەکەی سەر قەرەوێڵەکەی فڕێ دایە لایەك و دووبارە دەستی بەقسە کردەوە:

– من بە پێچەوانەی ئارەزووی خۆم چوومە ریزی سوپا. من ئینسانێکی بێ ئیرادەم. هەرگیز نەمتوانیوە قسەی برادەرەکانم رەت بکەمەوە. چەندین جار بیری راکردن لە سەری داوم. راکردن بۆ شوێنێکی زۆر دوور: تایلەند ... فیلیپین ... ژاپۆن ... مالیزیا ... بچوومایە هەر شوێنێ بە رووخۆشی وەریان دەگرتم. پاشان بە خۆمم دەگوت: " نا! ناتوانم، من نابێ رابکەم. ".

بە داخەوە هەندێ ئەرك و لێپرسینەوەی جەنگم لە ئەستۆ بوو، دەبوایە هەر بمێنمەوە.

دەزانم ئیتر هەرگیز ناتوانم لە شوێنێکی ئارام و هێمن، لەگەڵ مۆسیقا و شیعر و گوڵی سوورم، گۆشەگیربم.

سەیر لەوەدابوو بێ ئەوەی هیچ پرسیاری لێ بکەم، خۆی قسەی بۆ دەرکردم، تەنانەت دەرفەتی پرسیارکردنیشی بەمن نەدەدا. دەرفەتی نەدەدا بڵێم: " جەنەراڵ، شتی وا مەکە، ئەمە دوورە لە تۆ، باش نییە. تۆ جەنەراڵ (لون) یت. تۆ دڵرەقترین پیاوی ڤێتنامی، هەموو سایگون زراوی لەتۆ چووە. ئەگەر خەڵك تۆ بەم حاڵە ببینن کە وەکوو منداڵ دەگری و وێنەی مەسیح ماچ دەکەی و توند دەستی منت گرتووە، چ دەڵێن؟ بەسیەتی جەنەراڵ، تکا دەکەم، لانی کەم لێ گەڕێ من بڕۆم.

شتێکی تری سەیر ئەوەبوو، نە ژنەکەی و نە باوکی لەبەر فرمێسك و قسە نائومێدەکانی جەنەراڵ نارەحەت دیار نەبوون و تەنانەت هەوڵیشیان نەدەدا دڵی

بدەنەوە و هێوری بکەنەوە.

ژنەکەی قوتووە دەرمانەکانی دەبردە ئەم لاو ئەولا، باوکیشی رۆژنامەکەی دەخوێندەوە. ئایا ئەمانە هەست بە شەرمەزاریی دەکەن؟ پاشان باوکە رۆژنامەکەی دەق کرد و بە فرەنسی گوتی دەمەوێ برۆم.

(لون) گوتی:

– برۆ، برۆ.

ئینجا لە دەسەسڕێك گەڕاو فرمێسكی پێ سڕییەوەو لووتی پاك كردەوە، پاشان ئاوڕی لە ژنەکەی دایەوە و گوتی:

– تۆش ئەگەر دەتەوێ، برۆ.

ژنەکەی بە رەزامەندی جانتاکەی هەڵگرت و بەگەڵ خەزووری کەوت و رۆیشت.

پێش ئەوەی بڕوا بە هێدی گوتی:

" خواحافیز "

ئینجا دەرگای لە دوای خۆیەوە داخست. من و (لون) بە تەنیا ماینەوە.

ئەو رستانەم زۆر بە هێدی و بە ئاسانی بۆ هات کە ئامادەم کردبوون بە تەما بووم پێی بڵێم، لەوانەیە لەبەرئەوە توانیبێتم رستەکانم ئاوها بە ئاسانی دەربڕم، چونکە وەکوو جاران بایەخم پێ نەدەدان.

– جەنەراڵ (لون)، دەزانی من لە تۆ عادز بووم.

– بەڵێ ... بەڵێ ... هەموو لە من عادز بوون.

– جەنەراڵ (لون)، دەزانی قسە لە چ بابەتێك دەکەم.

– دەزانم، دەزانم.

– بەداخەوە، ئەو رووداوە لە ڕادە بەدەر گرنگ نەبوو، بەڵام جەنەراڵ تۆ بۆچی ئەو ئیشەت کرد؟

– تاوانبار بوو... زۆر کەسیشی کوشتبوو.

– ئاخر دیل بوو و دەستی بەسرابووەوە، جەنەراڵ!

– نا، دەستی نەبەسرابووەوە، نا!

– با، با جەنەراڵ، دەستیان بەستووەوە.





رووی کردە دیوار و هۆقە هۆقێکی کزو ناخۆشی لە گەروو هاتە دەرێ.

– جەنەراڵ، پێم وایە، پێشتر یەکێ ئەم پرسیارەی لێ کردووی؟ : ئایا پێشتر کابراکەت دەناسی؟ ئایا لە دەستەکەی خۆتان بوو؟

– نا، نا.

– ئەو وەختە، تووڕە بووی، سەرخۆش بووی.

– نا، نا.

– راستی بڵێ جەنەراڵ. ئەگەر ئەوکاتە سەرخۆش بووی، کارەکەت زیاتر شیاوی قبووڵ دەبێ.

– نا، نا.

– باشە جەنەراڵ، ئەی بۆچی ئەم ئیشەت کرد؟

– ئیتر سەیری دیواری نەدەکرد، ئاوڕی دایەوە و دووبارە چاوی بڕییە من. مەچەکی دەستەکەی تریشی گرتم، دەم و چاوی خستە ناو هەر دوو لەپم، بازووی بە فرمێسکی تەڕ کردم.

– جەنەراڵ، مەگری.

– ئەم گریانە ئۆخژنم پێ دەداو یارمەتیم دەدا.

– تکات لێ دەکەم مەگری.

– لێ گەڕێ بگریم. هەوڵ دە من چۆن لەتۆ گەیشتووم، تۆش ئاوها لەمن بگەی. من لە تیوری تۆ گەیشتووم. لەوانەیە ئەگەر منیش لە جێی تۆ بوومایە، هەر وام بکردایە، دەچوومە لای (لون) دەمگوت: " لۆن، تۆ بۆچی ئەم ئیشەت کرد؟ بۆچی؟ لۆن تۆ دەڵێی شتی جوانم خۆش دەوێ، گوڵی سوورم خۆش دەوێ، ئینجا دەچی ئا بەم جۆرە پیاوێك دەکوژی؟ لون تۆ زەلامکوژی. مەگری! " بەڵام من لەجێی تۆ نیم، من لە جێی خۆمم. بمەوێ و نەمەوێ سەربازم و لە یەکێ لە ئۆردووگاکانی ئەم جەنگە کاردەکەم...

– جەنەراڵ، ئەو ڤیت کۆنگەش سەرباز بوو، سەربازێکی کراس دامەیی بوو، بەڵام هەر چۆنێ بێ سەرباز بوو. ئەویش وەکوو تۆ لە یەکێ لە ئۆردووگاکانی ئەم جەنگە کاری دەکرد.

– ئەو جلی سەربازی لەبەرنەبووبوو، من ناتوانم پیاوێکم قبووڵ بیٚ کە جلی سەربازی لەبەر نەبیٚ و تەقە بکا. دەزانی بەو جۆرە زۆر ئاسانترە، تەقە دەکەی و ناناسرێی.

من پیاوی ڤێتنامی باکووریم قبووڵە چونکە وەکوو من جلی سەربازی لەبەرە، ئەویش بە رادەی من گیانی خۆی دەخاتە مەترسییەوە، بەڵاٚم ڤیت کۆنگ و بە جلی تایبەتی!! ... زۆر تووڕە ببووم، لە تووڕەییان چاوم نەیدەدی. لە دڵی خۆمدا گوتم: "ئۆی ئەوە تۆ ڤیت کۆنگی؟  بەو کراسەی بەرت دەتوانی لە هەر کویٚ بتەویٚ، خۆت بشاریتەوە.."

ئەوەبوو تەقەم لیٚ کرد.

– ئایا ئەمەبوو هۆی راستەقینەی کارەکەت؟

– بەڵیٚ!

– ئەی بۆچی تا ئێستا بە کەست نەگوتبوو.

– لەبەرئەوەی نە پێویستم بە حوکمی خەڵکی ترەو نە پێویستیشم بە بانگەشەیە بۆ خۆم. من لە ئاژاوەی (تەت) سیٚ جار بریندار بووم، هیچ کەس پێی نەزانی. مەگەر تازە بەرامبەر حوکمی چ کەسیٚ بوەستم؟:

بەرامبەر حوکمی پەیامنێران؟ بەرامبەر حوکمی ئەمریکییەکان؟

– دەشیٚ بەرامبەر حوکمی خۆت بوەستی؟

– ئەوە ئیشەکە کراوە. تەنانەت هەنووکەش کە رق و تووڕەییم بووە بە غەم و خەفەت و بە چاوێکی تر سەیری راستییەکان دەکەم، تەنانەت هەنووکەش ...

لە کاری ئەو رۆژەم شەرمەزار نیم و لیٚی پەشیمان نیم. هەندیٚ جاری وا هەبووە، ویستوومە هەستێکی وام هەبیٚ، بەڵاٚم هەرگیز نەمتوانیوە. تۆ پێت وایە من ئینسانێکی خراپم، وانییە؟

– نازانم جەنەراڵ، بە راستی نازانم.

– من لەوەتەی لەسەر ئەم قەرەوێڵەیە راکشاوم، تەنیا بیر لەم بابەتە دەکەمەوە و بەردەوام پرسیار  لە خۆم دەکەم: " ئایا من خراپم؟ "

شەوان، ژانی قاچم زیاتر دەبیٚ، دەترسم جەمسەرەکانی لەگەڵ یەك جۆش





نەخۆن و پاشان قاچم ببڕنەوە ... لەبەر ئەم بیر و غایەلە خەوم لیٚ ناکەویٚ و پرسیار لەخۆم دەکەم: " ئایا خوای ئەو گرتوومی؟ "

دیسان پرسیار لەخۆم دەکەم:" ئایا من بە راستی پیاوێکی خراپم؟".

ئینجا وەڵاٚمی خۆم دەدەمەوە: " نا. بەلانی کەمەوە لەو کەسانە خراپتر نیم کە لەم جەنگەدا بەشدارییان کردووە.

ئەگەر من خراپ بم، ڤیت کۆنگەکانیش خراپن، ئەمریکییەکانیش خراپن، هەروەتۆ هەموو ئەو کەسانەی پێش ئێمە هاتوون وئەوانەی پاش ئێمەش دێن. چونکە جەنگ خراپە، نەك بەشەر! لە جەنگا، تەنانەت باشترین و میهرەبانترین پیاویش خراپ دەبیٚ. لەوانەیە ئەو رۆژە من پیاوێکی خراپ بووبم، بەڵاٚم ئایا ئەو پیاوەی کوژرا، لەمن باشتر بوو؟ تکا دەکەم وەڵاٚمم بدەوە. ئایا تۆ پێت وایە ئەو لەمن باشتر بووە؟"

وەڵاٚمم دایەوە: (نا، لەوانەیە ئەو لەتۆ باشتر نەبووبیٚ.) بۆی هەیە ئەو کەسەی بەدەستی ئەویش کوژراوە، لەو باشتر  نەبووبیٚ. حەزم کرد ئەوەش بڵێم: " بەڵاٚم (لۆن)، ئەم بەڵگەیە بەڵگەیەکی تێرو تەسەل نییە، باشتر بوون یان خراپتر بوونی ئەو، پەیوەندی بە کاری تۆوە نییە. "

لەوکاتەدا چەند جارێك لە دەرگا درا، دوو سەرباز هاتنە ژوورەوە، زەرفێکی گەورەیان پیٚ بوو. (لون) لە گریان وەستا. مەچەکەکانی دەستی بەردام کە زۆر توند رایدەگوشین، سوور هەڵگەڕابوون. زەرفەکە مووچەی مانگانەکەی (لون)ی تێدابوو. دەوری دوو سەد فرانك و قسوور. پێش ئەوەی زەرفەکە بکاتەوە، پێنج قائیمەی مۆر کرد. کە سەربازەکان رۆیشتن و ئێمە دووبارە بە تەنیا ماینەوە، ویستم بڵێم: " بەڵاٚم (لون)، ئەم بەڵگەیەی تۆ بەس نییە، (لون)، ئەمە پەیوەندی بە قسەکەی منەوە نییە. "

داوای حەبەکان و پەرداخە ئاوێکی لیٚ کردم، منیش حەبەکان و پەرداخە ئاوەکەم دایە. سەریشم بڵند کرد بۆئەوەی بە ئاسانی ئاوەکە بخواتەوە.

بە راست ئەوە من بووم کە سەرم بڵند کرد و بە راست ئەوە ئەو بوو کە لیٚ گەڕا من یارمەتی بدەم!! پاشان چەند دەقیقەیەکی تر بە ئارامی قسەمان لەگەڵ یەك

کرد، چونکە ئیتر نەدەگریا. ئەوسا باسی ئەو رۆژگارەی بۆکردم کە لەگەڵ فرەنسییەکان دەجەنگا.

من بە وەڵامی ئەو پرسیارەی لە چاوپێکەوتنی یەکەمم هاتە پێشم، شادو خۆشحاڵ کرد. ئەو رۆژە پرسیارم کرد: " جەنەراڵ، تۆ لایەنگری چ کەسانێکی؟

وەڵامی دایەوە: " خانم، روخسەت بدە، ئەم نهێنییە هەر بۆخۆم بێ. "

– جەنەراڵ، ئایا ئێستا دەتوانی پێم بڵێی تۆ لایەنگری چ کەسانێ بووی؟

– لەگەڵ کۆمۆنیستەکان، لەگەڵ ڤێت کۆنگەکان؟

ئینجا باسی راهیب (تری کانگ) مان کرد. گوتی بۆیە (تری کانگ)م گرت تا لێ نەگەڕێم بکوژرێ: " تا ئێستا دووجار ژیانم نەجات داوە ... ئۆی خودایە ... لەگەڵ ئەوەشدا ئەو نازانێ من ئەم چاکانەم لەگەڵ کردووە. "

پاشان هاتینە سەر باسی ڤێت کۆنگەکان، گوتی: " بەڵێ، ئەوان برادەری ئێمەن، بگرە لە رۆژگاری (ڤێت مین)، شان بە شانی ئەوان دەجەنگام، بەڵام دوای ئەوە ئیتر نەمانتوانیوە هیچ جۆرە لەیەك گەیشتنێکمان هەبێ. "

چیرۆکێکی لە بارەی ڤێت کۆنگەکان بۆ گێڕامەوە. چیرۆکەکە لە بارەی کچێ بوو پۆلیسەکانی ئەو گرتبوویان و ئەو لێ نەگەڕابوو دەست لە کچەکە بدەن:" چونکە هەرگیز نەمدەتوانی بەرگەی شوورەیی ئازار و ئەشکەنجەدان بگرم. "

نەمزانی ئاخۆ ئێستای درۆ دەکا؟ یان کە یەکەم جار چاوپێکەوتنم لەگەڵ کرد درۆی دەکرد؟ بەڵام پاشان لە دڵی خۆمدا بیرم کردەوە کە جاری یەکەم درۆی دەکرد، چونکە ئەو پیاوەی ئێستا بەرامبەرم دانیشتووە، پیاوێکی دروست و نەجیبە. ئەوەندە دروست و ئەوەندە نەجیبە، ئیتر بە ناشیرینی ناکەوێتە بەرچاوم. بگرە لە لەحزەیەکا مەیلەو جوان کەوتە بەرچاوم.

– من ئیتر لەمەودا هیچ حیسابێکم بۆ ناکرێ. ئیتر دەسەڵاتم بەدەست نییە، بەڵام حەزدەکەم بە (جیاپ) و (هوشی مینە) بڵێم: " توخوا وەرن لەگەڵ یەك رێك بکەون، مەبن بە یاری دەستی بێگانان، دەست لە خوێن رشتن هەڵگرن. لەگەڵ یەکتر خاکی و ئازابن. چونکە ئازایی پێویستە بۆئەوەی ئینسان خاکی بێ. بەڵام من ناتوانم قسە لەگەڵ ئەوان بکەم و هیچ رێگا چارەیەك نابینم بۆ براندنەوەی ئەم





بەڵایە.

من پیاوێکی کارکردەم، واقیعیم، و بەبێ ئۆقرەیی چاوەڕێی کۆتایی ئەم جەنگە دەکەم. هەندێ هەن حەز دەکەن هەر لە جەنگ دابن، ژمارەشیان زۆر زۆرە، هەمووشیان باسی ئاشتی دەکەن، بەڵام هیچێکیان بە راستی ئاشتی ناوێ، لەو ماوەیەشدا ئێمە لە کوشت و کوشتار بەردەوام دەبین ...

خەریك بووین قسەمان دەکرد، دختۆر هاتە ژوورەوە. فرەنسییەکی تۆکمەو کەڵەگەت و بەخۆوە بوو بە سمێڵ بوو.

قاچی فەحس کرد و هاواری لێ هەستاند، ئینجا سەری هەڵبڕی و گوتی نابێ شەکەت و تووڕە ببی.

– جەنەراڵ، ئەوە دیسان گریای؟ ها؟

– بەڵێ، گریان ئۆخژنم پێ دەدا.

– وەی خودایە! ئۆخژن! ئێستا بۆ لای من وەرچەرخێ. لێ گەڕێن، ئیسراحەت بکا.

ئینجا من خۆم ئامادەکرد بۆئەوەی بڕۆم و پێش ئەوەی بچمە دەرەوە، لێم پرسی داخۆ پێویستی بە شتێ نییە؟: کتێب، رۆژنامە؟

زەردەخەنەیەکی ئاڵۆزکاوی کرد، زەردەخەنەیەکی پڕ خۆشەویستی و گوتی:

– یەکێکی تر پێش تۆ بیری لەمە کردۆتەوە. ئینجا ئاماژەی بۆ مێزی بەردەستی کردو ژمارەیەك گۆڤاری رەنگاو رەنگ و کاریکاتۆری نیشان دام.

– کێ ئەم گۆڤارانەی بۆ هێناوی؟

– کوڕێکی سەیر! ... بە راستی کوڕێکی سەیرە! ... کوڕێکی نائاساییە ... وانییە؟

بەڵام کوڕێکی مەزنە، دەزانی؟ پێم وایە ئەم گۆڤارانەی لە باوکی دزیوە بۆ ئەوەی بۆ منیان بێنێ. زۆر دەمێکە پێم گوتبوو حەزم لەم جۆرە گۆڤارانەیە.

گۆڤارەکانم ناسییەوە. شەوی پێشوو، لە فرانس پرێس، لەسەر مێزی (فرانسوا) دیبووین.

(٢٥) ی مایس

ئەمڕۆ رۆژی ئاخرمە لە (سایگون). ئەمڕۆ زیاتر حەز دەکەم لە بەڕێوەبەرایەتی بمێنمەوە، لەوەی کە بچم بە شەقامەکاندا بسووڕێمەوە.حەزناکەم بچمە دیار تەقەو ترس و تۆقانی بێ هوودە، وام پێ باشترە لە بەڕێوەبەرایەتی بمێنمەوە و گوێ لەو خوێندنەوە تایبەتییە بگرم کە (دەرك) و (فرانسوا) بۆیان ئامادە کردووم! دەرك پوختە نامەیەکی جوسپائو و فرانسواش کتێبەکەی پاسکالی بە دەستەوە گرتووە. هەرکەسە لە پشت مێزەکەی خۆی دانیشتووە، بە نۆرە قیت دەبنەوە و ئەو نووسینەی بە دەستیانەوەیە، دەیخوێننەوە.

(دەرك): دوێنێ فڕۆکەکانی (ب– ٥٢)، دوازدە جار رۆژئاوا و باکووری رۆژئاوای (داکتۆ)و باشووور و باشووری رۆژئاوای (میتۆ) و رۆژهەڵات و باشووری رۆژهەڵاتی (هوی – ئان) یان بۆمبا باران کرد. سەدو بیست و سێ ئەرکی هەوایی تریش بەڕێوەن."

(فرانسوا):"ئینسان ئەوەندە شێتە، شێت نەبوونیشی، خۆی لە خۆیەوە جۆرە شێتییەکە. "

(دەرك): ئێستا حاڵی حازر، لە پارێزگاکانی: (کانگ تری) و (کانگ نام) و (تو ئاتین) و (کانگ تین) و (تون تانگ) و (هونگیا) و (باکزوین) شەڕی خوێناوی بەردەوامە. سەربازانی هێزی دەریایی ... "

(فرانسوا): " کیلۆپاترە ئەگەر کەپووی نەختێ بچووکتربایە، رەوتی دونیا دەگۆڕا. "

(دەرك): " زیانی دوژمن: سەدو سێ نەفەر لە سەربازەکانی ڤێتنامی باکوور، حەفت کیلۆمەتر لە باکووری رۆژهەڵاتی (دونگ گا) کوژران. سەدو بیست و دوو نەفەر، چوار کیلۆمەتر دوور لە باشووری رۆژهەڵاتی (داکتۆ) و سی و سێ نەفەر، حەفت کیلۆمەتر دوور لە باکووری رۆژهەڵاتی (فومی) و پەنجاو سێ نەفەر، دە کیلۆ مەتر دوور لە باکووری رۆژاوای (هوی ئان)، کوژران.

(فرانسوا): بۆچی دەمکوژی؟ چ بووە؟ ئەی تۆش لەوبەری ئاو ناژیت؟

هاوڕێکەم، ئەگەر تۆ لەم بەری ئاو بژیابای، من بە کوشتنی تۆ بە زەلامکوژ دادەنرام و کوشتنی تۆ کارێکی دادپەروەرانە نەبوو، بەڵام لەبەرئەوەی تۆ لەوبەری





ئاو دەژی، کوشتنی تۆ بە کارێکی دادپەروەرانە دادەنرێ و هەموو کەس من بە پیاوێکی ئازا دەزانێ."

قسەم پێ بڕی و گوتم: " تۆ رۆژێ لە رۆژان ئاوها باسی جەنگت بۆمن کرد:

– جەنگ یارییەکە بۆ رابواردنی جەنەراڵەکان

– ئێستا تۆ دەبێ شێوەی ئەم یارییەم فێر بکەی.

(فرانسوا)، پاسکالی لەسەر مێز دانا و وەڵامی دامەوە، گوتی:

– شێوەی یارییەکە زۆر ئاسانە: دێنن پارچە ئاسن لە گۆشتی بەشەر رادەکەن. پارچەی گەورە و بچووك و نووك تیژ و چوار گۆشەو وردوخڕ.

بە هەرحاڵ دەبێ پارچە ئاسن بن و هەموو کەس بەو پارچە ئاسنانە پارچە پارچە بکەن و بیانکوژن.

(دەرك) گوتی:

– بەڵام بێ گومان بە ئاسنی سروشتی نا، بەڵکو بە ئاسنی دەستکردی بەشەری هوشیار و ئاگادار. ئەو بەشەرەی بەم دواییە مانگیشی خستۆتە ژێر رکێفی خۆیەوە.

فرانسوا گوتی:

– بێ گومان ئاسنەکە دەبێ لە بەهرەی تەکنیك و بەهرەی کیمیا و بەهرەی حیساب و بەهرەی زانستی دروست کرابێ. زۆربەی ئەو وڵاتانەی باشترین بەهرەیان کۆکردۆتەوە، تا ئێستا زیاترین پارچە ئاسنیان لە جەستەی بەشەر راکردووە.

ئینجا فیشەکێکی برۆنزی بەدەستەوە گرت درێژی دوو سانیمەتر و ئەستووری نیو سانتیمەتر بوو، بە پەنجە گەورەو شادە نوێژە گرتی و نیشانی منی داو گوتی:

– ئەمە فیشەکە، وانییە؟ تەنانەت دەتوانم بڵێم زۆر جوانیشە. فیشەکێکی (ئیم – ١٦) یە. یەك دانەی بەسە بۆئەوەی ئینسانێك بکوژێ، بێ ئەوەی پێویست بە دەستڕێژی گوللە بکا. چونکە خێراییەکەی لە خێرایی دەنگ نزیکە. کە دەڕوا دەتوانێ، بە تەواوی لەنگەری خۆی رابگرێ و کە بە نیشانە دەکەوێ، وەکوو

فیشەکێکی ئازا و دلێر و ئاسایی ناچێتە ناو گۆشت، نا، تەنانەت پارچە گۆشتێکیش راستەوراست نابڕێ، بەڵکو دەسووڕێ و گۆشتەکە دەدڕێنێ و بەماوەی چەند دەقیقەیەك چی خوێنت لەلەشدا هەیە هەمووی بەتاڵ دەکا. ئەندازیارە تەکنیکارەکان بەم هونەرکارییە دەڵێن (Tumbling Action) – تەقلە لێدان"!

ئەمە زۆر لە فیشەکی (دوم) کاریگەرترە کە بە نایاسایی داندراوە. فیشەکی (ئێم – ١٦) یاساییە چونکە توانای لە سنووری خۆی دایە! ئایا دەزانی ڤیت کۆنگەکان ژمارەی برینداریان کەمە؟ چونکە ڤیت کۆنگەکان بە زۆری بە (ئێم – ١٦) دەپێکرێن، بۆیە ماوەیەکی زۆر بە برینداری نامێننەوە، هەرزوو دەمرن.

ها بگرە، ئەمە بە یادگار لەگەڵ خۆت بەرە بۆ نیویۆرك! تۆ لە کاتێکا کە تەماشای ئەم فیشەکە دەکەیت و تام وچێژ لەسەیرکردنی وەردەگری، بیر لەوەش بکەوە کە ئەم فیشەکە بەرهەمی لێکۆڵینەوەیەکی گەلێ زۆرە. بێ گومان بارووتێکی تایبەتییان بۆ ئەم فیشەکە نەدۆزیوەتەوە، تەنیا ئەوەندەیە توانیویانە جۆرە بارووتێکی تایبەتی بۆ سازبکەن: بارووتی (دوپن)، چونکە (دوپن) نایەڵێ شت لەناو تفەنگ گیربخوا.

فیشەکەکەم وەرگرت و تەماشام کرد و چێژم لە سەیرکردنی وەرگرت. بە راستی بە شێوەیەکی بەرز دروست کراوە. باشە، دەبێ چ کەسێ ئەمەی داهێنابێ؟ پیاوێکە! رۆژێ، ئەم پیاوە بە هەموو سەبر و حەوسەڵەو زانست و خەیاڵبازی و تەکنیکی خۆیەوە دانیشت و شێوە و کێش و بارووت و loolە و شوێنی ئەنگاوتنی حیساب کرد. ئینجا لەو هەموو حیساباتەی وێنەیەکی کێشا و پرۆژەیەکی دانا، پاشان پرۆژەکەی خۆی بۆ خاوەنی کارخانەیەك پێشنیارکرد و خاوەنی کارخانەکە زۆر بە خۆشییەوە لێی کۆڵییەوەو بانگی تەکنیکارەکانی خۆی کردو داوای لێ کردن نموونەیەکی لەو فیشەکە بۆ دروست بکەن، لەهەمان کاتدا زۆر وریابن خاوەن کارخانەی تر بەم رازە نەزانن نەوەکوو بیرەکەی لێ بدزن.

تەکنیکارەکان دەستووری خاوەن کارگەکەیان جێ بەجێ کرد،ئینجا بەوپەڕی شادی  نموونەی فیشەکەکەیان پێشکەش خاوەنی کارخانەکە کرد، ئەویش بە





جۆرێ تەماشای فیشەکەکەی کرد وەکوو ئەوەی یەشم یان زمڕووت بێ.

گوتی:

" ئێستا با بزانین باش ئیش دەکا یان نا؟ "

ئەوسا هەر بۆ تاقی کردنەوە، فیشەکەکەی لەبەر تفەنگ راکرد و تەقاندی، بەلاَم بە چ کەسێکی وەنا؟ بە چ شتێ؟ لەوانەیە بە سەگێك، یان بە پشیلەیەك، یان لەوانەیە بە پارچە ئاسنێکی وەنابێ. بە هەرحاڵ، بێ شك بە هیچ ئینسانێکیەوە نەناوە. خۆ ئەگەر من بوومایە لەجێی ئەو، ئینسانێکم بۆ ئەم تاقی کردنەوەیە دەست نیشان دەکرد. بۆ نموونە داهێنەرەکە خۆی، یان خاوەنی کارخانەکەو یان هەردووکیان. بەلاَم، نا. دەزانم خاوەن کارخانە و داهێنەرێکی زۆر هەن هێشتا ساغ و سەلیمن! ...

پاشان خاوەنی کارخانەکە راوێژکارەکانی لە دەوری مێزێکی دارجاو دادەنێ و فیشەکەکەیان پێ نیشان دەداو پێشنیاریان بۆدەکا بڕیاری لەسەر بدەن و بیچەسپێنن و ملیاردەها  نموونەی لێ دروست بکەن بۆ ئەوەی بە سوپای بفرۆشن تا سوپاش لە ڤێتنام بەکاریان بێنێ.

راوێژکارەکان پێشنیارەکەی قبووڵ دەکەن و ئەنجام، سەیری ئەم کارخانە پڕ کرێکارە بکە کە فیشەك دروست دەکەن، سەیری ئەو کرێکارە پرۆلیتاریانە بکە کە مارکس  پارێزگارییان لێ دەکاو سەندیکاکەیان دەستیان لە پشت دەدا و هانیان دەدا.

ئەو کرێکارە ئازایانە هیچ گوناهیان نییە، گوناە گوناهی خاوەن کارخانەکانە و تەواو!

کرێکارەکان، ئەو کرێکارە کلۆلاَنە ئیشیان تەنیا گوێڕایەڵیی دەستوورەکانە. هەر چۆنێ بێ، ئەوانیش دەبێ چەرخی ژیانی خۆیان بسووڕێنن، دەبێ خاوو خێزانەکانیان بەڕێوە ببەن، دەبێ ئوتومبێلی بەقیست بکڕن. ئەی وانییە؟  ئایا ئەوان کات و توانای ئەوەیان هەیە بیر لەم جۆرە گرفتە بکەنەوە؟ ها؟ جا ئەوان فیشەکەکە دروست دەکەن و زۆر بە سەلیقە و حەوسەڵەو بە وردیش ئیشی خۆیان جێ بەجێ دەکەن. ئەو فیشەکەی کەم و کورتییەکی لە دروست کردنەکەیا هەبێ،

دووبارە دروستی دەکەنەوە: ئەگەر فیشەکەکە ناتەواو بێ، ئەگەر نەتوانێ گۆشت بدڕێنێ و پارچە پارچەی بکا، ئەگەر نەتوانێ هەموو خوێنی پیاوێکی بیست ساڵەی پێست زەرد بڕێژێ، (یان خوێنی پیاوێکی سپی، یان خوێنی پیاوێکی رەش، بە هەرحاڵ فەرق ناکا، چونکە ئەوانی تریش ئەم فیشەکانەیان هەیە.) ئەو کاتە دووبارە دروستی دەکەنەوە بۆئەوەی بە تەواوی، بێ خەوش و کەم و کورتی دەربچێ.

لەمۆسکۆ و پەکین، یان لەهەر جێگایەکی دی کە کارخانەی دروست کردنی ئەم جۆرە فیشەکەی لێ نەبێ، دەوڵەت خۆی کارخانەیەك دادەمەزرێنێ و فیشەکەکە دروست دەکا. هەرچۆنێك بێ، کرێکارەکان هەر ئەو کرێکارانەن و لەوانەیە چالاکتر و فەرمانبەردارتریش بن. زۆر حەزدەکەم سەردانی یەکێ لەم کارخانانە بکەم: چ لە (شیکاگۆ) بێ و چ لە (کییێڤ)و چ لە (شەنگەهای).

حەز دەکەم بەباشی تەماشای هەموویان بکەم: کرێکارەکان و سەرۆك بەشەکان و خاوەنی کارخانەکان و ئاخیری داهێنەرە بەڕێزەکەش. چونکە ئەم داهێنەرە لە هەر هەموویان گرنگترە. ئەمە باوکی سەربڕگە (مقصلە) ی دروست کردووە و باپیریشی سێدارە!

ئەم داهێنەرە، باوکی پیاوێکی ئازا بووە، باپیریشی پیاوێکی ئازا بووەو خۆیشی پیاوێکی ئازایە.

لێم مسۆگەرە کە: نشتمانپەروەرێکی باش و مێردێکی وەفادارو باوکێکی دڵسۆزە. چ لە (شیکاگۆ) بژی و چ لە (نیویۆرك)و چ لە (لوس ئەنجلس)، مەسیحییەکی خاوەن بڕواشە. ئەگەر کاتۆلیك بێ، یەك شەموان دەچێتە کڵێسەو جومعان بەرۆژوو دەبێ و گۆشت ناخوا.

ئەگەر ئەندامی لیژنەی پاراستنی گیانلەبەران بێ، جاروبار نامەیەك لە دژی قەتڵ و عامی (سەگاو)ەکانی (برجن) یان (هالیفاکس) دەنووسێ:

" جەنابی شارەوانی بەڕێز!

بەوپەڕی ناڕەحەتی باسی رووداوی ئەو قەتڵ و عامەم بیست کە هەموو ساڵێ لە شارەکەی ئێوە دەکرێ. بیستوومە هەموو ساڵێ لە شارەکەی ئێوە بێچووە





سەگاوە بێ گوناهەکان دەکوژن. بە زیندوویی، لەبەر چاوی دایکیان، پێستیان کەوڵ دەکەن، ئینجا دایکەکان کوێر دەکەن بۆئەوەی لەناو باخی گیانداران، بۆ خۆشی و رابواردنی خەڵك، تۆپ تۆپێن بکەن ... "

ژنەکەی دەڵێ: من چیتر قاپووتی کەوڵی سەگاو لەبەر ناکەم. حەزدەکەم ژنەکەی ببینم. دەمەوێ گەردانەیەکی پێشکەش بکەم. گەردانەیەك لەو فیشەکانەی مێردەکەی دایهێناون. داوای لێ دەکەم گەردانەکە لەگەڵ قاپووتی کەوڵی سەگاو لەبەربکا. ئەم دووانە بەیەکەوە شتێکی جوان و رێکیان لێ دەردەچێ.

(فرانسوا)، فیشەکەکەی لە دەستم وەرگرت و گوتی:

– زۆر بیری لێ مەکەوە. هێمن بەرەوە!

– تۆ پێت وانییە، داهێنەری ئەم فیشەکانە بە بیستنی قەتڵ و عامی سەگاوەکان، ناڕەحەت ببێ؟

زەردەخەنەیەکی تاڵ و ناخۆشی کردو گوتی:

– حەفتەی بووری، ئاشنایەتیم لەگەڵ پیاوێکی چینی خەڵکی (هۆنگ کۆنگ) پەیدا کرد. پیاوێکی نەرم و دڵسۆز و لە سەرەخۆ بوو. داوەتی کردم بۆ چێشتخانەیەکی (هۆنگ کۆنگ). چێشتخانەکە بە خواردنێکی تایبەتی بەناوبانگە. هەڵێنە، چ خواردنی تایبەتی هەیە!

– چ خواردنێکی تایبەتی؟

– مێشکی مەیموون. ئەویش دەزانی چۆن؟ بە خاوی.

کابرای چینی بۆی باس کردم کە مەیموونەکە دەگرن و بە زنجیر دەیبەستنەوە، دەیبەنە لای مشتری بۆئەوەی مشتری بە ئاگری جگەرە شوێنی جیاجیای لەشی مەیموونەکە بسووتێنێ، یان بە چەقۆیەك لەشی مەیموونەکە کون کون بکا.

بۆ نموونە چاوەکانی. مەیموونەکە لەبەر ئێش و ژانی خۆی شێت دەبێ. کە شێت بوو، خوێن دەپەڕێتە کەللەی. ئینجا مەیموونەکە دەگرن و تەق! کەللەی دەشکێنن و مێشکی بە خاوی و بەخوێن و خورەوە دەخۆن. زۆر بەتامە!

ئاسمانی (سایگون) هەورە. (با) ی کەژوەری دەریا، هەورەکە بەرەو (داکتو) داژوا. کاتی هەڵکردنی (با)ی وەرزی نزیك بۆتەوە. ئەو وەرزەی گەورەترین قەتڵ و

عامی سەگاو و مەیموونانی تێداکراوە.

" مەیموون تا شێتتر ببێ، مێشکی بەتامتر دەبێ! "

گۆڤارێکی وێنەدار، وێنەی سەگاوێکی بڵاوکردبووەوە، بەچاوێکی بێ گوناهانە تەماشای دەکردم، ئەمە تێی گەیاندم کە دڕندەیی بەرامبەر گیان لەبەر و نیمچە گیان لەبەر، یەك سەرچاوەی هەیە. پاشان هەر لەو گۆڤارە خوێندمەوە کە هەموو ساڵێ سەدو هەشتا هەزار سەگاوو بێچووە سەگاو بە زیندوویی کەوڵ دەکەن. ئەگەر ئەم قڕانە هەروا بەردەوام بێ، لەمڕۆوە تا ساڵی (١٩٧٢) و ئەو پەڕەکەی تا ساڵی (١٩٧٥) ئەم گیان لەبەرە تۆ و توخماتی لەسەر زەوی دەبڕێتەوە ..".

راستە قەتڵ و عامی سەگاو دەبێ کۆتایی پێ بێ، ئەی قەتڵ وعامی بەشەر؟ دەڵێن: جەنگی ڤێتنام تا ئێستا نیوملیۆن کوژراوی داوە، بگرە هەندێك دەڵێن: هەشت سەد هەزار!!

(فلیکس) هاواری کرد و گوتی:

– چۆنە داوا لە ئەنجوومەنی پاراستنی گیان لەبەران بکەین، ئەرکی پاراستنی گیان لەبەرێکی تریش بگرنە ئەستۆ کە ناوی بەشەرە؟

(فرانسوا) هەستاو کە ویستی بڕوا گوتی: دەچمە (چولون) و زوو دەگەڕێمەوە.

(فلیکس) بۆی باس کردم (فرانسوا) ئەو ماوەیە هەموو ئیش و کاری بۆتە چوونە (چولون)، هەروەها گوتی: " فرانسوا  هەمیشە دوودڵ بوو لە چوونە (چولون) و رقی لەوێ دەبووەوە، کەچی ئێستا ئەوە چەند رۆژە لەسەر یەك دەچێتە (چولون).

ئەگەر لێی بپرسم: بۆچی دەچیتە (چولون)، دەڵێ: دەمەوێ بزانم ئەو دوکانە عەنتیکە فرۆشەی، بە زۆری شتی لێ دەکڕم، ماوە یان نا؟

یان دەڵێ: دەمەوێ (لوان) ببینم.

(لوان) هیچ پەیوەندی بە (لون)ەوە نییە. سەرۆکی پۆلیسی شارەوانییە. پێش دوو حەفتە تفەنگێکی (أ.ك – ٥٢)ی بە دیاری دایە (فرانسوا).

لەوکاتەدا دیم و بە پیاوێکی ئازا کەوتە بەرچاوم. بەڵام تفەنگەکە پاکەتە فیشەکی لە گەڵدا نەبوو. ئەم فرەنسییە شێتە، کە، نەهەرگیز چۆتە راوو نە





دەتوانێ تەنانەت مێردەزمەکانیشی بکوژێ، بەدوای پاکەتە فیشەکێکدا دەگەڕێ بۆ تفەنگی (أ.ك – ٥٠) . بەڵام من دەزانم ئەم قسەیەی (فلیکس) راست نییە. دەزانم (فرانسوا) بە ئیشێکی تر دەچێتە (چولون)، بۆئەوەی بیسەلمێنێ کە هێشتا زیندووە خۆی دەخاتە مەترسییەوە. ئەمە کۆنە یارییەکی شێتانەو و خۆ سەلماندنە.

ئەمە تاقی کردنەوەیەکە هەمیشە بەهۆی جەنگەوە بۆت دابین دەبێ.

(فرانسوا) حەز ناکا لە (ڤێتنام) بڕوا، پێی خۆشە تا ئاخر دڵۆپەی بخواتەوە. هەقیەتی. منیش کاتێ بیرم دەکردەوە سبەی لێرە دەڕۆم، وەکوو ئەو پەست و غەمبار بووم.

ئایا ئەمە شتێکی سەیر و سەمەرە نییە؟

<u>شەو</u>

بە چاوی زەق و لە قەپێلك دەرپۆقیوەوە هاتە ژوورەوە و گوتی: هەر وەخت بوو بمکوژن. " رەنجەرەکانی ڤێتنام و ڤیت کۆنگەکان تەقەیان لە یەکدی دەکرد. فڕۆکەکانیش چڕە دووکەڵێکی زۆریان بە ئاسماندا بڵاوکردبووەوە. من وام زانی لەناو ئەم دووکەڵە کەس من نابینێ. بەڵام منیان دی. بێ شك رەنگی کاڵی پانتۆڵەکەیان دیبووم و: تەق! تەق! تەق! خۆم فڕێ دایە سەر شۆستە، چیتر تەقەیان لێ نەکردم. ئینجا هەستام و رام کرد و دووبارە: تەق! تەق! تەق! دیسان خۆم فڕێ دایە سەر زەوی و خۆم مراند. بیست دەقیقە بەبێ جووڵە لەوێ مامەوە و ئێستاش ئەوا لێرەم.

– (فرانسوا)، تۆ بۆچی ئەم ئیشانە دەکەی؟ بە کەڵك چ دێ؟

– بە کەڵکی ئەم ئیشە دێ!

وای گوت و دوو پاکەتە فیشەکی (أ.ك – ٥٠) ی لەسەر مێز دانا.

– ئەمانەت بۆ چییە؟ چییان لێ دەکەی؟

– هیچ! هیچ سوودیان نییە.

– (فرانسوا)، راست بڵێ. من دەزانم تۆ بۆ پەیداکردنی پاکەتە فیشەك نەچووبوویتە (چولون)!

– مەعلووم بۆ نەچوو بووم.

– (فرانسوا)، ئایا حەوسەڵەت لە جەنگ نەچووە؟

– با، بێ گومان حەوسەڵەم چووە. ئەی ئەوە نییە دەبێ دوای ماوەیەکی تر لێرە بڕۆم؟ ئەی نابینی دەرگای ڤێتنامم داخستووە؟ بەلاّم هەندێ جار حەزدەکەم دەرگاکە بکەمەوە و دووبارە سەیرێکی ناوی بکەم... تێ گەیشتی؟ ... لە جێ هێشتنی ڤێتنام، نارەحەتم.

– (فرانسوا) تۆ هێشتا نەرۆیشتووی، پەشیمان بوویتەوە.

– بەڵێ، وایە.

– چ جۆرە پەشێمانییەك؟

– تۆ بیربکەوە، من لەوە نارەحەتم کە چیرۆکەکە بە کۆتایی ناگەیەنم و بە نیوەچڵی لێی دەگەڕێم. من دەمەوێ تا کۆتایی تەماشای بکەم، وەکوو ئەوەی کە تراژیدیای (دالاس)م بینی، تا ئەوەی کە (روبی) تەقەی لە (سوالد) کرد. (روبی) کاتێ کە چووە پێش و تەقەی کرد، لە تەك من وەستابوو. دەمەوێ لێرەش، ڕۆژێ ببینیم (روبی) گوللە بە (سوالد)ەوە دەنێ.

– هەروەها منیش. کەواتە ئەی بۆچی دەڕۆی!

– لەبەرئەوەی منیش وەکوو تۆ ناتوانم هەموو ژیانی خۆم لەڤێتنام بەسەر ببەم، لەبەر ئەوەی لە شوێنی تری دونیا، زۆر شت هەن بیانبینن. لەبەرئەوەی دەزانم ئەم جەنگە درێژە دەکێشێ.

– (فرانسوا)، من وابزانم تۆ غەم بۆ ڤێتنام دەخۆی. وەکوو چۆن هەموو ئەوانەی کە لێرە دەڕۆن، غەمی بۆ دەخۆن.

– دەزانم، چوونە بەرازیلیش بۆ من هەر هیچ خۆش نییە. دەزانم هەر جارەی کە سەیری دەریای بەرازیل دەکەم، دەریای ڤێتنامم بیردەکەوێتەوە. هەر گاوێ کە بەرازیل لەبەر خۆرەتاو گەرم دادێ، خۆرەتاوی ڤێتنامم بیردەکەوێتەوە.

دەزانی؟ ئەم وڵاتە بچووکە زۆر شتی بە ئێمە بەخشیوە. ویژدانی بەشەراتی پێ بەخشیوین. لە بیرتە پاسکال لەبارەی جەنگ چی گوتووە؟

– بەڵێ.





– کاتێ کە ناچاربین حوکم بدەین، کاتێ کە دەبێ بجەنگین و بکوژین، کاتێ کە دەبێ ئەم هەموو ئەسپانییە بە مەرگ مەحکووم بکەین، تەنیا یەك کەس دەبێ بڕیار لەسەر ئەم ئیشانە بداو تەنیا هەر ئەویشە کە ئەم کارەی بەلاوە خۆشە، ئەویش هەڵبەت کابرایەکی سێیەمی بێ باکە!

– راستە. من پێم وایە کە من، ئەو پیاوە سێیەمە بێ باکەم. ئەوەش بڵێین ئێمە لێکۆڵینەوەکانمان لە بارەی جەنگ هەمیشە زۆر جوان و دروست بووە، بەلاّم پێویست ناکا زیاد لە رادەی خۆی تف لە رووی ئەو کارە بکەین کە پێی دەڵێن (قارەمانێتی). بەرگری کردن لە بەشەر، تەنیا مانای ڕێ گرتن نییە لە قەتڵ و عامی جەستەیی، بەڵکو مانایەکی تری وشەکە، یارمەتیدانە بە مانەوەی بەشەر و بە بونی بەشەرێتی، هەندێ جاریش دەبێ لە پێناوی بەشەرێت بمرین.

– نا، ئەمە نا. من ئەمەم قبووڵ نییە.

– چۆن! چۆن! ئەم میللەتە بچووکەی کە دژی بەهێزترین سوپای دونیا جەنگیوە و هەر دەشجەنگێ، کە ماوەی چەند ساڵی بەردەوام، جگە لە گوللەی (ئێم – ١٦) و بۆمبای ناپاڵمی دووسەد و پەنجا، یان پێنجە سەد کیلۆیی هیچی تری نەدیوە، بێ ئەوەی خۆی بە دەستەوە بدا، ئەو میللەتە بچووکە کە شانۆی پێشاندانی هەموو خراپەو بێ شەرمی و چڵێسی و چاوچنۆکی ئێستا و ئایندەیە، لەگەڵ هەموو ئەمەشدا خۆی بەدەستەوە نادا. ئەم میللەتە بچووکە کارێکی وا دەکا کە تۆ جەنگت قبووڵ بێ، چونکە ئەمانە تاکە میللەتێکن کە ئەمڕۆ لە پێناوی ئازادی دەجەنگن. کاتێ کە ئەم گەلۆرە چاکانە، بەپێ خاوسی، تانك داژۆن، کە شەو ناخەون بۆئەوەی هێرش بکەن، کە بە تەنیایی دەمرن، چونکە هیچ وێنەگرێك لە کاتی مردن وێنەیان ناگرێ مەگەر دوای مردن، ...

ئاشکرایە غەم بۆ ڤێتنام دەخۆم. ڤێتنام مەیدانی قارەمانانەترین جەنگی ڕۆژگاری خۆیەتی و هەرگیز ناتوانێ بەبێ (قارەمانێتی) بژی.

ئایا بە راست ناتوانی؟ من لەگەڵ ئەم قسەیەیدا نیم، یان لەگەڵیدا نابم. من لە سەردەمێکی ژیانی خۆما، ئەوەندەم قارەمانێتی دیوە، وەڕس بوویم. لە ڤێتنامیش وەرس بووم، ئێستا ئیتر ئەم دیدار و ئەم بینینەی کاری قارەمانێتی رەت

دەکەمەوە. چونکە ئەگەر قارەمانێتی قبووڵ بکەین، دەبێ جەنگیش قبووڵ بکەین، من نەپێویست دەکا جەنگ قبووڵ بکەم و نە دەمەوێ قبووڵی بکەم و نە دەشتوانم قبووڵی بکەم. ئەگەر پێم بڵێن: ئێستا نۆرەی سویسرایە، من وەڵام دەدەمەوە: دروست کردنی پەنیری چاك و چوكلاتی نایاب و ئەو سەعاتانەی زۆر باش كاردەكەن، بە هیچ جۆرێ شتی خراپ نین. ئێستا ئەم سارووخە نووربەخشە نەفرەتییانە، وەكوو ئەستێرەی كوشندە، لە ئاسمانی تاریك دێنە خوارێ و دوای نەختێكی تر دەنگی تەقینەوەیەك دێ و ئینجا یەكی تر و یەكی تر و دیسان یەكی تر.: (ب — ٥٢) ئەمشەو كاری خۆی دەكا و بەرەبەری بەیانی كە ئەو كاری خۆی تەواوكرد، ئەوسا نۆرەی هاوەنی ڤیت كۆنگەكان دێ جڵەوی یارییەكە بگرنە دەست.

دەنگ بڵاوە كە شەوی رابردوو ساروخێك بە نەخۆشخانەی منداڵات كەوتووە و بەشی كۆرپەڵەی نەوزادە تەقیوەتەوە. سێیان كوژراون دوازدەش بریندار بوونە. دەڵێن ئەمە سەرایی ریزە بۆمبا بارانێكە بەتەمان لەناو شاری بدەن تەنیا بۆ ئەوەی مێشكی خەڵكەكە هوشیار بكەنەوە بیانوروژێنن و كاریش بكەنە سەر گفتوگۆی ئاشتی پاریس. سەراپای سایگۆن وەكوو نێچیرێكی تۆقیو وایە. دەوڵەمەندەكان خاوو خێزانیان رەوانەی كەناری (سن ژاك) كردووە، ئەو دەوڵەمەندانە قەت نامرن چونكە زۆربەی كات دەتوانن بە پارە خۆیان لە چنگ مردن رزگار بكەن.

بەڵێ، (فرانسوا)، ئێمە بۆ ئەوە نایەینە دونیا تا تەنیا پەنیر و چۆكلات و سەعات دروست بكەین، بەڵكو بۆ ئەوە دێینە دونیا تا بە شانازی موعجیزەی لەدایكبوون تەی بكەین و بۆئەوەی دژی جیاوازی و بێدادی و كۆیلەیەتی راست بینەوە. ئەو گەلۆرە چاكانەی كە (ئەزكورا) و (كانتول) و (بریچ) و (پیگوت) و (لارامی) ی و ئینسانی تری زیندوویان كوشت كە نەدەبوایە بیانكوژن ... ئەمانە، بەراستی گەلۆری چاكن.

من زۆر بە ناڕەحەتی و بە گیانێكی هەراسان ئێرە جێ دێڵم.

<u>(٢٦) ی مایس</u>

دەچمە ئەوروپا، چەند رۆژێك لە (فلورەنسا) دەمێنمەوەو پاشان دەچمە





(نیویۆرك).

ماڵاواییم لە هەموو دۆست و برادەران كرد، لەوە دەكا ئیتر یەكدی نەبینینەوە. هەندێ لەو خودا حافیزییانە بە غەم و پەژارە و ناڕەحەتی بەرێوە چوون. وەكوو ئەوەی كە خاترم لە (تورنتا) ی سەفیری گەورەمان خواست. گوتی: " بۆی هەیە لە شوێنێكی تری دونیا، دووبارە یەكتر ببینینەوە، بەڵام هەڵبەت ئەو دیدار، جیاوازییەكی زۆری لەگەڵ ئەم دیدارە دەبێ. "

(فلیكس) یش هەر ئەم قسەیەی كرد. (فلیكس)ی داماو دەبێ سێ ساڵی تر لە سایگۆن بمێنێتەوە.

پێم گوت:

– واتە، تۆ كۆتایی جەنگ دەبینی.

گوتی:

– من جارێك، لە (١٩٥٤)، كۆتایی جەنگم بینی. تەنیا بۆئەوە لێرە دەمێنمەوە تا پایانی جەنگی ڤێتنام ببینم، بەڵام هەموو جارێ، كە كۆتایی جەنگێك دەبینم، دوا بە دوای ئەوە سەرەتای جەنگێكی تر دەبینم ... بە هەرحاڵ، ئەگەر لە كۆتایی جەنگ لێرە نەبم، بێ شك كاتی دەست پێ كردنی جەنگێكی تر لێرە دەبم.

(فرانسوا) ئەم گۆرانییەی گوت:

" دادە گەورەی باش

– بیر دەكەمەوە چینییەكان دەبینین

بەڵام هیوادارم بە ماوەی مانگێك كەمتر

رۆڵەكانمان بیانبەزێنن

ئەوسا من یەكێ دەبم لەوانەیپلەیان پێ دەدرێ. "

ئەمە گۆرانییەكی فۆلكلۆری (برتون)ی (تیۆدۆر بۆترل)ە. نامەی سەربازێكی فرەنسییە كە پێش سەد ساڵ چووبووە شەڕی دژی ئالاّ رەشەكان.

وا یەك سەدە بەسەر ئەمەدا تێدەپەڕێ، ئەوان وایاندەزانی جەنگی ڤێتنام لە مانگێك زیاتر درێژە ناكێشێ.

(فرانسوا) تا فڕۆكەخانە بەرێی كردم. كە (فرانسوا)م جێ هێشت ئەوەندەم

بەلاوە ناخۆش نەبوو، وەکوو ئەوە وابوو کە یەکێ جێ بێڵم بە شەمەنەفەری دواتر بەدوامدا بێ.

شەرمەزار بووم بەرامبەر بەو گومان و دوودڵییەی دوێ شەو لەکاتی گفتوگۆدا لەگەڵ (فرانسوا)، بۆم پەیدا بوو. گفتوگۆکەمان لەسەر ئەوەبوو کە: بەبێ قارەمان ناتوانین بژین، بەڵام ئەگەر قارەمان قبوول بکەین دەبێ جەنگیش قبوول بکەین. من چاوم بڕیبوە ئەو فڕۆکە فانتۆمانەی لە گۆڕەپانی باشووری رۆژاوا هەڵدەفڕین بۆئەوەی بچن قارەمان دروست بکەن. کە دوا فانتۆم هەڵستا، ئەوەندە بە شوێنیا روانیم تا لەناو هەور بزربوو، ئینجا ئەم دوعایەم بە ورتە ورت گوت کە شەوی پێشوو بۆخۆم رێکم خستبوو:

" ئەی خودای ئاسمانان، قەتڵ و عامی ئەمڕۆمانت لە ئێمە چاو نەبێ، لەو بەزەیی و عیشق و شارەزاییەی مەسیحی کورت پێی بەخشیوین، رەهامان بکە. "

(فرانسوا) گوتی:

– ئەوە چ بوو خوێندتەوە؟ تەرجەمەی کە!

– ئاخیری بۆت تەرجەمە دەکەم، ئەو رۆژەی کە قسەکانم بەراست بگەڕێ.

– ئاخر لە بارەی چی بوو؟

– ئاخ! پەیوەندی بە ئازار و ئەشکەنجەدانی خۆمەوە هەیە. دوو دڵم لە کارەکەم و لەم بارەیەوە هیچ جۆرە قسەیەك قبوول ناکەم، ئایا بەلای تۆ، ئەم کارەی من دەرمانی دەردی کەس دەکا؟

هەرچی کە باس بکەیت و روونی بکەیتەوە و راپۆرت بنووسی، ئەوان هەر لە کوژران و کوشتنی خۆیان بەردەوام دەبن. (فرانسوا)، ئەم کارەی من بە کەڵکی هیچ نایەو دەرمانی هیچ دەردێك ناکا.

– روون کردنەوە و پێشاندانی گەلۆری و خراپەی بەشەر، هەرگیز بێ فایدە نەبووە، بێ گومان ئەگەر بڕوامان بە بەشەر هەبێ.

– ئەمە، ئەو گوتی. زۆر حەزدەکەم قسەکانی راست دەربچێ!





## بەشی یازدەم

دەبینی، هێشتا پرسیارەکەی (ئیلیزابێتا) م لە بیر نەکردووە: " ژیان، یانی چی؟".

بە درێژایی ئەو چەند مانگە بە دوای وەڵامێکدا دەگەڕام لەو وەڵامە باشتر بێ کە پێش سەفەرەکەم بۆ ڤێتنام، دابوومەوە:

" ژیان، ماوەیەکە لەنێوان ئەو کاتەی کە لە دایك دەبین و ئەو کاتەی کە دەمرین... "

بەڵام وەڵامێکی بەدڵی خۆمم دەست نەکەوت. ئایا راستە نیگەرانی و پەشۆکانی خۆت بۆ منداڵێك باس بکەی؟ من ویستم شتێکی وابکەم، بەڵام پاشان بیرم کردەوە: " چیرۆکەکە بە هەقایەتی کەروێشکی بچکۆڵەو پەروانە و فریشتەی پاسەوان تەواو بکەین. چیرۆکەکە بە تەفرەدانی هەمیشەیی تەواو بکەین، پێی بڵێین: کە تۆ دێیتە دونیا، دونیات وەکوو موعجیزەیەکی پڕ چاکی و پاکی نیشان دەدەن، پاشان کە گەورە بووی، ئەوسا تێ دەگەی پەروانە لە سەرەتا کرم بوونە و کەروێشك یەکتر هەڵدەدڕن و فریشتەی پاسەوان وجوودی دەرەکییان نییە: چ دەبوو ئەگەر هەر لە سەرەتای لەدایکبوونتەوە، راستیمان پێ گوتبای!؟ ".

هەموو شتێ لەو هاوینەدا بەرێوە چوو، کە هات و سێبەری دڕندەیی و زۆرداریی و بێ بەزەیی بەدواوە بوو.

ئەرێ تۆ هاوینی (١٩٦٨)ت لەبیرە؟

من دوازدە سەعات دوای کوژرانی (رۆبەرت کەنەدی) گەیشتمە ناو نیویۆرك. لە نیسان (مارتن لۆتەر کینگ) کوژرابوو و لە حوزێران (رۆبەرت کەنەدی) یان کوشت.

لەناو خوێنەوە هاتبووم بۆئەوەی بگەڕێمەوە ناو خوێن. دەم و چاوی خڕی

سـەرحان بەشـارە سـەرحان و چـاوەکانی، کـە وەکـوو چـاوی بـەراز وابـوون، نەیانتوانی دوودڵی من بەرامبەر بە گەشبینی بگۆڕن.

تەنانەت کورسی کارەبایی کۆمەڵێ شارستانیش کە حوکمی لە سەرحان بەشارە سەرحانی کرد لەسەری دابنیشێ، نەیتوانی بەرامبەر بە بەشەرییەت گەشبینم بکا.

ئەو ئەگەر لە جەنگ، مەیلی گوللە باران و ئینسان کوشتنی نەبوایە، لەباتی کورسی کارەبایی، نیشانی خزمەت کردنی نیشتمانیان لە بەرۆکی دەدا. بە هەرحاڵ، ئەگەر چاومان لەسەر کوشتنی (رۆبەرت کەنەدی) بۆ لایەکی تر وەرگێڕین، چ دەبینین؟:

وێنەی ئەو منداڵانە دەبینین کە لە (بیافرا)، لە برسان مردن. ئاژاوە و پشێوی رووسەکان لە رووداوی بەهاری (پراگ) دەبینین دژی پیشەسازی وەستانی قوتابیانی بۆرژوازی دەبینین کە (چی ڤارا) رەت دەکەنەوە بۆئەوەی لەگەڵ دایە و بابە، لە هەوای خۆش و لەناو خزمەتکار و بە ئوتومبێلی دوا مۆدێلی باباجان و بلووزی دانتیل و یانەی شەوانە، بژین.

وەرە (ئیلیزابێتا)، هەر چۆنێ بێ من هەقایەتەکانت بۆ دەگێڕمەوە:

– تۆ ئەم پیاوە قژ زەردە بەرێزە دەبینی کە یەك یەك پێدا دێ دەستی خەڵکەکە هەموویان دەگوشێ و چاك و خۆشییان لەگەڵ دەکا بۆئەوەی بیکەن بە سەرۆك کۆمار و لەپڕ دەکەوێ و ئیتر هەڵناسێتەوە؟

ئەمەیە ژیان!

– تۆ ئەم منداڵە رەشە دەبینی کە لە کەللەی سەری،تەنیا کاسەکەی ماوە؟

ئەمەیە ژیان!

– تۆ ئەم سەربازە دەبینی کە بە پێی پەتی بە چۆڵ و بیابان دا دەڕوا و لەپڕ فڕۆکە دەگاتە سەری و تەقەی لێ دەکا؟

ئەمەیە ژیان!

– تۆ ئەم ریزە تانکە زرێپۆشە دەبینی کە نیشانەی ئەستێرەی سووریان بە سەرەوەیە؟





ئەمەیە ژیان!

– تۆ ئەم گێل و گەمژە و گەلۆرە قژ درێژە دەبینی کە پێی وایە خەریکە شوورە بە دەوری خۆیدا دەکێشێ، بەبێ ئەوەی خۆیشی بزانێ بۆچی وا دەکا؟

ئەمەیە ژیان!

هەر لەوکاتەشدا، نوێنەرانی بێ شەرم و حەیای دەسەڵاتدار، دەیانەویست لەو هۆڵانەی چرای گرانبەهایان تیا داگیرساوە و مافووری مەخمەڵیان لێ راخراوە و دروشمی زێڕینییان پێدا هەڵواسراوە، دەیانەویست (ئاشتی) بدۆزنەوە.

جەنەراڵ (کی) ژنەکەی دەباتە گرانترین گەڕەکی پاریس (فوبورسن ئونوری)، نوێنەری بەرەی ئازادی میللی قژی سادەی لای سەرتاشێکی پاریسی چا دەکا.

لەولاشەوە، هەر نامەی جەرگبڕە لە سایگۆنەوە دێ. (فرانسوا) نووسیویەتی:

" ئەوە دە رۆژە سایگۆن لە ترس و فەرتەنەیەکی تازەدا دەژی. هەر ساروخی ڤیت کۆنگەکانە بەناو شار دەکەوێ. شەقامی (تودو)، شەقامی (لە لوی)، شەقامی (کیا لونگ) و شەقامی (پاستۆر) هەموو تەواو وێران بوونە و لەناوچوون. ساروخێکی (١٢٢) بە دیواری گەراجەکەی من کەوت و کونی کرد، ساچمەکانی لەناو ڤێلاو لەناو باخ کەوتوون،.ڤێلاکەی دراوسێشمان وێران بووە. شەو گوێمان لە دەنگی هاویشتنی ئەو ساروخانە دەبێ و ئینجا دەبێ بە دنیایەکە کش و مات و پاشان دەتەقێتەوە. زۆربەی هەرە زۆری هێزەکەیان تەقە دەکەن، زۆربەی هەرە زۆری هێزی خۆیان، زیاتر لە هەموو شوێنێ، لە گەڕەکەکەی ئێمە خستۆتە کار. ئەو خانووەی ماڵی (فلیکس)ی تێدابوو، زەرەری زۆری پێ گەیشتووە. سەعات شەشی بەیانی، ساروخێك کەوتە ناو داڵانی خانووەکەی و دوو ژن بە ساچمەکانی بێ سەر بوون. شەقامەکان پڕن لە کەل و پارچەی بۆمبا و بریندار و جەستەی بێ گیان. چەند ساروخێکی تریش بە بەرێوەبەرایەتی بەرید کەوتوون، یەکەو راست بە ئامێری دەنگ و باس کەوتوون. راستەوخۆ بەو شوێنەی تۆ هەموو رۆژێ دەنگ و باست لێوە دەنارد.

پەیکەری مریەمی پاکیزە، کە بەرامبەر کڵێسە بوو، تێك و پێك چووە. رەنگە بزانی کە کەلانتەر (لوئان)، ئەو مرۆیەی تفەنگەکەی دامێ، بە ساروخێك کوژرا کە

هیلیکۆپتـەرێکی ئـەمریکی بـە غەڵـەت هاویـشتبووی. راسـتی، بـەبێ ئـۆقرەیی چاوەڕێ دەکەم بچمە (ریۆدۆ جانیرۆ) ..."

(تۆرنتا)ی سەفیری گەورەمان نووسیویەتی:

" خەسان بە تەواوی لەگەڵ خاک بۆتە یەک، دەق وەکوو ئەوەی گەسکیان دابێ ئاوها تەخت بووە و پاک بۆتەوە.

بە هەرحاڵ، خەسان ئیتر شوێنی کەس نییە. هەموو بە وێدا تێدەپەڕن. بەڵام کـەس لـەوێ لانـادات. شـارە چـۆڵەکانی تـریش وەزعیـان وەکـوو خەسـان وایـە. (داکتو)ش سەرەڕای ئەو کوشتارەی داویەتی، بە ئەنجامی خەسان دەگات.

جەنەراڵ (لون) قاچی نەبڕاوەتەوە، دەڕوا بەڵام دەشەلێ. بۆتە پیاوێکی تەواو! ئەو گۆڕانە ئەخلاقییەی تۆ تیا کەشفت کردبوو، بە هانایەوە نەهات. هەموو کاتی خـۆی بـە قومـار بەسـەر دەبـا. هـەموو پیاوەکـانی و هـەموو دەسـەڵاتێکیان لێ سەندۆتەوە. ئێستا سەرهەنگ (تران وای هان) لەجێی ئەو بۆتە سەرۆکی پۆلیس. ئەمـەیان پیـاوێکی رازقـایم و کەمـدووە و زۆر لـە (لـون) رەقـترە. لـە بـارەی خۆشمانەوە، هیچ قسەم نییە بۆت بنووسم. لە دەنگی بۆمبا راهاتووین ..."

ئەگـەر ئـەو هاوینـە پرسـیارت لێ کردبـام، رۆحـم لـە چ بارێـک دایـە؟ وەڵامـم دەدایتەوە: هیچ!

گەڕانەوەم بۆ ئاشتی، ئەوەندە جێی نائومێدی بوو بۆ من، کە ئیتر بیرم لە هیچ شتێ نەدەکردەوە. تەنانەت بە دوو دڵیش خۆمم نەجات نەدەدا. بڕوا بە بەشەر بوون و جەنگان لە پێناوی بەشەر، لەپای چی؟

شانازی کردن بەوەی بەبەشەر هاتووینەتە دونیا، نەک بە درەخت و ماسی و کەمتیار، لەپای چی؟

بـە مـن مـەڵێ: حـوکمی پـەیامنێر، سـەبارەت بـە رووداوی نائاسـایی، شـێوەی واقیعـی خـۆی لەدەسـت دەدا و هـەرگیز حـوکمێکی دادپەروەرانـە نـابێ. ئایـا لـە راستیدا، چارەنووسی بەشەر بە رووداوی ئاسایی بەسراوەتەوە، یان بـە رووداوی نائاسایی پەیامنێرێک؟

مێـژوو: ئایـا ئـەو پیـاوە چاکانە دروسـتی دەکـەن کـە تـەنیا شـت دەبیـنن و بـە





سـەرەڕۆیی تێدەپـەڕن، یـان ئـەو بەدکارانـە دروسـتی دەکـەن کـە بـە ئالاکانیـان نیشانەی راست لەسەر کوشتار و زەلامکوژی دادەنێن. ئایا بولدۆزەری جادەساز مێژوو دروست دەکەن، یان ئەو تانکانەی جادە وێران دەکەن و تێکی دەدەن؟

مـن دەڵـێم: ئـەم تانکانـەن کـە مێـژوو دروست دەکـەن، چـونکە مـن خـۆم هـەرگیز نەمبیستووە یەک پیاوی چاک رەوتی دونیای گۆڕیبێ.

تۆ دەڵێی: بەڵێ.

دە کەواتە ڤێتنام و بیافرا و رۆژهەڵاتی ناوەراست و چیکۆسلۆڤاکیا و سەرحان بەشار سەرحان و ناڕەزاکانی بۆرجوازیم بۆ روون بکەرەوە. بۆم روون بکەرەوە و بۆم بسەلمێنە، بۆئەوەی منیش شانازی بەخۆم بکەم کە بە بەشەر لەدایکبووم، نەک بە درەخت و ماسی و کەمتیار!

پاشان رووداوێکی تر قەوما. پایز داهات و یاری ئۆلمپیادی مەکسیک!

من یەکسەر کەوتمە ناو قەتڵ و عامێک، قەتڵ وعامێکی زۆر لەو قەتڵ و عامانە خراپتر کە لە جەنگ دیبوومن. چونکە لە جەنگا، پیاوی چەکدار تەقە لە پیاوی چەکدار دەکا. ئەگەر باش بیربکەینەوە، دەبینین جەنگ لە ژێرەوە مانای سزادان و تۆڵە سەندنەوەی تێدایە. تۆ من دەکوژی، منیش تۆ دەکوژم. یان بە پێچەوانەوە. بەڵام لە قەتڵ و عامدا، دەتکوژن و تەواو!

جگە لەو سێ سەد کەسەی کە بڵاویان کردۆتەوە کوژراون، هەندێک دەڵێن: ئەمشەو پازدە کەسی تریش کوژراون: منداڵ و ژنی دووگیان و گەنج!!

قـەتڵ و عـامی (ئـەروود). (ئـەروود)، کـە هـەردەم دووبـارە لـەدایک دەبێتـەوە بۆئەوەی مەسیح لە دونیای ئینسان بباتە دەرەوە، پێش ئەوەی کە ببێ بە بەشەر.

ئەو رووداوەش گەرداوێکی وای لە رۆحی من هەڵگیرساند کە دووبارە گێڕایەوە شوێنی ئەسڵی خۆی.

(ئیلیزابێتا) وەڵامی پرسیارەکەتم دۆزییەوە!

وەڵامەکەتم بە سێ برین دۆزییەوە کە ئێستاش جێیان بە لەشمەوە دیارە.

تۆ پێم دەڵێی: "جا سێ برین شتێکی ئەوەندە گرنگە؟! "

دەزانم راست دەکەی. سێ برین شتێکی زۆر کەمە، شتێکی ئەوەندە گرنگ نییە.

ئەگەر بڵێی بە هۆی مەترسی کارەکەمەوە ئەم سێ برینەم کەوتۆتە لەش، دیسان قسەکەتم قبووڵە. کە چوویتە ناو شەڕ، کەمترین شت بەسەرت بێ، لەوانەیە بریندارببوون بێ. چ زوو چ درەنگ. بە هەرحاڵ، دەزانی؟ ئەگەر ئەو سێ برینەم نەبوایە، زیاتر هەستم بە زەبوونی دەکرد. چونکە دیسان ئەم پرسیارە لەخۆم دەکەم: ئایا هاتنە دونیا بە کەڵك چ دێ؟ مردن بە کەڵك چ دێ؟ مردنی ئەو کەسانەم بەلاوە بێ هوودەبوو کە بەدەستی کەسانی تر کوژران. وەکوو سووسە ماری ژێر خۆرەتاو مامەوە: بێ باك و بێ جووڵە، تەنیا لەبەر سستی و تەمبەڵی خۆم جاروبار باوێشکم دەهاتێ. من پێش قەتڵ و عامی (ئەروود)، پێش گەرداوەکە ڕۆحم، ئاوها بووم.

ئێستاش داوام لێ بکە ئەو ڕووداوەی لە دووی تشرینی یەکەمی (١٩٦٨) قەوما و ئەو وەڵامەی لەوێ دەستم کەوت، بۆت باس بکەم:

ئەوێ گۆڕەپانێکی لێیە پێی دەگوترێ گۆڕەپانی سێ کولتور. چونکە سێ کولتووری مەکسیك لەوێ کۆبوونەتەوە: ئازتەك، بە کەلاوەی هەرەمێکی ئازتەك، ئەسپانیا بە کلیسایەکی سەدەی شازدەم، مۆدەرن بە بینایەکی هەور بڕی مۆدەرن.

دەزانی؟ گۆڕەپانەکە گۆڕەپانێکی فراوانە، زۆر ڕێگای دێتە سەرو زۆر ڕێگای لێ دەردەچێ. بەلاش نەبوو قوتابیان ئەم گۆڕەپانەیان بۆ خۆپێشاندانی دژی (ئەروود) هەڵبژاردبوو.

قوتابی و کرێکار و مامۆستا و هەموو ئەو کەسانەی زاتی ڕووبەڕووبوونەوەی (ئەروود) یان هەبوو و لە مەکسیك پێیان دەگوترێ شۆڕشگێڕ، بەڵام لە ڕاستیدا ناویان سۆشیالیستە. بەڵام چ سۆشیالیستێك؟ هەژارەکانی کۆماری فیدراڵی مەکسیك لە هەموو هەژارەکانی دونیا هەژارترن.

لە لادێ، حەفتەی دەست حەقیان تەنیا حەفت فرانکە و ئەگەر دەم بکەنەوە بە تەقەی ڕەشاش دەمکوتیان دەکەنەوە. قوتابیان دژی ئەم کارە ناڕەزایی دەردەبڕن. قوتابی نەیاندەویست ئەو سەربازانەی کەرەستەی لێکۆڵینەوەکانیان دەشکاندن، زانکۆیان لێ داگیربکەن و لەناو شانۆی نیمچە بازنەییان سەنگەر بگرن، ئیتر ناڕەزاییان دەردەبڕی.هۆیەکی تری ناڕەزایی دەربڕینیان ئەوە بوو نەیاندەویست





یاری ئۆلمپیاد لە مەکسیك بکرێ.

ئەوان دەیانگوت: " ئەم یارییە لەعنەتییانە ملیاردەها ئەسکەناس خەرجییان لە ئێمە دەوێ. شورەییە ئەم هەموو پارەیە لە یاری ئۆلمپیاد خەرج بکرێ، کەچی میللەتەکەمان لە برسان بمرێ.

دەزانی؟ قوتابی مەکسیکی وەکوو قوتابی ئیتاڵی و فەرەنسی و ئینگلیزی و ئەمریکی نین. ئەوان سواری ئۆتومبێلی دوا مۆدێل نابن، بلووزی دانتێل لەبەر ناکەن، زۆر شارەزای ئەم لاو ئەولا نین. ئەوان کوڕە جوتیار و کوڕە کرێکارن، تەنانەت هەندێ جار خۆیشیان کرێکاری دەکەن.

با باسی گۆڕەپانەکە بکەین:

گۆڕەپانەکە لە شێوەی لاکێشەدایە. لایەکی ئەم لاکێشەیە بە پیادەڕۆیەکی باریك کۆتایی دێ و لایەکەی تری بە پلیکانەیەك کە دەچێتە باڵەخانەیەك پێی دەگوترێ ( چی هوئا هوئا ).

(چی هوئا هوئا) بەسەر هەموو شوێنێکدا دەڕوانێ. لەسەر ئەوێوە، کڵێسەی ئەسپانی و کەلاوەکانی ئازتەك لەلای دەستە چەپ و باڵەخانەی هەوربڕ لە لای دەستە ڕاست و پیادەڕۆی باریك لە دواوە و پلیکانە لە ژێرەوە دەبینین. هەر نهۆمێکی (چی هوئا هوئا) شانشینێکی هەیە دە مەتر درێژ و پێنج مەتر بەرین، لەگەڵ مێردڕەوێکی نزیکەی یەك مەتر بڵند و پەنجەرەیەکی سێ مەتر بڵند. دەبێ ئەندازەکان بزانین بۆئەوەی باش تێ بگەین دواتر چۆن توانییان لە هیلیکپتەرەکانەوە تەقەی لێ بکەن. دەتتوانی لە پلەکانی لای چەپە، یان لای ڕاستە، یان بە (هەڵکێش – ئەسانسۆر) بچیتە شانشینەکانەوە. دەرگای هەڵکێشەکە لە لای درێژایی باڵەخانەکە دەکرێتەوە، کەچی دەرگاکانی هاتنە ژوورەوەی باڵەخانەکە لەلای بەرینایی دەکرێنەوە.

ئایا باش بۆم ڕوون کردیتەوە؟ شانشینەکان جێی زۆر فراوان بوون. هەریەکە بە فەراحی پەنجا کەسی دەگرت و جێی زۆر لەباربوون بۆ گوتاردان و قسەکردن لەگەڵ جەماوەری خەڵك. ڕابەرانی قوتابییان هەمیشە نهۆمی سێیەمیان هەڵدەبژێرارد، بێ گومان بە ڕوخسەتی خاوەن ماڵەکان. ئینجا میکرۆفۆن و

ئالآكانیان لەسەر مێردڕەوەكە دەچەقاند و لەوێ گوتاری خۆیان دەدا. من چوار ڕۆژ پێش پێشاندانی نارەزایی ئەوان، لەسەر ئەم شانشینە بووم.

ئەوان لەوێ كۆبوونەوە بۆئەوەی یادی كوژراوەكانی حوزێران و كۆتایی ئەیلوول بكەنەوە.

كە ئەم خۆپێشاندانەم بینی، لە ركان و تووڕەییان گەرووم گیرا، دەزانی؟ باران دەباری، دونیا تاریك بوو، كوڕەكان لەبەر باران و تاریكی، بەبێ جووڵە وەستابوون. پاشان باران لێی كردەوەو یەكێ تەڵە شقارتەیەكی داگیرساند، ئینجا یەكێكی تر تەڵە شقارتەیەكی داگیرساند و پاشان هەموویان، هەریەكە تەڵە شقارتەیەكی داگیرساند، وای لێ هات سەرلەبەری ئەو گۆڕەپانە بوو بە بڵێسەی بچووك بچووك، لە پلەكانەوە تا پیادەڕۆ. نازانم یەكەم جار كێ ئەو بیرەی بۆهات كە ڕۆژنامەیەك بكرێ و بیكا بە چراوگ، ئینجا هەموو لاسایان كردەوە و هەریەكە چراوگێكی بە ڕۆژنامە دروست كردو كۆبوونەوەكەیان بوو بەیەك چاوگ و چراخان. ریزە چراوگێك، بەدەم دووركەوتنەوە، بەیەكەوە گۆرانییان دەچڕی:

.Goya .goya .chachu .chachu .rara .

chachu .rara .agoy .goya .universided

ئینجا تاقمێكی تر ئەم گۆرانییەیان دەگوت:

Gueu .gueuc .goria .ala .chachi .chachi .porra!

Gueu .pin .porra .politecnico .politecnico .goria !

پرسیم: " ئەم گۆرانییە مانای چییە؟ " گوتیان: " هیچ مانای نییە، تەنیا گۆرانییە. گۆرانی منداڵانە! " لەبەر ئەوەی ئەم قوتابییانە، ئەم قوتابییە بەسامانە كە مەترسییەكی گەورەبوون بۆ یاری ئۆلمپیاد و شان و شەوكەتی دەوڵەتی مەكسیكی، لەناخەوە لە منداڵ زیاتر نەبوون، من زیاترخۆشم ویستن، چونكە منداڵانێ بوون بە پەرۆشی منداڵان و پاكی منداڵان و رووگەشی منداڵان. پاشان بووین بە هاوڕێ. یەكەم هاوڕێم (موزە) بوو. (موزە) كرێكارێكی هێڵی ئاسن بوو. لە بەشی تەكنیكی ناوی خۆی نوسیبوو. نازك. شەرمن. قژ قاوەیی، كراسێكی كۆنی زیوار زیوار و چاكەتێكی پینەی لەبەربوو. هەوەسی بەوە دەهات كە من





چووبوومە ڤێتنام، دەیگوت: " مس ئوریانا، ڤیت كۆنگ، زۆر ئازان! بەڵێ زۆر ئازان! "

هاوڕێی دووەمم (ئانجلۆ) بوو. قوتابی فیزیا و بیركاری بوو، سوێندی تەنیا بە سەری (ماوتسی تونگ) و بیتلەكان دەخوارد. دەم و چاوێكی لاوازی هەبوو.

ئینجا (ماری بێلا)، كە كچێكی عازەبی هەژدە ساڵی بوو، لێوی شەكر باریشی نەبایە، هەر كچێكی قشت و خشكۆك بوو. دووچاوی ئارام و شادو تینووی ژیانی هە بوو.

ئینجا (سوقرات)، كە كوڕێكی قەڵەو بوو، سمێڵی هەبوو، دەق وەكوو (ئیمیلیانۆ زاپاتا)، شۆڕشگێڕێكی وابوو ئامادەبوو هەموو شتێ بكاتە قوربانی. ئاخیریش (جی ڤارا) كە خەریكە دیپلۆمی فەلسەفە دەسەنێ. بێدەنگ و سەنگینە.

ئەو چوار شەممەیە بەیانییەكەی چووم چاوپێكەوتن لەگەڵ جەنەراڵ (كتو)ی سەرۆكی پۆلیسی شار بكەم، ئەوانم كەوتەوە یاد. جەنەراڵ (كتو) ئەوكەسەیە كە دەیگوت: " پەیامنێر هەمیشە زێدەڕەوی دەكەن! " هیچ روونادا، هەر هیچ. ئەم قسانە هەموو درۆن. كەس تەقە لە قوتابییان ناكا. ئێمە هەقمان بە كۆبوونەوەی ئەوان نییە. بە هەرحاڵ، من خۆم روخسەتی ئەم كۆبوونەوەم پێداون. "

تێگەشتی؟ ئەو خۆی روخسەتی رێكخستنی ئەم كۆبوونەوەیەی دابوون و دەیگوت:

" هیچ روونادا. "

بەلآم هەر خۆی پێشتر دەستووری دابوو:

" تەقەیان لێ بكەن! "

كۆبوونەوەكە، بڕیار بوو سەعات پێنجی دوای نیوەڕۆ بكرێ. من سەعات پێنج كەم چارەكێك گەیشتمە ئەوێ. ئەوكاتە نیوەی گۆڕەپانەكە پڕ ببوو. دەوری چوار هەزار كەس دەبوون. پۆلیس هیچ شوونی دیار نەبوو. چوومە سەر شانشینەكە و لەوێ (سوقرات) و (چی ڤارا) و (ماری بێلا) و (موزە) و پێنج شەش كوڕی ترم بینی نەمدەناسین: قوتابییەكی كونسرواتوار، كە ئیتاڵی دەزانی، یەكێكی تری قژ رەش و بە گڵوازە و یەكێكی بلووز سپی كە وەستام بۆئەوەی باشتر تەماشای

بکەم. لەبیرمە زۆر سپی بوو.

پرسیارم لێ کردن: بارودۆخ چۆنە؟

گوتیان: " باشە! ".

لەبەرئەوەی پۆلس نەبوو دەیانتوانی بە سەر (گاسکو سانتو توماس) یش دا بڕون. لەوکاتەدا ئانجلۆ بە هێنکە هێنك و ڕەنگ پەڕیوی هات و گوتی:

– من زۆر بە زەحمەت توانیم خۆم بگەیەنمە ئێرە. سوپا ئابلۆوقەی داوین. ئێستا دوو سێ کیلۆمەتر لێرە دوورن، بە لۆری و تانك هاتوون. من خۆم ڕەشاش و بازوکەم پێ دیتن. بەسەر (گاسکو سانتو توماس) دا ڕۆیشتن وەکوو خۆکوشتن وایە.

(چی ڤارا) پرسی:

– بەرەو گۆڕەپان دێن؟

– بەڵێ پێم وایە بۆ گۆڕەپان دێن.

(ماری) بێلا گوتی:

– کەواتە با لێ نەگەڕێین جەماوەر زیاتر بێنە ناو گۆڕەپانەکە.

(چی ڤارا) گوتی:

– بەڵام شتی وا چۆن دەکرێ؟

پەنجەی بۆ جەماوەرەکە درێژ کرد کە چرکە بە چرکە زیاتر دەبوو.

– سەیرکە، دەوری هەشت نۆ هەزار کەس دەبن، جگە لە قوتابییان: منداڵ. ئەو منداڵانەی حەزدەکەن بێنە ئەم جۆرە کۆبوونەوانە و ژنیش. ژنی کوڕ کوژراوو سك سووتاو!

کارمەندانی فەرمانگەی برووسکەو هێڵی ئاسن لە تەنیشت پلیکانە وەستابوون و چەند لافیتەیان هەڵکردبوو، لەسەریان نوسرابوو:

– ئێمەی کرێکارانی هێڵی ئاسن پشتگیری بزووتنەوەی قوتابییان دەکەین. پۆلی خوێندن سەربازخانە نییە!

– کۆماری دکتاتۆر و تاوانباران!!!

(موزە) بە خەفەتەوە تەماشای دەکردن، چونکە ئەو داوای لێ کردبوون بێنە





ئەوێ.

– ئەمانە برادەری منن، مس ئۆریانا، برادەری منن!

– منداڵینە، ئێوە دەبێ شتێ بکەن. دەبێ ئەو خەڵکە ئاگادار بکەنەوە!

– کێ قسەیان بۆ دەکا ؟

– سوقرات، پێویستە سوقرات قسە بکا.

سوقرات گوتی:

– زۆر باشە. لە مێردڕەوی شانشینەکە نزیك کەوتەوە، میکرۆفۆنی بە دەستەوە گرت. دونیا خەریك بوو تاریك دادەهات.

– سوقرات پێیان بڵێ هێور بنەوە.

– زۆرباشە.

– بەڵام باسی مانگرتنی خواردنیشیان بەبیر بێنەوە.

– زۆرباشە.

لێوی دەلەرزی. زۆرباش لەبیرمە سمێڵیشی دەلەرزی.

– هاوڕێینە ... سوپا، بە هەزاران سەربازی چەکدار ئابلۆوقەی داوین. هێور بنەوە. پێیان نیشان بدەن کە خۆپیشاندانەکەمان خۆپیشاندانێکی ئاشتیخوازانەیە. هێوربنەوە، هاوڕێینە ... ناچینە (گاسکو سانتو تۆماس).

کە کۆبوونەوەکە تەواو بوو، پەرتە بکەن و بڕۆنەوە ماڵی خۆتان...

– سوقرات، باسی مان گرتنی خواردن بکە.

– دەمانەوێ ئاگادارتان بکەینەوە کە بۆ دەربڕینی ناڕەزایی بەرامبەر یاری ئۆلمپیاد، ئەمڕۆ لە خواردن مان دەگرین ... ئەم مان گرتنە، لە ڕۆژی دووشەممەوە، لە ناوچەی گۆلی ئولمپیاد، دەستی پێ دەکات و ...

لەوکاتەدا، هیلیکۆپتەرێك لە ئاسمان دەرکەوت. هیلیکۆپتەرێکی سەوزی سەربازی. دەق شێوەی وەکوو ئەوانە وابوو کە لە ڤێتنام دیبوومن. بەدەم خوولانەوە، هەر نزم بووەوەو نزمتربووەوەو نزیك کەوتەوە دەق وەکوو ڤێتنام. دەنگی بەهێزتر بوو، دەق وەکوو ڤێتنام. لەدڵی خۆمدا گوتم: " نا، ئەم ئیشەی ئەوانم پێ خۆش نییە! " لە کاتێکا کە خەریك بووم بیرم لەم مەسەلەیە دەکردەوە،

هیلیکۆپتەرەکە دوو بۆمبای نووربەخشی هاویشت، دەق وەکوو ئەو بۆمبا نووربەخشانەی لە ماوەی چەند مانگێك لە ڤێتنام دیبووم. ئەمانە ئەستێرەی کلکداری ترسناك بوون، دووکەڵێکی رەشیان لە دوای خۆیانەوە جێ دەهێشت.

ئەستێرەیەك بەرەو لای ئێمە هاتە خوارێ و یەکێکی تر بۆلای کەنیسە چوو.

هاوارم کرد:

– وریابن، ئەمە نیشانەی دەسپێکی ئیشەکەیانە.

بەڵام کوڕەکان شانیان هەڵتەکاند و گوتیان:

– بڕۆ، بابە، بڕۆ، نیشانەی چی!

بە سووربوونەوە گوتم:

– بۆمبای نووربەخش داوێن بۆئەوەی ئامانجی گوللەیان دیاری بکەن.

– تۆ ئێستاش، بە چاوی ڤێتنام شت دەبینی.

– سوقرات، قسە بکە، قسەبکە!

– هاوڕێینە، لە کەناری گۆلی ئۆلمپیاد کۆدەبینەوە و ...

بەڵام ئەم جارە نەیتوانی رستەکەی تەواوبکا، دەنگی لەناو دەنگی تانك و لۆری بزربوو. تانك و لۆری لە کۆڵان و پیادەڕۆ و هەر رێیەکی لەو گۆڕەپانەکەی دەکردەوە، هاتن و ڕژانە ناو گۆڕەپانەکە. سەربازەکان بە هات و هاوار، تفەنگ بەدەست لە لۆرییەکان دادەبەزین. رەشاشیان لەسەر پێ بوو. گێل و گەمژە بووین ئەگەر نەزانین ئەمانە چاوەڕێی یەك دەستوور دەکەن.تەنیا یەك دەستوور!

لەپڕ هەموو لە مەسەلەکە گەیشتن و پێیان پێوەنا، هەڵاتن. ئیتر رێگای هەڵاتن نەبوو. گۆڕەپانەکە ببوو بەیەك پارچە، یان یەك قەفەسی دەرگا گیراو. سوقرات رەنگی بزڕکابوو، میکرۆفۆنی بە دەستەوە گرت و گوتی:

– هاوڕێینە، را مەکەن، ئەمە تەنیا وروژاندنە. هێوربنەوە، هێوربنەوە.

دەنگی یەکەمین تەقە هات. ئەمە، ئەو دەستوورە بوو کە سەربازەکان چاوەڕێیان دەکرد. چونکە دوای تەقەی یەکەمین، یەکسەر دەنگی تەقە لە پیادەڕۆ و کەنیسە و باڵەخانەی هەوربڕ و لەژێر پلەکانەوە بەرز بووەوە.

بازنەیەکی ئاگری. دەقیقە بە دەقیقە ژمارەیان زیاتر دەبوو. زۆر باش شارەزای





ئیشی خۆیان بوون. تەڵەیەکی بە راستی بوو!

بوو بە کەلەش بەربوونەوە: تەق! تەق! تەق! یەکەم کەلەشم بینی بەربووەوە، کەلەشی کرێکارێك بوو. داری لافیتەیەکی بە دەستەوە بوو، لافیتەکە لە سەری نووسرابوو:

" کۆماری دکتاتۆر و تاوانباران!!!! "

رایدەکرد، لافیتەکەی فڕێ داو خۆیشی بۆ پێشەوە چەمایەوە، لەتری دا وەکوو چۆن کەروێشك کە گوللەی پێ دەکەوێ قەلەمباز داوێ، ئاوها. پاشان هەست و خوستی لەبەر بڕا. دووەم کەلەشم بینی بەربووەوە، کەلەشی ژنێك بوو جلێکی زەردی لەبەربوو، بەڵام ئەویش کە گوللەی پێ کەوت، یەکسەر بەرنەبووەوە. یەکەم جار دەستەکانی وەکوو خاچ لێك بووەوە، ئینجا وەکوو چۆن درەخت بە توندی بەردەبێتەوە، ئاوها بەربووەوە. لە هەموو لایەکەوە هەر کەلەش بوو بەردەبووەوە. دەزانی، تەرمێکی زۆر لەسەر پلیکانە کەوتبوون. هەموو لە هەموو یەکتریان پاڵ دەداو رایان دەکرد و کەس نەدەگەیشتە پایەی کۆتایی. دەزانی؟ من ئەمەم لە راپۆرتێك بۆ رۆژنامەکەم نووسی. ئەم دیمەنە، شەڕی ناو (پۆتەمکین)ی بەبیر ئینسان دەهێنایەوە.

حەشیمەتەکە بە پلیکانەکەدا رایان دەکرد و بەردەوام گوللە دەیئەنگاوتن. کەلەش دەکەوتنە سەر پلیکانە و بەسەر سەردا بەردەبوونەوە، یانی یەکەم جار سەریان دەهاتە خوارێ و پێیان لە پایەی سەرەوەتر دەجەڕا. پیرەژنێکی ڕەشپۆشم بینی، دەق بەم شێوەیە دەهاتە خوارێ و دامەنی کراسی هەڵکرابوو، مایۆی بە دەرەوە بوو. دیمەنێکی ناشیرین بوو. لەو راپۆرتەی بۆ رۆژنامەکەمم نارد، باسی ئەم دیمەنەشم کردبوو. بەڵام هیچم لەبارەی دیمەنەکانی تر نەنووسی بوو. چونکە لەبەرئەوەی بریندار بووم، کەوتمە نەخۆشخانە و زۆر بە ئازار بووم، تازە عەمەلیاتیان کردبووم مێشکم مەیلەو شڵەژا بوو. بۆ نموونە لە راپۆرتەکەما باسی ئەو کوڕەم نەکردبوو کە تەمەنی دەوری دوازدە ساڵ بوو، دەستی بە دەم و چاوییەوە گرتبوو و رایدەکرد، یەك رێژنە گوللەی بە سەری کەوت و نزیکەی هەر هەموو پێستی سەری هەڵگرت و یەك کانی خوێن فیچقەی کرد. پاشان کوڕێکی

ترم بینی خۆی بەسەر زەوی دادابوو، کە چاوی بە کوڕە دوازدە ساڵییەکە کەوت، لە جێی خۆی قیت بووەوە و خۆی بەسەر داداو هاواری کرد: " (ئوبرتۆ)، ئەوە چ بوو؟ (ئوبرتۆ)!؟ " ئەویشیان دایە بەر ڕێژنەی گوللەو نزیکەی کردیانە دوو لەت.

بە تاساوی و حەپەساوی لە شانشینەکە وەستابووم تەماشام دەکرد، بێ ئەوەی هەوڵ بدەم خۆم بشارمەوە.

لە ڤێتنام فێرببووم، خۆم لە حەشارگەیەك بشارمەوە، بەڵام لێرە تەنانەت سەری خۆیشم نەکێشایەوە. لێرە هەستم بە شتێ دەکرد هەرگیز لە ڤێتنام هەستم پێ نەکردبوو: حەپەساوی و ناباوەڕی. گوێم لە دەنگی هاوارێك بوو، هەستام. دەنگەکە لەلای پلیکانەوە دەهات: " قەحپە داك، کێوە دەچی؟ وەرە! وەرە سەرەوە! وەرە! "

ئاوڕم دایەوە، لەپڕ دیتم هیچ یەکێ لە هاورێکانم لە شانشین نەماوە. سوقرات نەمابوو، ئانجلۆ وموزە و جی ڤارا و ماری بێلاش نەمابوون. هیچ کەس نەمابوو. بیرم کردەوە:

" چەند سەیرە! ئەوانە بە هێواشی رۆیشتوون و هەر منیان ئاگادار نەکردۆتەوە. خۆیان شاردۆتەوە و منیان لێرە بەتەنێ جێ هێشتووە. منیش دەبێ بڕۆم. بەڵام بچمە کوێ؟ بە هەڵکێش ناتوانم، چونکە کاتی ئەوەم نییە، بە پلیکانە خراپتریش. دەمبینن رادەکەم و تەقەم لێ دەکەن. رەنگە وا باشتربێ هەر نەجووڵێمەوە. "

لەم بیرانەدا بووم، دیتم بیست پیاوی وەروەڕ بە دەست، کۆمەڵە خەڵکێکیان داوەتە بەر پاڵەسووان و دەیانبەن. ئەو کۆمەڵە خەڵکە (موزە)شیان لەگەڵ بوو، ئەو کوڕەی قوتابی کونسرواتوار بوو، لەگەڵ ئەو کوڕەی بلووزی سپی لەبەر بوو و ئەو کوڕەی قژی قاوەیی و بە گڵوازە بوو و دوو پەیامنێری ئەڵمانی و دوو وێنەگری مەکسیکی ئەسیوشێتدپرێس.

لێرەدا هەستم بە شتێك کرد: هەموو چەکدارەکان کراسی سپییان لەبەر بوو و دەستی چەپیان یان لە دەستکێشی سپیدابوو، یان دەسە سرێکی سپی لێ پێچرابوو. پاشان زانیم ئەمە نیشانەی ناسینەوەی لیوای ئولمیاد بوو. ئەو رۆژە جلی ئاساییان لەبەر کردبوو بۆئەوەی ئاسانتر خەڵك بکوژن و یەکەم کەس کە





دابوویانە بەر گوللە، (ماری بیلا) بوو، کە خەریك بوو رایدەکرد. سێ گوللەیان لە دڵی داو ئیتر لە زمان کەوت:

" کۆمۆنیست، ئاژاوەگێڕ! "

دەنگی هاوارێکم بە چوڕو چاوی کەوت، بەڵام یەکسەر هەستم نەکرد مەبەستی ئەم هاوارە منم. ئەو کاتە هەستم کرد کە دیتن دەمانچەیان لێ راگرتووم.

دەستێکی دەستکێش سپی، قژی گرتم و رایکێشام و فڕێی دامە لای دیوارو سەرم توند بە دیوارەکە کەوت. چەند لەحزەیەك لەم بارودۆخی تاسان و هێدم گرتنەدا مامەوە. (موزە) و ئەو کوڕەی قوتابی کنسرواتور بوو و ئەو کوڕەی بلووزی سپی لەبەر بوو و ئەو کوڕەی قژی قاوەیی و بە گڵوازەبوو و ژمارەیەکی تریش لەبن دیوارەکە وەستابوون.

دەنگی رێژنەی گوللە بە بەردەوامی لەلای گۆڕەپانەکەوە دەهات. هیلیکۆپتەرێك بە ئاسمانەوە بوو نزم دەبووەوە. لە هەموو لایەکەوە دەنگی هات و هاوار و تووك و نەفرەتی خەڵك و ئاخ و ئۆف و ناڵەناڵ دەهات. گوللەیەك هاتە شانشین و بە تەنیشت سەری (موزە) دا تێپەڕی و بە دەرگای هەڵکێشەکە کەوت.

موزە بە دەنگی لەرزانەوە گوتی:

– میس ئۆریانا!؟

گوللەیەکی تر هات و دیسان گوللەی سێیەمین! ئەم گوللانە، ئایا پۆلیسەکانی خوارێ دەیانهاوێشت، یان ئەو پۆلیسانەی لە پشت سەرمانەوە وەستابوون؟ من پشتم تێ کردن. لەوە زیاتر تاقەتی دیتنی ئەوانەم نەبوو.

– موزە، ئەوە کێیە تەقەمان لێ دەکا؟

– پۆلیسن، میس ئۆریانا!

– گیراوینە، بێ دەنگ بن

تەقینەوەیەکی پڕ دەنگ و سەدا، هەموو (چی هوئا هوئا) ی هەژاند، ئەمە نارنجۆك بوو، یان بازووکە؟

– گیراوینە، خۆتان بەسەر زەوی دادەن!

خۆمان بە جۆرێ بەسەر زەوی دادا، دەم و چاومان بە عەرزەکە کەوت.

– دەستتان بەرزکەنەوە! دەستتان بەرزکەنەوە!

دەستمان بەرز کردەوە. پیاوی دەستکێش سپی لە دەست، بە وەڕوەڕەوە چاوەدێرییان دەکردین: پەنجەیان لەسەر پەلاپیتکە بوو و ئامادەبوون تەقە بکەن.

هەریەکەمان پۆلیسێکی وەڕەوەڕ بە دەستی لەسەر وەستابوو. ئەو وەڕەوەڕەی رووی کرابووە من، لوولەکەی تەنیا یەك مەتر لە جێ نووکم دوور بوو.

لەو هەموو شتانەی تا ئێستا دیبووم، ئەمە لە هەموویان سەیرتر و پڕو پووچتر و جانەوەرانەتربوو. کاتی کە ئەمەم لەگەڵ جەنگ بەراورد دەکرد، جەنگم بەلاوە دروست بوو. دووبارەی دەکەمەوە: لە جەنگ دەتوانین خۆمان لە پەنا سەنگەرێك بنێین، یان خۆمان لە پشت هەر شتێ بشارینەوە، ئەوکاتە کەس نییە نیشانە لە جێ نووکما بگرێ و لێ نەگەڕێ خۆمان حەشار بدەین. بە هەرحاڵ، لە جەنگ، هەمیشە بواری راکردن هەیە، بەڵام لێرە نا.

ئەو دیوارەی بەخورتی ئێمەیان لەبن راگرتبوو، لە راستیدا دیواری ئیعدام بوو. ئەگەر بچووکترین جووڵەمانە بکردایە، پۆلیسەکان دەیانکوشتین و ئەگەر نەجووڵابینەوەش سەربازەکان دەیانکوشتین. کە ئەم دیمەنەم بینی چیرۆکی دووپشکەکەم هاتەوە بیر کە لەناو ئابڵووقەی ئاگردا گیری خواردبوو: دووپشکەکە نەیدەتوانی خۆیشی فڕێ داتە ناو ئاگر چونکە دەست بەجێ دەمرد.

– میس ئۆریانا، بمانبوورە، مس ئۆریانا!

– (موزە) بوو، چاکەتێکی بەسەر سەری خۆی دادابوو، دەنگی لە ژێر چاکەتەکەوە دەهات.

– (موزە)، لە چ ببوورم؟

– میس ئۆریانا، تۆ نابێ ئێستا لەگەڵ ئێمە دابی، تۆ دەبێ لە لایەکی تر بوەستی، وەکوو ئەو دوو پەیامنێرەی تر.

دوو پەیامنێری ئەڵمانی، لەلای پۆلیسەکان لە ژێر مێردڕەوەکە وەستابوون، وێنەگری ئاسوشێتدپرێس لە تەك ئەوانەوە وەستابوو.

پیاوە دەستکێش سپییەکان، ئەوانەیان لەسەر پلیکانە دی بوو و بردبوویانن بۆ ئەوێ. نەیاندەتوانی بیانگرن، چونکە تەنیا ئەمری گرتنی قواتبییانیان پێ بوو.





منیش بە قوتابی تێگەیشتبوون. دەزانی؟ من بە (ماری بێلا) گەیشتبوون. بێ گومان پاشان ئەمەم زانی.

– موزە، سەبرت هەبێ.

– تۆ دەبێ پێیان بڵێی کە تۆ پەیامنێری. میس ئۆریانا، ئەگەر پێیان بڵێی، بێ شك تۆش دەبەنە ژێر مێردڕەوەکە.

– موزە، تازە تێپەڕیوە، ئیتر بە قسەکەم بڕوا ناکەن.

– گیراوینە، بێ دەنگ بن!

ئینجا تەقییەوە و بوو بە دۆزەخ! لە (داکتۆ) و (هوئە) و (دانانگ) و (سایگون) و لە هەموو شوێنێ بەشەر سەلماندوویەتی کە جانەوەرە، نەك بەشەر. ئەم بەشەرە لەهەر رەگەز و شارستانی و پایەیەکی کۆمەڵایەتی بێ، جیاوازی نییە. لەبەر ئەوەی، باش گوێ بگرە، لەبەر ئەوەی، ئەم رووداوە دەق وەکوو چیرۆکی ئەو کرێکارانە وایە کە (ئیم – ١٦) دروست دەکەن. بە وردی و بە سەبر و حەوسەڵەو بە چوست و چالاکی فیشەکی خراپ دروست دەکەن. ئایا ئاخیری لەم رۆڵانەی میللەت دەبوورین؟ ئایا ئەوانەی شەوی دووی تشرینی یەکەم (١٩٦٨) کوڕانی میللەتیان قەتڵ و عام کرد، خۆشیان کوڕی میللەت نەبوون؟

دەڵێن: ئەوانە ئەرکی سەرشانیان جێ بە جێ دەکەن، دەق وەکوو ئەو کرێکارانەی فیشەك دروست دەکەن. (ئایشمن) ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێ دەهێنا، ئەویش بە جۆرە دڕدۆنگی ودلێرییەکی وەکوو ئەوانی دیکە. نە ئەوو نە ئەم کوڕانەی میللەت هیچ یەکێکیان لە بیریان نەچووە کە دەبێ بە چاکی و بە دروستی تەقە بکەن. تەنانەت هیچیان ئەوەی بە بیردا نەهاتووە کە بۆ نموونە گوللە بە هەواوە بنێ.

هاوەنێك بە تەلاری نزیك ئێمە کەوت و هاوەنێکی تر بە نهۆمی سەرەوەی ئێمە کەوت، رێژنە شەستیرێك کەرپووچی بەردایەوە و ئێستا هیلیکۆپتەریش خەریکە بە شەستیر تەقە دەکا. هەموو گوللەکان بە دیواری هەڵکێش کەوتن، بەڵام دوای نەختێ زانیمان ئێمەین ئامانجی ئەوان و کە تەقەیان بۆ شانشین دەکرد نیشانەیان لە ئێمە گرتبوو. وایان دەزانی ئێمە رابەر و پێشەنگی قوتابیانین.

پۆلیسەکانیش لەم مەسەلەیە گەیشتن. هەرچەندە ئەوان لە پەنا دیوار وەستابوون، بەلاّم دیسان لەوانەبوو، گوللەیان پێ بکەوێ، بۆیە ترسیان گەیشتێ و هاواریان کرد:

– تەقە نەکەن! تەقە نەکەن!

– بەتالیۆنی ئۆلمپیاد لێرەیە، بەتالیۆنی ئۆلمپیاد.

– سەر، سەر!

– بڕووخێ، بڕووخێ!

– بەتالیۆنی ئۆلمپیاد!

لە ترسان هەمیشە هاواریان دەکرد و بە لوولەی وەرەوەرەکانیان نیشانەیان لە ئێمە و لە ئاسمان گرتبوو. بەلاّم تەقە بەردەوام بوو، یەك ڕێژنە گوللە بەرەو من و پۆلیسی تەنیشتم هات. من گوللە بچووکە مسەکانم بینی و پاشان گوێم لە دەنگێ بوو گوتی: " ئۆۆۆی ی!! "

تەماشای لایەکەی ترم کرد، کوڕەی بلووز سپیم بینی، کە بلووزەکەی ئیتر سپی نەبوو، سوور سوور ببوو و دەیەویست لە جێی خۆی هەستێتەوە، بەلاّم هەندێ خوێنی لەدەم دەرپەڕی و دەمەو روو خەڵتانی خوێن بوو. ئینجا نۆرەی

قژ قاوەییەکە هات. گوللەیەك، یەکەو راست بەدڵی کەوت و تەنیا گوتی:

" بەلاّم ... " ئەویش بەربووەوە. ئینجا ژنێکم بینی، وا بزانم لە شوقەی (٣٠٦) هاتبووە دەرێ بۆ ئەوەی بزانێ چ هەیە چ نییە. پۆلیس روخسەتیان نەدابوو بڕوا و گوللەی بە سکی کەوتبوو. ئینجا نۆرەی (موزە) هات کە دەست و ملی بریندار بوو، تەنیا بریندار بوو. ئەوسا نۆرەی من هات کە لە ناخی ناخەوەی حەقیقەتم چاوەڕێم دەکرد. ئەو ناخەی کە هەمیشە و هەمیشە دەرووشێ، بەلاّم هەرگیزاوهەرگیز بە دوو دەست لەمس ناکرێ و هەمیشە گوم و بزرە.

چاوەڕوانی من دەوری نیو سەعات درێژەی کێشا. ئەو چاوەڕوانییەی بە دڵنیاییەوە دەمانزانی لێی رزگار نابین و خەریکە دوا ساتی ژیانمان بەسەر دەبەین.

پاشان لێیان پرسیم:





– ئەو کاتە هەستت بەچی کرد، دەتوانی باسی بکەی؟

– بەڵێ، دەتوانم باس بکەم: هەستم کرد بە تەواوی خۆم بەدەستەوە داوە ، بەلاّم خۆ بەدەستەوە دانی چەسپاوو بێ جووڵە نا، بەڵکو خۆ بەدەستەوە دانی بەرهەمی خەیاڵ و ئەندێشە. بەرهەمی ئەو ئەندێشانەی ئەندێشەی تریان لێوە پەیدا دەبێ. دەق وەکوو یاری کردن بە ئاوێنە، یان بە ئەبەدییەت. کە ئەو شتەی ونم کردووەو بە سەیرکردنی وردی ئاوێنە، بیدۆزمەوە: واتە عیشقم بەرامبەر بە خەڵك.

بێ هوودەیە، دەزانم بێ هوودەیە، لەو لەحزەی کە بەشەر، ئیتر بەشەر نییەو مردنمان قبووڵ کردووە، ئەو جۆرە شتە بدۆزینەوە. تۆ دەتوانی بەم قسەیەم پێ بکەنی، بەلاّم ئەمەبوو کە لەوکاتەدا هەستم پێ کرد. تۆ دەتوانی زۆریش پێ بکەنی، بەلاّم شتەکە دەق بەو شێوەیە بوو کە پێم گوتی.

زۆر باش لە بیرمە، لەوساتەدا عیشقی ونبووی نەخواستەی خۆم دۆزییەوە.

دەق لە ناخی ناخەوەی خۆمدا دۆزیمەوە، ئەوکاتەی کە بیرم دەکردەوە: ( کەواتە ئینسان ئاوها دەکوژرێ، ئەمە دادپەروەرانە نییە، ئەمە نالۆجیکییە! بەلاّم مردن ئاوها. نا. بەلاّم هیچی ترم لەدەست نەدەهات، هیچ. تەنیا ئارەزووم دەکرد، دایکم زۆر ئەزیەت نەخوا بە تایبەتی کە نەخۆشی دڵیشی هەیە. بێ شك خەبەری مەرگی من ببیستێ ئەویش دەمرێ. هیوادارم زۆر بە هێمنی ئەم خەبەرەی بدەنێ. نەك بە شێوەیەکی وا ناڕەحەتی بکا.

ئومێدەوارم ئەویش کە ئەم خەبەرەی بیست، بڵێ: " ئەمە چارەنووسە!! لەناو جەنگ نەمرد بۆ ئەوەی  شانشینی ئەوێ بمرێ. "

جەنگ!! (فرانسوا)، تۆ ئاوها پێناسەی جەنگت بۆ کردم، گوتت: یارییەکە بۆ رابواردنی جەنەراڵەکان. چۆنیەتی یارییەکەشت بۆ باس کردم: ئەوەیە چەند پارچە ئاسنێك لە گۆشتی لەشی ئینسان را دەکەن. بەلاّم ئێرە جەنگ نییە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانە پارچە ئاسن لەناو گۆشت را دەکەن. ئەمەش هیلیکۆپتەرە، دووبارە وا دێ و بەدەم نزم بوونەوە چ دەنگ و سەدایەکی دروست  کردووە. ڤیت کۆنگەکانیش، ئەو  رۆژەی ئێمە بە سواری هیلیکۆپتەرەکەمان نزم دەبووینەوە،

یـان ئـەو رۆژەی لیمـۆ ترشـەکانمان رژا، بـێ شـك ئـەم هەسـتەی ئـەمڕۆی منیـان هەبووە.

یـان ئـەو رۆژەی تـر کـە بـە (آ– ٣٧) هـەڵفڕین. ئـەو خەڵکـە شـێتە، شـێت!!!. تـۆ ئەگەر شۆربا بە چەنگاڵ بخۆی یەکسەر پێت دەڵێن تۆ شێتی و دەتبەنە شێتخانە، بەڵام ئەگەر هـەزاران کـەس ئاوهـا قـەتڵ و عـام بکـەی، هیـچت پـێ نـاڵێن و رەوانـەی هیچ شێتخانەیەکت ناکەن.

دەبێ شتێ بکەین، دەبێ پێشیان لێ بگرین. کـێ دەزانـێ تـا ئێستا لـەم خـوارەوە چەند کەسیان کوشتووە؟! ڤیت کۆنگەکان هەقیانە، پێویستە بجەنگین، تەنانـەت ئەگەر لەم پێویستییەدا غەڵەتیش بکـەین و تەنانـەت ئەگـەر ناچاریش بین، وەکوو کەسانی بێ گوناهی وەك (ئیگنـاری) و (ئـەزکورا) و (بـریچ) و (پیگـوت) و (لارامـی) و (کانتول) و هی تر، ببینە قوربانی.

ئەمەیـە نرخـی خەونـەکانمان. سـەیرکە، تەماشـاکە! ئـەوا گوللەکـەی هاویـشت، بـەڵام بـە ئێمـە نەکـەوت، داخـۆ لـە بـاتی ئێمـە کێـی کوشـتووە؟ خـەڵکی بـێ چارەی کوشـتووە. بـەڵام ئـەوە مـن چـۆن تـوانیم بێـژم بەشـەرم خـۆش نـاوێ. ئـەو خەڵکـەی هەمیـشە بەرامبـەر بـەدکاری وەسـتاون، لەگـەڵ سـووکایەتی رووبـەروو بوونەتـەوە، هەمیشە لە خاچ کێشراون.

بە راست ئەوە من چۆن توانیم بڵێم ئـەم هـەموو کـارە بـێ هوودەیـە، چـۆن تـوانیم بڵێم: لەدایك بوون و مردن بە کەڵك چ دێ؟

بە کەڵك ئەوە دێ کە پێش ئەوەی درەخت، یان ماسی بین، ئینسان بین.

بە کەڵك ئەوە دێ بـەدوای دادپـەروەری دا بگـەڕێین، چـونکە دادپـەروەری هەیـە. ئەگەر نەبێ، دەبێ دروستی بکەین. گرنگ مردن نییە، گرنگ مردنـە بـە شـێوەیەکی راسـت و دروسـت. مـن خـەریکم بـە شـێوەیەکی راسـت و دروسـت دەمـرم. بـێ شـك ئاوهایـە. مـن وا لەتـەك (مـوزە) دەمـرم کـە هەمیـشە لەگـەڵ بـەد رەفتـاری خـەڵك رووبەروو بۆتەوە، فەقیر بووە و هەمیشە سووکایەتی پـێ کراوە، هەمیشە لـە خـاچ دراوە. من لەتەك پۆلیسێکی دەستکێش سپی نامرم.

بێ شك، ڤیت کۆنگێکیش کە هیلیکۆپتەرێکی دیوە لێی نزیك دەکەوێتـەوە بیری





لەم شتە کردۆتـەوە: سـەیری کـە، وا دێ! وا نـزم دەبێتـەوە! چـۆنە دەسـتی دوعـا و پاڕانەوە لەبەر خوا پان بکەمەوە؟

– بڕۆ، بابە بڕۆ، خودا؟!! ئێمەین کە خودامان دروست کردووە، خودا هەر نییـە، ئەگـەر هەبایـە و ئێمـەی بـەهی خـۆی بزانیبایـە، هـەرگیز رێـی بـەم قەسـابخانەیە نـەدەدا. هـەرگیز لێ نەدەگـەڕا کـوڕە بلـووز سپییەکە، کوڕە قژ قاوەییەکە، ژنەکـەی شوقەی (٣٠٦) وئەو کوڕەی بانگی (ئوبرتۆ)ی دەکرد و (ئوبرتۆ)ش، بمرن.

– نـابێ ئێمـە دژی خـوا بوەسـتین. بـەڵکو دەبـێ دەمـی گوتارمـان بکەینـە مـرۆڤ، دەبێ بـەرگری لـە خـەڵك بکـەین، دەبـێ لـە پێنـاوی ئـەوان بجـەنگین. چـونکە کـەس ئەوانی بە وجوود نەهێناوە، (فرانسوا) تۆ هەقت بوو، راستت دەکرد کە گوتـت: " جاری وا هەیە دەبێ بمرین بۆئەوەی پیاو بین! "

ئینجا لەپڕ هەستم کرد ئەو شوێنەی لێی وەستاوم، شـوێنێکی بـە ترسـەو سـەرم لـە مەترسـیدایە. وەك کـرم دەسـتم بـە خـزین کـرد و هێـدی هێـدی بـە جووڵانـدنی ماسوولکەکانم رۆیشتم. پۆلیسەکە منی دی و کردییە پرتە و بۆڵە:

– گیراوینە، نەجووڵێن!

دووبارە لوولەی وەڕوەڕەکەی لەسەر جێ نووکم راگرت. بەڵام ئەم جارەیان گوێم پێ نەدا، چونکە دەمزانی لەمەودوا نابێ لە وەڕوەڕەکەی ئەو بترسم، بـەڵکو دەبـێ لـەو هیلیکۆپتـەرە بترسـم کـە بـە خـۆو بـە شەسـتێرەوە بەسـەر سـەرمدا دەفـڕێ. شەستێری هیلیکۆپتەرەکە نیشانەی لە شانشینەکە گرتبوو.

من چاوی خـۆم نوقانـد بۆئـەوەی نـەیبینم و گـوێی خـۆم گـرت بۆئـەوەی گـوێم لـە دەنگی نەبێ، بەڵام هەم بینیم  و هەم گوێشم لە رێژنەی گوللەکە بوو و هـەر زوو لـە ناخـەوە هەسـتم بـە ئـازارێکی قـووڵ کـرد. سـێ چـەقۆی ئاگرین جەستەیان بڕیم و سووتاندمیان: چەقۆیەك لە پشتم و دووچەقۆ لە قاچم.

لەو چۆقۆیە گەڕام کە لە پشتم چووبووە خوارێ، نەمدۆزییەوە. تەنیا هەستم بـە ئەسـتوورایيەکی گـەورە کـرد. لـە قاچـەکانم دا بـەدوای دا گـەڕام، لـەوێش نەمدۆزییـەوە: تـەنیا خـوێنێکی زۆرم بینـی. ئینجـا بـیرم کەوتـەوە لـە جـەنگ دەیـانگوت: " یـەك بـرین نیـشانەی بەختەوەرییـە، چـونکە کـەم روودەدا ئینـسان

دووجار گوللەی پێ بکەوێ. "

پاشان هەستم بە بارێکی ئاسوودەیی کرد. ئێستا دەرفەتی کوژرانم کەمترە. بەڵام دووبارە یەکسەر یادم کەوتەوە کە لە جەنگ دەیانگوت: " بە برینێکی سووك دەمری کە خوێنی لەشت هەمووی بەتاڵ بکا. "

ئینجا دەستم بە هات و هاوار کرد، گوتم:

" بریندار بوویم! فریام کەون! تکایە، خوێنم لەبەر دەڕوا. "

بەڵام ئەو پۆلیسەی وەڕوەڕی پێ بوو، گوتی:

– گیراوینە، بێ دەنگ بن.

دیسان بە وەڕوەڕەکەی نیشانەی لێ گرتم.

ئەوسا بە سێ چەقۆی ناو لەشم و بەو دەرد و ئازارەی وەکوو شەپۆل لە گیانم دەهات و دەچوو، بێ دەنگ بووم، لە کاتێکا کە خاوبوونەوە و بێ تاقەتییەکی زۆر دایگرتبووم. لەوکاتەدا وام بە خەیاڵدا هات لەسەر قەرەوێڵەیەك خەوتووم، لە خەودا گوێم لە دەنگی (موزە) بوو، بەدەم گریانەوە دەیگوت: " مس ئوریانا، ئوە، مس ئوریانا ". پاشان گوێم لە دەنگێکی تر بوو دەیگوت:

" تکایە ئەم ژنە خەتەرە، دەمرێ! "

ئەو ژنە کێ بوو کە ئەو باسی دەکرد و خەریك بوو بمرێ؟ بۆچی دەمرد؟ موزە بۆچی دەگریا؟ ئایا بۆ ئەو ژنە دەگریا، یان بۆمن؟

ئەگەر بیانەوێ بمبەن، منیش خۆم توند بە موزەدا شۆڕ دەکەمەوە و لەگەڵ خۆمی دەبەم. دەبێ موزە نەجات بدەم.

پاشان پێیان گوتم کە من دەوری سەعات و نیوێك لەوێ مابوومەوە و هەر خوێنم لەبەر دەڕۆیشت. خۆم نازانم.

تەنیا وێنەگری ئاسۆشێیتدپرێسم دێتەوە یاد، لەناو پۆلیسەکان دانیشتبوو، وێنەی منی دەگرت و ئەوەشم لەیادە دەستێك قژی ڕاکێشام و بردمی، منیش هەوڵم دا مووزە بگرم. بەڵام مووزە ئاگای لەمن نەبوو. خۆم توند بە کورە قوتابییەکەی کۆنسرواتوار شۆڕکردەوە و لەباتی مووزە، ئەوم لەدوو خۆم ڕاکێشا. ئینجا پلیکانەیەکم دێتەوە بیر پڕ سەرباز بوو. یەکێ لە سەربازەکان سەعاتی لە





مەچەکی دەستم کردەوە و بە پێکەنینەوە بۆ خۆی بردی. ئینجا شوێنێکم دێتەوە یاد پڕ پۆلیس بوو، پاشان دارەبازەیەکم دێتەوە خەیاڵ لەسەر زەوی داندرابوو. ئینجا شوێنێکی ترم دێتەوە بەرچاو ئاوێکی پیسی پێدا دەڕۆیشت و ئاوەکە بە دەم وچاوم دەکەوت. ئاوەکە وردتکە پیسایی تێدابوو، بۆنی میزی لێ دەهات. ئەو ئاوە لە درزی بۆڕی شکاوی ئاودەستخانە دەهاتە دەرێ. گوێم لە دەنگی یەکێ بوو، هاواری کرد و بە سەربازەکانی گوت: " توخوا لێرە دایمەنێن! "

بەڵام سەربازەکان پێدەکەنین، هەر لەوێ دایاننام چونکە منیان بە ئەنقەست و هەر بۆ گاڵتەو قەشمەری لەوێ دانابوو. پیرەژنێکی مردوو لە تەنیشت من کەوتبوو، پریاسکەیەکی لە ژێرەوە بوو، وەکوو پریاسکەی شیرینی وابوو. کوژراوی تریشم لە دەوروبەر بوون، هەریەکە بە شێوەیەکی خراپ کەوتبووە سەر زەوی. قوتابییە دەستگیر کراوەکان لەبن دیوار وەستابوون. یەکێکیان کراسی لەبەر کردەوە و بەسەر دەم و چاوی تەڕی منی دادا و گوتی:

" ها، ئەمە بۆ تۆ ئازیز گیان، دەم و چاوی خۆتی پێ داپۆشە! "

لەگەڵ دەنگی ڕێژنەی گوللەو تەقینەوە، کە هێشتا هەر بەردەوام بوو، گوێم لەو دەنگە بوو. چونکە قەتڵ و عامی (ئەروود) تا نیوەشەو درێژەی کێشا. تێگەشتی؟

کە بە ئوتومبێلی فریاکەوتن منیان برد، سەعات دەوری (٩)ی شەو بوو. تازە بە بازووکە دەستیان بە بۆمبا بارانی (چی هوئا هوئا) کردبوو. سێ نارنجۆك بە شانشینی نهۆمی سێیەم کەوت و پۆلیسێك گیانی لەدەست دا.

پۆلیسی گۆڕەپانەکە قەتڵ و عامیان دەکرد. بەسەرە نێزە گەرووی کوڕیژگەیەکیان هەڵپچڕی و سکی ژنێکی دووگیانیان هەڵدڕی. هەڵبەت باوەڕ بەم قسانەی من ناکەی، بەڵام ئەگەر سەیری ئەو وێنانە بکەی کە ئەو ڕۆژە گیراون، دەبینی هی ئەوەنین بڕوایان پێ نەکرێ و ئەگەر تۆ وەکوو من لە نەخۆشخانە بوویتایە، ئەوسا مەسەلەکەت لەلا روون و ئاشکرا دەبوو. ئاخ چەند برینداری لێ بوو و هەریەکە لە حاڵەتێکی چەند ناخۆش دابوو. کچێك تەنیا نیوەی دەم و چاوی مابوو، لێوی بە نیوە ساغەکەی دەم و چاوی دا شۆڕببووەوە. دختۆرێك خەریك بوو بە لەفافی پزیشکی دەم و چاوی چەسپ دەکرد و دەم و چاوی کچەکە

بەردەوام خوێنی لێ دەهات. دختۆرەکە گوتی:

" چ بکەم!. لێ بگەڕێم بمرێ؟ بەڵێ، دەبێ لێ بگەڕێم بمرێ! "

هەندێ دختۆر فرمێسکیان لە چاو قەتیس مابوو. یەکێکیان هاتە لای من و بە هێواشی گوتی: " ئەو هەموو شتەی دیوتە، بینووسە، هەمووی بنووسە! "

پاشان فەرمانبەرێکی دەوڵەت هات، دەیەویست بزانێ من کاتۆلیکم یان نا؟

پێم گوت: " گە!!! "

بە پەنجە هەڕەشەی لێکردم و گوتی:

– تۆ کاتۆلیك نی! تۆ کاتۆلیك نی!

بەڵام من پێشتر باسی ئەم شتانەم کردبوو. ئەوشتەی باسم نەکردبوو ئەمەبوو:

ئەو کوڕە قوتابییەی کونسرواتوار، کە خۆم پێدا شۆڕکردەوە و رامکێشا بۆئەوەی نەجاتی بدەم و هێنامە نەخۆشخانە، لە جیاتی ئەوەی سوپاسم بکا، گوتبووی گوایە من کۆمۆنیست و ئاژاوەگێڕم، بە جۆرێ کە هەموو رۆژنامەکان نوسیبوویان گوایە من جلی خۆم گۆڕیوە و چوومەتە شانشینی نهۆمی سێیەم بۆئەوەی زیاتر قوتابییان هان بدەم ... و شی تر ... ئاخر، بەشەر ئاوها دروست کراوە. ئیتاڵییەکانی مەکسیك، کە نزیکەی هەر هەموویان فاشیستن، هەموویان لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا بوون ، تەنانەت  ئەوەشیان خستبووە سەر کە من بریندار نەبوویم و جێ گوللەیان  بە جلەکانمەوە نەدیوە. ئاخر بەشەر ئاوها دروست کراوە.

هەروەها لەگەڵ ئەو گوڵ و برووسکەو کاغەزە دڵسۆزانەی بۆم هاتن، کاغەزی تریشم بە دەست گەیشت، ئارەزوویان دەکرد بۆ هەمیشە ئیفلیج بم و جێم سەر کورسی پێچکەدار بێ. ئاخر بەشەر ئاوها دروست کراوە! هەڵبەت یاری ئۆڵمپیاد بەردەوام بوو. هیچ لە وڵاتە بەشدارەکان خۆیان لە یارییەکان نەکێشایەوە و یەکەمین وڵاتیش کە بە لێپرسراوانی دەوڵەت ناسێنرا، رووسەکان بوون، ئاخر بەشەر ئاوها دروست کراوە!

ئەگەر لێم بپرسی، چۆن لەگەڵ ئەم هەموو شتانەشا، دەتوانم بەشەرم خۆش بوێ، وەلامت دەدەمەوە: چونکە ژمارەیەکی زۆر ئیعتیرافیان نەکرد، چونکە





بەرگەی ئەشکەنجەو ئازار و جەزرەبەیان گرت، چونکە کاتێ کارەبایان لە زەکەریان دان، یان لەناو گوێیان دان، متەقیان لێوە نەهات. چونکە کاتێ کە چۆن هەڕەشەی کوشتنیان لە زیندانییەکانی ڤێتنام دەکرد، ئاوها هەڕەشەی مەرگیان لێ دەکردن، ئەوانیش بەرگەیان گرت و هیچ قسەیان لە دەم نەهاتە دەرەوە، ئامادەبوون بمرن بەڵام خیانەتیان نەکرد. ئاخر بەشەر بەم جۆرەش دروست کراوە.

ئەوانەی توانیبوویان را بکەن، دووبارە کۆبوونەوە سەر یەك و دیسان کەوتنە باسی ئازادی و پۆلیس بەردەوام بەدوایانەوە بوو و هەر ناو بە ناو یەکێکی لێ دەکوشتن. وەکوو ئەو رووداوەی بەسەر (رافائیل) ی قوتابی ساڵی سێیەمی فەلسەفە هات. بە مردوویی لەسەر پیادەڕۆیەك دۆزییانەوە. بەسەرە نێزە کوشتبوویان و سەراپای لەشی شوێنی ئەشکەنجەی ئاگری جگەرە بوو، بەڵام ناوی هاوکارەکانی خۆی ئاشکرا نەکردبوو، ئاخر بەشەر بەم جۆرەش دروست کراوە.

حەزم دەکرد من لەجێی ئەوان بوومایە. هەندێ جار سووکایەتیم پێ دەکردن، هەندێ جاریش بیر لەوە دەکەمەوە، ئەو جانەوەرانەی ئەو رۆژە جلی سەربازییان لەبەر بوو، ئینسان بوون، پاشان قسەکانی (نگوین وان سام) م بیرم کەوتەوە: " ئەوانە بێ گوناهن، چونکە بەشەرن! ".

بۆ من نموونەی بەشەری هەرە بەرز و تەواو، (مووزە)یە. (مووزە) بە موعجیزە لە قەتڵ و عامی شانشینەکە گیانی بەدەر دەبرد.

مووزەیان دەستگیر کردو  بردیانە زیندانێکی سەربازی. لەوێ پارەو ئەوراق و پێڵاویان لێ سەند و نۆ رۆژی تەواو لێیان داو ئازارو ئەشکەنجەیان دا.

رۆژی نۆیەم، بەبێ پارەو بەبێ ئەوراق و بەبێ پێڵاو وەدەریان ناو سێ سەعاتی رەبەق بەپێ بەرەو شارهات. پێیەکانی بریندار و خوێناوی بوون، (تا)ی لێ بوو، برینی ملی لێی پیس کردبوو، کێم و زووخاوی لێ دەهات، نەیدەتوانی سەری بجووڵێنێ. دەگریا و بەدەم گریانەوە دەستی لە ئۆتومبێلان رادەگرت کە بە تەنیشتی دا تێدەپەڕین، بۆئەوەی بۆی رابگرن. ئۆتومبێلەکان نەدەوەستان، و

ئەگەر بشوەستایان بۆ ئەوەبوو بڵێن هەڵت ناگرین. لەسەر ئەو حاڵ و وەزعەی خۆی بەدوای منـدا دەگەڕا ، تـا منـی دۆزییـەوە. مـن لەبـەر دەرد و دەرمـان خاوببوومەوە و لەسەر قەرەوێڵەکە کەوتبووم، کاتێ هەستم کرد یەکێ بە هێدی دەستی گرتووم و دەملاوێنێتەوە. چاوم کردەوە، دیتم بە راستی یەکێ خەریکە دەستم دەلاوێنێتەوە: مووزە بوو! بە جل و بەرگی شڕ و وڕو دڕادڕاوی، بە دەم و چاوێکی ئاوساو بێزەوەر، بە سیماو روخساری بچووکی هەژارانەی کە بۆ ئازار کێشان و لێدان خواردن و توورِ هەڵدران دروست ببوو!

مـووزە دەسـتەکانی دەلاواندمـەوە. خـەنی خۆشـی بـوو کـە مـن زینـدووم و نەمردووم، دەیگوت:

– میس ئوریانا، ئەوە تۆ زیندووی؟

کە ماچم کرد، بۆن بۆگەنی لێ دەهات. ئێستاش لەبیرمە ئینسان هەر بە ماچ کردنی تووشی دڵەکوتێ دەبوو. بەڵام وەکوو بەشەرییەتم دۆزیبێتەوە ئاوها ماچم کرد. هەستم بە شەرمەزاری کرد بەرامبەر ئەو دوعایەی پێش ماوەیەك بۆ خۆم دەکرد.

– ئەو دوعایە چ بوو؟

– فرانسوا، وا چاکە پێت نەڵێم.

– نا، دەبێ پێم بڵێی.

– زۆرباشە. دوعاکە ئەمە بوو:

" ئەی باوکی ئاسمانان، قەتڵ و عامی ئەمڕۆت لە ئێمە چاو نەبێ، ئێمە لەو بەزەیی و عیشق و زانیارییە بەتاڵ کە، کە عیسای کوڕت بەئێمەی بەخشیوە، چونکە بە کەڵك هیچ شتێ نایە، ئامین! "

– کە گوتت: " بە کەڵك هیچ شتێ نایە "، راستە.

– دەزانم.

– بەڵام دەبێ بە کەڵك شتێ بێ. دەبێ پێش لە قەتڵ و عام بگرین ... دەبێ لەو ئینسانانە بپرسین: بابە ئێوە بۆچی یەکتر دەکوژن ...

– ئێستا لەمە دەگەم.





– بۆئەوەی لەم شتانە بگەی، هەر دەبوایە بکەویتە بەر گوللەی ئەوان!

– بەڵێ (فرانسوا).

بە شەلەشەل بەسەر پردی (ریۆدۆ جانیرۆ) دا دەڕۆیشتم.

پێش چەند رۆژێ، (ئانجلۆ) کە پۆلیس بە دوایەوە بوو، هاتە لام و گوتی: " پێویستە بە زووترین کات لە مەکسیك بڕۆی:

" زۆر نزیکە ئەو رووداوەی بەسەر رافائیل هات، بەسەر تۆش بێ. سواری یەکەمین فڕۆکە بەو بڕۆ. "

یەکەم فڕۆکە دەچووە (ریۆ). لە (ریۆ)، تووشی ویجدانی زیندووی خۆم هاتم: تووشی (فرانسوا) هاتم.

کە دیم هێدی هێدی بەرەو رووم دەهات، چ شادی و خۆشییەکی گەورە دایگرتم!! بە دەم و چاوی جوانی گەنجانە و بە قژی سپی و بە حاڵەتی بەهێزی لادێیانی (ئوورونی)، وارە وارە بەرەو رووم دەهات.

– چۆنی، چاکی؟ تۆ هەمیشە بەختت هەیە: برینێکی سووك بوو، وانییە؟

چاکەت و پانتۆڵێکی خۆڵەمێشی زۆر رێکی لەبەر بوو، قەرەوێتەیەکی بەستابوو لە قاتەکەی دەهات، بلووزێکی رێك و پێکی لەبەر بوو، دوگمەی سەر دەستەی بەستبوو، بەمە هەمووی نەگۆڕابوو، دەتگوت هەست بە بارگرانی هەموو ئەمانە دەکا لەسەر لەشی. بەجۆرێ هەوای (ریۆ)ی هەڵدەمژی دەتگوت دڵی گیراوە. بە جۆرێ قسەی لە ئێشی پشتم دەکرد وەك ئەوەی ئێشی رۆماتیزم بێ، نەك ژانی گوللە. بەڵام کاتێ کە باسی (مووزەم) بۆ کرد، فرمێسکی لەچاو قەتیس ما.

– هەمیشە (مووزە)یەك هەر دەبێ خۆی بکا بە قوربانی ئەوانی دیکەش ... ئەوانی دیکەش بەو جۆرەن کە (نگوین وان سام) پێی گوتی.

– پێی گوتم: " ئەوانە بێ گوناهن، چونکە بەشەرن! "

– راستە.

– (فرانسوا)، (نگوین وان سام) چی بەسەر هات؟

– نازانم. رەنگە گوللە بارانیان کردبێ ... یان لەوانەیە خستبێتیانە ژێر

لۆرییەی ئەمریکی.

– ئێستاش خەڵك قسە لەبارەی چوونە سەر مانگ دەکەن.

– بەڵێ.

– لێرە چ باسە؟

– هیچ. لێرە هیچ باس نییە. نە کەس گوللە باران دەکەن و نە دەچنە سەر مانگ. ئێرە تەنیا هەتاوە و تەواو!

– بەلاّم هەتاوی ئێرە هەمان هەتاوی (نگوین وان سام) ی ئێمە و هەتاوی ڤێتنامی ئێمە نییە، ئەی وانییە (فرانسوا)؟

– نا، نە ئەو هەتاوە و نە ئەو دەریایەو نە ئەو خەڵکە. خۆ ئەوانت بینی؟

بەلاّم ئەوانم بینی! هەزاران و هەزاران کەسم لەوان بینی لە کەناری (کوپا کابانا)، لەبەر هەتاو پشوویان دەدا، بەبێ جووڵەو بەبێ خەم و نیگەرانی و بەبێ هەستی لێپرسراوێتی و دوور لە هەموو رووداوێکی دەورو بەریان. وەکوو سووسەمار: دەوڵەمەند و هەژار، سپی و رەش، پیر و گەنج، ژن وپیاو، سووسەماری بەر هەتاو! ئەم سووسەمارانە هەتاو جێ ناهێڵن، مەگەر کاتێ کە بیانەوێ بچنە یاریگای (ماراکان) بۆ ئەوەی لەوێ ئالاّکانیان هەڵشەقێنن. بەلاّم دەزانی کام ئالاّ؟ ئالاّی تیپی تۆپی پێیان.

– بێ جووڵەو شادو بە کەیفن.

– (فرانسوا)، دەڵێن ئێرە دەبێ بە ڤێتنامی ئایندە.

– منیش بەر لەوەی بیانبینم هەروا تێدەگەیشتم. بیرم لە (چی ڤارا) دەکردەوە و لە دڵی خۆمدا دەمگوت: " من لای هەندێ ئینسان دەڕۆم بۆئەوەی بچمە دیداری ئینسانی تر. گەرداوێك لەم ولاّتەدا هەڵدەکا، لێرە دەمێنمەوە بۆ ئەوەی ئەو گەرداوە ببینم ". بەلاّم (جی ڤارا) مرد. بە رۆژی نیوەڕۆ کوشتیان، ئیتر گەرداو لێرە هەڵناکا. ئەوانیش دەرمانی خۆیان دۆزیوەتەوە.

– چ شتی خۆیان دۆزیوەتەوە!؟

– دەرمانی خۆیان. دەرمانێکی زۆر کۆن و سڕکەرە، دەسەلاّتداران دروستیان کردووە. ئێستا ئەمریکییەکان ئەو دەرمانە بەکاردێنن. دەرمانێکی زۆر کاریگەرە.





لە هەموو شوێنێ کاری خۆی کردووە: لە ئەورووپا، لە ئاسیا، لێرە.

– گوتت: سڕکەرە!

– بەڵێ، یەك سانتیمەتری، یان یەك میللیمەتری بەسە بۆ ئەوەی بە درێژایی ژیان بتپارێزێ.

– لەچی بتپارێزێ؟

– لە شۆڕش، لەسەرپێچی، لە ناڕەحەتی، تەنانەت لە ئازایەتی. ئەی دەتەوێ بەرامبەر چیتر پارێزراو بیت.

– دەکرێ ئەم دەرمانە لەکێ وەربگرین؟

– لە سەفارەتی ئەمریکا،لە سیا، لە یەکێتییەکان، لە دەوڵەتان و لە کڵێسە، دەست دەکەوێ.

– بە نهێنی، یان بە یاسایی؟

– بە یاسایی. تەنانەت بە خۆڕاو بە شێوەیەکی زۆر ئاسانیش.

– گوتت، ناوی چییە؟

– دەرمان.

– هەر ئەوەندە!

– هەر ئەوەندە! نازانم لە زەمانی کۆن چییان پێ دەگوت، بەلاّم ئێستا بەم ناوە ناسراوە.

– باشە لە چ مژارێك دروست کراوە، (فرانسوا)؟

– لە مژارێکی زۆر سەخت و لە هەمان کاتیشدا زۆر ئاسان. چونکە هەم لە زۆر مژار دروست کراوە و هەم لە هیچ مژارێکیش دروست نەکراوە: خۆشبەختی، سەلامەتی، دیموکراتی، یەکێتییەکان، زایەند، تەلەفزیۆن، کلینیکس، جاز، مەعجوونی ددان، شتی کۆنینە، گوڵی پلاستیکی، پشوو، مۆتێل، ئوتێل، مانگ، بەڵێ مانگیش. دەچنە سەر مانگ و مووزە و (نگوین وان سام) ەکان دەخەنە پەردەی لە بیرچوونەوە.

– کەواتە شتێکی خراپە، ژەهرە!

– ئوە، نا، بە پێچەوانەوە. کە یەکێ لەو دەرمانانە بە دەرزی لە لەشت بدەی،

هەست بە خۆشی دەکەی، بێ جووڵەو ئارام دەبی، ئەی خەونی ولاتە کۆمۆنیستەکانیش هەر بەکارهێنانی ئەم دەرمانە سڕکەرە نییە؟ یان ئەدی مارکس هەوڵی نەداوە بەم ئەنجامە بگا؟

– بەڵام سڕکەر شتێکی خراپە. تۆ دڵنیای کە شتێکی خراپ نییە؟

– بە تەواوی دڵنیام. ئەمریکییەکان نایانەوێ هیچ کەس نارەحەت بکەن و ئامانجیان هەمیشە شەریفانە بووە. ئەو دوو جیهانگەڕە بێنەوە بیرت کە مێخەکانی دەستی عیسایان دەرکێشا، بۆئەوەی لە خاچ ئازادی بکەن.

– بەڵێ، ئەو حەلە عیسا لنگەو قووچ بووەوە و بە پێیەکانی شۆڕبووەوە. تەنانەت کاتێ کە بەبیرم دێتەوە چییان لەو لادێییانە کرد، دیسان مەسەلەی عیسام بیردەکەوێتەوە.

– من لە هەموو شوێنێ ئەم مەسەلەیەم هەر لە بیرە. بچمە هەر شوێنێ. هەموو جارێکیش حەزدەکەم هاوار بکەم و بڵێم: " وازی لێ بێنن! " بەڵام ئەوان ناتوانن، بەراستی ناتوانن.

– بەڵام، هەر چۆن بێ، ئەم دەرمانە دەبێ کاردانەوەیەکی خراپیش لە ئینسان پەیدا بکا، وانییە؟

– بەڵێ، کاردانەوەیەکی خراپیشی هەیە.

– ئەو کاردانەوە خراپە چییە؟

– ڕێ لە بیرکردنەوەولەیاخی بوون و لەئاژاوەو لە جەنگانیش دەگرێ. ئەمەش هەر قەدەغە کردنی بیرکردنەوەیە. بێ جووڵەو ئارام! سووسەمارانی بەر هەتاوی کوپا کابانا، ئیتاڵیا، ئەمریکا، رووسیا و ... ویژدانی ئاسوودەی ئێمەیان خستۆتە خەوو تەنیا دەزانن نارەزایی دەربڕن و هیچی تر.

– کەواتە ئەمە دەرمانێکی وایە کەس ناتوانێ لێی رابکات. ئەی وانییە (فرانسوا)؟

– ئەی منیش هەر وام پێ نەگوتی؟ نزیکەی هەر هەموو خەڵک ئەم دەرمانەیان خواردووە، جگە لە میللەتێکی بچووک، لە وڵاتێکی بچووک، کە ناوی ڤێتنامە.

لە بیرتە کاتێ بە دوو دڵی سایگونت جێ هێشت، چیم پێ گوتی؟





– گوتت: ئەمانە ئەمرۆ تاکە میللەتێکن بۆ ئازادی دەجەنگن.

– لە پێناوی شەرەفی رۆڵەکانیشیان. هەر لەبەر ئەوەش بوو نەتدەتوانی خۆشت نەوێن.

– (فرانسوا)، من کوژرانی مەکسیکییەکانیشم بینی، ناتوانی ئەوانیشت خۆش نەوێ.

– مەعلوومە – ناتوانی ئەو چوار سەد هەزار چینییەشت خۆش نەوێ کە پێش دوو ساڵ، لە ئەندەنووسیا قەتڵ و عام کران!

چوار سەد هەزار کەس، بە ماوەی چوار رۆژ قەتڵ و عام کران. وەکوو بەراز خنکاندیانن. لە گوندان و لە شاران. بێ ئەوەی دونیا دەم لێك بکاتەوە و یەك قسەیان لەبارەوە بکات و بێ ئەوەی ئەنگلۆسەکسۆنی پێست سپی پرۆتستانی وەکوو (کابوت لاج) نارەزایی بەرامبەر بەم کارە دەربڕن. بە پێچەوانەوە، گوتیان: لێ گەڕێن با وایان لێ بکەن، لێ گەڕێن با ئەو فاشیستە ئەندەنووسیە چاکانە، ئەو چینییانە قەتڵ و عام بکەن کە ئیتر لە من و تۆ زیاتر کۆمۆنیست نین. تاکە شتێ کە پەسندم نەکرد، ئەوەبوو ئەمانە خۆیان بە دەست خەفەکردنەوە دا.

خۆ بەدەست خەفەکردن دان، بەس نییە. قوربانی دان بەس نییە و هیچ دەردێ دەرمان ناکا.

– هیچ دەردێ؟

– هیچ دەردێ. پاش مانگێکی تر، ئیدی هیچ باسی ئەم مەکسیکەی تۆ ناکرێ. هەروەکوو ئەوەی ئێستا کەس باسی ئەندەنووسیا ناکا. بەڵام هەمیشە باسی ڤێتنامی ئێمە دەکەن.

ئینجا راوەستاین بۆئەوەی تەماشای دەریا بکەین کە دەریا نەبوو و سەیری خۆر بکەین کە خۆر نەبوو، مەسیح لەسەر بەرزایی (کورۆ کووادو) دەستی کردۆتەوە و دوعامان بۆ دەکا، وەکوو خەونێکی ختۆکە بەخش وایەو شەو حاڵەتێکی تایبەتی هەیە. دەڵێی ئەستێرەیەك لە ئاسمانەوە هاتووە بۆئەوەی سەرسامان بکا و پێمان بسەلمێنێ کە موعجیزەیەك هەیە. پاشان کە دەچیتە ئەو سەرەوە، هەست دەکەی ئەمە ئەستێرە نییە، خەون نییە، موعجیزەش نییە،

بەڵکوو تەنیا پەیکەرێکی گەورەیە لە هەزار و سەد و چل و پێنج دانە بەرد دروست کراوە، روناکی پرۆجەکتەرەکانی کارەبای گشتی لێی دەداو روناکی دەکاتەوە.

پاشان قسەمان لە بارەی زۆر شتی دیکە کرد، بۆ نموونە باسی قوربانی دانمان کرد کە بێ مفایی ئەم دەرمانە دەسەلمێنێ. باسی ئەو ئازایەتییەمان کرد کە پیاو پێویستییەتی بۆئەوەی لێ نەگەڕێ خەفە بکرێ.

بەبێ دەستی خۆم ئەم پرسیارەم هاتە سەر زمان کە هەرگیز لەبیرم نەدەچووەوە:

– (فرانسوا)، ئەرێ قەت پێم گوتووی، پێش ئەوەی بێمە ڤێتنام خوشکم چ پرسیارێکی لێ کردم؟

– نا، پرسیاری چی لێ کردی؟

– پرسیاری لێ کردم: " ژیان یانی چی؟!"

– جا تۆ چت وەڵام دایەوە؟

– نەمدەزانی چ وەڵامێکی بدەمەوە.

– پێت باوەڕ دەکەم.

– بەڵام ئێستا دەمەوێ وەڵامی بدەمەوە ... ژیان یانی چی؟

– ژیان ... ئەم زەوییە گرووڤەرەیە کە سێ ملیارد ئینسانی لەسەر دەژی. هەریەکە تێگەیشتنی تایبەتی بۆ ژیان هەیە. خۆت دەزانی، بەلای هیندییەکی هیندستان کە دێتە دونیا و دەمرێ بێ ئەوەی هەر هەستیشی پێ بکاو ئەمریکییەک کە هەر خەریکی دەرمان دروست کردنە و ڤێت کۆنگێک کە ئەگەر تفەنگەکەی سێ فیشەکی تێدابێ دەچێ پێش لە تانک و زرێ پۆش دەگرێ، ژیان شێوەی جۆراو جۆری هەیەو ... جیاوازە ... ژیان ...

– (فرانسوا)، ژیان یانی چی؟

– نازانم، بەڵام هەندێ جار پرسیار لەخۆم دەکەم: ئایا ژیان شانۆیەک نییە کە بە فەرمانی یەکێ توور هەڵدەدرێیتە ناوی و کاتێ کە کەوتیتە ناوی، ئیتر دەبێ هەمووی تەی بکەی و ئەم تەی کردنەش هەزاران جۆری هەیە: جۆری هیندی و جۆری ئەمریکی و جۆری ڤێت کۆنگ ...





– ئێ، پاش ئەوەی تەیت کرد؟

– یەک جار تەی بکەی، ئیتر بەسە. تۆ ژیاوی. لە شانۆ دەچیتە دەرەوە و دەمری.

– ئەی ئەگەر یەکسەر مردی؟

– جیاوازی نییە: مانای وایە شانۆت بڕیوە، بەڵام نەختێ خێراتر. ئەو ماوەی بەم تەی کردنە سەرفی دەکەی، گرنگ نییە، جۆری تەی کردنەکەت گرنگە. گرنگ ئەوەیە بە چاکی تەی بکەی.

– باشە، تەی کردنی بە چاکی، یانی چی؟

– یانی نەکەویتە کونی سوفلور. یانی وەکوو ڤێت کونگێ بجەنگی. لێ نەگەڕێی خەفەت بکەن، لێ نەگەڕێی خۆپەرستان هەڵەوەڕیت دەرهەق بکەن. یانی ئیمانت بە شتێ هەبێ و وەکوو ڤێت کۆنگێ بۆی بجەنگی.

– ئەی ئەگەر غەڵەت بکەین؟

– بە جەهەننەم! گرنگ نییە. غەڵەت بکەی باشترە لەوەی، هیچ نەکەی!

– (فرانسوا)، دەفتەرە بچووکەکانی منت لە بیرە کە بە نووسین پڕم دەکردنەوە؟

– دەفتەرە بچووکە سەیرەکان! بەڵێ لە بیرمە.

– بیرم لەوە کردۆتەوە، ئەمانە بەکاربێنم و کتێبێک بنووسم.

– باشە، ئەگەر ئەم ئیشەی تۆش غەڵەت بێ،هەر بە جەهەننەم! گرنگ نییە.

بەم جۆرە، کتێبەکەم نووسی و دام بە تۆو ئەگەر غەڵەتم کردبێ و ئەگەر غەڵەت بکەم و ئەگەر دەبوایە غەڵەت بکەم، بە جەهەننەم! گرنگ نییە.

ها، فەرموو بگرە! ئەمە ژیانی یەک ساڵی منە. لەوکاتەوە دەستم پێ کردووە تا ئێستا، یەک ساڵی رەبەق تێپەڕیوە. (با)ی زستان دووبارە درەختی ڤێلاکەمی وشک کردووە و ئیلیزابێتا لەناو نوێنەکەما لە تەنیشتم دانیشتووە: بچکۆلەو ناسک و شادان!

–" مانگ، سەیری مانگ کە!"

کەشتییەکی ئاسمانی، سێ رێبواری تێدایە، خەریکن لە خولگەی (مانگ) دەسووڕێنەوە. بەم زووانە لەسەر مانگ دەنیشن بۆئەوەی سنووری دەرد و ئازار و

ناتەواویمان فراوان بکەن. تەماشای کە، لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن ببینە. من مانگم زۆر خۆش دەویست و ستایشی ئەو کەسەم دەکرد کە رۆژێ بێ و بتوانێ بچێتە سەر مانگ.

بەڵام ئێستا، کە ئەم مانگە خۆڵەمێشییە بۆش و بەتاڵە لە هەموو شت، بۆش و بەتاڵە لە ئازار و ژیان، دەبینم، کە بۆ لەبیر کردنی غەڵەتەکانی خۆمان و شوورەییەکانی ئێرە و بۆ دوورکەوتنەوە لە خۆمان، داگیرمان کردووە، قسەیەکی تۆم بیردەکەوێتەوە (فرانسوا)، کە پێت گوتم:

" مانگ، ئارەزووی ئەو کەسانەیە کە مانگیان نییە! "

من خۆم ئەم گۆیە سەوز و سپی و شینەم بەلاوە پەسەندترە کە پڕە لە چاکەو خراپە و ژیان و ناویشی (زەوی) یە.

دەزانم ئەم گۆیە شتێکی ژەهراوییە، مادام دەستی لێ بدەین، یان لەناوی بمێنینەوە، دەمرین.

(فرانسوا)، دەزانم ژیان جۆرە مەحکوومییەتێکە بە مردن، بەڵام هەقتە کە تۆ ئەم قسەیەت بە من نەگوت. هەر لەبەر ئەو مەحکوومییەت بە مردنەشە، کە دەبێ تەی بکەین و بێ یەك هەنگاوی غەڵەت و بێ ئەوەی یەك چرکە بخەوین و بێ ئەوەی دوودڵ بین کە غەڵەت دەکەین، یان پێمان وابێ دەیشکێنین، دەبێ تەی بکەین. ئێمە ئینسانین، نە فریشتەین و نە حەیوان، ئێمە بەشەرین!!

وەرە، خوشکە چکۆلانەکەم (ئیلیزابێتا)، تۆ رۆژێ لە رۆژان دەتەویست بزانی ژیان یانی چی؟ ئایا ئێستاش هەر دەتەوێ بزانی؟

– بەڵێ، ژیان یانی چی؟

– ژیان شتێکە دەبێ باش پڕبکرێتەوە، بێ ئەوەی چرکەیەکی لەدەست بدەین، تەنانەت ئەگەر کاتێ کە پڕی دەکەینەوە، بشتەقێ.

– ئەی ئەگەر تەقی!؟

– ئیتر بە کەڵك هیچ نایە، هیچ و تەواو. ئامین!

وەرگێڕ

(هەولێر/ گەڕەکی مەلایان).